

پەیمانگای جیهانیی فیکری ئیسلامیی

(8)

# چەند لێکۆڵینەوەیەک دەربارەی بزاڤی هاوچەرخی کورد

## بەرگی دووەم

نووسینی: دکتۆر عوسمان عەلی

وەرگێڕانی: کامەران جەمال بابان زادە





چەند لێکۆڵینەوەیەک دەربارەی بزاڤی هاوچەرخی کورد

نووسینی: دکتۆر عوسمان عەلی

وەرگێڕانی: کامەران جەمال بابان زادە

2

کەوتنی رژێمی سەدام حوسێن لە عێراق (2003)، جارێکی تر مەسەلەی کوردی هێنایەوە سەر شانۆی رووداوەکان، لەوەتەی دەوڵەتی عێراق دروست بووە یەکەم جارە کورد قورسایی گەورەی هەیە لە داڕشتنی بڕیار و دیاریکردنی ئاییندەی ئەو وڵاتە، لەو حاڵەتەدا ئارەزووی تورکیا بۆ چوونە ناو یەکێتی ئەورووپا و لۆبی کوردیی رێکوپێک لە دەرەوە، رێگە خۆش دەکات کوردانی تورکیاش بتوانن زیاتر دەستکەوتی نەتەوەیی دەست بخەن، هەروەها فیدراڵیەتی کوردان لە عێراق و کەناڵە کوردییە ئاسمانییەکان کاریگەریی بەرچاویان هەیە لەسەر کوردی ئێران، ئاییندەی کێشەی کورد لە دە ساڵی رابردوو دەبێتە جێی بایەخی داڕێژەرانی بڕیار و پسپۆڕان لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست.

زۆری ئەو بابەتانەی لە دوای رژێمی سەدام حوسێن هاتنە بەر باس، بەتایبەت رۆڵی کورد، ئەو بابەتانەن، کە دوای شەڕی یەکەمی جیهانیی و سەردەمی دامەزراندنی دەوڵەتی عێراق لەلای لایەنە پەیوەندییدارەکان جێی بایەخ بوون، ئێمە لە چوار بەشی ئەم کتێبەدا باسمان کردوون.

بۆ تێگەیشتن لە بایەخی کێشەی کورد لە داڕشتنەوەی رۆژهەڵاتی ناوەڕاستی تازە، ئەم کتێبە دەبێتە جێی بایەخی پسپۆڕان و چاودێران بە کێشەی عێراق و کورد.



پەیمانگای جیهانیی فیکری ئیسلامیی

(8)

# چەند لێكۆڵینەوەیەك دەربارەی
# بزاڤی هاوچەرخی كورد

## بەرگی دووەم

نووسینی:
دكتۆر عوسمان عەلی

وەرگێڕانی:
كامەران جەمال بابان زادە

1431 كۆچی
2010 زایینی

ناوی کتێب: چەند لێکۆڵینەوەیەك دەربارەی بزاڤی هاوچەرخی کورد

نووسینی: دکتۆر عوسمان عەلی

وەرگێڕانی: کامەران جەمال بابان زادە

نەخشەسازی ناوەوە: ئیدریس سیوەیلی

نەخشەسازی بەرگ: هاوژین عومەر

تیراژ: **1000**

ژمارەی سپاردن: (**2655**) ساڵی **2009**

نۆرەی چاپ: یەکەم

ساڵی چاپ: **2010**

شوێنی چاپ: چاپخانەی چوارچرا

پێوانەی لاپەڕە: **17.5×25**سم

لە بڵاوکراوەکانی پەیمانگای جیهانیی فیکری ئیسلامیی ژمارە (**8**)

ئیمەیلی پرۆژە: iiitkurdistan@yahoo.com

پێشینەی سیاسەتی بەریتانیی لە عێراق لە ساڵانی (1921–1923) لە بەرانبەر هەڕەشەی تورکی زامنکردنی سنووری عێراقی بووە، بۆ ئەو مەبەستەش پشتیوانی جوڵانەوەی نەتەوایەتی کوردی کردووە بۆ بەرەنگاربوونەوەی رەوتی جامیعەی ئیسلامیی لە ناو کورد، ئەو جامیعەیەی کە تورکیا بەکاری هێناوە، هەتا لەو رێگەیەوە کورد هانبدات بەرهەڵستی ئیدارەی بەریتانی بکەن لە کوردستانی عێراق، حکومەتی بەریتانی دەبوایە هاوسەنگی رابگرێت لە نێوان خۆزگە نەتەوایەتییەکانی کورد و داواکارییە سیاسییەکانی لە عێراق بۆ پتەوکردنی حکومەتی مەلیك فەیسەڵ لە بەغدا، ئەمەش بۆ ئەوەی عێراق داگیرگەیەکی ئارام بێت، دامەزراندنی حکومەتی سێیەمی شێخ مەحمودیش کاتی بووە، بۆ خزمەتی ئامانجە سیاسییەکانی بەریتانی لە عێراق.

## کۆنگرەی قاهیرە - 1921-

ئەو زیانانەی تووشی ئینگلیز ببوو بە هۆی شۆڕشی (1920)ەوە لە عێراق، هەتا کۆنگرەی قاهیرەی ساڵی (1921) نەخشەیەکی بۆ سیاسەتی بەریتانی لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست دیاری کرد، فشارێکی زۆری لەسەر درووست کردبوو بۆ کەمکردنەوەی شاڵاوە سەربازییەکانی لە دەرەوە، ئەم کۆنگرەیە ئاکامی سەرکەوتنی هێزەکانی کەمالی بووە لە ئەنادۆڵ، کە بووە هۆی پەرتبوونی سیاسەتی "لیورد جۆرج"ی تایبەت بە تورکیا[1]، بۆ مانەوەی دەسەڵاتی ئینگلیز لە باکووری عێراق لە دژایەتی بەردەوام دابووە، داواکاری بۆ کەمکردنەوەی هێرشە سەربازییەکانی هاوکات بووە، لەگەڵ داواکارییە ستراتیژییەکانی بەریتانیا. لەو بارەیەوە بە فەرمانی هێژا (چەرچڵChurchill) وەزیری دەوڵەت بۆ داگیرگەکان، بۆ توێژینەوە لە بارودۆخی رۆژهەڵاتی ناوەڕاستو دانانی بنەمایەکی تازە بۆ سیاسەتی ئینگیز لە ئازاری (1921) لە قاهیرە ئەو کۆنگرەیە بەسترا، هەتا لە قاهیرە رێککەوتن لەسەر سپاردنی ئیدارەی عێراق بە حکومەتی عەرەبیو بەکارهێنانی پێگەی ئینگلیز بۆ گرەنتی پاڵاوتنی مەلیك فەیسەڵ بە پاشای عێراق. لە دوایی دەست بەوتووێژ کرا لەگەڵ حکومەت بۆ بەستنی رێککەوتننامەی

---

[1]- Curzon the Last Phase pp.260-262, Harold Nicolson.

هاوپەیمانییەتی، بۆ کەمکردنەوەی تێچوونی نێردراوە سەربازییەکان، کە جێگای ئینتیداب بگرێتەوە[2].

بەمەش ئەگەری ئەوە هەبووە یارمەتی حکومەتی بەریتانی بدرێت بۆ کەمکردنەوەی تێچوونی بە شێنەیی، کە تێچوونەکەی لە (32) جونەیهی ئیستەرلینی ساڵانە لە ساڵی (1921) بۆ کۆتایی بیستەکان کەم ببێتەوە بۆ (5/4) ملیۆن جونەیهی ئیستەرلینی، هەروەها رێککەوتن لەسەر کەمکردنەوەی ژمارەی هێزەکانی بەریتانی لە عێراق لە سیو حەوت تیپی سەربازییەوە تەنیا بۆ چوار تیپ. بەر لە پێکهێنانی سوپای تۆکمەو کشانەوەی هێزەکانی بەریتانی بۆ پڕکردنەوەی ئەو بۆشاییە لەشکری ناوخۆییان دامەزراندووە، هەروەها رێککەوتن پشتگیری لەشکری نێوخۆیی بکرێت لە رێگەی هەشت دەستە لە فڕۆکەکانی سەر بە هێزی ئاسمانی پاشایەتی بەریتانی[3].

بۆ خۆپاراستن لە هەستیاری نەتەوایەتی عەرەب لە بەرانبەر سیاسەتی سەرپەرشتیاریەتی بەریتانیو بۆ ئەوەی مەلیك فەیسەڵ بەبێ سڵەمینەوە مامەڵە لەگەڵ لەندەن بکات، حکومەتی بەریتانی بڕوای بە مۆرکردنی رێکەوتننامەی هاریکاری هەبووە لەگەڵ حکومەتی فەیسەڵ[4] و چاوەڕوانکراو بووە، بەو نزیکانە رێککەوتننامەی ئاشتی لەگەڵ ببەسترێ، دەبێت حکومەتی عێراقی وای لێ بکرێت پەرە بە سەرچاوە نەوتییەکانی خۆی بدات، بۆ ئەمە واپێویست بووە هاوکاری عێراق بکرێت، هەتا بەریتانیا بتوانێت بیکاتە داگیرگەیەکی بەتوانا تا لەسەر پێی خۆی بووەستێ[5].

ئەوەی لە پێشەوە بە دیاردەکەوێ لە باشووری کوردستان جۆرێك لە تێڕامانی ئاشتی هەبووە، بۆیە مەسەلەی کورد لەو بابەتە بنەڕەتیانە نەبووە لە کۆنگرەدا

---

[2]-- Ieland,pp.311-113

[3] – Bullard, Camel, P.117: H. Young Independent Arab pp.324-325, Ireland, pp.311-314, F.O, 371/6344, The Middle East Committee, Minuets of meeting held at a Colonial office on Monday 2nd 1921: Stives p.77, A.S. Klieman, the Foundation of British Policy in the Arab World the Cairo Conference of 1921(Baltimore The Johns Hopkins Press, 1970) p.111.

[4] – Niama pp.59-60, F.O, 371/23754, 31 May 1921, Teleg. Numb from Churchill to Curzon

[5] – Strives, p.76.

وتووێژی لەسەر بکرێت، بگرە لە کاتی تێڕوانینی جیاجیای کاربەدەستانی بەریتانی لەسەر ئەو سیاسەتەی کە دەبێت پیادەی بکەن لە باشووری کوردستان زۆرترین بابەتی وروژاند، وتووێژەکان لەسەر دوو تەوەرەی بنەڕەتیو دوو گروپی جیاواز بوون:

گروپی یەکەم: بانگەشە بۆ دانانی قەوارەیەکی سەربەخۆی کوردی لە عێراق، لایەنگرانی ئەم بۆچوونە چەرچڵو هەندێ لە پیاوانی دەوڵەت بوون. چەرچڵ بۆچوونی وابوو، لە جیاتی ئەو دەوڵەتەی لە سیڤەر بڕیاری لەسەر دراوە، کە لە ئەنادۆڵ دابمەزرێ، حکومەتی بەریتانی دەبێت بڕیاری دەوڵەتی کوردی لە باشووری کوردستان بدات، کوردی موسڵ ئارەزوومەندبوون بچنە پاڵ ئەو دەوڵەتە، ئەم دەوڵەتە بەهۆی بەرهەڵستی هێزەکانی تورکی پێك نەهێنرا. لەو کاتە بڕیاربوو هەموو ئەو شارانەی زۆرینەی عەرەب نین بچنە پاڵ ئەو دەوڵەتەی کورد[6]، چەرچڵو هاوڕێکانی قسەیان هەبووە لەسەر رقی کورد بەرانبەر عەرەب، بە جۆرێ کورد تووشی بێ ئومێدی دەبوون، ئەگەر لە ژێر دەستی تورکیا دەریانبهێنیو بیانخەیتە بن دەستی عەرەبان، لە دیدی کوردانەوە ئەمانە شارستانی تر نەبوون لەتورك.

چەرچڵ لەسەر توانای دەوڵەتی کوردی قسەی دەکرد، کە دەبووە ئامرازێکی ئاستەنگ لە بەردەم بڵاوبوونەوەی نەخشەی بەلشەڤ و بەرگریی لە فراوانبوونی ئیمپراتۆریەتی نوێی رووسی[7]، هەروەها چەرچڵ دەیوت: (لە حاڵەتی وروژاندنی دوژمنداریەتی کورد، ئەگەر تورك هێرش بکاتە سەر موسڵ نرخی زۆری دەوێ، بێگومان کورد لەو حالەتە هاوهەڵوێستی هێزەکانی تورکی دەبن)[8].

گروپی دووەم: ئەوانە بوون، کە پشتیوانیان لە دەوڵەتی کوردی نەکرد، بێرسی کۆکس نوێنەری باڵا لە عێراق نوێنەرایەتی دەکرد، لەگەڵ زۆربەی کاربەدەستە

---

[6] -British High Commissioner file (from now on BHCFO 13-14 Events (Kurdistan Policy) vol, 1, Teleg No 196 June 24, 1921 Churchill l, to Cox.

کوردستانی سەربەخۆ کە "جۆزیف هیل" دیاری کردووە، لە ژێر پاراستنی بەریتانیاوە ڕاستەوخۆ بەهۆی کۆمیساری باڵاوە بەڕێوە دەبرێ، لە ڕێگای دەزگای پێکهاتوو لە ئەنجومەنی ناوخۆیی کاروباری ناوخۆییان بەڕێوە دەچێت و لە حکومەت هاوکاری وەردەگرن.

[7] - F.o 371\634646,telp,Curchill to Cox June,13 1921

[8] - Spencer Noel, p. 123 Klieman p.110.

بەریتانییەکان، گرنگترین هۆکار لە ڕەتکردنەوەی دەوڵەتی کوردی بەلای ئەوانەوە سروشتی جوگرافیای عێراق بووە، ناتوانرێ بەرگری لە عێراق بکرێت بەبێ زاڵبوون بەسەر چیاکانی کورد لە باکوور و باکووری خۆرهەلات[9].

خاتوو بێڵ بەوپەڕی بایەخەوە بەشداری کردو وای دەبینی گرنگی لە ستراتیژیەتی بەرگریکردن لە عێراق لە هێڵی ئاگربەستەوە دەبێت، ئەگینا دەشتەکانی عێراق هەتا بەسرا کراوە دەبێ بۆ هێزەکانی تورکی، هەروەها بەدابڕانی باشووری کوردستان کانە نەوتییەکانی ناوچەکە دەکەوێتە بندەستی تورکیاو کانە نەوتییەکانی سەر بەکۆمپانیای ئینگلیزی– فارسی لە باشووری ئێران دەکەوێتە بەر مەترسیی[10].

سەرەڕای ئەمە لە لایەن نەتەوەخوازی عەرەبی لە بەغدا بەرهەڵستیەکی گەورە هەبووە لە بەرانبەر دانانی دەوڵەتی کوردی، گومانیان لە سیاسەتی بەریتانی هەبووە لە کوردستان، وایان بینیووە بەریتانیا هەوڵدەدات کوردستان بکاتە چەکی فشار بۆ سزادانی بەرهەڵستکارانی حکومەتەکەی لە عێراق[11]، مەلیك فەیسەڵیش دوودڵ بوو لە پێکهێنانی دەوڵەتی کوردی، چونکە لای نەتەوەخوازانی عەرەبی هەڵوێستی لاواز دەبوو، دەبووە بەکرێگیراوی بەریتانیاو یارمەتیدەر بۆ پارچە پارچەکردنی عێراق. کۆکس لەو بارەیەوە دەڵێ: (لە ڕاستییدا جۆشدانی قەوارەی ناسیۆنالیستی عەرەبی سەرکەوتووترین چەك بووە بۆ بەرگریی لەهەر هێرشێکی تورکی یان بەلشەفی، لە سەرمان پێویستە سیاسەتمان بەو ئاڕاستەیە بەرین)[12]، هەروەها کۆکس ـ پسپۆڕ لەو مەسەلەیەـ وا بیری دەکردەوە، کە کورد توانای دابینکردنی دەسەلاتی سەربەخۆیی نییە، ئەوانە لە ناوخۆیاندا پەرتوبلاونو هەستی نەتەوایەتی پتەویان نییە[13]. ستێڤن لۆنگریك سەرپەرشتیاری ئیداری لە کەرکووك بۆچوونی وابووە، کە کورد بەسەر چەند

---

[9] - Cab, 24 921, C.P. 2743, Feb, 26- 1921 Memo. (South Kurdistan..(

[10] - Graves, pp.275-278. FO, 371/ 6346 Teleg No, 201.

[11] -Lady Bell, Personal Papers

[12] - BHCF. 13/14, Events in Kurdistan. 1,vol, Teleg, No, 201, 21 June 1921, cox to Churchill ..

[13] - BHCF. 13/14, Events in Kurdistan. 1,vol, Teleg, No,257, 1,July 1921, HC, to Churchill..

هۆزێك دابەش بوون، سەرۆكە ناكۆكەكان سەرۆكایەتییان دەكەن و هیچ هەستی نەتەوایەتیان نییە[14].

خاتوو بێڵ بڕوای وابووە هەرچی تاقیكردنەوەیەك لە كوردستانی عێراق بكرێت سەرناگرێت، بۆیە دەیوت: (بابەتەكەتان لەسەری دەنووسرێ فاشیل، زۆربەی خەڵكیی خۆیان بە پیرۆز دادەنێن، نیوە ئاقڵ، نیوە برسی، تەواو بەربەرین، هەموو دژی یەكن، چۆن دەوڵەتی كوردی درووست دەكەن؟)[15].

كۆنگرەی قاهیرە بە هۆی هەستیاریی كێشەی كوردی دواخست، كۆكس داكۆكی دەكرد، ئەو مەسەلەیە رابگیرێت هەتا بتوانێت سیاسەتی خۆی بە هێواشی جێبەجێ بكات لە هەمبەر لكاندنی ناوچە كوردییەكان بە عێراقەوە، لەكۆی دەنگ لەسەر ئەوە بوون بەهەر هەوڵێكی بە زۆر كورد ناچار بكرێت بخرێتە سەر حكومەتی عەرەبی، بێگومان كورد بەرهەڵستی دەكات، كۆنگرە رای سپارد كوردستان لەژێر سایەی كۆمیساری باڵای بەریتانیدا بمێنێتەوەو راستەوخۆ سەربەخۆ بێت لە عێراق[16]، هەتا كاتێكی لەباربێت كورد بتوانێت چارەنووسی خۆیان دیاری بكەن.

هەردوو گفتوگۆكار "چەرچڵو كۆكس" قاهیرەیان بەجێهێشتو بڕوایان وابووە، كە لایەنی تریش رازی بكرێت لەو سیاسەتەی لەكوردستان پەیڕەو دەكرێ، كۆكس نووسیبوی: (بۆ ئەوەی لەگەڵ ئەو سیاسەتەی لەكۆنگرەی قاهیرە بڕیاری لەسەر دراوە بڕوا، لەدوای گەڕانەوەی لە عێراق راستەوخۆ لەگەڵ پسپۆڕەكانی ناوخۆی بەریتانیا كۆبووە، هەتا سەبارەت بەو سیاسەتەی دەبێت لەكوردستان بگیرێتە بەر، گوێ لە بۆچوونی ئەوان بگرێ، هەروەها كۆمیسونی باڵا بۆ وەزیری داگیرگەكان جەختی كردووە، كە بیر لە پێكهێنانی ناوچەیەك دەكاتەوە بۆ كورد، حوكمی زاتی تەواویان هەبێت لە چوارچێوەی عێراق)[17]. بەمەبەستی كەمكردنەوەی ئەو مەترسییانەی چەرچڵ خستبوویە ڕوو لەسەر توانای لێكنزیكبوونەوەی كوردو تورك، كۆكس دەیوت: (هەست دەكەم

---

[14] - Graves, p.284.

[15] - Iraq, 1900-1955,p.131

[16] - Lady Bell, Personal Papers,2. p.134

[17] - Cab, 24/121 C.P, 2866, Report for the period March $24^{th}$ to $30^{th}$ 1921

بەرنامەکەمان دەبێت سەرنج ڕاکێشتر بێت لەهەر بەدیلێکی تورکیا دەیخاتەڕوو، دەبێت پڕۆژەیەکی بەرفراوان بێت هەتا کوردە خاوەن خۆزگەکان بێنە ژێربالّیەوە)[18] .

چەرچڵ وەڵامی قسەکانی کۆکسی دایەوە، کە ئەو باوەڕی تەواوی هەیە، وازلێهێنانی کورد بۆ ژێرباری هەر حکومەتێکی عەرەبی لە بەرژەوەندی حکومەتی بەریتانیادا نابێت، دەڵێ: (بەتێگەیشتنی جیا لە هی کۆکس لە قاهیرە گەڕامەوە، بۆچوونی هاوسەنگم هەبوو لە بەرانبەر کوردستان، پێم وابوو دانانی دەوڵەتێکی سەربەخۆ لە باشووری کوردستان دەبێتە بەربەست لە نێوان تورکیاو عێراق)[19] .

بیرۆکەی چەرچڵ دەبووە زرێیەکی پاسەوانی بۆ عێراق لە بەرانبەر ئێران و تورکیا، عێراق رزگاری دەبوو لە بەرگری لە بەرانبەر سوپای نیزامی[20]، ئەمەش زیندووکردنەوەی نەخشەی "سێر هنری رۆلنس" بووە، کە بۆ هەمان مەبەست لە ساڵی (1853)دایینابوو، بەڵام کۆکس بە بەردەوامیی پێی رازی نەدەبوو، کە گوێڕایەڵی فەرمانەکانی وەزیرەکەی بکات.

بارودۆخە نێوخۆییەکانی عێراق کاریگەری گەورەیان هەبووە، بەوەی کە مەلیك فەیسەڵ بە هاوکاری هەندێك لە پیاوانی ئیداری بەریتانی فشاری دەخستە سەر کۆمیساری باڵا بۆ جێبەجێکردنی سیاسەتی پێوەلکاندن، مەلیك کۆمیساری باڵای رازی کردبوو، کە درووستکردنی کوردی عێراق لە ئەندازەیەکی زۆری دانیشتوانی سوننە مەزهەب بێبەش دەکات، کە ئەوکات حوکمی دەوڵەتێکی زۆرینە شیعە مەزهەب ئەستەم دەبوو[21]، بەڵام میجەر یونگ بە داوایەکەی مەلیك رازی نەبووە بۆ لکاندی کوردستانو روونی کردەوە، کە مەلیك فەیسەڵ لەو کاتەی عەرشی عێراقی درابوویە داوای کوردستانی نەکردبوو، بە ڕوونی وتی: (ئێمە بەڵێنی هاندانی نەتەوەیی عەرەبیمان داوە،

---

[18] -FO, 371/6346 Teleg, No. 196 June 21, 1921 Churchill to Cox ..

[19] - FO, 371/6346 Teleg, No, 196, June 9,1921, cox to Churchill Administered Report on Iraq 1921, p.7.

[20] – FO, 371/6346 Teleg, No, 196, June 9,1921, Cox to Churchill. FO, 371/6397,Teleg No 503 Sept, 23, 1921 Cox to Churchill

[21] – Busch,p.373..

نەك ئیمپریالیستی عەرەبی)[22]، لەگەڵ ئەوەدا كۆمیساری باڵا كاری دەكرد بۆ بەهێزكردنی مەلیك فەیسەڵ، چونكە بانگەشەی بۆ بەرژەوەندییەكانی ئینگلیز دەكردو لەگەڵ بەهێزكردنی دەوڵەتی عێراقدا بوو، كۆكس بۆ چەرچڵی نووسیبوو: (بۆ ئێمە نییە لە هیچ حاڵەتێكدا لەو راستییە بێئاگا بین، كە كێشەی كوردستان بە پلەی دووەم دێت لە دوای كێشەی عەرەبی، ئەگەر ویستمان دۆستایەتی عەرەب بكەین نابێت هیچ شتێك بكەین كاریگەری لەسەر ئەوە هەبێت عێراق ببێتە دەروازەیەك بۆ كوردستان)[23].

لە ئابی (1921) كۆكس توانی باوەڕ بە چەرچڵ بهێنێت، كە لە كوردستان پشتگیری لە سیاسەتەكەی بكات، لە (25)ی ئاب چەرچڵ بە دڵنیاییەوە بۆی نووسی كێشەی بنەڕەتی مسۆگەركردنی شوێنی مەلیك فەیسەڵەو كێشەكانی تر پلەی دووەمە، لە هەمان كاتدا فەرمانیدا لە كوردستان فەزڵی عەرەب نادا بەسەر كورد. وەزیری داگیرگەكان فەرمانیدا بە كۆمیساری باڵا بۆ ماوەی دوو ساڵ نەخشەكەی جێبەجێ بكاتو لە چوارچێوەی بەرفراوان خودموختاری بدات بە كورد، هەتا دەسەڵاتی مەلیك فەیسەڵ پتەو دەبێت[24]، ناكۆكیی نێوان كۆكسو چەرچڵ درێژەی هەمان ناكۆكی نێوان كیرزۆنو وڵسن بوو، لەسەر كێشەی موسڵی ساڵانی (1918–1920)، كە جەخت لەسەر نەبوونی سیاسەتێكی روونو ئاشكرا دەكات لە بارەی كورد، لە هەمبەر نەبوونی رێككەوتنامەی ئاشتی بووە لەگەڵ توركیا. نەخشەی كۆكس لە سێ خاڵی بنەڕەتی پێكهاتبوو ئەوانیش:–

1– پێكهێنانی لیوایەكی كوردی لەو چوار قەزایەی ویلایەتی موسڵ وەك: زێبار، ئاكرێ، ئامێدی، دهۆك، بەشێوەیەكی كاتی ناوچەكە بكەوێتە ژێر فەرمانی یاریدەدەری موتەسەریفی بەریتانی، هەتا كاربەدەستێكی ئیداری كورد دەست دەكەوێت.

---

[22] - BHCF. 13/14, Events in Kurdistan. 2,vol, Teleg, No,1072,May 14,1921 Office Political Sulaimani, to HC, Baghdad Busch p.373 Teleg No, 616, Oct.25, 1921 cox to Churchill cited in Aziz al, Hajj. p.188

[23] - FO, 371/6367 Teleg No. 616 From HC, to S.S. cot,26 Oct, 1921, BHCF 13/14 Events in Kurdistan. 2,vol,1.(Major Young s appreciation of position as regards Kurdistan) 24Oct,1921

[24] -BHCF, Events in Kurdistan, vol, 2, U/D

2– پێکهێنانی لیوایەك لە هەولێر و کۆیە و ڕەواندز و چەند دامەزراوێکی گرنگی حکومەت بە هاوکاری ئینگلیز و عێراقییەکان بدەنە کورد.

3– ناوچەی سلێمانی لەلایەن موتەسەڕیفـو ئەنجومەنی لیوا بەڕێوەببرێت، ئەفسەرێکی سیاسیی بە پلەی موتەسەڕیف سەرۆکایەتی بکاتو کۆمیساری بالاَ ببێتە بازنەی بەیەکگەیاندنی موتەسەڕیفـو ئەنجومەنی دەولەت لە بەغدا[25].

تۆڵدسمیت ئەفسەری سیاسیی لە سلێمانی هەواڵی دایە سەرۆکە کوردەکان، کە سیاسەتی حکومەت ئامانجی راهێنانی کوردە لەسەر سەرکردایەتی کردنی خۆیان، ئیدارەی ئینگلیز دەمێنێتەوە هەتا دامەزراوەکانی حوکمی زاتی تەواو پێك دێت[26].

مەلیك فەیسەڵو نەتەوەخوازانی عەرەب بڕوایان بەو سیاسەتە نەبووە، کە کۆکس پیادەی کردووە، وایان دانابوو ئەمە نەخشەیە بۆ دانانی دەوڵەتی کوردی، بەم پرسیارانەی خوارەوەی مەلیك فەیسەڵ گوزارشتە لەو سیاسەتە:

ئەگەر هێزێکی دەرەکی هێرشی کرد، ئایا بەریتانیا ئامادەیە بەرگریی لە کوردستان بکات؟ لە دوای ئەوە، ئایا دەتوانێت گرەنتی عێراق بکات لەهەر هێرشێك، کە بە کوردستاندا بێت؟ ئەگەر ئەمە وایە هەتا کەی وادەبێت؟ ئایا بەریتانیا ئامادەیە بەرپرسیاریەتی گەڕەلاوژەی ناو کوردستان لە ئەستۆ بگرێـت، کە ببێتە مەترسی بۆ سەر عێراق؟ ئەمە ئەگەر وایە تاکەی؟ ئەگەر هەندێ لە کۆمەڵە کوردییەکان ئارەزووی خۆیان دەربڕی بۆ لکاندنیان بە عێراقەوە، ئایا بەریتانیا مەبەستیەتی ناچاریان بکات لە عێراق دابڕێن؟ لە حاڵەتی جیابوونەوە، بەریتانیا چ جۆرە حکومەتێکی دەوێ بۆ کوردستان؟[27]. چەرچڵ لەسەر کۆنفیدراڵی وەڵامی دایەوە، کە حکومەتی بەریتانی هیچ

---

[25] – BHCF 13/14 Events in Kurdistan. 2,vol, 1 Teleg. No, 2109 August 25. 1921, Churchill to Cox FO, 371/6397 C.p. 3460 , (Cabinet Meeting the Milting. The Military Situation in Iraq) Dispatch No. 622 Dobbs to Churchill..

[26] – Special Report on Progress of Iraq, pp.252-24.

[27] – Peshkawtin, May 12-1921: FO. 371/6387, Memo p.1954

بەشێکی کوردستان قەدەغە ناکات بچنە پاڵ عێراق، حوکمی زاتی کوردستان بۆ ڕازیکردنی کوردە هەتا لە پشت سنوورەوە بە پیر هێرشەکانی تورکییەوە نەچن[28].

ئەو پرسیارانەی مەلیك فەیسەڵ لە کۆکس لە تێگەیشتنی وردی فەیسەڵەوە سەرچاوەی گرتبوو بۆ بارودۆخی پەرتی کوردستان، مەلیك فەیسەڵ هوشیار بووە بەوەی، کە حکومەتی بەریتانی ئامادەنییە بەرپرسیاریەتی کوردستان لە ئەسۆ بگرێ، بەم پرسیارانە ویستوویەتی ڕێگر بێ لە عێراق لە هەمبەر پێکهێنانی حوکمی زاتی، هەروەکو لە وەڵامەکەی چەرچڵ بەدیاردەکەوێ مەسەلەی حوکمی زاتی فەرمانێکی جێگیر نییە، بەڵکو بزاڤێکی سیاسییە بۆ پوچەڵ کردنەوەی کاریگەری تورکیا لەسەر کورد.

سەرکەوتنی ستراتیژییەتی کۆنگرەی قاهیرە وەستابوو لەسەر ئاشتی لە کوردستانو ئاسایی بوونەوەی پەیوەندییەکانی لەگەڵ تورکیا و نەبوونی بەرهەڵستی دەسەڵاتی فەڕەنسی لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست[29]، بەڵام نیگەرانی هەبووە لە هەمبەر نەخشەی

---

[28] - FO.371/6397 Meeting of the Eastern Committee With Regard to Policy in Kurdistan Nov.2, 1921, Memo, by E.G, Adam.

[29] - فەرەنسا بەتوندی بەرهەڵستی هاتنی مەلیك فەیسەڵ بووە، بۆ سەرۆکایەتی عێراق، چەندین جار هەوڵیدا پەشێوی بخاتە ڕژێمەکەیەوە، لەگەڵ بەریتانیا لە دوای شەڕ سەرکردایەتی دوو سیاسەتی جیاوازیان دەکرد، وا دەردەکەوێ فەرەنسا وەکو ئارەزووی بووە تورکیا لەناوبەرێو لە ئاستی نێودەوڵەتی بیگۆڕێ بۆ هێزێکی لاواز، ئەمەش لە ڕێگەی دابەش کردنی بۆ یەك دەوڵەتۆکەی بچووك، بۆیە بەریتانیا بە خەستی لە شەڕەکانی ساڵی (1920 – 1922) یارمەتی هێرشی یۆنانیەکانی داوە بۆ سەر تورکیا، فەڕەنسییەکانیش لە لای خۆیانەوە حەزیان کردووە یارمەتی تورکە کەمالییەکان بدەن، لە (20)ی تشرینی یەکەمی (1921) ڕێککەوتنامەی "فرەنکلین بولون"ی لەگەڵ تورکیا مۆرکرد، بەو پێیە هەرێمی سیسلیا "ئەسکەندەرۆنە" ڕێڕەوێکی ئارام بێت بۆ تورکیاو ئاسیای بچوك، لەگەڵ داگیرکردنی سوریا لە لایەن فەرەنسییەکانەوە بەریتانیا ناڕەزایی دەربڕی لە بەرانبەر ئەو ڕێککەوتنامەیە، چونکە تورکیا بەهێزدەکات، بەڵام فەرەنسا لە ئەمە ڕاوێژی بە بەریتانیا نەکرد، گەرچی فەرەنساش ئەندامی ئەو کۆمەڵە دەوڵەتە بووە، کە لە جەنگی یەکەمی جیهانی شەڕیان لە دژی تورکیا کردووە- بڕوانە :See .Lady Bell, Spencer, papers,2 p.217

فەرەنسییەکان لە هەوڵی ورووژاندنی گومانو دوودڵیدا بوون لەسەر مەلیك فەیسەڵ، ئەوەیان بۆ بەریتانییەکان باس کردووە، کە کەسێکی لاوازەو ئەمە بۆ مەلیك فەیسەڵ شوێنێکی گەورەیە، ئەم

سیاسییی بەریتانی لە ناوچەکەدا، ئەم نیگەرانییە بە بانگەوازی تورکی بۆ پێکهێنانی جامیعەی ئیسلامی زیادی کردو شوێنەواری خراپی لەسەر بەرژەوەندییەکانی بەریتانی لە ناوچەکە بەجێهێشت، ئەم نیگەرانییە لە کاتی راپرسی تاج لەسەرنانی مەلیك فەیسەڵ بۆ عەرشی عێراق ئامادە کرابوو، بەدیار کەوت، کە لە توێژینەوەکەی کۆکسدا دیارە.

کۆمیساری باڵا لە دوای گەڕانەوەی لە قاهیرە هەوڵیداوە لە هەستی کوردان ئاگادار بێت بەرانبەر مەلیك فەیسەڵ، کە هەندێ لە نەتەوەخوازانی سلێمانی کەوتنە هاندان بۆ پێکهێنانی دەوڵەتی کوردی، لەگەڵ کەمی ژمارەیان، بەڵام دەستەبژێرێکی بەهێزبوون، هەموو پەیوەندییەکیان لەگەڵ بەغدا رەتدەکردەوە، تەواو هوشیار بوون بە پەیوەندی بەهێزی نێوان ئابووری کوردستان لەگەڵ هەموو ناوچەکانی عێراق، بەڵام وایان دەبینی دەبێت ئەو پەیوەندییە ئابوورییانە لەسەر بنەمای ئاڵوگۆڕی هاوبەش بنیات بنرێ لە نێوان ئەو دوو دەوڵەتە خاوەن سەروەرییە[30].

بەو شێوەیان سەرنج دابوو، کە پڕوپاگەندەی کۆکس لەسەر نەبوونی یەکێتی کورد راست نییە، هۆیەکە بۆ پێکنەهێنانی دەوڵەتی نەتەوەیی لە لایەن ئینگلیز، لە سلێمانی کوردەکان پرسیارێکیان لە میجەر "گۆڵد سمێت"ی ئەفسەری سیاسییی کرد: بۆچی کۆمیساری باڵا پێکهێنانی دەوڵەتی کوردی لەو ناوچانەی دەکەونە ژێر ئینتیدابی

---

کەسێکی ترسناکە، بۆ خۆبواردن لە مەترسییەکانی تورکیا "لیود جۆرج" لەو کاتەی کۆسپەکانی بەردەم بەریتانیایی ڕوون دەکردەوە لە عێراق بەزیادەڕۆییەوە بەو کۆسپانە دەیووت: بەریتانیا لە عێراق دوو ڕێگەی لەبەردەم دایە، یان دەبێت دەسەڵاتدارێکی عەرەب دابنێت، یان بەریتانیا، بە زۆرترین هێز بیپارێزێو بەریتانیاش ئارەزووی ئەم ڕێگەچارەی دوایی نییە. بڕوانە: See: 371/635 Teleg March (14, 1920 Churchill to Lloyd George

سەرەڕای ئەمە بەریتانیا بەڵێنی بە فەڕەنسییەکان دا فەیسەڵ ئێستا هیچ داوایەك لە کەس ناکات، لە ئاییندەش جوڵانەوەکانی لە ناو عێراق دەکەوێتە ژێر چاودێری وردەوە- بڕوانە: See, Naima, p.73: Noel Spencer, pp.45-47

[30] -- BHCF. 13/14, Events in Kurdistan. 1,vol,2 Dispatch No. 1072/1/E, po Sulaimani, May, 14,1921.

بەریتانی بەکارێکی مەحاڵ دەزانێت؟ بۆچی هیچ هاوکاریو ڕێنومایییەك نادات بۆ پێکهێنانی حکومەتی نەتەوەیی؟ هەروەکو لەگەڵ عەرەبی عێراقدا کردی[31].

لەمەسەلەی لکاندنی تەواو لەگەڵ عێراقو حوکمی زاتی ژێرئینتیدابی بەریتانی بۆچوونی پیاوماقوڵو سەرۆکە کوردەکانی کەرکووكو هەولێرو موسڵ لێك جیابووە[32].

ڕاپرسی کۆکس ئەنجامێکی روونمان دەداتێ لەسەر هەڵوێستی کورد بەرانبەر بە یەکگرتن لەگەڵ عێراق، کوردەکانی سلێمانی نەیانویستووە لەو ڕاپرسییە بەشدار بن، دەنگدەرانی کەرکووك لەسەدا چواری دەنگدەران بوون[33]. خەڵکی هەولێر دەنگیان بە مەلیك فەیسەڵ دا، بەڵام دەنگدانەکە بەهەوڵی رائد "لیون"ی یاریدەدەری ئەفسەری سیاسیی بووە، پیاوماقوڵانی موسڵ فەیسەڵیان هەڵبژاردو مەرجیان هەبوو لەوانە:

1- بەردەوامیی ئینتیدابی بەریتانی لە عێراق.

2- دانپێدانانی فەرمی بەزمانی کوردی لە فێرکردنو دادگاو کارگێڕی.

3- دەستەبەری یاسایی بۆ مافی کوردی لە عێراق.

4-لە حاڵەتێ، کە کوردستانی باکوور بووە دەوڵەتی سەربەخۆ، کورد مافی ئەوەی هەبێت بچێتە پاڵ ئەو دەوڵەتەی لە پەیمانی سێڤەردا هاتووە[34].

بۆ بەدیارخستنی ناڕەزایی هیچ نوێنەرێکی کوردی لە سلێمانی و کەرکووك ئامادەی ئاهەنگی تاج دانانی مەلیك فەیسەڵ نەبوون[35]. ڕاپرسییەکەی کۆکس لە مایس و ئەو

---

[31] - Administrative Report Iraq, October 1921 to march 1922, p.7, FO,371/6345. Intelligence report No, ,No, 20, Feb., 20, 1921. The Daily Telegraph, June 13, 1921.

[32] - Administrative Report Iraq, October 1921 to march 1922, p.7

[33] - بەریتانیا لە (28 و29)ی تەموز ڕاپرسی گشتیی بۆ سەرخستنی فەیسەڵ بۆ عەرشی عێراق ئەنجامدا، لە پێش ئەم ڕاپرسییە کۆبوونەوەی حکومەتە خۆجێییەکان "لە نێوان چاودێرانی حکومەتی بەریتانی و سەرۆکی ئەو حکومەتە خۆجێیانە" هەبوو، ڕوونیان کردەوە، کە ئارەزوو دەکەن دەنگی ئەرێتی بدەن، تێکگیرانی فەرمی لە لایەن دۆستانی بەریتانیا و لایەنگرانی پشتگیری ئینتیداب شتێکی پەسندبوو، بەڵام تێکگیرانی بەرهەڵستکاری مەلیك فەیسەڵ، یان بەرهەڵستکاری ئینتیداب ڕەت دەکرایەوە- بڕوانە: Administrate Report Iraq October 1920 to March 1922, p.14 Spencer Noel pp.55-57 Slugfest. Pp.332-335

[34] .Teleg August 12, 1922, BHCF, 13/14 Events in Kurdistan, vol, 3.

ڕاپرسییانەی لە حوزەیران لە عێراق ئەنجام دران بەدیار کەوت کورد لە سلێمانی و هەولێر و کەرکووک زیاتر لە سێ بەشی دانیشتوانی کوردستان پێکدەهێننو هەر هەموویان مەلیك فەیسەڵیان قبوڵ نەکردووە، ئەمەش ئاساییە، چونکە لەوەو پێش نەیانناسیوەو دۆستایەتیان نەکردووە، ئاماژەی دژبەیەکی کۆکسو چەرچڵ لە بەغدا تاڕادەیەك بووە، بۆتە هۆی ناوزڕاندنی مەلیك فەیسەڵ لە کوردستان. ئاماژەیەکی تریشە، کە مەلیك فەیسەڵ لە حکومەتەکەیدا کوردی پێ باش نەبووە، ئەم گرژییەی سوود لێ وەرگرتووە بۆ هەوڵی گەڕانەوەی دەسەڵات بۆ موسڵ.

## مەسەلەی ئۆزدەمیر

تورکیا لە ماوەی ساڵانی (1921- 1922) هەوڵی داوە نیگەرانی کوردان دژی بەریتانیا بقۆزێتەوە بەتایبەت گۆڕانکاریی و بێزارییەکان لە دانانی مەلیك فەیسەڵ بۆ سەرهەڵدانی کێشەو دەستبەسەراگرتنی موسڵ، بڕوانامەی تورکی رایگەیاندبووە، کە ویلایەتی موسڵ بەشێکە لە تورکیا و جیاناکرێتەوە، لە پێنجی حوزەیرانی (1921) ناسیۆنالیستەکانی ئەنقەرە توانییان میانڕەوەکان دەربکەن، بەکر سامی لە میانڕەوەکان ناچارکرا دەست لەکاربکێشێتەوە، حکومەتی نوێی مستەفا کەمال سیاسەتی فراوانخوازی بوو، داوای لە وەزیری تازەی دەرەوە کرد، کە لە سنووری عێراقدا سیاسەتی هێرشبردن بگرێتە بەر[36]. نەخشەی ستراتیژی کەمالی بۆ دەرەوە فشار بووە بۆ سەر دوژمنانی تورکیا، وەکو: فشاری بۆ سەر فەرەنسا بەداگیرکردنی سلیسیا "ئەسکەندەروونە"، فشار بۆ سەر یۆنان بەداگیرکردنی سمیرنە (ئەزمیر). بەهۆی سەرکەوتنی لە ڕزگارکردنی زۆربەی ئەو زەوییانەی پێشتر لە لایەن یۆنانی و

---

[35] -FO, 371/6397, Intelligence Report Iraq No. Nov 1921: Iraq Administrative Report October 1920 to March 1922 P.7 Longing Iraq 1900-1950 p.133, Graves p.301. Bird wood Nori Study in Arab Leadershiq (London, Cassell and Co, 1959 .(

[36] -Edmonds, Kurds. Turks and Arabs, p.118.Iraq Administrative Report October 1920 to Match 1922,p.15 .

فەرەنسییەکانەوە داگیرکرابوو، مستەفا کەمال پێی وابوو کاتی ئەوە هاتووە فشار بخاتە سەر سنووری عێراقی[37].

لە حوزەیرانی (1921) حکومەتی رووسی پشتگیری خۆی بۆ سیاسەتی کەمالیی راگەیاند، بۆ گەڕاندنەوەی دەسەلاتی تورکیا بۆ ئەو ناوچانەی کە "جێی گفتوگۆ نییە"، لە ئەرمینیاو باتۆم و رۆژهەلاتی تەورێزو کوردستان و ناوچەکانی فرەنەتەوەکان، "ئەم دەربڕینەی دوایی ئاماژە بووە بۆ ویلایەتی موسڵ"[38]. مستەفا کەمال پێی وابووە عێراق ئەڵقەیەکی لاوازی بەیەکگەیاندنە لە سیاسەتی دەرەوەی بەریتانیاو پێویستە هێرش بکرێتە سەر ئەو ئەڵقە لاوازە، هەتا جۆرێك لە فشار درووست بکرێت لەسەر بەریتانییەکان، ئەوانەی کۆسپی سەرەکین لەبەردەم رێککەوتن لەگەڵ هاوپەیمانەکان[39]، هەروەها پێی وابووە بەریتانییەکان سوود لە کورد وەردەگرن بۆ لەتکردنی دەسەلات لە تورکیا، سووربوون لەسەر ئەو باوەڕە، ڕاپەڕینەکانی ساڵی (1921)ی ویلایەتەکانی باشووری رۆژهەلاتی تورکیاوە بووە، لیژنەی پەرلەمانی تورکی لە دوای بەدواداچوون دەریخست دەسەلاتدارانی بەریتانی و مەلیك فەیسەڵ لە عێراق لە پشت ئەو راپەڕینەوە بوون، بەریتانیاو حکومەتی عێراقی نکۆڵیان لەو پڕوپاگەندانە کردو وتیان: لیژنەی پەرلەمانی لە لایەن بەکرێگیراوانی فەرەنساوە بە هەڵەبراون[40].

هێزەکانی تورکیا بەنزیکەی سی و شەش هەزار سەربازەوە کەوتنە ئامادەییەوە، لەکاتێکدا بەریتانیا بۆ فشاری کەمکردنەوەی هێزەکانی لە عێراق ملکەچ بوو، ئەمەش مانای شەڕێکی بێ توانایی تازەیە لەگەڵ تورکیا لەسەر ویلایەتی موسڵ[41]. سەرەڕای

---

[37] - Lady Bell, Personal Papers,2. p.217

[38] - ناکۆکی نێوان رووسیاو تورکیا لەسەر سنووری فارس و قەوقاز لە ئازاری ساڵی (1921) بەمۆر کردنی بڕوانامەی دۆستایەتی نێوان ئەو دوو دەوڵەتە چارەسەر کرا ـ بڕوانە:- FO, 371/6397, cab. Papery No, 3494 No, v. 21,1921

[39] - FO, 371/7781 Cab, Paper No. 3847, March 20, 1922, FO. 371/6397, Cab Paper, 3494 (Docility of a Turkish Offensive in Northern Iraq) memo by 5.5. War, 21Nov, 1921.

[40] - FO,371/6391 Teleg No 821 Dec 28, 1921 HC to SS, Col, 6397 Teleg No 12, 1921, H. Rum bold to F,O.

[41] -FO, 371/7781 Cab. Paper No, 3847 (Possibility of a Turkish Offensive in Northern Iraq) memo Nov,21,1921

ئەوە بێبەش بوونی بەریتانییە لە بەکارهێنانی کورد لەململانێ لەگەڵ تورکیا، بۆیە هێرش دەکرێتە سەر ویلایەتی موسڵو بەزەبری هێز بەسەر کورد زاڵ دەبن[42].

بێزاری پیاوماقوڵانی کوردو نەتەوەخوازان لە باشووری کوردستان چەکێکی بەهێزی دایە دەست مستەفا کەمال بۆ فشار خستنە سەر دەسەڵاتدارانی بەریتانی لە عێراق، دوورخستنەوەی کورد لە ناوچەکانی خۆیان، لە کاتی سەرکوتکردنی شۆڕشەکەی شێخ مەحمود لە ساڵی (1919)و سیاسەتی مشتەکۆڵەی ئاسنی (میجەرسۆن)و (های) وای کرد هەموو ئەو کێشانە زۆربەی سەرکردە کلاسیکییەکانی کورد و بەشێك لە رووناکبیرانی کورد پەنابەرنە بەر یارمەتی تورکیا بۆ دەربازبوون لە هەوڵەکانی حکومەتی بەریتانی بۆ لکاندنیان بە عێراق، کوردەکانی ناحەزی بەریتانیا لە دەوری کۆمەڵێکی نهێنی کۆببوونەوە بەناوی "کۆمەڵەی نهێنی کورد"، کە پێشتر کارمەندی حکومەتی عوسمانی بوون، یان پیاوماقوڵانی دۆستی تورکیا بوون، زۆربەی لە سلێمانی و رەواندز کۆببوونەوە.

ئەحمەد تەقیو کەریمی فەتاح بەگو نوری باویل ئاغاو عەباسی مەحمود ئاغا لە ئەندامە دیارەکانی ئەو کۆمەڵەیە بوون[43]. شێخ ئەحمەدی بارزانی و شێخ ئەمینی سندۆڵان لە ڕانییە و فارس ئاغای زێباری پشتگیری بوون. کۆمەڵە لە نیسانی (1921) (ئەحمەد تەقی)یان نارد بۆ تورکیا بۆ هاریکاری کاربەدەستانی کەمالی لەسەر سنوور، تورکیا بەو ئەندازەیە لە ئینگلیز بێزار بوو بە ئەحمەد تەقیان وتبوو: داوای تورکان بکەن بێنە ناو باشووری کوردستان، کوردەکان هەواڵیان دایە والی وان ئامادەن خەرجی ئەو هێزانە بدەن، کە دەنێردرێنە باشووری کوردستان، کۆمەڵەی کوردی باوەڕی وابووە، کە سوپای تورکی لە خاکی کوردان هاوکار دەبێ بۆ کورد دژی بەریتانیا، ئەمەش لە بەهێزی دۆستایەتی کوردەوە بووە بۆ خەلافەت[44].

مستەفا کەمال مەسەلەی گەڕانەوەی ویلایەتی موسڵی جێهێشت بۆ عەلی شەفیق ناسراو بە "ئۆزدەمیر"، ژەنەڕاڵی بەڕەچەڵەك چەرکەسی، لەو کاتەی لە میسر بوو ناوی

[42] - FO, 371/6391. Teleg No, Baghdad 821 HC. To SS, Col

[43] - FO, 371/6391. Teleg No, 476,July 5,1922

[44] - Edmonds, Kurds. Turks and Arabs, p.230ا.

دەرکرد، نەخشەی ئۆزدەمیر بۆ گەڕانەوەی ویلایەتی موسڵ درووستکردنی فشاربووە بۆ سەر دەسەڵاتدارانی بەریتانی بە ڕێگەی ئاژاوەو پەشێوی نانەوە لە باشووری کوردستان، بنەڕەتەکانی ئەو نەخشەیەش ناردنی هێزی نیزامی بووە، بۆ چالاکی لە ناوچە کوردییەکان.

لە پێش گەیشتنی ئۆزدەمیر، بەردەوام پەیوەندی لە نێوان پیاوماقوڵو سەردارەکانی کوردو تورك دا هەبووە، لە کانوونی دووەمی ساڵی (1921) لە وان لە ڕۆژهەڵاتی تورکیا کاربەدەستانی تورك نامەیان بۆ چەند کەسایەتییەکی ناوداری کورد نارد، بەڵێنیان پێدان بەگەڕانەوەی دەسەڵاتی تورکی بۆ ناوچەکە، بەر لەگەیشتنی ئەوان فەرمانیاندا بەسەرۆکی هەمەوەندو جاف بیرۆکەی ڕاپەڕین دژ بە ئینگلیز ساز بکەن، هێرشەکان بۆ زیندووکردنەوەی خەلافەت لەگەڵ ناردنی دیاری بۆ سەرکردەکانی کوردو بەدواداچوونی هاوکارانی حکومەتی بەریتانی[45].

ئۆزدەمیر لە حوزەیرانی (1921) توانی کارگێڕییەکی کوردی دۆستی تورکیا دابمەزرێنێت، سوپای نانیزامی دۆست بە تورکیا زیادی کرد بۆ هەشتا هەزارو ڕەمزی بەگ چووە پاڵیان و کرایە قایمقامی تورکیا لە ڕەواندز[46]، لە بەرئەنجامی هاوکاری ئۆزدەمیر لەگەڵ شێخ عوبێدوڵڵای سوورچی، کە خاوەنی شەشسەد هەزار سەرباز بووە لە باشووری رەواندزو ڕۆژهەڵاتی هەولێر هێرشیان بردە سەر هێزەکانی بەریتانی، دوو سەد سەربازو ژمارەیەك باجگر کوژران. ئەمە پێگەی حکومەتی بەریتانی لەق کرد لە ناوچەکە، بۆیە بە پێنج هەزار عەرەبو کوردی سەر بە هێزی گەنجانە "الشبانە"، کە لە

---

[45] - FO,371/6333, Intelligence Rep, No.19, Iraq. 15,1921.Teleg No, 29, Aril 19,1921. Cox to Churchill, cited in al-Hajj, pp.40-41 371/10098 Intelligence Rep. Sept, 18,1924 Iraq.

[46] - Iraq Administrative Report Oct, 1920 to March 1922 p.78 in June 1921.

ـ دەسەڵاتی کوردی لایەنگری تورکیا لە ڕەواندز پێکهاتبوو لە:

سدیق ئاغای سورچی – سەرۆکی ئەنجومەنی ڕەواندوز.

ئەحمەد تەقی - یاریدەدەری سەرۆك

باویل ئاغا - ئەندامی ئەنجومەن

شەوکەت ئەفەندی - سەرۆکی شارەوانی

بڕوانە: حیلمی: ب6، ل2-9

خوارووی عێراقەوە هێنابووی بەڕووی ئەو هێزە ڕاپەڕیوەی دا کرد، توانی هێزی سورچیەکان تێك بشکێنێت، بەڵام هێزەکەی ئۆزدەمیر بەتەواوی تێك نەشکا[47].

سەرەڕای شەڕی پارتیزانی، ئۆزدەمیر تۆڕێکی پەیوەندیی لەگەڵ ناودارانی کورد لە شارەکانی سلێمانی و کەرکووك و هەولێر و ئاکرێ و موسڵ درووست کردبوو، لەو پەیوەندییانەدا دڵنیای کردبوونەوە، کە تورکیا دێت بۆ ویلایەتی موسڵو بەڵێنی حوکمی زاتی پێ دان لە سایەی حکومەتی تورکی[48]. بە جوڵاندنی هەستی ئایینی سەرنجی گوندنشینەکانی ڕاکێشابوو، ئەم نامەیەی دوایی باشترین نموونە بووە: (ئەوەی پێویستە برا هاودینەکانمان کاربکەن بۆ بەدیهێنانی ئەو یەکێتییە، کە دەوڵەتی عوسمانی نەخشەی بۆ کێشاوە، ئێمە دەزانین ناتەواویتان لە تەقەمەنیو هەندێ پێویستی تر هەیە، هەموو شتێکتان بەم نزیکانە بۆ دابین دەکەین، هەتا نەفرین بۆ موشریکان تۆمار بکەین، کە ئایینی خۆیان بە ئینگلیز و فەیسەڵ و دۆستەکانیان فرۆشتووە)[49].

ئەوەی ڕوونە مەلیك فەیسەڵ ئامانجی هێرشەکانی ئۆزدەمیر بوو، لەگەڵ هاندانی هۆزەکانی عەرەبو کورد لەسەر سنوور بۆ شۆڕش، پێدەچێ ئۆزدەمیر هاوکاری دارایی و مرۆیی لەکاربەدەستانی فەرەنسی لە سوریا دەست کەوتبێ، یارمەتی شێخ ئەحمەدی سنووسی دابوو، بۆ سازدانی هێرش، ئەو میرەی مستەفا کەمال لە باکووری ئەفریقاوە هێنابووی هەتا بیکاتە بەدیل بۆ عەرشی عێراق، لە ساڵی (1921) سنووسی مەبەستی

---

[47] - Peshkawtin 12 January 1922 Iraq Administrative Report Oct, 1920 to March 1922, p.45.

[48] - FO,371/6346 Teleg No, 29,Abril 1921 cox to Churchill 10098 Intelligence Rep, Sept, 18,1924, Teleg 1710, July 3, 1922, General Head Quarters Iraq to War Office Iraq Administrative Report Oct 1920. to March 1922,p.78.

[49] - Edmonds: Kurds Turks and Arabs, p.246.

ئۆزدەمیر ئاگادار بووە سوپای بەریتانی لە عێراق ژمارەیەکی لە موسڵمانی هیندی تێدایە، بۆیە بێ دوودڵی بە هەستی ئایینی لە ڕێگەی بڵاوکراوە نووسراوەکانی دەیدواندن کە بە زمانی ئوردو بڵاوی دەکردەوە ـ بڕوانە:

See: FO, 371/6353 Intelligence Report, No,19,August 15,1921 .

بوووە لەسەر سنوور هەندێ پەیوەندی دابمەزرێنێ لەگەڵ بەرهەڵستکارانی عێراقی لەویلایەتی موسڵ[50].

مەبەستی ئۆزدەمیر لە مایسی (1922) لەناو کوردا گەیشتە ئاکام، سەرۆکی هۆزی جەباری هاوتوخبی چەمچەماڵ بەئاشکرا هەڵگەڕایەوەو هۆزی هەمەوەندیش، کە خاوەنی پێگەی بەرفراوان بوو چوونە پاڵیان، لە کۆتاییدا دوو سەربازی بەریتانیان کوشت، شێخ موحەممەدی جەباری و کەریم فەتاح ئاغا لەگەڵ سێسەد کەس لە شوێنکەوتوانیان لەدوای لێدانی هێزەکانی بەریتانی پەنایان بردە بەر ڕەواندوز[51]. ئەم هێزە زیادەش* ئۆزدەمیری هاندا تا هەڵوێستی شاڵاوبردن بگرێتە بەر، هێرشی بۆ سەر هێزەکانی

---

[50] - FO,371/7781, Desp No, 61,Consulate Aleppo May 17 1922 Lady, Bell, personal paper 2,pp232-233, FO,371/6397 Teleg. No, 700 Nov, 21.cox to Churchill, Iraq Administrative Report Oct, 1920 to March 1922, p.76..

[51] - See, FO, 371/6397 Teleg No,29 April 19,1921.cab. paper. 3494, (Possibility of a Turkish Offensive in Northern Iraq) memo, by S.S. War, Nov,21,1921 .

ئەو دوو بەرپرسە بەریتانییەی لە چەمچەماڵ کوژران کابتن بۆندو کابتن ماکانت بوون، بەرپرس بوون لە کۆکردنەوەی باج یان سەربازگیری خۆجێی بوون لە ناوچەکە، کەریم فەتاح بەگ لە (18)ی حوزەیران بانگی کردنە گوندەکەی خۆیی‌و کاتێ هاتن هەردووکیانی کۆشت، لەو کاتە حکومەتی بەریتانی دوودڵ بوو لەگەیاندنی تەواوی سەربوردەکەیان بە پەرلەمان. لە (27)ی حوزەیران سکرتێری داگیرگەکان لەلایەن هەموو ئەندامانی موعارەزەوە پرسیاری ڕووداوەکەی لێ کرابوو، وڵامی دابوونەوە: (ئەمە کارێکی خیانەتکاری تاکڕەوانەی سەرۆك خێڵێکی سەر سنوورە، پێویست ناکات بەهیچ کێشەیەکی سیاسی ببەسترێتەوە.

See: H.C, Parl. Deb, vol.155. p.1827.

* - لە دوای شەڕی دەربەندی بازیان و دیلکردنی شێخ مەحمود، کەریم بەگی هەمەوەند بەخۆیی و سابیری برای هەندێك لە خزمەکانی لە هۆزی هەمەوەند بەشەڕی پارتیزانی لە ناوچەکانی چەمچەماڵ‌و بازیان‌و شوان خەریك بوو، خۆی نەدا بووە دەست هێزەکانی بەریتانی. ئەو ئەفسەرە سەرەڕای کۆکردنەوەی باج، کابتن ماکاند بەرپرسی سوپای لیڤی بوو لە ناوچەکە. بۆ دانووستان‌و خۆبەدەستەوەدان بانگی ئەو بەرپرسە بەریتانییەی کردۆتە گوندەکەو هەردووکیانی کوشتووە. مەبەست لێرەدا کەریم بەگی فەتاح بەگی هەمەوەندە، چونکە کەریم بەگی تریشمان هەیە. بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: دارا ئەحمەد، کەریم بەگی فەتاح بەگی هەمەوەند و...، هەولێر، (2001).

بەریتانی لە ڕانییە و هەریر دەست پێ کرد، هێزەکانی ئۆزدەمیر دەستیان بەسەر هەردوو شوێندا گرت، هێزەکانی بەریتانی هێرشیان کردەوە بۆ گەڕانەوەی ڕانییە، بەڵام بێ ئاکام بوو، ئەم دەستکەوتانە شکۆی ئۆزدەمیری لەناو کوردا بەرزکردەوەو وەکو چاوەڕوان نەکراوبووە، توانای شاڵاوەکانی پەرەپێ دا[52].

لە دوای ئەو زیانەی پێیان کەوت لە ڕانییە ئیدارەی بەریتانی لەکوردستان وێران بوو، کۆمیساری باڵا وای دەبینی ڕانییەو قەڵادزە بەڵگەن لەسەر دەستەوەستانی توانای سەربازیی لە سلێمانی، بۆیە لە شار کشایەوە، هێزە کوردییەکانی لایەنگری ئۆزدەمیر بەرەو باشوور ڕۆیشتن، هەتا دەست بگرن بەسەر کۆیە و تەقتەق، لە ئەیلولی (1922) هێزەکانی ئۆزدەمیر چل میل لە کەرکووکەوە دووربوون[53]. کوردەکانی لایەنگری تورك لە سلێمانی داوایان کرد دەست بەسەر شاردا بگرن، عەباسی مەحمود ئاغا بەرەو سلێمانی سەرکردایەتی ئەو هێزانەی دەکرد، بەڵام شێخ قادرو پیاوماقوڵانی شار تکایان لە عەباس کرد، کە هێرشەکەی بە ئاڕاستەی سلێمانی ڕابگرێ، هەتا شێخ مەحمود دەگات، حکومەتی بەریتانی لە پێناو وەستاندی خزینی تورکی کەوتە ئەنجامدانی ڕێوشوێنی پێویست بۆ گەڕانەوەی شێخ مەحمود لە کوێت[54].

ناوچە کوردییەکانی ڕۆژئاوای ڕەواندوزیش تووشی هەمان بارودۆخ بوون، سەرکردە کوردەکانی هاوکار لەگەڵ تورکیا دوودڵ بوون لە خستنەڕووی گوێڕایەڵی بۆ ئۆزدەمیر، هەریەك لە فارس ئاغاو شێخ ئەحمەد گوێڕایەڵییان ڕاگەیاند و بە تیپێکی سەربازییەوە چوونە پاڵ سوپای ئۆزدەمیر[55]. وای لێ هات شارەکانی کوردستان بێجگە لە هەولێر و کەرکوك ئەوەی تر هەمووی چوونە ژێر دەسەڵاتی ئۆزدەمیر، ئەوەی تر بە ناڕەحەتی لە ژێر دەسەڵاتی ئیدارەی بەریتانی مایەوە، ماوەی مانگی ئەیلول کوردستان لە بارێکی

---

52 - FO, 371/6381. Teleg No, 479, July, 5,1922, cox to Churchill

53 .- Iraq Administrative Report Abril 1922 to March 1923,p.649. Edmonds, Kurds. Turks and Arabs, p.296, Longrigg, Iraq 1900-1950, pp.44-50 .

54 - ئەحەد تەقی: ل66.

55 -Edmonds: Kurds Turks and Arabs, p.230 .

ئاژاوە و پەشێوی دابوو، ئیدارەی بەریتانیش وای لێ هات، هەروەکو لەسەر گڕکان بێت[56].

سەرەڕای کارامەیی‌و لێوەشاوەیی، ئۆزدەمیر تواناێکی سیاسییی قوڵی هەبوو بۆ سەرکردایەتی هێزەکانی ڕۆژهەڵات، دەنووسێ: (بەپێی زانیارییم ئینگلیز سلێمانیان بەجێ هێشتووە و لە کەرکووك و هەولێریش دەردەچن، ئەمە سەرەتایە بۆ پێکهێنانی دەوڵەتی کوردی، نامەم لە کوردەکانی ئاکرێ و چەمچەماڵ و کەرکووك وەرگرتووەو داوایان لێ کردووم شارەکەیان داگیر بکەم، من گومان دەبەم کوردەکان بە لاوازی ئێمە بزانن بە خیانەت هەوڵی زیندوو کردنەوەی کوردستانی سەربەخۆ بدەن)[57]. کۆمیساری باڵا لە سەرکەوتنەکانی ئۆزدەمیرو پیاوانی دەدوان، بەوەی چەند فەرمانبەرێکی تورکن‌و پێگەیان لەناو هۆزەکانی کوردا پەیدا کرد بۆ ڕاپەڕین، ئەمەش وایکرد بەریتانیا بەهەموو سیاسەتی خۆیدا بچێتەوە[58].

لەو بارەیەوە جویدە دەڵێ: (گومانی تێدا نییە زۆر هۆکار هەبوون لە بەرژەوەندی تورکان، لە ڕاستییدا هێزێکی قەبارە بچووك، بەدەرامەتی سنووردار لە وروژاندنی بەشێکی زۆری گوندەکانی کوردستان سەرکەوت، بە سوپایەکی کەمی تورکان توانی لەو ناوچانە درِ بە لەشکری بەریتانی بدات، بەڵام بە لێوەشاوەیی‌و ئازایەتی‌و بە زەبری تۆکمەیی)[59].

ئەحمەد تەقی سەرنجی دابوو ئۆزدەمیر بەهرەمەندەو هێزێکی بێوێنەی بووە لە بەرانبەر ئەوەدا هەندێ لە ئیدارییەکانی بەریتانی لەکوردستان وا دەبینن ئۆزدەمیر بە تەنیا لە سیاسەتی ناوخۆیی لێوەشاوە بووەو شانازی بەخۆوە کردووە، لەگەڵ ئەوەشدا "ئۆزدەمیر یەکێك بووە لە ئازادکارانی کوردستان، بەبێ بەکارهێنانی هێز زۆربەی دانیشتوانی کوردی بە لای خۆیدا ڕاکێشابوو"[60]. کارگێڕییەکانی بەریتانی بەگشتیی

---

[56] – Edmonds: Kurds Turks and Arabs, p.229-230

[57] - یاداشت، ب6، ل68

[58] -FO, 371/6381. Teleg No, 479, July, 5,1922, Cox to Churchill

[59])-- Kurdish Nationalism Movement) pt.2, p.553.

[60] – ئەحمەد تەقی: خەباتی گەلی کورد، ل62

سەرکەوتنی ئۆزدەمیر دەگەڕێننەوە بۆ بارودۆخی ئەو کاتە، نەك بۆ لێوەشاوەیی ئەو. هێژا ئەدمۆنس لە ماوەی ئەیلولی (1922) سیاسەتی ئیدارەی بەریتانی شی کردۆتەوە بەوەی نارۆشنو لاواز بووە، دەڵێ: کورد لە هێزو زەبر تێدەگات، دەبێت بە زەبر مل کەچی بکەی لە پاڵ نەرمییەکی کاتیی، بەڵام دەسەڵاتی کۆتایی دەبێت بە زەبر بێت[61].

مەرجی بنەڕەتی پێویست لە سەرکەوتنی ئیدارەی بەریتانی یەکلایی کردنەوەو خێراییە لە دەرکردنی بڕیار، هەتا ڕادەیەك ئەدمۆنس دەڵێ: لەدەستدانی ڕانییە بەو خێراییە بەهۆی لاوازی ئیدارەی بەریتانییەوە بووە، نەك بەهۆی لێوەشاوەیی ئۆزدەمیر، خانم "بێڵ" لەسەر ئەوە هاوڕایەو دەڵێ: (تورکەکان ئامادەن هێرش بکەنە سەر باکووری هەولێر، لەگەڵ ئەوەش خاوەنی لەشکر نین بەتەنیا بەڕێگەی ئەو هۆزانەوە ڕاپەڕین، کە لەگەڵیاندان، ئێمە هەتا ئێستاش بە وریایی دەستمان لەگیرفانمان دایە، سلێمانیشمان لەدەستدا، چونکە لەدوای (48) کاتژمێر نەبێت ڕێوشوێنی گونجاومان نەگرتەبەر)[62].

حاڵەتی نائارامی کوردستان هۆکارێکی تر بووە لە سەرکەوتنی تورکان، بەهۆی سیاسەتی ناڕۆشنەوە بووە. "کنیت ولیام" نووسەری بەریتانی گفتوگۆی لەسەر ئەوە کردووەو دەڵێ: (لە هەڵگیرسانی شەڕی یەکەمی جیهانییەوە لەبەر نەبوونی پسپۆڕ لە ناوچەکە بۆ هاریکاری سیاسەتی بەریتانی لە قاهیرە و ئەستەمبوڵ و بەغدا سیاسەتی بەریتانی تایبەت بەڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست ناڕێكو نەگونجاو دوودڵی بووە)[63].

خانم "بێڵ" لە شوباتی ساڵی (1922) دەنووسێ: (هۆکاری پاشگەزبوونەوەی سیاسەتی بەریتانی نەبوونی سیاسەتە، لەبەرئەوە پێویستە ڕێوشوێنی بەپەلە بگرینە بەر، ئێمە بە نەبوونی سیاسەتێکی ڕوونی بەرچاو زۆر دەسپێشخەریمان لەدەستداو وامان لێهات بەسەر ڕووداوەکان بازبدەین، وەکو بازدەر لە تاریکە شەوێکی ترسناك)[64].

لە دوای کشانەوە لە کوردستان نارۆشنی لە سیاسەتی بەریتانی زیادی کرد، ئەو کشانەوە تێفکرینێکی لەلای کورد درووست کرد، کە بەریتانیا مەبەستی نییە لە

---

[61] -Kurd and Turks and Arabs, p.236.

[62] - Lady Bell, Personal Papers,2. p.298.

[63] - The significance of Mosul, pp.350-351

[64] - Lady Bell, Personal Papers,2. p.282.

کوردستان بمێنێتەوە، بۆیە لە ترسی تۆڵەسەندنەوەی کاربەدەستانی تورکی کەس ئارەزووی هاوکاری نییە لەگەڵ کاربەدەستانی بەریتانی[65]. لە پێداچوونەوەیەکی رەخنەیی لە سیاسەتی بەریتانی لە کوردستان لە ساڵی (1922) توێژەرەوەی کورد "هەورامی" دەنووسێ: دژە بۆچوون لە سیاسەتی بەریتانیدا هەبووە،، ئەوان ئیدارەو حوکمی کوردستانیان دەویست لەگەڵ ئەوەدا پێچەوانەکەیان ڕاگەیاندبوو، ئەوان ڕقیان لەوە بووە وەکو هێزێکی داگیر کەر وێنە بگیرێن، زیاتر لەوەش ڕقیان لە فیکری ئەو تێچوونە دەبووەوەو بە موغامەرەیان داناوە، ئەوان سەرکەوتنیان دەوێت لە دۆستایەتی کورد، بەڵام لە ویستو دەسەڵاتی زۆرینە دابڕاون، یارمەتیدانی کورد بە باش دەزاننو لە مەبەستی ئەوان دڵنیانین[66].

هەریەك لەم هۆکارانە بەکێشی خۆی، کاریگەری هەبووە لەسەر ڕاپەرینی کوردستانی ماوەی ئازار بۆ ئەیلولی (1922)، بەڵام دەبێت سەنگێك بدەین بەئۆزدەمیرو کۆمەڵەکەی، هەروەها لێڵیو تێنەگەیشتن لە سیاسەتی بەریتانی لەکوردستان بەگرنگترین هۆکاری ئەو ڕووداوانەبووە، کە زەمینەی لەباریان ڕەخساند بۆ چاندنی تۆوی ناکۆکیو شۆڕش کردن، لەسەر ئەو شەڕەی کە لەکوردستان کرا دەسەڵاتدارانی بەریتانی هەڵوێستیان لاواز بوو، لەهەمان کاتدا ئۆزدەمیر کەسایەتیەکی نەتەوەیی یەکگرتووی هەبوو، "مستەفا کەمال" لەناو دانیشتوانی ناوچەی ململانێ ژمارەیەکی زۆر هاوسۆزی لەگەڵ بووە، بەهۆی دوودڵی حکومەتەکەیان لە لەندەن لە دەسپێشخەری ئازایانە، کە وەڵامدەرەوەی پابەندی نوێ بێت بەرپرسانی بەریتانیش لە عێراق دەستەوەستان بوون، سەرەڕای ئەوە ناچاری ڕەتدانەوەی بەرەنگارییەکانی ئۆزدەمیر بوون لە ناوچە شاخاوییە سەختەکان، کە باڵادەستی تەکنیکی بەریتانی سوودی نەبوو، هەتا دانیشتوانی ئەو ناوچە دابڕاوانە لە حاڵەتێکی تەواو دوژمنایەتی دابن.

نووشستی سیاسەتی توندو تیژی بەریتانی بەرانبەر کورد لە قاهیرە بەدیارکەوت، فێڵو ناجێگیری کە خەسڵەتی سیاسەتی بەریتانی بووە لە ماوەی ساڵی (1918) هەتا

[65] - FO,371/6346 Teleg No,29 April 1921 Iraq Administrative Report Oct 1920. to 1922, p.43.E.B,Soane,(Evacuation of Kurdistan), Journal Report Central Asian Studies, vol, 10, pt,1.1923.p.73.

[66] -Hawrami: Sheikh Mahmod and the Kurdish Question, pt.2, p.102 .

ساڵی (1920)، بەوە نەگەیشتە هیچ چارەسەرێك، بەڵگەیەك نییە لەسەر جێبەجێکردنی سیاسەتی "کۆکس" بۆ حوکمی زاتی، یاسای زاڵبوون بە هێز وەکو خۆی کاری پێ دەکرا، داڕێژەرانی بڕیاری بەریتانییەکان بایەخیان نەدا بەسووربوونی لە ڕادەبەدەری مستەفا کەمال بۆ درووست کردنی ئاژاوەو نائارامی لە ناوچەکەدا، بڕیاری حکومەتی بەریتانی بۆ گەڕانەوەی شێخ مەحمود بۆ سلێمانیو جارێکی تر بۆ وەرگرتنی دەسەڵات، کە گەورەترین بەڵگە بووە لەسەر ڕاڕاییو ناجێگیری سیاسەتی بەریتانی پەیوەست بەکورد[67].

## ئیدارەی دووەمی شێخ مەحمود

نووشستی نەخشەی بەریتانی لەکوردستان "چەرچڵ"ی خستە بارێکی زۆر نیگەرانییەوە، وای لێ هات قەوارەی کەمالی بەگەورەترین دوژمن دابنێ، بڕیاریدا ڕێوشوێنی زیاتر بگرنەبەر بۆ نەهێشتنی کەمالییەکان لە ڕاکێشانی زیاتری کوردستان[68]. بەرپرسەکانی بەریتانی زیاتر بایەخیان بەعێراق دەدا، لە ڕاپۆرتی ئیداری ساڵی (1922)دا هاتووە، کە بۆ بارودۆخی ئێستا ڕێوشوێنی خێرای دەوێ، چونکە لە هەموو باشووری کوردستان پێگەی دەسەڵاتی بەریتانییەکان لەسەر ڕۆخی لەناوچونە، گەرەلاوژە بەخێرایی بەرەو کەرکوك بڵاودەبێتەوە، لەکاتێکدا حکومەتی تورکی هەستی ئایینی وریا دەکاتەوە بۆ گرەنتی هەڵوێستی کورد بەلای خۆیدا، بەرپرسانی بەریتانی لە عێراق دەیانزانی هۆشیاربوونەوەی هەستی نەتەوایەتی لە لای کورد وەڵامدانەوەیەکی لەبارە دژی هێرشەکانی تورکی، "بوش"ی توێژەرەوە لە تێبینییەکانی خۆیدا دەنووسێ: (وا بەدیار دەکەوێ نەتەوایەتی بەدیلە)، ئەو پێشنیارەی "کۆکس" خستیە ڕوو بەشێکی گونجاوی لێ جێبەجێکرا، بەردەوام بوو لە چاودێری هەستی نەتەوایەتی لەلای کورد هەتا بتوانن بەرپەرچی تورکی پێ بدەنەوەو ناچاری بکەن بە ڕێککەوتنامەی داواکراو ڕازی بن)[69]

لە تەموزی (1922) لەو کاتەی شێخ مەحمود پەناهەندە بوو، ڕێگە بەمستەفا پاشا درا (کۆمەڵەی کوردستان) پێك بهێنێ، زۆربەی ئەندامانی لەکاربەدەستە کۆنەکانی

[67] - Lady Bell, Personal Papers,2. p.296.

[68] - Iraq Administrative Report Oct, 1920 to March 1923, p.24.

[69] -From Mundros to Lausanne, p.374.

شاربوون لەگەڵ هەندێ لە بەرپرسە سەربازییەکانی سوپای عوسمانی پێشوو، ڕەفیق حیلمی ئەندامی چالاکو ئەندامی دەستەی نووسەرانی بانگی حەق، "ڕۆژنامەی فەرمیی کۆمەڵە"[70]. دەنووسێ: ئامانجی سەرەکی کۆمەڵە بڵاوکردنەوەی بیری نەتەوایەتیو بەرەنگاربوونەوەی پێگەی تورکییە، لە ساڵی (1922) تۆفیق وەهبی وەکو یەکێك لەکاربەدەستانی دۆستی بەریتانیا سەردانی سلێمانی کردو هەوڵیدا خەڵکی ڕازی بکات دەسەڵاتی تورکی ڕەت بکەنەوەو ڕێگە نەدەن بێنە شارەوە، هەروەها هانیدان لەسەر بەدواداچوونی سەرۆکێکی تر لەجیاتی شێخ مەحمود[71]، حکومەتی بەریتانی بەردەوام دەگەڕا بەدوای سەرۆکیکی تر بۆ سەرکردایەتی جوڵانەوەی نەتەوایەتی کوردی. "جوڵد سمیپ"ی بەرپرسی سیاسی لە سلێمانی گەڕانەوەی شێخ مەحمودی پێ چاك بوو، بەڵام ئەدمۆنس بەرهەڵستی ئەو بۆچوونە بووە، چونکە پێی وابووە شێخ کەللە ڕەقەو قابیلی گۆڕان نییە، بۆیە پێشنیاری سەید تەهای کردووە. هەروەها نویلێ ڕای خۆی دەربڕی، کە زۆر بەگومانە لە شێخ مەحمود: (ئەوەی ڕابورد عەقڵیەتیو مامەڵەی قورسی ئەوی دەرخست)، بەڵام ئەدمۆنس دەنووسێ: لە کۆتاییدا دەستەوەستان مابنەوەو خێرایی ڕووداوەکان ناچاری کردین[72]. ئەوەش ڕوونی کردۆتەوە، کە حکومەتی بەریتانی ناچاربووە ئەو ڕاستییە قبوڵ بکات، کە شێخ مەحمود تاکە کەسایەتییە لە کوردستان

---

[70]- مەبەست لەکۆمەڵە (کۆمەڵەی کوردستان)ە "وەرگێڕ"

[71] -لە دوای کشانەوەی بەریتانیا لە سلێمانی گەڕەلاوژە و کێشە پەیدابوو، فەتاح بەگی سەرۆکی هۆزی هەمەوەند چووە ناو شارەوە، دۆستانی بەریتانی خستە بەندیخانە و ئەوەی تر لە بەریتانییەکان هەڵاتن، لەو کاتە ڕۆژنامەی کۆمەڵەی کوردستان کوردی ئاگادار کردەوە بەگەڕانەوەی شکۆداریەتی تورکیا.

بڕوانە: بانگی کوردستان، ژمارە (6)، 8ی ئەیلولی 1922، ژمارە (8) 29ی ئەیلولی ، 1922، ژمارە(9)ی 1ی تشرینی 1922.

[72] - لەو کاتە سمکۆ زاڵ بوو، بەسەر زۆربەی کوردستانی ئێران حکومەتی بەریتانی لەگەڵیدا لە پەیوەندی پتەودابووە بەو هیوایەی لە دژی کورد بەکاری بهێنێ، خاتوو بێڵ بڕوای وابووە دانانی سەید تەهای هاوڕێی نزیکی سمکۆ وەکو حوکمدار هۆکارێکە بۆ ڕاکێشانی سمکۆی هاوپەیمان لەگەڵ تورکیا، سمکۆ لە ساڵی (1922) لە بەرانبەر هێزی تورکیی و ئێران تێکشکا لە ئاکامدا سەید تەها لەدەستچوو، وەکو پاڵێوراوی پایەی حوکمداری کوردستانی باشوور بمێنێتەوە. بڕوانە:

BHCF, 13/14 TQM, 58,No. 581/5 17 Aug 1922 Political Rawnduz to HC Lady, Bell, personal papers 11,p.297.

بتوانێ کورد لە سایەی نەتەوایەتی کوردی ڕێکبخات، خانم بیلێ دوودڵ بووە لە قبوڵی گەڕانەوەی شێخ مەحمود، بۆ کۆکسی نووسیوە: (بانگەوازو هاواری خەڵکی سلێمانی دەڵێ: تاکە ڕێگەی هێمن کردنەوەی بارودۆخەکە ڕێگەدانە بەگەڕانەوەی شێخ مەحمود، لەکاتێکدا ئێمە لەم حاڵەتەی ئێستا ئامادە نەبووین بە دووبارە داگیرکردنەوەی ناوچەکە، هیچ لەدەست نادەین، ئەگەر دەرفەتێکی تر بدەین بە شێخ مەحمود و تاقیی بکەینەوە)[73].

"لەیس" ڕایەکی هاوشێوەی هەبووە، جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە، کە شێخ مەحمود لە کاتی گونجاودا هات هەتا حکومەتی بەریتانی نەجاتی بێت لەبەرپرسایەتیو درك بێت بۆ تورکان و ڕەگەزێکی دژ و بێزارکەر بێت[74].

وادەردەکەوێ داواکارییەکی میللیی هەبووبێت بۆ گەڕانەوەی شێخ مەحمود، نەتەوەخوازانی کورد لەکۆمەڵەکەی ڕەواندزو سلێمانی لەسەر گەڕانەوەی ئەو ڕێککەوتن، هەروەها ئەنجومەنی هەڵبژێردراو بێجگە لە ئەفسەران ئەوانەی لە سەرکردە ناودارەکانی کوردستانەوە ڕاسپێردرابوون داوای گەڕانەوەی شێخ مەحمودیان دەکرد، هەروەها ئەندامانی کۆمەڵەی کوردستان فشاریان هەبووە لە پێناو گەڕانەوەی شێخ مەحمود[75]، بەڵام وەکو دەردەکەوێ "کۆکس" دوودڵ بووە لە ڕەزامەندی دەربڕینی لەسەر گەڕانەوەی شێخ لەگەڵ ملکەچ بوونی بۆ کۆی بەرپرسانی بەریتانیو سەرۆکەکانی کورد[76].

---

[73] - Lady Bell, Letters, 2, p.534.

[74] - Two Years in Southern Kurdistan, 2, p.277.

[75] - FO, 371/7781 Teleg no 646 Cox to Churchill, Sept- 10,1922, Air 23/339 Teleg from GHQ Baghdad, June 19, 1922, Special Report on Progress of Iraq, p..255. Air 23/339 memo No.901, July 3.1022, From po Sulaimania: Hawrami, pt.2, p.105, Lady Bell Personal Papers. 2.p.299.

[76] - BHCF, 13/14 Events in Kurdistan vol 3. (Anole on the Situation in Kurdistan) July 14,1922, Air 23/339 Teleg. No, Po/50/1162, uld, Cox to po, Sulaimania.

کۆکس پەسندکردنی گەڕانەوەی شێخ مەحمود بۆ سلێمانی بە هەڵە دانسقەکان دادەنێت. بڕوانە: See:Graves,p.320

مەلیك فەیسەڵ و عەبدولموحسین بەرهەڵستی گەڕانەوەی شێخ مەحمود بوون، داوایان دەکرد ڕێگە بە حکومەتی عێراقی بدرێ دەسەڵاتی لە کوردستان هەبێت هەتا پشت بە خۆیان ببەستن بۆ بەرهەڵستی تورکان، حکومەتی بەریتانی پێی وابووە داواکاری حکومەتی عێراقی ناکردەییە[77]، لە کۆتاییدا هەروەکو ئەدمۆنس باسی کردووە: حکومەتی بەریتانی هیوابڕاو بووە لە توانای خۆی بۆ دورخستنەوەی تورکان بۆ دەرەوەی کوردستان، جارێکی تر شێخ مەحمودیان هێنایەوە بۆ بەهێزکردنی هەستی نەتەوایەتی کوردی، وەکو تاکە هۆکارێکی بەدیهێنانی ئامانجەکانیان، هەموو داواکارییەکی شێخیان قبولّ کرد، کە داواکاری پێشتری کۆمەڵەی کوردیش بووە[78].

وادی جوەیدە دەنووسێ: (هەرچۆنێك حکومەتی بەریتانی ملکەچی بڕیاری گەڕانەوەی شێخ مەحمود بووبێت، پێش ئەوەی گەل داواکاریی بکات یان دوای ئەوە، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر دانپێدانانی حکومەتی بەریتانی، بەوەی شێخ مەحمود گرنگترین کەسایەتی کوردبووە)[79]، لەبەرئەوە لە (12)ی ئەیلولی (1922) شێخ مەحمودیان لە پەناهەندیی هێنایەوە کوێت، لەوێش بۆ بەغدا، سازدانی وتووێژی چەند رۆژە لە نێوان ئەو و کۆکس و مەلیك فەیسەڵ، شێخ مەحمود لە تشرینی یەکەمی (1922) گەیشتە سلێمانی و بە جۆشوخرۆشەوە وەکو حوکمداری کوردستان پێشوازی لێ کرا، هەموو سەرکردەکانی کورد لە هەموو کورستان لە سلێمانی ئامادەبوون بۆ خستنەڕووی ڕێزو گوێڕایەڵی بۆ شێخ[80]، لە تشرینی دووەم مەلیکایەتی بۆ خۆی ڕاگەیاند، ئەنجومەنێکی لە نۆ وەزارەت پێکهێنا، کە لە ژمارەیەك سەرۆك هۆز و لە هەندێ ئیداری بەتوانا پێکهاتبوو، بۆ نموونە: مستەفا یامولکی وەزیری پەروەردەو ژەنەراڵ سەدیقی قادری چاودێری گشتیی ئیدارە بوو، لە یەکەم مانگدا شێخ بۆ رایی کردنی کاروباری دادگەریو

---

[77] - BHCF 13/14, Events in Kurdistan, vol, 2, no, 339/5 June,1922.

[78] -Edmonds: Kurds Turks and Arabs, pp.303-304.

[79])- -Kurdish Nationalist Movement) pt.2.p.562.

[80] - Special Report on Progress of Iraq Administrative Report April 1922 to March 1923 p.36, Longing, Iraq 1900-1950, p.144.

حیلمی: ج6، ل9-10. بانگی کوردستان، ژ (6)، (27) تشرینی یەکەمی،(1922).

پەروەردە زنجیرەیەك ڕێوشوێنی ئیداری دەرکرد، "ڕۆژی کوردستان"ی وەکو ڕۆژنامەیەکی فەرمی حکومی بڵاوکردەوە[81].

وادیارە حکومەتی بەریتانی لە ڕووی مەبدەئییەوە ڕازی بووە بە شێخ مەحمود بەو هێندە هێزەی لە توانایی دایە لە سلێمانی بێت لەگەڵ دەست تێوەردانێکی کەمی بەریتانی، فەرمانیان بۆ کۆکس دەرکرد کە: (ئەگەر شێخ مەحمود داوای یارمەتی کرد ڕاوێژکاری سیاسیی بدەنێ با لەگەڵی بێت، وەکو بەرپرس کاربکات بۆ پەیوەندی نێوان شێخو بەغدا، بە هیچ شێوەیەك هەوڵ نەدات وەکو بەڕێوەبەر کاربکات، بۆ پاراستنی پەیوەندی دۆستانەمان بە هەرچی لە تواناداية سەربەخۆیی کوردستان بپارێزین، هەتا بێتە هێزێکی جیاکەرەوەی نێوان عێراقو تورکیا)[82].

(نوێل)یان لەگەڵ شێخ مەحمود دا نارد هەتا ئەرکی ڕاوێژکاری سیاسیی ببینێ، لەگەڵ نازناوی قونسوڵیەتی لەسلێمانی[83].

فەرمانڕەوایەتی شێخ مەحمود لە ئەیلولی ساڵی (1922) هەتا تەموزی (1924) خایاند، سروشتی پەیوەندی لەو ماوەیەدا بە بەرپرسانی بەریتانییەوە لە عێراق وەکو ئەو پەیوەندییەی ماوەی یەکەمی دەسەڵاتی هەبوو، لە خاسیەتەکانی گومانو ڕووبەڕووبوونەوەو خاوکردنەوە بووە، هۆی ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ناجێگیری سیاسەتی بەریتانی بەرانبەر کورد، لەلایەکی ترەوە بۆ پەیوەندی شێخ مەحمود بە تورکیا.

تەواوبوونی سیاسەتی بەریتانیو گەڕانەوەی خێرای شێخ مەحمود بۆ دەسەڵات هاریکاری شێخیان نەکرد لەسەر تێگەیشتنی دەوری تازەی لە سلێمانی، بەرپرسانی بەریتانی جەختیان دەکردەوە لەسەر بەڵێنەکانی شێخ مەحمود لەکویت، کە بەڵێنو

---

[81] - ڕاپۆرتی حکومەتی بەریتانی لەسەر عێراق لە مانگی نیسانی ساڵی (1922) ڕایگەیاندووە، کە شێخ مەحمود هیچ ئیدارەیەکی تۆکمەی نییە، وادیارە هیچ فەرمانێکی ڕاپەڕاندن یان یاسادانانی نییە. بڕوانە (See,p.37)، ئەو پروپاگەندەیەش بە چاوی دادگەرییەوە ئەو زنجیرەیەی بە بایەخ وەرنەگرتووە لەسەر ڕاپەڕاندنو یاسادانان، کە وەکو بڵاوکراوە لەلایەن شێخ مەحمودەوە دەرچووەو لە ڕۆژنامەی ڕۆژی کوردستان بڵاوکراوەتەوە.بڕوانە ڕۆژنامەی ناوبراو "ژمارە 12"

[82] - Lady Bell, Personal Papers,2. p.282.

[83] - Edmonds: Kurds Turks and Arabs, pp.301.

پەیمانی پتەوی دابوو بۆ گوێڕایەڵی حکومەتی بەریتانیو مەلیك فەیسەڵ، کە دەست لە کاروباری کوردانی دەرەوەی سلێمانی وەرنەدات[84].

لە پاڵ هەموو ئەو لێڵیە لە تشرینی دووەم لە سلێمانی لە ئاهەنگی تاج لە سەرنانی شێخ مەحمود، بە ئامادەبوونی نوێل وەکو "قونسوڵ"، شێخ وەکو مەلیکی هەموو کوردستانە راگەیەنرا، ڕۆژنامەی کوردستان داوای لە هەموو کوردی باشووری کوردستان کرد بدەنە پاڵ مەملەکەتی تازە لە ژێر سایەی مەلیك مەحمودی یەکەم، لە ماوەی هەفتەی یەکەمی تشرینی دووەم هەموو سەردارەکانی کەرکوك و کفری و ڕانییە و ڕەواندوز لە سلێمانی بۆ دەربڕینی گوێڕایەڵی سەردانی شێخ مەحمودیان کرد[85]. ئەدمۆنس ئەم گۆڕانکارییە لە ناکاوەی شێخ مەحمودی بەم شێوە لێك داوەتەوە: (دەبێت شێخ مەحمود بەرلەوەی بەغدا بەجێبهێڵێ نییەت پاك بووبێت، ناچارکراوە جەخت بکاتە ئەوەی لە ئاییندە چالاکییەکانی لە ئیدارەی سلێمانی کورت بکاتەوە، بەڵام ئەو پێشوازییە گەرمەی لە گۆڕەپانی وێستگەی نزیك کەرکووك لێی کرا، هەروەها بارودۆخی کوردستان هەر بەڵێنو پەیمانێك هەبوو نەیان هێشت، کە داوای لێ کرا پێوەی پابەندبێت[86]. ئەوانی تر سوور بوون، کە شێخ مەحمود خاوەنی گەورەترین خۆزگەی نەتەوایەتییە، کەچی خۆی لەناوجەرگەی ئەو گەرەلاوژە دیتەوە، کە تورك لەکوردستان

---

[84] - Edmonds: Kurds Turks and Arabs, pp.300-301, Special Reports on progress of Iraq, p.255.

[85] - Less: p.271: Edmonds: Kurds Turks and Arabs, p.301: Rozh-I Kurdistan, No, 2, vol, I, Nov. 22, 1922.O.

لە6ی تشرینی دووەم ڕۆژنامەی "ڕۆژی کوردستان" دوو وتاری لە وەڵامی ڕۆژنامەی "البلاد العراقیە" دەداتەوە. ڕۆژنامەکە بەتووندی نارەزایی دەربڕیوە لە بەرانبەر "البلاد العراقیە"، کە سلێمانی بە لیوایەکی عێراقی داناوە، ڕۆژنامەی ڕۆژی کوردستان دەنووسێ: (قسە لەسەر کوردستان دەکەن وەکو بەشێك لە عێراق و دەڵێن: لیوای سلێمانی پەیوەندی ئابووری و بازرگانی لەگەڵ سلێمانیو بەغدا هەیە، هەروەها بە پەرلەمانی کوردستان دەڵێ: ئەنجومەنی فەرمانڕەوایەتی هەرێمی، ئەمەش ئەوپەڕی قین لەدڵییە، چاوەڕوانمان نەدەکرد عێراقی دراوسێ و دۆست، کە هەزاران ساڵە پەیوەندی باش هەبووە لە نێوان ئەم دوو حکومەتەو ئەم دوو گەلە... بکەوێتە پێشێلکاری سنووری ئێمە...) بڕوانە ڕۆژی کوردستان، ژمارە (2)، 1922

[86] -- Edmonds: Kurds Turks and Arabs, pp.301

درووستیان کردبوو، نەیتوانی دەستبەرداری ئەو سوودە بیّ، کە ڕێی هاتو نەهات بووەو گەورەتربووە لەوەی ڕێی پیّ درابوو[87] .

ڕووداوەکانی ئەو چەند ساڵە ئاماژەن، کە شێخ مەحمود بڕوای پتەوی هەبووە بەئاکارو خاسیەتەکانی نەتەوایەتی کوردی، ئەو بیروبۆچوونانە لە هۆشی شێخ مەحمود هەروەكو خۆیان مابوونەوەو لەناو نەچوو بوون، لە ڕاستییدا ئەو هەر بەتوندڕەیو دەمارگیری مابووەوە. "نوێل" چیرۆکێکمان بۆ دەگێڕێتەوە، کە لەنێوان خۆیو شێخ دا لە سلێمانی ڕوویداوە:

(ئەم ئێوارەیە زۆرم هەوڵدا شێخی گەورە رابگرم، بەوەی بەشێك لەکوردستان "سلێمانی" بکاتە پاشانشینێکی بچوکی خۆی، بەبیّ کۆسپو چاودێرییو دەسەڵاتی کەس بەڕێوەی ببات، ئەوەم خستە بەردەمی، کە بۆ ئەم بیرۆکەیە لە مانگێکدا (300ڕووپیە) دانراوە، گەرچی شایانی کارەکە نییە[88] .

هەندیّ بەڵگە هەیە کە ئاماژەن بۆ بیرۆکەی نەتەوایەتی کوردی، کە لەگەڵ تێپەڕبوونی ساڵی (1922) لەناو دەرچوانی کورد لە قوتابخانەکانی کەرکووك و سلێمانی و هەولێر خاوەن پێگەبووە، هەروەها لای هەندیّ لە بەرپرسانی سوپاو ئەوانەی لە ئیمپراتۆریەتی عوسمانی کاریان کردبوو بۆ خزمەت بەمەدەنییەت، بەر لە تێپەڕبوونی ساڵی (1922) کۆمەڵەی کوردستان هەستی نەتەوایەتی کوردی لە عێراق وروژاند، ئەو کۆمەڵەیەش بەر لە هاتنەوەی شێخ مەحمود لە سلێمانی بوون. بەمەبەستی دوورخستنەوەی لایەنگرانی خەلافەت "تورکیا" لە کوردستان لە دەوری شێخ مەحمود، هەروەها بۆ پشتگیری سەرکردە ئایینی و خێڵەکییە ناودارەکانی کوردستان، ئەو کۆمەڵەیە توانی شێخ مەحمود رازی بکات ببێتە سەرۆك، کە لێرەوە ئەو کۆمەڵەیە گرووپبەندی تێکەوت: باڵی تەقلیدی شێخ مەحمودو شێخ عبدالکریمی قادر کەرەم نوێنەرایەتیان دەکرد، باڵی دووەم چینێکی ڕۆشنبیر نوێنەرایەتیان دەکرد، کە بە ڕووناکبیر ناسراوبوون، ژەنەراڵ مستەفا پاشا یامولکیو ڕەفیق حیلمی لە ناودارترین ئەندامانی ئەو کۆمەڵەیە بوون.

---

[87] - W, Jwaideh: Kurdish Nationalist Movement, pt. 2, pp.561-564.

[88] -BHCF 13/14, Events in Kurdistan, vol, 3,Sulaimani Oct,12,1922, Noel to Cox.

له تشرینی دووەمی ساڵی (1922) ڕۆژنامەی "رۆژی کوردستان" گۆڕا بۆ "بانگی کوردستان"و بووە زمانحاڵی کۆمەڵەی کوردستان، ڕووناکبیران دەستیان بەسەر ڕۆژنامەکەدا گرتبوو، کۆمەڵە ڕەچاوی بیرۆکەی کوردستانی سەربەخۆی دەکرد لە ژێر چاودێری بەریتانی، هەموو پەیوەندییەکی بە عێراقەوە ڕەتدەکردەوە[89].

بەریتانییەکان نەیاندەویست لەناکاو هەڵوێستی شێخ بگۆڕێ و بە ڕێگەی هەڵچوونێکی سۆزدارانەوە لەکوردستان هەڵسوکەوت بکات، کە ژیانی لە میرایەتییدا بەسەر بردووە، بە هۆی ئەو بارودۆخە قورسەی پێیدا تێپەڕیوە لە منداڵییەوە بەهێز بوو، لەگەڵ ئەوەشدا خواستی تاکەکەسی زاڵ بوو بەسەر کەسایەتییدا، دەبێ ئەمە هۆکاربێت بۆ شکاندنی ئەو پەیمانەی بەریتانییەکان باسی دەکەن، بەڵگەو شوێنەواری ئەو پەیمانە دیار نییە و ناتوانین لە دوورو نزیکەوە ئەو پڕوپاگەندانە بە ڕاست وەربگرین، بۆ سەلماندنی ئەو پەیماننامانە دەمێنێتەوە سازشی بارمتەیی‌و هەندێ تێگەیشتن لە بەغدا بەزارەکی، کە لە نێوان هەردوولایاندا دەبێت هەبووبێت.

پڕوپاگەندەی بەردەوام لە لایەن شێخ مەحمودەوە بەر لە ئەیلولی (1922)، کە مەلیکی فەرمیی هەموو کوردستان بووە لە دوای تێکۆشان‌و پێداگرتن لە پشت ئەو ئامانجەوە، کە لە ساڵانی دواتر هەروەکو لە خوارەوە باسی دەکەین دەرفەتمان بۆ ناهێڵێتەوە بڕوابکەین، کە شێخ مەحمود پەیمانی دیاری کراوی دابووبێت بە سنووردارکردنی خواستەکانی لە سلێمانی، سەرەڕای ئەمە ئەگەرێ نییە لە سایەی ئەو بارودۆخەی ئۆزدەمیرو دەستتێوەردانی تورکی درووستی کردبوو فشار لەسەر شێخ مەحمود هەبووبێت لە لایەن کۆکس یان حکومەتی عێراقی.

## کورد و هەڵبژاردنی ئەنجومەنی دامەزراندن

دیاریکردنی ناسنامەی ناوچە کوردییەکانی دەرەوەی سلێمانی بۆ شێخ مەحمودو بەریتانییەکان و حکومەتی عێراقی زۆر ئاڵۆز بوو، ئاکامی لێڵی سیاسەتی بەریتانی لە بەرانبەر کورد، ڕۆڵی تازەی شێخ مەحمود لەکوردستان، ململانێ لە پێناو دەست

---

[89]- رۆژی کوردستان: ژمارە (1) (15)ی تشرینی دووەمی (1922). ژمارە (5) (20)ی کانوونی یەکەمی (1922)، ژمارە (8)ی کانوونی دووەمی (1922).

بەسەراگرتنی دەرەوەی سلێمانی، لەسەر هەموو ئەوانە مشتومڕ دەستی پێکرد، بە ڕوونی لە تەمووزی (1924) لەوکاتە دەرکەوت، کە حکومەتی عێراقی بۆ پێکهێنانی ئەنجومەنی دامەزراندن بڕیاری هەڵبژاردنی دا[90].

بەریتانییەکان لەو بڕوایەدابوون لە ناوچەکانی دەرەوەی سلێمانی شێخ مەحمود پشتگیریی ناکرێ، کورد لە کەرکووك و هەولێر ئارەزوو ناکەن بدەنە پاڵ مەملەکەتی نوێ، بۆ نموونە دەیانوت: دەستێوەردانی شێخ مەحمود لە کەرکووك هۆکاری سەرەکی بووە لە سەرهەڵدانی ململانێی نێوان ئەو و حکومەتی بەریتانی[91].

لە (23)ی تەمووزی (1923) حکومەتی عێراقی بڕیاری دا بۆ دیاری کردنی نوێنەری ئەنجومەنی دامەزراندن لە هەموو عێراق هەڵبژاردن بکرێ، کورد لە سەرەتاوە دوودڵ بوون لە هەڵبژاردنی نوێنەر بۆ ئەو ئەنجومەنە، دەترسان ئەمە قبوڵ کردنی دەسەڵاتی عەرەبی بێت لە کوردستان و بێبەشیان بکات لە چوونە پاڵ دەوڵەتی سەربەخۆی کوردی لە هەرێمەکانی باشووری ڕۆژهەڵاتی تورکیا، وەکو لە بەندی شەستو چواری بڕوانامەی سیڤەری ساڵی (1920)دا هاتووە[92].

ئەنجامە سەرەتاییەکانی ناونووسین بۆ هەڵبژاردن لەهەر یەك لەکەرکووكو هەولێرو سلێمانیو کوردەکانی موسڵ حکومەتی بەریتانی هێنابووە سەر ئەو باوەڕەی کە کورد لەوبارەیەوە کۆکن بەشداریی هەڵبژاردن بکەن. سەرکردە دیارەکان لە کەرکووك و هەولێر بە گشتیی بەلای شێخ مەحمودو حکومەتەکەیەوە بوون[93]، بەپێی لێکدانەوەی حکومەتی عێراقی بەشداریی نەکردنی کورد لەو هەڵبژاردنە مانای هاوسۆزی کورد نەبووە

---

[90] - دەبوایە ئەنجومەنی دامەزراندن وەکو پەرلەمانی عێراق کاری بکردایە، لە تشرینی یەکەمی ساڵی (1922) بەریتانییەکان بە هەموو توانا هەوڵیان داوە بۆ مسۆگەرکردنی بەشداریی کورد لە هەڵبژاردن، لە کاتێکدا نیشتیمانییە عێراقییەکانو زانایانی شیعە بەو بیانووەی حکومەتی بەریتانی ئەم ئەنجومەنە بەکاردێنێ بۆ پەسندکردنی ڕێککەوتنامەی ئەنگلۆ ـ عێراقیی بەرهەڵستی بەشداری هەڵبژاردن بوون، بەرهەڵستکاران ئەم ڕێککەوتنامەیان بە پیلانی بەریتانی داناوە بۆ درێژەپێدانی ئینتیداب لە عێراق. بڕوانە: See: Ireland, pp.391-395

[91]-- Special Report on Progress of Iraq, p.257.

[92] -- Iraq Administrative Report April, 1922 to March 1923, p.14.

[93] - الادهمی: ل301.

لەگەڵ شێخ مەحمود، ترساون ئەو تۆمارە رایان بکێشێتە خزمەتی سەربازیی ئیلزامیو سەپاندنی باج، ئەمەش حکومەتی عێراقی ناچاردەکات دەنگدان دوابخەن بۆ تشرینی دووەمی ساڵی (1923ن)[94]..

بابەتی هاوبەشی کردنی کورد لە هەڵبژاردن، مشتومڕێکی گەرمی لە نێوان بەرپرسانی بەریتانیو بەرپرسە بەریتانییەکانی ناو عێراق و مەلیك فەیسەڵ درووست کرد، کۆکس لە تشرینی یەکەمی (1922) بە ئەدمۆنسی ڕاگەیاند، کە کاری جدی بکات بۆ ڕاکێشانی پشتگیری خەڵکی کەرکووك لەکوردو تورکمان بۆ بیرۆکەی بەشداری کردن لە هەڵبژاردن، سەرەڕای ئەمە بەرپرسانی بەریتانی لە باشووری کوردستان فەرمانیان پێدرابوو ئاگاداری کورد بکەن، ئەگەر ئارەزوویان هەیە بەشداریی هەڵبژاردن بکەن، بەوە بێ بەش نابن لەو مافەی لە ڕێککەوتننامەی سیڤەر بۆیان دیاریکراوە[95].

کۆکس لەبەر دوو گوزارشت ئەو ئارەزوومەندییەی دا بەکورد لە دیاریکردنی نوێنەر بۆ ئەنجومەنی دامەزراندن، وەزیری داگیرگەکان لە ئەنجومەنی گشتیی لە (11)ی تەمووزی (1922) ڕایگەیاندبووە کورد ناچار ناکرێت دەسەڵاتی عەرەب لە عێراق پەسند بکەن[96]، کۆمیساری باڵا لە تەمووزی (1922) دەیزانی کورد ئومێدیان نەماوە بتوانن بچنە پاڵ کوردستانی سەربەخۆ لە هەرێمەکانی باشووری ڕۆژهەڵاتی تورکیا، دوای ئەوە کۆکس ڕای وابووە لە داهاتوو نوێنەری خۆیان بۆ ئەنجومەنی دامەزراندن دیاری دەکەنو دەبێتە دەستکەوت بۆ نەتەوەخوازانی کورد لە حکومەتی نیشتمانی بەغدا، بەشداریکردنی کورد لە هەڵبژاردنی عێراق لە ئاییندە لە دوائەنجامی چوونە پاڵ عێراق ڕێوشوێنە یاساییەکانی بۆ دەستەبەر دەکات، ئەوکات یەکانگیر دەبێت لەگەڵ ئەو سیاسەتەی کۆکس پیادەی دەکات[97].

---

[94] - Edmonds: Kurds Turks and Arabs, p.318 -::99 الادهمی: ل290.

[95] - BHCF 18/14, Events in Kurdistan, vol, 3,Teleg,Coxto Churchill, Oct, 1922.

[96] - Spence Walter, p.124, BHEF 13/14 , Events in Kurdistan, Memo No, 40/49 Secretariat of He Baghdad to Council of Ministers. Iraq Oct, 3, 1922.

[97] -Graves, P.322 .

مەلیك فەیسەڵ دوودڵ بوو لەوەی دەرەفەت بەكورد بدات هەتا ئازادبن بە ئارەزووی خۆیان نوێنەر هەڵبژێرن بۆ ئەنجومەنی دامەزراندنو پێی لەسەر ئەوە داگرت، كە حكومەتی بەریتانی سوور نییە لەسەر ڕێوشوێنی پێویست بۆ بڕیاری بەدواداچوونی پرۆسەی هەڵبژاردن لە كوردستان و مامەڵە لەگەڵ شێخ مەحمود، بۆیە فەیسەڵ سوربوو لەسەر ئەوەی كورد هەمان ئارەزوومەندی ڕاپرسی ساڵی (1921)ی بدرێتێ، لە زۆربەی حاڵەتەكاندا بەشێوەیەكی ئیجابی دەنگیان داوە[98].

كۆكس بە توندی پێچەوانەی ئەم ڕایە بوو، چەرچڵ دەڵێ: (هیچ شتێك نییە رازیم بكات بەوەی "تێڕوانینی فەیسەڵ" بێسوودە)[99]، چونكە حكومەتی بەریتانی ئەگەر بە ڕاپرسی ساڵی (1921)ی رازی ببوایە ئەوە كورد لە سلێمانی و زۆربەی كەركووك بە عێراقی دانەدەنرا، چونكە دەنگیان نەداوە[100]. سەبارەت بە ڕازیبوونی مەلیك فەیسەڵ لە هەولێر ئەوە تەگبیری "لیون" بووە[101]. مەلیك فەیسەڵیان وا لێ كرد، كە دیاری كردنی ناسنامەی كوردستان بە نادیار دابنێ، حكومەتی بەریتانی فاكتەرەكانی فەیسەڵ تێگەیشتبوو لەسەر سوور بوونی لە ئەنجامدانی هەڵبژاردنی كوردستان. كۆكس لەوبارەیەوە نووسیویەتی:

لەوانەیە ئێمە بە تەواوی لەو هۆكارە تێ نەگەین، كە مەسەلە دەستخستنو لكاندنی كوردستانە، یان مەسەلەكە سەرخستنی تەرازووی سوننی، یان شیعەیە لە ئەنجومەنی دامەزراندن، یان مەسەلەیەكی گرنگە لەلای داڕێژەرانی سیاسەتی عێراقی. ئەگەر نوێنەرانی كورد دوابكەون كە زۆرینەی سوننین لە ئاییندە زۆرینەی ئەنجومەن دەبێتە شیعەو ئەوان بەهێز دەبن، ئەمەش ڕۆڵی ئاییندەی بەڕێوەبردنی كارەكانی مەلیك فەیسەڵ ئەگەر شیعە لە ژێر كاریگەری واقعی سەركردە ئایینییەكان دابن لە دەسەڵاتی عێراقی گرفت درووست دەبێت.

---

[98] .290ل :الادهمی - Edmonds: Kurds Turks and Arabs, p.318 -::99-

[99] - BHCF 18/14, Events in Kurdistan, vol,3,Memo by Cox to Churchill, Spent, 1, 1922.

[100] - BHCF 13/14, Events in Kurdistan vol.3, Teleg No 15 po. Sulaimani, 20th august, 1922.

[101] - BHCF 13/14, Events in Kurdistan vol.3, Teleg No 11/12 po. Sulaimani, 20th august, 1922.

ئەنجومەنی دامەزراندن پەسندکردنی پەیماننامەی عێراقی ـ بەریتانی ساڵی (1922) ڕەتکردەوە[102]. هەندێ لە بەرپرسانی بەریتانی بەگومان بوون کورد ئارەزووی بەشداریکردنی هەڵبژاردنی هەبێت، ئەوانی تریش لە سەلامەتی بیرۆکەکە بەگومان بوون، نۆیل بە توندی سوور بووە، کە حەفتاو پێنج لەسەدی دانیشتوانی کەرکووک کوردن‌و ئارەزوویانە پشتگیری شێخ مەحمود بکەن و نایانەوێ بەشداریی هەڵبژاردن بن، کفری کوردن‌و هەموویان داوا دەکەن بچنە پاڵ مەملەکەتی سلێمانی[103]، "لیون " لەلای خۆیەوە وتبووی کورد گەرم و گوڕنین بۆ ئەو هەڵبژاردنە، ئەگەر دەرفەتیان پێ بدرێ لە داهاتوو داوا دەکەن بچنە پاڵ شێخ مەحمود[104]. ڕاپۆرتە کارگێڕییەکانی عێراقی ساڵانی (1922 – 1923) جەختدەکەنە سەر ئەوە، کە هیچ ئارەزوومەندییەك بۆ هەڵبژاردن نەبووە، هۆی ئەمە دەگەڕێنێتەوە بۆ هەوڵی خۆ دزینەوەی کورد لە باج دان[105]. هەندێ لە بەرپرسانی بەریتانی جەخت لەسەر ئەوە دەکەن، کە ئەنجامدانی هەڵبژاردن لە بارێکی دووژمنکارانەدا لە ئاییندە زیاتر دەبێتە هۆی گۆشەگیرکردنی کورد و گومانی زیاتر لە بیرو هۆشی کورددا درووست دەکات[106]، لەسەر ئەوە نوێل دەڵێ: من دژی گومانی هەمەلایەنەم، هەندێ جار ساغ دەبێتەوە بۆ ڕادەی یەقین، بە بەکارهێنانی قولاب، یان گۆچانی شوان بێت سوورین ئەوەی کورد بەعێراقەوە بلکێنین، کەواتە هەموو پرۆسەی هەڵبژاردن تەنیا سەرلێشێواندنە[107]، لە کۆتاییدا تکام وایە لێرە ئاماژە

---

[102] -BHCF 13/14, Events in Kurdistan vol.3, Teleg No 11/12 503,Sept,22,1922 Cox to Churchill .

[103] - BHCF 13/14, Events in Kurdistan vol.3, A note on the Kurdistan, Situation. Noel to Cox Oct. 11, 1922. Memo by Cox to Churchill Sept, 7,1922. Teleg. No. 15, Oct,11,1922.

[104] - BHCF 13/14, Events in Kurdistan vol.3, Teleg 15 Oct, 11, 1922, 70, 371/70 Telg E, 1019, Memo. By Edward, 26,1923.

[105] - Iraq Administrative Report April, 1922 to March 1923,p.36-37.

[106] - BHCF, 13/14 Events in Kurdistan vol, 3. Teleg No. 15,po Sulaimani Oct, 1922

[107] -BHCF, 13/14 Events in Kurdistan vol, 3 The Situation in Kurdistan Oct, 1922 Noel to Cox .

به بیر و هۆشی کورد بکەم، جەختەکانی وەزیری داگیرگەکان ئەوە نییە کورد ناچار ناکرێن بۆ چوونە پاڵ عێراق، بەپێی ڕای نویل کەرکوك بۆتە مەڵبەندی هەڵبژاردنە گشتییەکان، بەڵام هەوڵەکانی حکومەتی عێراقی بۆ ئەنجام دانی هەڵبژاردن لە کەرکوك لە ئاییندە زیاتر دەبێتە هۆی گۆشەگیرکردنی شێخ مەحمودو خانەوادەکەی و لاواز کردنی پێگەی ئەوان.

کۆکس ئاگاداریی دا، کە بەریتانییەکان بەبێ کاریگەری شێخ مەحمود ناتوانن ئیدارەی کوردستان بکەن، هەروەها وریایی دایە حکومەتی بەریتانی بە هۆی مامەڵەی دوولایەنەیان سەرکردە تورکمانەکان لە کەرکوك لە هەوڵی تێکدانی پەیوەندی نێوان شێخ مەحمودو بەرپرسانی بەریتانین، لە لایەکی ترەوە پیاوماقوڵانی تورکمان بە بەریتانییەکان دەڵێن: خانەوادەی شێخ مەحمود بێ توانایە لە ئیدارە، ئەم پشتگیرییەی ئێستای شێخ مەحمود لە کەرکوك هیچ نییەو "کارێکی نەزۆکەو هیچی لێ شین نابێ"، ئەمە هۆی گزییە لەگەڵ سەرکردە کوردەکان، لە لایەکی ترەوە تورکمانەکان بە شێخ مەحمودیان وتووە: بە گەیشتنی فەیسەڵ بۆ کەرکوك ئەو ڕەتدەکەنەوە[108].

لەبەر چەند هۆیەك حکومەتی بەریتانی ناچار بووە هەڵبژاردن بکات، ئەمەش بەهۆی ڕازیبوونی مەلیك فەیسەڵ و زۆربەی سیاسەتمەدارانی بەریتانییەوە بووە، کە بەشداری نەکردنی کورد لە هەڵبژاردن هاوکاری دەبێ بۆ بەهێز بوونی پڕوپاگەندەی تورکیا، لەسەر خاوەنداریەتی ویلایەتی موسڵ[109].

سەرەڕای ئەوە لە حاڵەتی بەشداری نەکردنی کورد، لە هەڵبژاردنەکان شوێنی مەلیك فەیسەڵ لە بەرانبەر نیشتمانییە عێراقییەکان دەکەوتە مەترسییەوە، کە بەگومان بوون لە سیاسەتی بەریتانی لە کوردستان، نیشتمانییەکان لە بیرکردنەوەی بەریتانییەکان دەترسان پشتێنەیەکی کوردی لە باشوور لە ژێر دەسەڵاتی خۆیان درووست بکەن، لە دواییدا بەریتانیا دەتوانێ زاڵ بێ بەسەر حکومەتی عێراقی لە بەغدا[110]. بە مەبەستی

---

[108] - BHCF, 13/14 Events in Kurdistan vol,3 po, Sulaimani Letter from Noel to Cox Oct, 12,1922.

[109] - Adhami, pp.297.8. Longing, Iraq 190-19500, p.100: Niama, pp.79-80

[110] --Iraq Administrative Report April, 1922 to March 1923, pp.6-7

بڕوا پێهێنانی کورد بۆ بەشداری لە هەڵبژاردنەکان کۆمیساری باڵا "هنری دوبیس" داوای لە حکومەتی عێراقی کرد لێدوانێکی فەرمی دەربکات بۆ هێور کردنەوەی کورد، مەلیك فەیسەڵ وتی: ئامادەم حوکمی زاتی بدەم ئەگەر بڕیاریاندا نوێنەریان بنێرن بۆ ئەنجومەنی دامەزراندن، حکومەتی عێراقی لە (23)ی ئەیلولی (1923) بڕیارێکی دەرکردو چەند بەڵێنێکیدا لەوانە:

1- زمانی عەرەبی بەسەر زمانی کوردیدا نەسەپێنرێت.

2- هیچ بەرپرسێکی عەرەب لە ناوچە کوردییەکان دانەمەزرێنرێت.

3- زامنکردنی مافە شەرعییەکانی ناوچە کوردییەکان[111].

زیاد لەوەش لە پێناو زامنکردنی بەشداری کورد لە کەرکوك، ئەدمۆنس داواکار بووە مامەڵە لەگەڵ ژمارەیەکی کەمی تورکمانەکاندا بکرێت، کە کاریگەری بەهێزیان لەسەر ڕێڕەوی ڕووداوەکانی کەرکووکدا هەبووە، ئەوانە بەزۆری "ئەفەندی" بوون، بە مەترسییەوە تەماشای پیاوانی هۆزە کوردییەکانیان کردووە، پڕوپاگەندەی شێخ مەحمودیان بۆ کەرکووك پێ گاڵتەجاڕی بووە، سەرەڕایی ڕێنومایی سیاسی لە پشتگیریکردنی ئەو کۆمەڵەیە لە تورکیاوە، بەڵام وەکو گرووپێکی کۆمەڵایەتی ئەتنی بەپێی بەرژەوەندی خۆیان دەڕۆیشتن.

لەگەڵ کۆتایی ساڵی (1923) وردە وردە تورکمان درکیان بەوەکرد، کە ئەگەری گەڕانەوەی تورکیا نەماوە بۆ ویلایەتی موسڵ، بۆیە بەتێگەیشتنی ئێستا زیاتر دەیانویست مامەڵە لەگەڵ مەلیك فەیسەڵدا بکەن، حکومەت لەو ساڵەدا ڕازی بوو لەسەر پاراستنی دەستکەوتەکانی تورکمان لە لیوای کەرکووك، ئەویش وەکو سەردەمی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی، زمانی تورکی بە زمانی فەرمی شار بمێنێتەوە[112].

---

[111]- Iraq Administrative Report on Progress of Iraq, p.257, Spencer.

[112] -BHCF 18/14, Events in Kurdistan (Kurdistan Policy) H. Dobbs, March 28, 1923.

سەرۆکی بەناوبانگی تورکمانی نازم بەگ، بە ئەدمۆنسی گوت: (من هاوڕێی دێرینی شێخ مەحمودم، خۆشم دەوێ، ئەمە بەو مانایە نایە پێم خۆش بێت ببێتە حاکم، کەرکوك بەهای خۆی هەیە، ئەوە ببینن کەرکوك خۆی خستۆتەڕوو کێ لەو پێشبڕکێیە دەیباتەوە، دیارە ئەو کەسەی لەو موزایەدەیە زیاتر سەرنجی

لەگەڵ سەرکەوتنی حکومەت بە ڕاکێشانی کەرکووك بۆ لای خۆیو تەنگ پێهەڵچنینی پێگەی شێخ مەحمود لەناو شاری سلێمانی، کوردەکان دەچوونە گوندەکانی دەوروبەر بۆ دیاری کردنی نوێنەر بۆ ئەنجومەنی دامەزراندن[113].

ئەو مشتومڕەی لە ساڵانی (1922 ـ 1924) پەیدابوو لەسەر هەڵبژاردنی ئەنجومەنی دامەزراندن لەکوردستان ئاماژە بووە بەوەی پڕوپاگەندەکانی شێخ مەحمود لە بەدەسهێنانی پشتگیری لە دەرەوەی سلێمانی بەشێوەیەکی گشتیی نییە، بەڵام بایەخەکانی حکومەتی بەریتانی بۆ بەهێزکردنی شوێنی مەلیك فەیسەڵ زاڵبووە بەسەر هەموو گوزارشتێکی تر، نەخشەی شێخ مەحمود بۆ دەوڵەتی کوردی بە ڕوونی تێك دەگیرا لەگەڵ سیاسەتی بەریتانی، کە دەیویست ناوچە کوردییەکان بە بەغداوە ببەستێتەوە، لەسەر ئەو بنەڕەتە تێکگیرانی شێخ مەحمود و حکومەتی عێراقی کارێکی چاوەڕوان کراو بووە.

---

کەرکوك رادەکێشیٚو باشترین بەها دەدا، ئەگەر شێخ مەحمود دەیەوێت کەرکووك لە ئامێز بگرێت، دەبێت بەپیاوە سەرکردەکانمان بگات، بۆ نموونە من دەمەویٚ گرەنتیم بداتیٚ سەرۆك یان موتەسەریفێکی (گێل)ی هۆزی جافمان بەسەرەوە دانەنێت، چونکە ئەوانە بە چەندان ساڵ لە ئێمە بێئاگاترنو ئێستا دەیانەوێت منداڵمان بکەنەوە. بڕوانە:

See: BHCF 18/14, Events in Kurdistan Vol,3,Desp No,K813. Pot Kirkuk Division, Oct,16, 1922 .

Iraq Administrative Report April 1923, to December 1924(London, H.M. Stationary office, 1925) p.32.

[113] - BHCF 18/14, Events in Kurdistan vol, 5, Teleg No 275, May, 11, 1924. Iraq Administrative Report April 1923, to December 1924(London, H.M. Stationary office, 1925) p.32.

سلێمانی پێنج نوێنەری ناردنە بەغدا، یەکیان برای شێخ مەحمود بوو، کوردەکان دەیانووت بە گشتی نوێنەرەکانمان لە بەغدا بیٚ بەهان، کاریگەرییان بۆ کوردستان نییە، وەکو بەکرێگیراو بۆ حکومەتی بەریتانی کاردەکەن (بڕوانە: هاوار، الپقافە الکردیە، ج1، ص91-92)، شێخ مەحمود زۆر ناڕەحەت بووە لە بەشداری کورد لە هەڵبژاردنەکان و لە هەوڵی بەرتیل بەخشین بوو بەعەبدولقادری برای هەتا بەشداری نەکات:

See: FO,371/10098 In telling. Report, Iraq 30th April, 1924.

## شێخ مەحمود و ئۆزدەمیر

له پەیوەندی شێخ مەحمود لەگەڵ ئۆزدەمیر چەند شتێکمان بۆ دەردەکەوێ، لەوانە بێمتمانەیی شێخ بە بەریتانییەکان، ئەگەر بە قووڵی لە پەیوەندییەکانی شێخ مەحمود بە ئۆزدەمیرەوە بڕوانین ئارەزووی هەردوولا "تورکانو بەریتانییەکان"مان بۆ ڕوون دەبێتەوە لە بەکارهێنانی شێخ مەحمود لە شەڕی دەستبەسەراگرتنی ویلایەتی موسڵ.

له دوای گەڕانەوەی شێخ بۆ سلێمانی لە ئەیلوولی (1922) گرژی توند لە کۆیە و ڕانییە کەوتە نێوان شێخ مەحمودو بەریتانییەکان، هەردوو شاری بچووکی ڕۆژئاوای سلێمانی، لەکاتی کشانەوەی هێزەکانی بەریتانی لەو دوو شارە لە ساڵی (1922)، هێزەکانی ئۆزدەمیر ئەو شوێنانەیان داگیرکرد، شێخ لەگەڵ حکومەتی بەریتانی ڕێککەوت لە ئایندە پێگەی خۆی لە لای پیاوماقوڵانی ئەو دوو شارە بەکاربهێنێ بۆ ناچارکردنی کشانەوەی هێزەکانی ئۆزدەمیر، بەو مەرجەی بکەونە ژێر دەسەڵاتی شێخ مەحمود، لە دوای لێك تێگەیشتنی شێخ و پیاوماقوڵان لە کۆیە و ڕانییە، تورکان ناچارکران ناوچەکە بەجێ بهێڵن، لە ئاکامی فێڵی هەندێ لە کوردانی دانیشتووی ڕانییە و هێزەکانی بەریتانی، شاری کۆیەو ڕانییەیان داگیر کرد، نوێنەری شێخ مەحمود بۆ بەڕێوەبردنی شار دەرکراو پیاوێکی کوردی لایەنگری بەریتانیا وەکو قائیمقام لە شوێنی ئەو دانرا[114]، شێخ مەحمود بە خەمێکی زۆرەوە پێشوازی لەم هەواڵە کرد، نوێل لەسەر ئەم ڕووداوە دەنووسێ: (ئەم ڕووداوەی کۆیە و ڕانییە بە ڕوونی زیاتر کاری لە شێخ مەحمود کرد بێتە سەر ئەو باوەڕەی ئێمە بەکاری دەهێنین بۆ دەرپەڕاندنی تورکان[115].

بێئومێدی شێخ مەحمود بە بەریتانییەکان لە ناوەڕۆکی ئەو دوو نامەی تشرینی دووەمی (1922) زیادی کردووە، سمکۆ نامەیەکی بۆ شێخ مەحمود ناردو ئامۆژگاری کرد بوو ئارام بگرێ لەگەڵ بەریتانییەکان، شێخ لە وەڵامدا نووسیبوی: حکومەتی بەریتانی دڵسۆز و وەفاداری پەیمانی خۆی نییە[116]. لە نامەیەکی تری بۆ ئۆزدەمیری

---

[114]- ئەحمەد تەقی: ل68، حیلمی: ج6، ل31-32.

[115] -BHCF, 13/14 Events in Kurdistan vol,3 po, Sulaimani Letter from Noel to The Advisor of the Ministry of Interior, Oct,12,1922.

[116] - ڕۆژی کوردستان، ژمارە (7)، 30ی تشرینی دووەمی 1922

نووسیبوی: (لە بیری ناکەم بەریتانییەکان ریسوایان کردم، بەریتانییەکان لە بیرناکەم، بۆم دەرکەوت لەوەی تایبەتە بە سەربەخۆیی کورد دڵسۆزنین، دەیانەوێت دژی تورك بەکارمان بهێنن)[117].

شێخ مەحمود بڕوای بە تورکان نەدەکرد، لەو ئاساتەشدا نەدەبوو دوژمنایەتییان بکات، دەیزانی ئەو سیاسەتەی بەرپرسانی بەریتانی بەر لە ئەیلولی (1922) پەیڕەویان کردووە لە باشووری کوردستان خاوەن پێگەی زۆری لە ناو سەرکردە کوردەکان درووستکردووە، هەندێکیش پەیمانیان بە ئۆزدەمیر داوە، سەرەڕایی ئەوە لە دوای گەڕانەوەی بۆ سلێمانی نامەیەکی لە ئۆزدەمیر پێگەیشت، کە تێیدا هاتبووە: هەتا ئێستاش ویلایەتی موسڵ بە بەشێکی تورکیا دادەنرێ، لە ئاییندەش ئەگەری سوپای تورکی بۆ ناوچەکە پێشڕەوی دەکات بۆ ناوچەکە، شێخ مەحمود نەیدەتوانی خۆی بێئاگا بکا لە وریاکردنەوەکانی ئۆزدەمیر[118]. لە سەرەتاوە شێخ لە لایەن بەریتانییەکانەوە نێردرابوو بۆ دەرپەڕاندنی ئۆزدەمیر، بەڵام بۆ ئەو کارە ئەندازەی پێویستیان لە پارەو یارمەتیو چەكو تەقەمەنی پێ نەدابوو، بەرپرسانی بەریتانی لەگەڵ ئەو توانایەی لە بەردەستیان دا بوو سەرنەکەوتن.

شێخ مەحمود پێی وابوو ئەرکی دەرکردنی تورکان لە کوردستان بەسەرچووەو کارێکەو بەدیهێنانی دوورەو باش نییە، چونکە لە کوردستان و سلێمانی بە سەرکردە کوردەکانی دۆستی تورکیا دەورە دراوە، دڵنیاش نەبووە لە خۆسازدان و مەبەست و مانەوەی بەریتانییەکان لە کوردستان.

"حیلمی" بە کورتی لەو بارەیەوە دەڵێ: (شێخ مەحمود بەدرەنگەوە هاتو ناچار کرا لەگەڵ شەپۆلان بڕوات)[119].

شێخ هەوڵیدا پەیوەندی پتەوەی لەگەڵ هەردوولادا هەبێت، بە ئومێدی بەکارهێنانی پێگەی شایستە بۆ خۆی لەسەر وورووژاندنی تورکان لە دژی بەریتانییەکان و بەمەبەستی بەهێز کردنی ئەو پێگەیە لە سلێمانی و دانانی حکومەتی کوردی لە ویلایەتی موسڵ،

---

[117] - حیلمی: ج6، ل71-73.

[118] - حیلمی: ج6، ل13، 35-36.

[119]- حیلمی: ل13-24

شێخ لە تشرینی یەکەمی ساڵی (1922) بۆ فەوزی بەگی بەرپرسی سەربازی ئۆزدەمیری نووسیبوی[120] : (ئەگەر هێزی تەواوت لەگەڵدایە بۆ داگیر کردنی کەرکووك هەتا حەمرین خێرا پێشڕەوی بکە، منیش دوایی دەبمە سەربازی دڵسۆزی خەلافەتو سلێمانیت دەخەمە بەردەست، ئەگەر ئامادە نیت بێی، هەتا دڵسۆزی منت بۆ بەدیار بکەویٚ، ئەوە هەر شوێنێکم بۆ دیاری بکەیت، سلێمانی بەجێدێڵم، ئەگەر ئارەزووی ئەوەشت نەکرد، ئەوە چەكو پارەی پێویستم بۆ بنێرە بۆ دەرکردنی بەریتانییەکان، ئەگەر ئەمانەت هیچی نەکرد، تکایە بکشێنەوە، جارێکی تر لەگەڵ سوپایەکی بەهێزتر وەرنەوە کوردستان)[121] . بەم هەنگاوە دیبلۆماسییە کارامەیە شێخ مەحمود توانی ڕێگربێت لە هێزەکانی ئۆزدەمیر بچنە سلێمانی، تورکان لە کۆیە و ڕانییە پاشەکشەیان کرد.

بەدواداچوونی وتارەکانی ئۆزدەمیر لە لایەن بەریتانییەکانەوە لە زاخۆ لەو ڕێنومایییانەی تایبەتە بە کورد بە دیارکەوت، ئۆزدەمیریش وەکو ئەوانی تر شێخ مەحمود بەکاردێنیٚ، بەڵام ئەو بە شێوازی زیرەکانە شێخی دواندووە، لە جیاتی حکومەتی تورکیا خۆی لە هەموو شتیٚ دەبوێریٚ، کە لە بەرژەوەندی سەربەخۆیی کوردستان دابێت. بۆ دۆستانی تورکیا لە کۆمەڵەی بەرگریی لە مافی کەرکووك نووسیبوی: حکومەت لە تورکیا هیچ مەبەستی پشتگیری خواستەکانی ئێستای شێخ مەحمودی نییە لە ویلایەتی موسڵ[122] . بە پێی قسەی "حیلمی" ئۆزدەمیر خۆی لە

---

[120] - FO,371/18824 Desp. No, 179, Council of Ministers, Baghdad, jan, 17, J/1/3 1923. FO, 371/9004 E 1619, Memo, E,J, Edmonds Jan, 26, 1923, BHF, 13/14, Events in Kurdistan vol, 3, HC, to Air HQBF Baghdad Feb 15,193.

شێخ مەحمود لەسەر دوو هێڵ سیاسەتی دەکرد، بە ڕێگەی تایەرەفەندی نامەی لەگەڵ ئۆزدەمیر ئاڵوگۆڕ دەکردو لە لایەکی ترەوە هەوڵیدا ئەو باوەڕە دروست بکات، کە دوژمنی بەریتانییەکان نییە، بۆ ئەمەش سوودی لە برایەکەی دەبینی، بڕوانە: حیلمی: ج6، ل39.

[121] - حیلمی: ل72-74.

[122] - Iraq Administrative Report April 1922, to March 1923, p.36. FO, 371/8824. Desp. No, 226, Jan, 29,1923, Secretariat of HC, Baghdad to Major Young (Answer to Question Vll.)

هەموو ئاماژەیەك بەدوور دەگرت، كە لێدوانی تایبەت بێت بە نەتەوایەتی كورد، لەگەڵ ئەوەدا بەڵێنی ویلایەتێكی وەكو ویلایەتەكەی خدێوی میسری لە كوردستان بە شێخ مەحمود دابوو[123]، هەروەها ئۆزدەمیر دەیزانی، كە شێخ بۆ مامەڵە لەگەڵ توركان دڵسۆز نییە، لە ئۆزدەمیرەوە دەگێڕنەوە لە باسی شێخ گوتویەتی: ئامرازێكی بەریتانییەكانە، دوایی دەیەوێ گیانی بەخت بكات لە پێناو توركیا، ئێمە ئەو شێخەمان ناوێ‌و پیاوێكی ساویلكەیە[124]. ئۆزدەمیر لەلای خۆیەوە وەكو راوچی مشك شێخ مەحمودی بەكاردەهێنا، لە پشت هەموو ئەمانەوە ئامانج دووبارە داگیركردنەوەی ویلایەتی موسڵ بووە[125].

هەموو وتووێژو بۆچوونەكان لەگەڵ هی توركان لەسەر شێخ مەحمود هاوڕان، لە ماوەی ساڵی (1923) بۆ ئەدمۆنس‌و هنری دۆبیس دەنووسێ‌و لەوێدا دۆستایەتی نەبڕاوەی خۆی بۆ حكومەتی بەریتانی دەردەبڕێ لەگەڵ دەرخستنی رق بەرانبەر لە توركان[126]، بەڵام وەكو بەدیار دەكەوێ لەبەر نەبوونی سیاسەتی روونی بەریتانی لەكوردستان قورسایەكی زیاتری دابوو بە پەیوەندی لەگەڵ توركان، ئەمەی لە بیری خۆی هێشتبووەوە، كە لە كۆتاییدا بەریتانییەكان كوردستان بەجێدەهێڵن، شێخ گومانی وابوو دوا جار لە سایەی حوكمی زاتی ژێر دەسەڵاتی تورك حوكمی كوردستان دەكات[127].

---

[123]- حیلمی: ج6، ل74

[124] - FO, 371/9004, Memo, C.J. Edmonds, No, E 3620, April 1, 1923

[125]-- FO,371/8824 Baghdad HC, to Major Young Advisor to the minister of Interior (Answer to Question Vll).Jan 29, 1925 Iraq Administrative Report April 1922, to March 1923, p.36.

[126] - BHCF 18/14, Events in Kurdistan vol, 3, Teleg No 1410. Feb.24,1923.Al-Kik, Div, to HC, FO.371/18824,Baghdad, HC, to Major Young, Advisor to Minster of Interior Answer to question Vll, Jan 29 1925 Hamilton, p.208, FO, 371/90101 Intelligence Report Iraq, No.19.Oct,4,1923.

[127] - شێخ مەحمود بۆ ئەوەی گوێڕایەڵی بۆ ئۆزدەمیر بەدیار بخات، كاتێ كۆمەڵەی كوردستان داوایان لێكرد ببێتە سەرۆكی كۆمەڵە راوێژی بە ئۆزدەمیر كرد، چونكە دەیزانی ئۆزدەمیر دژی سیاسەتی كۆمەڵەیەو كۆمەڵەش دژی توركیا بوون. (بڕوانە: حیلمی، ج6، ل86).

شێخ سیاسییەکی بیر تیژ بووە لە مامەڵەی لەگەڵ ئۆزدەمیر و بەریتانییەکان، هەوڵی داوە یەکەم دژی ئەوی تر بەکاربهێنێ، بەڵام پێ دەچێ ئەندازەیەکی زیاتری لە متمانە بۆ تورکان دانابێ، کە ئەمیان لەگەڵ کوردەکانی تورکیا سیاسەتی بە تورککردنی پەیڕەو دەکرد، مستەفا کەمال لە بانگەوازکارانی بەهێزی دەوڵەتی مەرکەزی بووە، کە بەهیچ شێوەیەك حوکمی زاتی تیدا نەبووە[128].

بێمتمانەیی ساڵانی (1918ـ 1920ز) نێوان شێخ مەحمودو بەریتانییەکان و لێڵی سیاسەتی بەریتانی لە کوردستان لەگەڵ ناکۆکییە یەکلانەکراوەکانی نێوان تورکیاو بەریتانیا لەسەر ویلایەتی موسڵ، هەروەها گرێدانی ناوچە کوردییەکان بە عێراق، کاریگەری هەبووە لەسەر پەیوەندی شێخ مەحمود و بەریتانییەکان و هەمان هۆکار بەردەوام بۆتە هۆی گرژی پەیوەندییەکانی ئەنگلۆ ـ کوردیی لە ساڵانی (1921 – 1923)دا.

## سەید تەها، سمکۆ، شێخ مەحمود

گەیشتنی سەید تەهاو سمکۆ ئاغای شوکاك لە کۆتایی تشرینی یەکەمی ساڵی (1922) بۆ باشووری کوردستان گرژی نێوان شێخ مەحمود و بەریتانییەکانی زیاتر کرد[129]. سمکۆ خاوەن پێگە و کاریگەری زیاتر بووە لە سەید تەها، ئەدمۆنس ڕێنومایی و پێشنیاری بۆ وەزارەتی دەرەوەی لە باشووری کوردستان کردووە، کە سوود لە سمکۆ وەربگرێ بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی نێوان شێخ مەحمود و تورکان لە ڕەواندوز، لە سەرەتاوە نووسینگەی دەرەوە ئاگاداری کۆکسی کردووە، کە دەتوانێ سمکۆ بەکاربێنێ بۆ پیادەکردنی سیاسەتی تایبەت بە دەرپەڕاندنی تورکان لە ناوچەی

---

[128] Hawramani,pt,2, 110

[129] – لە ساڵی (1922) سمکۆ و سەید تەها هاوڕا بوون لەسەر سەرکردایەتی ڕاپەڕینی سنووری تورکیی ـ ئێرانییان بە هیوای پێکهێنانی دەوڵەتی کوردیی، بەڵام شۆڕشەکە بە هۆی هێزەکانی کەمالی لە ڕۆژئاواو هێزەکانی ئێرانی لە ڕۆژهەڵاتەوە سەرکوتکرا، سمکۆ ناچاربوو مەیدانی شەڕ بەجێبهێڵێ، هەموو شتێکی لە خۆراك و تەقەمەنی لە پاش بەجێ ما، تەنانەت کوڕە تەمەن شەش ساڵەکەشی ـ see: Edmonds: Kurds Turks and Arabs,p.305

ڕەواندوز[130]، بەڵام مانەوەی بەردەوامی سمکۆ لەسەر سنووری عێراق - ئێران و مامەڵەی بەریتانیا لەگەڵ سمکۆ، بۆتە هۆی دەربڕینی ناڕەزایی بەرپرسانی ئێرانی.

لە کانوونی یەکەمی ساڵی (1922) حکومەتی ئێران وەزارەتی دەرەوەی بەریتانیای ئاگادار کردەوە، کە هەتا ئێستاش سمکۆ چالاکیی ئەنجام دەدات، ئەمەش دەبێتە تێکدانی ئاسایش و ئارامیی کوردستانی ئێران، بۆیە لە (11)ی کانوونی یەکەمی ساڵی (1922) فەرمان درا بە کۆمیساری باڵا لە بەغدا لەگەڵ سمکۆ مامەڵە نەکات[131].

لەگەڵ پەیدابوونی سەید تەها بەریتانییەکان مەبەستیان بوو وەکو ئامرازێکی گونجاو بەکاری بهێنن دژی فێڵی تورکەکان لە ڕەواندوز، چونکە ئەو کوڕەگەورەی شێخ عوبێدڵڵای نەهری و خاوەن پێگە بووە لە بادینان‌و هەندێ لە ناوچەکانی دەوروبەری رەواندز[132].

پەیدابوونی لە ناکاوی سەید تەها لە باشووری کوردستان وەکو چارەسەرێکی کاتی بوو بۆ ئەو قەیرانەی نێوان شێخ مەحمود و بەریتانییەکان. لە سەرەتای تشرینی دووەمی ساڵی (1922) وتووێژەکانی نێوان شێخ مەحمودو بەرپرسانی بەریتانی بە بنبەست گەیشت، وەفدی کوردی داوای لە حکومەتی بەریتانی کرد بە تەواوی دان بنێ بە ڕاگەیاندنی مەلیکایەتی شێخ مەحمود بۆ کوردستانی سەربەخۆ، هەروەها وەفدی سلێمانی لە کاتی وتووێژەکاندا لەگەڵ ئەدمۆنس هەموو مامەڵەیەکی لەگەڵ حکومەتی عێراقی ڕەت کردەوە.

بەرپرسانی بەریتانیش وایان دانابوو داواکاری کورد لە سنوور دەرچووە، هەڵوێستی ڕەقی شێخ مەحمود دەگەڕێتەوە بۆ ئارەزووەکانی لە سوودوەرگرتنی لە ئۆزدەمیر لە ڕەواندوز بۆ فشار خستنە سەر بەریتانییەکان بە مەبەستی دانان بەو نەخشەی خۆی داینا بوو بۆ پێکهێنانی دەوڵەتی سەربەخۆی کوردستان[133]. بۆ ئەوەی شێخ مەحمود

---

130 - FO,371/7782,despatch, Nov, 17,1922.

131 -FO,371/7782 Teleg No.438,Persia Political ,sir Percy Nov 27,1922. Teleg No,3933,December 11,1922.

132 - Almonds, Kurds, Turks., and Arabs, pp.306-307

133 - BHCF 18/14, Events in Kurdistan vol, 3, (A note on the Kurdish Situation Jan.14.1923.

بێبەش بکات لەوەی سوود لە سەید تەها وەربگرێ بۆ دەرکردنی تورکان لە ڕەواندوز، لە ناوەڕاستی تشرینی دووەمدا کۆکس ڕازی بوو لەسەر ئەو نەخشەیەی ئەدمۆنس پێشنیاری کردبوو، بە پێکهێنانی سوپایەکی خێڵەکی لەژێر دەسەڵاتی سەید تەها بۆ هێرش بردنە سەر هێزەکانی ئۆزدەمیر لە ڕەواندوز.

سەرکەوتنی ئەو فێڵەش تاقی کردنەوەیەکی درووست بوو بۆ توانای شێخ مەحمودو بچڕانی هێڵەکانی پەیوەندی نێوان ئەوو تورکان، سەرەڕای ئەوە ڕۆشنبیرانی کوردی دۆستی بەریتانیا لە سلێمانی پەیوەندییەکانی شێخ مەحمودیان بە تورکانەوە بە کارێکی زیانبەخش دانابوو بۆ سەر بەرژەوەندی کورد، وایان دەبینی سەید تەها سەرکردایەتیەکی ڕووناکبیرە بۆ زامنی کێشەی نەتەوایەتیو هەڵوێستی هاوسەنگ لەگەڵ حکومەتی بەریتانی، ئەم پرۆژەیە لەلایەنی روخسارەوە باش بوو، بەڵام بەهۆی زنجیرەیەك کاریگەری چاوەڕوان نەکراوە جێبەجێ نەکرا، چونکە سەید تەها زیادەڕەوی هەبوو لە پێشبینیکردنی پێگەی خۆی لە ناو هۆزەکانی کوردی سەرسنوور، حکومەتی بەریتانییش لە یارمەتی دارایی و سەربازی نەیتوانی وەفاداربێت بە بەڵێنەکانی، سەرەڕای ئەوە بۆ خۆی لە هەڵسوکەوتدا سەلماندی، کە پیاوێکە لە مانای ستراتیژیەت تێناگات، فڕوکەی RAFی نارد بۆ لێدانی ئەو هۆزانەی پیاوەکانیان نانێرن بۆ بەشداری لە سوپا خێڵەکییەکەی، بە هۆی ئەستەمی ناوچەکە لە تشرینی دووەم لە کوردستان باران چالاکییە سەربازییەکانی لە ناوچەکە ڕاگرت، لەبەر ئەم هۆیانەو لە ناوەڕاستی کانوونی یەکەمی (1922) حکومەتی بەریتانی بۆی دەرکەوت، سەرەڕۆییەکانی سەید تەها نوشستی هێناوە[134].

شێخ مەحمود ئەو مامەڵەیەی بەریتانییەکانی لەگەڵ سەید تەهای بەڕکابەری خۆی دەزانیو پێی تورە ببوو، داوای لە ئۆزدەمیر کرد یارمەتی سەربازی و دارایی بۆ بنێرێ هەتا نەخشەی سەید تەها نوشستی بێنێ، پرۆژەکەی سەید تەها بەر لەوەی شێخ مەحمود هیچ هەنگاوێك لە دژی بهاوێ لەبارچوو، بەڵام تاڕادەیەك بەشداریی کرد لە

[134] - FO,371/7782 Teleg, No,878, Cox to Churchill, Dec16,1922, -- BHCF 18/14, Events in Kurdistan, (Kurdish Frontier Policy), Dec,21,1922, Iraq Administrative Report April 1922, to March 1923, p.36-37. Almonds, Kurdish, Turks, and Arabs, pp.305-308.

درووستكردنی بۆشایی نێوان بەریتانییەكان و شێخ مەحمود، هەروەها لاوازكردنی هەڵوێستی دۆستەكانی بەریتانیا لە سلێمانی و بەهێزكردنی هەڵوێستی دۆستانی تورك[135] .

لە مانگی تشرینی دووەمی (1923) ئەدمۆنس هەوڵیدا بە ڕێگەی بەكارهێنانی فشاری ئابووری بۆ سەر سلێمانی، ورەی شێخ مەحمود لاواز بكات،، توتن سەرچاوەی سەرەكی داهاتی لیواكە بوو، ئەدمۆنس ڕێنومایی دا بوو بە حكومەتی عێراقی توتنی لیوای سلێمانی وەرنەگرێت. ئەمەش زیانی گەیاندە ئیدارەی شێخ مەحمود، چونكە دوایی بازرگانەكانی توتن ڕازی بوون لە سلێمانی و لە بەغدا باجی زیادە بدەن، شێخ مەحمود توانی بە كۆكردنەوەی میرانە (الرسومات)ی گومرگی لەسەر توتن و دەیەك لەسەر بەرهەمەكانی تر پێویستی حكومەتەكەی دابین بكات (300/000) ڕوپیەی زیادەی كۆكردەوە[136] ، ئەندمۆنس بەم هەنگاوە سزا دوژمنكارانەیە، سەركەوتنی بەدەست نەهێنا، بەڵكو زیاتر شێخ و حكومەتی بەریتانیی لێك دوورخستەوەو دۆستانی توركیای بەهێز كرد[137] . ئەو هۆكارانە لە كۆتایی ساڵی (1922) بووە هۆی گرژی بارودۆخی كوردستان و بەرزبوونەوەی شوێنی شێخ مەحمود لەناو كورد. دوای نوشستی سەید تەها، ئەدمۆنس هەوڵیدا دۆستەكانی ئینگلیز و نەتەوەخوازانی كورد و

---

[135] - BHCF 18/14, Events in Kurdistan vol, 3, Teleg.No,969, Administrative Inspector (Al) Arbil to Baghdad, Dec,21,1922. Teleg.No.332, Dec,19,from Cox to FO .

- شێخ مەحمود ئۆزدەمیری ئاگاداركردەوە كە سەید تەها سەد هەزار ڕوپیەی دراوەتێ بۆ پێكهێنانی سوپایەكی نیزامی بۆ دەرپەڕاندنی هێزەكانی توركیا لە ڕەواندوز ـ بڕوانە: حیلمی، ج6، ل89.

[136] - BHCF 18/14, Events in Kurdistan, vol, 3,General Appreciation of Sulaimani Situation Secretariat of HC, to Air HQBF, Iraq, Feb, 15, 1923. Desp No, No, PA, 776.AL, Kirk to Cox Dec. 26, 1922 :

Edmonds Kurds, Turks and Arabs, p.304-305: Jwaideh, (Kurdish Nation Movement), pt,2, p.575

[137] -BHCF 13/14, Events in Kurdistan, vol, 3 (General Appreciation of Sulaimani Situation). HC, Secretariat of HC, to Air HQBF, Iraq feb. 15, 1923, BHCF, 13/14 Events in Kurdistan). Jan 1, 1923, BC, Edmonds, No, 4/1. Al-Kirk, Division, Teleg. No,K/91,Jan,8,1923.

خانەوادەکانی سەر بە سەید تەها هانبدات بۆ بەهێزکردنی هەوڵەکانی کۆمەڵەی دۆستانی بەریتانیا لەناو کوردەکانی سلێمانی. ئەوانەی دەوری شێخ مەحمود لەسەر کارەکانی (ئەدمۆنس) ئەو خاوەن پێگانەی وەکو سەرۆکە تاڵەبانییەکان و بەرزنجییەکانی دۆستی بەریتانیای جولاند بچنە سلێمانی دوستایەتی خۆیان بۆ شێخ رابگەیەنن، شێخ حەبیب تاڵەبانی و شێخ عەبدلکەریمی قادرکەرەم لەگەورەترین سەرکردە خاوەن شکۆکانی ناو نەتەوەخوازانی کوردی دۆستی بەریتانیا بوون، بە(ئەدمۆنس)یان وت: مادام حکومەتی بەریتانی چەند هەنگاوێکی خێرای نەگرتۆتە بەر بۆ ڕازی کردنی خواستە نەتەوەییەکانی کورد، ئەوە لایەنە دۆستەکانی تورکیا لە سلێمانی شێخ مەحمود رازی دەکەن بچێتە پاڵ ئۆزدەمیر بۆ کاری دوژمنکارانە لە دژی بەریتانییەکان لە کوردستان[138].

چەپمەن Chapman))ی بەرپرسی سیاسی لە کاتی گەڕانەوەی لە سلێمانی لە (20)ی کانوونی یەکەم کۆمەڵی شێخ قادر و بەگەکانی جاف دۆستی بەریتانیای بینی هەستیان بە نیگەرانی کردووە لە هەمبەر نوشستیهێنانی حکومەتی بەریتانی لە بەرانبەر رازیکردنی حکومەتی عێراقی تا ئەو مەترسییەی سەر کوردان نەهێڵێ و هەڵوێستیان بەهێز بکات[139].

لەبەر ئەم هۆیە بووە، بەرپرسانی بەریتانی لە عێراق لە کانوونی یەکەم توانیان حکومەتی عێراقی بڕوا پێبکەن بەیاننامەیەکی هاوبەش ڕابگەیەنن لەسەر سیاسەتی خۆیان بەرانبەر کورد، مەبەستی هەوڵەکانیان بە هاندانی نەتەوەخوازانی کوردی دۆستی بەریتانیاو سنووردانانێك بووە بۆ پێگەی شێخ مەحمود لە ناو کورد. بەیاننامەکە دەڵێ: (حکومەتی بەریتانیو عێراقی دان بە مافی کورددا دەنێن، ئەو کوردانەی لە ناو سنووری عێراقی دەژین لە ناو ئەو سنوورە مافی پێکهێنانی حکومەتی کوردییان هەیە، ڕەگەزە کوردییە جیاجیاکانیش لەگەڵ لەپاڵ ئەو رێککەوتنە، بەزووترین کات دەتوانن لەسەر

---

[138] - BHCF 18/14, Events in Kurdistan, vol, 3, Sulaimania, PO, Desp. ST/92,Dec,20,1922. Al-Kirk Division, Teleg, P.A, 773, Dec,18,1922.

[139] - BHCF 18/14, Events in Kurdistan, vol, 3, Sulaimania, PO, Desp. ST/92,Dec,20,1922. Al-Kirk Division, Teleg, P.A, 773, Dec,18,1922.

شێوەی ئەو حکومەتەی بڕیاری لەسەر وەردەگیرێ و ئارەزووی لێدەکەن فراوان بێت، ئینجا وەفدێکی ڕاسپێدراو بنێرنە بەغدا بۆ وتووێژ لەگەڵ خاوەن شکۆ و حکومەتی عێراقی)[140].

بەدواداچوونی ورد بەو گفتوگۆیانەی پێش ڕاگەیاندنی (24)ی کانوونی یەکەمی (1922) لە نێوان بەرپرسەکانی بەریتانی بۆمان ڕوون دەبێتەوە، کە هەڕەشەکانی تورکیا لە کوردستان هۆکاری یەکەم بووە لەسەر حکومەتی بەریتانی بۆ ڕەزامەندی لەسەر کاری هاوبەش.

لە کانوونی یەکەم نویلێ بۆ کۆمیساری باڵا دەنووسێ: بارودۆخ لە کوردستان بە شێوەیەکی زۆر مەترسیدار وێران بووە، دەبێ حکومەتی بەریتانی هەنگاوی زۆر توند بهاوێ لە دژی شێخ مەحمود، یان سازش بکات بۆ تورکان[141]. لە (20)ی کانوونی یەکەم چەپمان نووسیویەتی: (دواخستنی ڕاگەیاندنێك، کە بەڵێنی ئامادەیی حکومەتی بەریتانی تیدا بێت بۆ مافی نەتەوەیی کورد، یارمەتی هاتنی تورکانی دا بۆ سلێمانی)[142]. لە (18)ی کانوونی یەکەم ئەدمۆنس بە حکومەتەکەی وت: (کاتی کات بەفیڕۆدانمان نییە، ئامۆژگاری حکومەتەکەی کرد، هەر لە ئێستاوە کار بکات بۆ ئەو ڕاگەیاندنە، مەترسی لەسەر لیوای هەولێر و کەرکووك نزیکە، داوا دەکەم بەهۆی بەرهەڵستی پەرلەمانی عێراقی زۆر چاوەڕێ مەبن)[143]. لە سەرەتاوە نویلێ هەندێ خۆی پاراستووە لە ڕاگەیاندنی (24)ی کانوونی یەکەم، گومانی هەبوو، ئایا ئەو ڕاگەیاندنە شوێنەواری پێویستی دەبێت لەسەر کەمکردنەوەی هێزی شێخ مەحمود لەناو کورد؟ نویلێ نووسیویەتی: من دڵنیات دەکەم ئاگادارم بەشێخ مەحمودو ئەوانەی پێیان دەوترێ میانەڕەوەکان، بەکەمتر لە سنووری چیای حەمرین ڕازی نابن‌و بە هیچ شێوەیەك

---

[140]-Special report on Progress of Iraq, p.256

[141] - BHCF Events in Kurdistan, vol, 3,AP Sulaimania, Desp. No, st/92 Dec, 12. 1922،

[142] BHCF 18/14, Events in Kurdistan, vol, Al-Kirk, Teleg, PA. 773, Dec,18, 1922.-

[143] - BHCF 13/14, Events in Kurdistan AL. Teleg. PA 773 Dec, 18, 1922..

سەرۆكایەتی ڕەهایی عێراقی پەسەند ناكەن، دان بەو سنوورەشدا نانێن، ئەوەش گومانە، كە میانڕەوەكان شێخ مەحمود بەجێدەهێڵن[144].

نوێڵ لە بری ئەوە پێشنیاری زیندووكردنەوەی نەخشەی پرۆژەكەی سەید تەهاو سمكۆی كردبوو:- هەموو باشووری كوردستان دەبێت پێكەوە مامەڵەی لەگەڵدا بكرێت، نەك بە پارچەپارچەیی، ئەگەر پێویستی كرد بۆ كورد فەرمانڕەوایەتی رابگەیەنرێت، نەك بۆ شێخ مەحمود، چونكە وەكو كارتی فشار مەترسی توركی لەلایەن شێخ مەحمودەوە بەكاردەهێنرێ بۆ گەیشتن بەو داوایە، بۆیە لەسەر حكومەتی بەریتانییە ڕێگە نەدات ئەوە لە هۆشی كورد درووست ببێ، كە ڕاگەیاندنەكە بەهۆی هەڵوێستی شێخ مەحمودەوە بووە[145]. سەرەڕای ئەمە باوەڕی نۆیل وابووە، دواكاری سلێمانی بۆ سەربەخۆیی بە فیتی ئۆزدەمیر بووە، حكومەتی بەریتانی ورياییدا، كە ڕاگەیاندن لەكوردستان وەكو هەنگاوێكی سەرەتایی لێك دەدرێتەوە بۆ چۆڵكردنی تەواوی ناوچەكە لە بەرژەوەندی توركان. نویڵ دووبارە وتی: دوژمنكاری توركی كێشەیە، كەمكردنەوەی مەترسی لەسەر خەڵكی سلێمانی مەسەلەیەكی وا گرنگ نییە، لەم ڕووەوە بایەخی سەید تەها و سمكۆ كەمتر نییە لە بایەخی شێخ مەحمود[146].

كۆكس بە پێچەوانەی نویڵ لەگەڵ ڕای ئەدمۆنس بوو لە پێناو ئەوەی بتوانن لە كوردستان سنوورێك بۆ پێگەو كاریگەری توركی دابنێن، پێویستە پشتیوانی لە مەڵبەندی نەتەوەخوازانی كورد بكەین لە قادركەرەمو كفری و سلێمانی[147].

سەرەڕای ئەمە وەكو نوێڵ دەڵێ: شێخ مەحمود بە فیتی ئۆزدەمیر داوای سەربەخۆیی كوردستان ناكات، ئەم داواكارییە بە هۆی چۆڵكردنی سلێمانییەوە لە

---

[144] - BHCF 13/14, Events in Kurdistan vol, 3,Teleg No, 469 Dec,21,1922, Arbil Noel to Cox.

[145] - BHCF 13/14, Events in Kurdistan vol, 3,Teleg No, 269 Dec,20,1922, Arbil Noel to Cox.

[146] - BHCF 13/14, Events in Kurdistan vol, 3,Teleg No, 269 Dec,20,1922, Arbil Noel to Cox

[147] -Special Report on Progress of Iraq, p.256, Iraq Administrative Report April 1922, to March 1923, p.37.

حوزەیرانی ساڵی (1922) بایەخەکەی زیادی کردووە، ڕاگەیاندن میانەڕەوانی کوردی دڵنیا کردەوە، کە حکومەتی عێراقی دوژمنایەتی خواستە نەتەوەکانیان ناکات[148].

ئەدمۆنس هۆکارەکانی ڕاگەیاندنی لەسەر ئەم فاکتەرانەی خوارەوە بنیاتنابوو:-

(پێویستە لەو شوێنانەی ڕێك و پێکن بە چاوی سۆزەوە نەتەوایەتی کوردی وەربگرێن، لە سنووری هێمنانە ڕێنومایی بکەین، بەو مەرجەی خواستەکانیان وەربگرین و دەرگایان لەسەر دانەخەین و لە بەرانبەریان قوفڵی نەدەین)[149]. حکومەتی عێراقیش ئەو مەرجەی دانا ڕاگەیاندن مانای جیابوونەوەی سیاسیی و ئابووری لیوا کوردییەکانی عێراق نییە[150]، حکومەتی بەریتانی بەهیوایە بەو ڕاگەیاندنە لە دایکبوونی کوردستانێکی خودموختار لەخۆبگرێ، ئەمەش لە سایەی پەیوەندییەکی بێهێز لەگەڵ عێراق، بە دەربڕینێکی تر، بە جدی هەوڵی دا بۆ گەڕاندنەوەی ئەو پەیوەندییانەی بەر لە پاشەکشە لە سلێمانی هەیانبوو، لەگەڵ گۆڕینی ئیدارییەکانی بەریتانی بە ئیدارییەکانی کورد، لەسەر ئەو بنەڕەتە ڕاگەیاندنەکە دەبێتە دوا پەناگە، چونکە حکومەتی بەریتانی و عێراقی لەو ڕۆژانەدا لە توانایاندا نەبوو دەست بەسەر کوردستاندا بگرن[151]. هەرچۆنێك بێت ڕاپۆرتە ئیدارییەکانی بەریتانی لەسەر عێراق لە ماوەی نیسانی (1922) هەتا ئازاری (1923) دەڵێن هیچ شتێکی بەرجەستە نەبووە ئەلتەرناتیڤی ڕاگەیاندنەکە بێت، چونکە ڕاگەیاندن زۆر بە درەنگەوە هاتووە، دەسەڵاتی شێخ مەحمود هەروەکو نوێل دەڵێ: زۆر بەهێزەو ناتوانرێ بەهۆی باڵی نەتەوایەتی دۆستی ئینگلیز بلەرزێ، زیاد

[148] - BHCF 18/14, Events in Kurdistan vol,3, Teleg, No,3111 From Cox to Adviser for Ministery of Internal Affairs.

[149] - FO.371/9004. Memo C.J. Edmonds, E 1019, Jan. 29,1923

[150] - Lady Bell, personal papers, pt.2,p.306, BHCF 18/14, Events in Kurdistan, vol,3(A note on the Kurdish Situation) by C.J Edmonds no K/9 Al-Kirk, Div, Jan,1, 1923.

[151] - BHCF 18/14, Events in Kurdistan, vol,3(A note on the Kurdish Situation) by C.J Edmonds no K/9 Al-Kirk, Div, Jan,1, 1923.

لەوەش لەکاتی ڕاگەیاندنەکە پێگەی تورکی بەجۆرێ ڕەگی داکوتاوە ناتوانرێ هیچ گۆڕانێکی سیاسی لە هەڵوێستیان ئەنجام بدرێ[152]، بەڵگەیەکی تر لەسەر سیاسەتی بەریتانی لەکوردستان، ڕاگەیاندنەکە لە (24)ی کانوون لەسەر شێوازی بێ نەخشەیی (ارتجالی) بووەو سازو ئامادەکراو نەبووە، ئەمەش وەکو نەخشەکەی مانگی مایسی ساڵی (1922)ی کۆکس بوو بۆ حوکمی زاتی، هەروەها بڕیاری حکومەتی بەریتانی لە گەڕانەوەی شێخ مەحمود لە مانگی مایس بۆ سلێمانی. ڕاگەیاندنەکە گوڕێکی سیاسی حکومەتی بەریتانی بوو بۆ ڕێگەگرتن لە مەترسییەکانی تورکی لە باکووری عێراق، لە ماوەی کانوونی دووەم تا ئازار پەیوەندییەکانی نێوان شێخ مەحمود و بەریتانییەکان وێرانییەکی خێراو گەورەی بەخۆوە بینی و هەردوولا نزیك بوو تووشی ڕووبەڕووبوونەوەی سەربازیی ببنەوە.

سمکۆ لەگەڵ گەیشتنی بۆ عێراق لە تشرینی یەکەمی (1922) یەکەمجار لە پشدەر نیشتەجێ بوو، لە دواییدا ماوەیەکی کەمی لە هەولێر بەسەربرد، لە ساڵی (1923) چووە سلێمانی، بە گەیشتنی پەیوەندییەکانی شێخ مەحمود و حکومەتی بەریتانی چووە بارێکی گرژەوە، چونکە بەریتانییەکان دژی پشتگیریی ئەو بوون لە ململانێ لە بەرانبەر ئێرانییەکان، هەروەها لە کۆتایی تشرینی دووەم لەگەڵ سەید تەها کەوتنە ناکۆکیی، سمکۆ بۆ فەرماندەی تورکی لە ڕۆژهەڵات نووسیویەتی: کە ئەو ئامادەیە هاوکاری ئۆزدەمیر بکات لە شەڕی دژی بەریتانیا و دووبارە داگیرکردنەوەی ویلایەتی موسڵ لە لایەن تورکیاوە[153].

فەرماندەی سەربازی تورکی فەرمانی بە سمکۆ دا، کە شێخ مەحمود هانبدات بۆ وەرگرتنی هەڵوێستی دژ بە بەریتانیا، لەگەڵ گەیشتنی بۆ سلێمانی وەکو پاڵەوانێکی

---

[152] -- Iraq Administrative Report April 1922, to March 1923, p.38-39, Spencial Report on Progress of Iraq, p.250.

[153] – سمکۆ ویستی هاوکاری لەگەڵ تورکیا بکات، بۆ ئەوەی کوڕەکەی و هەزار پارچە زێڕی کە لەلای هێزەکانی ئەوان دەستی بەسەردا گیرابوو لە هەرێمی باشووری ڕۆژهەڵاتی (لڤان) وەریانگرێتەوە. بڕوانە: See * Taqi * P * 70

نەتەوەیی پێشوازی لێکرا، مانەوەی لە سلێمانی بووە هۆی بەرزبوونەوەی ورەی نەتەوەخوازانی کورد و گوڕێکی بەتینی دا بە شێخ مەحمود[154].

ئەدمۆنس جەختی لەسەر ئەوە کردووە، کە گەیشتنی سمکۆ بۆ سلێمانی بە شێوەیەکی باش پەیوەندی دۆستانی تورکیای بە شێخ مەحمودەوە بەتین کردووە، سەرەڕای ئەوەش کەرەستەیەکی تر بوو بۆ مەشخەڵی شکۆی نەتەوایەتی، پێشتر ئەدمۆنس حکومەتەکەی ئاگادار کرد، کە سمکۆ لە سلێمانی داهاتووی خراپی دەبێت لەسەر ناوچەکەدا[155].

شێخ مەحمودیش لەلای خۆیەوە ناوبانگی سمکۆی لەناو کورد بەکاردەهێنا، لە کانوونی دووەمی (1922) شێخ مەحمود بانگی هەموو سەرکردە کوردەکانی کوردستانی کرد، هەتا ئامادەبن لە کۆنگرەیەکی گەورە لەسەر ئەوەی مەلیکی هەموو کوردستانە[156]. سەرەڕای ئەمە ڕۆژنامەی "ڕۆژی کوردستان" لە وتارەکانیدا داوای لە هەموو کورد کرد لە پێناو مافی خۆیان بدەنە پاڵ ئۆپۆزسیۆنی بەریتانی لە کوردستان، لە ئاماژەیەکی ڕوونی ڕۆژنامەی عێراق، ڕۆژنامەکە داوای "دراوسێ"ی کوردستانی کردووە بۆ گەڕاندنەوەی هەموو خاکی کوردی بە مەملەکەتی سلێمانییەوە[157]، سەرەڕای

---

[154] - BHCF 18/14, Events in Kurdistan, vol,3, (General Apparition of Sulaimani Situation) Secretariat of HC to Air HQ BF Iraq Appreciation of Memo AL-Kik, Div. Jan. 13,1922, Teleg. No, ST,/101. pol. Sulaimani. 10,1923, Edmonds, Kurds, Turks and Arabs, p.313 .

شێخ مەحمود زانی ئەو کاتە سمکۆ پاڵەوانێکی نەتەوەییە، بۆ ڕێزلێگرتنی فەرمانیدا ئاهەنگی فەرمی لە سلێمانی بۆ ساز بکرێ- بڕوانە: ڕۆژی کوردستان، ژمارە (8)ی کانوونی دووەمی (1923)، خاتوو بیلێ سەری سوڕمابوو لە پەیوەندی باشی شێخ مەحمودو سمکۆ، بۆیە دەنووسێ: (ناچێتە ئەقڵەوە سمکۆ ئەو پێشوازییەی شێخ مەحمود بەهێند هەڵبگرێ، ئەگەر کارەکەمان لەسەر ئەو شێوە بەجێ هێشت، ئەوە نێوانیان بەرەو خراپی دەچێت.

) see: lady Bell: Personal papers * 6 “303

[155] - BHCF, Events in Kurdistan, vol, 3, Al. kik, Div,to Adv, Ministry of Interior, Jan 14,1923

[156] - BHCF 18/14, Events in Kurdistan, vol,3,(Demands of the Council of Kurdistan) Chaponan to Al-Kirk, Div, Desp. No. ST/103.

[157] ،-Rozh-I, Kurdistan, vol, 1,No, 8,Jan. 10,1923

ئەمە لە کانوونی دووەم وەفدی کوردی لە کەرکووك لەگەڵ ئەدمۆنس کەوتە گفتوگۆ، وەفدی سلێمانی لەو گفتوگۆیەدا هەڵوێستی توندی وەرگرت، داوای لە حکومەتی بەریتانی کرد خێرا وەکو مەلیکی کوردستانی یەکگرتووی سەربەخۆ دان بنێن بە شێخ مەحموددا، ئەدمۆنس بە وەفدی کوردی وت:

1- هەر مامەڵەیەکی حکومەتی بەریتانی لەگەڵ حکومەتی سلێمانی دەبێتە مەحاڵ.

2- پێویستە بەئاشکرا کورد رازی بێت بە ئینتیدابی بەریتانی.

3- لەسەر حکومەتی سلێمانی پێویستە ڕێککەوتنامەی ئابووریو سیاسی لەگەڵ حکومەتی عێراقی مۆر بکات.

4- لکاندنی هەر شوێنێکی تازە بۆ مەملەکەتی سلێمانی دەبێت، لە ڕێگەی وتووێژەوە بێت لەگەڵ حکومەتی عێراقیو دانیشتوانی ئەو ناوچەیە[158].

هەڵوێستی وەفدی عێراقیش لە وتووێژەکان توندبوو، حکومەتی بەغدا بە هەموو تواناوە تێدەکۆشا بۆ گۆڕینی ناوەڕۆکی ئەو ڕاگەیاندنەی (24)ی کانوونی یەکەم، کە بەغدا لە ژێر فشاری بەریتانییەکان پەسندی کرد، نیشتمانییە عێراقییەکان نەیاندەویست نەتەوەی کورد لە ئامێز بگرن، ڕێگەیان نەدەدا فەیسەڵ گرەنتی حوکمی زاتی بدات، بۆیە حکومەتی عێراقی کێشەی حوکمی زاتی بە بابەتی بایەخدار دانەدەنا[159].

ئەدمۆنس بەو هەڵوێستەی لە وتووێژەکانی "عێراقی ـ کوردی" دەری خست، کە تووشی بێئومێدی بووە، لە چەند سەرنجێکی سەرسوڕهێنەرانەدا دەڵێ: ((من کوردی ناسیۆنالستی دەمارگیر نیم، ئەمانە خەڵکی خراپن پێویستە پێ یان بڵێم لەگەڵ نەتەوەکەتان بۆ دۆزەخ، لە ماوەیەکی بتوانین ئارەزوومەندی گەرممان هەیە بۆ دوورخستنەوەی تورکان، وادادەنێین سلێمانی ئێستا وەکو ماسی میزلاقە دەیەوێت

---

158 - BHCF 18/14, Events in Kurdistan, vol,3, Desp, No, D.O, K78, Edmonds to Bordello Acting High Commissioner Jan.30: Iraq Administrative Report April, 1922, to March 1923.

159 - BHCF 18/14, Events in Kurdistan, vol,3, Desp,No, K58, Al-Kik, Div,to HC,Jan, 23, 1923, Desp. Jan, 6.1923, Arbol Noel.

بازبدات، دەبێت بە ئارامی مامەڵەی لەگەڵدا بکەین، هەتا دەیخەینە ژێر چەپۆکی سەبەتەی عێراقەوە[160].

نووشستی وتووێژەکانی کانوونی دووەم زنجیرەیەك ڕووداوی بەدوا داهات، کە زیاتر کاریان کردە سەر گرژی پەیوەندییەکانی شێخ مەحمودو بەریتانییەکان، لە کۆتایی کانوونی دووەم‌و شوباتی (1923)، کۆمەڵێك ئەفسەری تورك هاتنە سلێمانی، لەوێ نەخشەی هاوبەش داڕێژرا بۆ هێرش کردنە سەر کەرکوك‌و هەولێر، هەر لەو ماوەیەدا شێخ مەحمود پەیوەندی کرد بە هەردوو مەڵبەندی شیعەنشین لە نەجەف‌و کەربەلای ناحەز بە بەریتانیا، بەو هێوایەی پشتگیری چالاکییەکانی بن دژی بەریتانیا[161].

لەلایەکی ترەوە، کاریگەری لایەنگرانی تورکیا لە دەوری شێخ مەحمود بە بەردەوامی زیادی دەکرد، شێخیان هاندا بەگرتن، یان دەرکردنی ئەو ڕۆشنبیرو شێخانەی دۆستی بەریتانیان لە سلێمانی، بەرپرسە ئیدارییە کوردەکانی پێشتر کۆڵەکەی حکومەتی هاوچەرخیان بۆ شێخ مەحمود پێك هێنابوو ناچاربوون لە شار هەڵبێن، مستەفا پاشای یامولکی لە توندترین ڕەخنەگرانی سیاسەتی شێخ مەحمود بوو لەسەر دۆستایەتی تورکیا، پێی وابوو ڕوو هەڵسوڕانی بەو ئاراستەیە "هۆکاری ڕاستەوخۆی لە دەستدانی متمانەی کوردانە لەلای بەریتانیای گەورە"[162].

---

[160] - BHCF 13/14, Events in Kurdistan, vol,3, Desp, No,D.O, K78, Edmonds to Bordello Acting High Commissioner Jan.30.

[161] -Edmonds Kurds Turks, and Arabs, p.314. F,o, 371/18824 Dsp, No. 179/18824, Dsp. 179/J1113, Jan. 17, 1923, Secretaria of Ministries Iraq, Jwaideh, “Kurdish NATIONAL” pt.2,p.576 .

[162] - BHCF 13/14, Events in Kurdistan, vol,3, Teleg, Al-Kirk, Div,Jan,21,1923, Air,520/1 Desp, HQBF, Iraq to Air Ministry, March 13, 192395-94 حیلمی، ل .

لەکانوونی دووەمی 1923 مستەفا کەمال، فەتاح بەگی بەرپرسی سەربازی تورکیای نارد بۆ سلێمانی، هەتا دەوری شێخ مەحمود بدەن، چونکە ئەم برای گیانی بەگیانی بووە لەگەڵ شێخ مەحمودو متمانەیەکی باشی هەبووە لای ئەو، مانەوەی کاریگەری زۆری هەبووە لەسەر سیاسەتی دوژمنکاریکردنی بەریتانی۔ ( بڕوانە: See:FO,371/18824 Dobbos to Aimery, Jan 22, 1925, Almonds, Kurds,

بۆیە لە شوباتی (1923) لە بەغدا کۆنگرەیەك لە بارەی کێشەی کورد بەسترا، بەڵام شێخ مەحمود لە خۆی ترساو رازی نەبوو بەشداری تێدا بکات، لەوێدا حکومەتی بەریتانیا بڕیاریدا بە خێرایی بەرەنگاری ئەو هێرشە چاوەڕوانکراوەی شێخ مەحمود و ئۆزدەمیر ببێتەوە، لەو گۆنگرەیەدا نەخشەی سەربازی بۆ دەرپەڕاندنی شێخ مەحمود لە سلێمانی دارێژرا، لە ئازاری ساڵی (1923) شاری سلێمانییان بۆردومان کردو بۆ رۆژی دوایی شێخ مەحمود بە ناچاری لە شار دەرچوو[163].

داگیرکردنی سەنگەرە ئەستەمەکانی شێخ مەحمودو هەروەها سەنگەرەکانی ئۆزدەمیر پێویستیان بەکاری سەربازی بەرفراوان هەبوو، کەواتە پێویستە بۆ ئەو کارە چاوەڕێ بین هەتا وتووێژەکان لە لۆزان لە نێوان هێزە هاوپەیمانەکانو تورکیا تەواو دەبێت. بۆیە لە ماوەی ساڵانی (1921 ـ 1923) بەشێکی سیاسەتی بەریتانی بەرانبەر بەکورد دارێژرابوو بۆ پوچەڵ کردنەوەی کاریگەریی هەڕەشەکانی تورکیا لە باکووری عێراق، لەو کاتەی پێویستی بە پشتیوانیو بەهێزکردنی مەلیك فەیسەڵ هەبوو لە بەغدا، حکومەتی بەریتانی بەبەردەوامی هانی نەتەوەخوازانی کوردی داوە، ئەم سیاسەتەی پێشتر دەست پێکرد بە مەبەستی بەرهەڵستی بیرۆکەی جوڵانەوەی

---

Turks, and Arabs, p.314. FO, 371/18824 Desp, No, 179/J/1113 Jan,17.1923 Secetara of Ministers, Iraq.

[163] – – Edmonds, Kurds, Turks, and Arabs, pp.314-315. BHCF 13/14, Events in Kurdistan, vol,3. (General Appreciation of Sulaimani Situation) Secretariat of HC, to Air HQBF, Iraq, feb,15,1923.

ئەو نەخشە سەربازییەی لە کۆنگرەکەدا دیاری کرا بریتی بوو:

کۆمیساری باڵا لە5ی شوبات پەیامێك بنێرێ بۆ شێخ مەحمودو ڕێنومایی بکات بەوەی کە لە بەغدا ئامادەبێت. ئەگەر ئەو ڕێنومایەی جێبەجێ نەکرد، ئەوە فڕۆکەی (Raf")ی جەنگی لەسەر سلێمانی بسوڕێتەوەو بەیاننامە بەردەنە خواریۆ تێیدا لابردنی حوکمدار ڕابگەیەنن، لەگەڵ درێژکردنەوەی دەرفەتی پێنج ڕۆژی تر، کە لەب ەغدا ئامادەبێ ـ .

دوو گروپی هێزی بەریتانی بنێرن بۆ کەرکوك بۆ بەرگری لەهەر هێرشێك بکرێتە سەر شار.

ئەگەر شێخ مەحمود سلێمانی بەجێ هێشت هێرشی ئاسمانی بکرێتە سەر مۆڵگە سەربازییەکانی و بارەگاکەی خۆی. بڕوانە:Edmunds, Kurds, Turks, and, Arabs, pp. 215.

ئیسلامی تورکیا، که له کوردستان گرتبویەبەر، کۆکس هەروەکو ئەوانی پێش خۆی له لکاندنی تەواوی خاکی کوردستان به عێراقەوه پشتی به سیاسەتی پلەپلەیی بەستبوو، حکومەتی بەریتانی له سالّی (1921) بۆ (1923) به ڕاستی پابەند بوو به پارێزگاری سیاسەتی دلّنیایی کورد له عێراق بۆ حوکمی زاتی، سەرەڕای ئەوەش لەو ماوەیەدا له کوردستان به نەخشەیەکی سیاسی ناڕۆشن مایەوه، کەواته حوکمی زاتی ئاشکرای مایسی (1921)، هەروەها بڕیاری مانگی ئەیلولی (1922) به گەڕانەوەی شێخ مەحمود بۆ سلێمانیو دوایی دانانان به مافی نەتەوایەتی کورد له ڕاگەیاندنی تشرینی دووەم، لەگەلّ گرەنتیدانی فەرمی لەسەر بنەڕەتی سیاسەتی لەخۆوه "ارتجالی" بووه، هەر هەموویان بۆ بەرپەرچدانەوەی بارودۆخی ئەوکاته بوو، که ئارەزوومەندی بەردەوامی تورکیا بۆ دەسەلاّت له ویلایەتی موسلّ درووستی کرد بوو، کورتەی قسان ئەوەیه سیاسەتی بەریتانی له کوردستان لەو ماوەیه جۆرێك بوو له هاندانی خواستەکانی کوردو خستنەگەڕی ئەو خواسته بۆ بەدیهێنانی ئامانجه ئیستیعمارییەکانی له عێراق.

لە دوای شەڕی یەکەمی جیهانییەوە، کورد وەکو نەتەوەکانی تر دەرفەتی هەبووە دەوڵەتی نەتەوەیی پێکبهێنێ، ئەو بۆشاییو گەڕەلاوژەی لە ئاکامی لەناوچوونی دەوڵەتی عوسمانی درووست بوو، دەرفەتی سیاسیی لە ناوچە کوردییەکانی باشووری رۆژهەڵاتی ئەنادۆڵو باکووری عێراق درووست کرد، نەتەوەخوازانی کورد، وەکو نەتەوەخوازانی دیکە هەوڵیاندا ئەو دەرفەتە بقۆزنەوە، لەو کاتەدا ستراتیژیەتی بەریتانی سەرقاڵ بووە بە پوچەڵکردنەوەی هەڕەشەی بەلشەفی، ئەمەش وای پێویست کردووە پشتیوانی لە یەکێتی خاکی هەریەك لە عێراقو ئێرانو تورکیا بکات، پاشانشینی یەکگرتووی بەریتانی بزواندنی نەتەوایەتی کوردی دژی ئەو دروشمە ئیسلامییانەی تورکیای کەمالی لە سەرەتاوە بەرزی کردبووەوە بەچاك دەزانی،،بەڵام هەر دوای وتووێژەکانی لۆزان خۆیان بەرەنگاری بیرۆکەی دەوڵەتی کوردی بوونەوە.

## لە لۆزان کورد بووە قوربانی

بە واژۆکردنی بڕیارەکانی لۆزان لە (24)ی تەممووزی (1923) کوردستان بە فەرمیی بەسەر عێراقو تورکیاو سوریا دابەش کرا، لەم وتارەدا ئەوە روون دەکەینەوە، بۆچی لە ماوەی وتووێژەکانی لۆزان کوردو کێشەکەی لەلایەن ئینگلیزەوە بووە قۆچی قوربانی؟ چۆن کوردستان بەسەر هەریەك لە عێراق و تورکیا لکێنرا؟ دوایی چۆن وتووێژەکانی لۆزان شوێنەواری لەسەر سیاسەتی بەریتانی لە بەرانبەر کورد بەجێهێشت، هەر لەم باسەوە تیشك دەخەینە سەر هەندێ لە ڕیشەکانی مەسەلەی کورد لە بیستەکان.

لە (20)ی تشرینی دووەمی ساڵی (1922) وتووێژەکانی لۆزان بۆ ئاشتی دەستی پێکرد، هەریەك لە "لۆرد کیرزۆن" و "عیسمەت ئینینۆ" بوونە نوێنەری لایەنی بەریتانیو تورکی، رژێمی کەمالی نەیدەویست خۆی بەمەرجەکانی سیڤەرەوە پابەند بکات، هەتا چیای حەمرین لە باکووری عێراق داوای ولایەتی موسڵی دەکرد، بەریتانیاش لە جیاتی عێراق داوای هەموو ولایەتەکەی دەکرد[164]، تورکیا لەسەر چەند بنەمایەك داواکاری خۆی بۆ ولایەتی موسڵ دانابوو، لەوانە:

---

[164]-هەردوو بەندی (62 / 65) لە پەیماننامەی سیڤەری ئابی ساڵی (1920) لە نێوان ئیمپراتۆریەتی عوسمانیو هێزەکانی هاوپەیمان واژۆکرا، دەرفەتی پێکهێنانی دەسەڵاتێکی کارگێڕیی لە هەرێمە

لە رووی پێکهاتەی دانیشتوانەوە: عەرەب لە ولایەتی موسڵ کەمینەن، زۆرینەی کوردو تورکن، کە هەردولایان هاوڕەچەڵەکو لێك دانەبڕاون.

لە رووی هۆکاری ئابوورییەوە: زۆربەی بازرگانی ناوچەی ململانێ لەگەڵ رۆژهەڵاتی ئەنادۆڵدا بووە.

لە رووی یاساییەوە: ولایەتی موسڵ لە دوای ئاگربەستی "مۆندەرۆس" لە لایەن بەریتانیاوە داگیر کراوە.

لە ڕووی دیاریکردنی مافی چارەنووسەوە: دانیشتوانی ولایەتی موسڵ دەیانەوێ بخرێنە پاڵ تورکیا[165].

لە چواردەی کانوون کیرزۆن وەڵامی هەموو ئەو پاساوانەی تورکیای دایەوە، بەوەی کە:-

1- لە بواری پێکهاتەی دانیشتوانەوە: زۆرینەی زۆری دانیشتوانی ئەو ناوچەیە کوردن، ئەوانەش لە هیندو ئەورووپیینو لە بنەڕەتەوە جیاوازن لەگەڵ تورك، کە لە"ئۆراڵ ئەلتای"*ین.

2- لە ڕووی ئابوورییەوە: زۆربەی بازرگانی ناوچەکە لەگەڵ عێراق بووە، نەوەکو تورکیا "ئەنادۆڵ".

3- لە رووی یاساییەوە: بەریتانیا بەڵێنی بەرپرسیاریەتی ئینتیدابی عێراقی لە کۆمەڵەی گەلان پێدراوە.

---

کوردییەکانی باشووری ڕۆژهەڵاتی تورکیا دابوو بەکورد، بەو پێیە کوردەکانی باکووری عێراقیش ئارەزوومەندانە دەچوونە پاڵ ئەو بەرێوەبەرایەتییە خۆجێییە ـ بۆ زیاتر زانیاری لەسەر پەیماننامەی سیڤەرو وتووێژەکانی لۆزان بڕوانە:

William Spencer The Modul Question in International Relational Unpub, Doctoral dissertation, The American University, 1965. Greet Britain. Near Eastern Affair 1922-1923 Records of Proceedings and Draft Terms Peace (Cmd. 1814) London. HMSO, 1923

[165] - Lausanne, Conference, pp.2652-2654

* - لەبەرانبەر خانەوادەی زمانەکانی سامیو هیندو ئەورووپایی خانەوادە، یان کۆمەڵەی (ئەلتای) هەیە، کە تورك بەشێکن لە ئەوان. "وەرگێڕ".

4- شۆڕشە یەك لەدوای یەکەکانی کورد لە سەدەی نۆزدەهەم هەتا شەڕی یەکەمی جیهانیو دوای شەڕ، هەمووی بە ڕوونی ئەوە دەگەیەنێت، کورد رازی نەبووە ببێتە بەشێك لە تورکیا[166].

لەکاتی وتووێژەکانی لۆزان هەریەك لە ئینینۆو کیرزۆن وەکو یەك هەڵوێستی توندیان وەرگرت، یەکەمیان دەیوت حکومەتی تورکیا ناتوانێت واز لەو سنوورە بهێنێت کە ناکۆکی لەسەرە[167]. کیرزۆنیش دەیوت حکومەتەکەی ناتوانێت بەرپرسیاریەتی ولایەتی موسڵ بداتە تورکیا[168]. وتووێژەکان وەستانو ئەمەش بە بەردەوامی بووە کۆسپ لە بەردەم بابەتەکانی تر، بۆیە تورکیاو دەوڵەتانی هاوپەیمان لە شوباتی ساڵی (1924) بەشێوەی کاتی رێککەوتن بابەتی موسڵ لە کارنامەی وتوێژەکان لابەرن[169].

هەڵوێستی بەریتانیا لە وتووێژەکانی لۆزان بۆ ئاشتی تارادەیەك لە ژێر کاریگەریی گوزارشتە سیاسییەکانی ناوخۆدا بووە، سەرکەوتنی کەمالییەکان لە ساڵی (1922) لە یۆنان هۆکارێکی زۆر گرنگ بووە، لەم ئاکامەوە بووە لە تشرینی دووەمی (1922) حکومەتە ئیئتیلافییەکەی "لۆید جۆرج" رووخاوە، لە (15) تشرینی دووەمی (1922) "بۆنار لۆی" لە پارتی پارێزگارانی کۆن سەرکەوت، کە داوای دەکرد ئەرکو پابەندییە دەرەکییەکان کەم بکرێتەوە[170]. وا بەدیاردەکەوێ بۆنار لۆی بەڵێنی دابووبێت واز لە ولایەتی موسڵ بهێنێ، کیزۆن لە (8)ی کانوونی دووەمی ساڵی (1923) نووسیویەتی:

دوو شتی زۆر زیندوو هەبوون بۆ ئێمە: یەکەم: لە پێناو موسڵ نەکەوینە شەڕەوە. دووەم: هەروەکو بە تاقیکردنەوە فێر بووین فەڕەنسییەکان لە بەرگریی لە موسڵ بەشداریمان ناکەن. بۆیە لەسەرمانە بۆخۆمان شەڕی تورکان بکەین، هەتا ناچاریان

---

166 -Ibid. pp.366-367, 369-370

167 - Ibid. pp. 363363, 372.

168- Ibid, p.363.

169 - Noel Walter Spencer (The Diplomatic History of Iraq 1920-1932) Unpub, Doctoral dissertation, University of Utah, 1932, p.131.

170 - Colin Davies (British Oil Policy in the Middle East 1912-1932) Unpub, Doctoral dissertation, University of Edinburgh, 11973, p.199.

بکەین بەو پابەندییانەی دەمانەوێ رازی بن، کەمالییەکانیش ئەوەیان ناوێ کە لە پەیمانی سیڤەردا هاتووە[171].

لە لای هەموو جەماوەری بەریتانی ئارەزووی گەرم هەبووە بۆ تێکدانی ئەو پەیوەندییە و کشانەوەی راستەوخۆ لە عێراقو هەرێمی موسڵ، ئەمەش لە رۆژنامەکانی بەریتانیادا رەنگی دابووەوە[172]، لە (20)ی شوباتی (1923) "ئەسکویت"ی سەرۆك وەزیرانی پێشوو ئەندامی ئەنجومەن لە بەرهەڵستکاران لە ئەنجومەنی گشتیی رایگەیاند، کە پێویست نییە بەریتانیا لە عێراق بمێنێتەوە، چونکە ئەو بەرژەوەندییە زیندووە نابینرێت، کە پێویستی بەو قوربانییە بێت مانەوەی بەردەوامی هێزەکانی بەریتانی لە عێراقدا دەیەوێ، بۆنارلۆی بانگەشەی خێرای بۆ کەمکردنەوەی هەموو هێزەکانو کەمکردنەوەی هەموو ئیلتیزاماتی بەریتانیای دەکرد لە عێراق[173]. لە دوای ئامادەکردنی بەهای تێچوونی ئەو یارمەتییانەی بۆ بەردەم ئەنجومەنی گشتیی ئامادەکرابوون بۆ رۆژهەڵاتی ناوەڕاست بنێردرێن، بە هۆی ئاریشەی باجەوە، کۆدەنگی هەبووە بۆ سووککردنی ئەو بارە قورسە، هارنس ویرس "ئەندامی بەرهەڵستکار لە ئەنجومەنی گشتیی" وتبووی: (پێم وایە هەستێکی گشتیی هەیە، بۆ مەبەستی کشانەوەی حکومەت لە عێراق)، لەوکاتە "ئەمیری" وەزیر بۆکاروباری داگیرگەکان وەڵامی دابووەوە، کە پاشەکشەی خێرا لەم کاتەدا لە عێراق نابێت یان جێی باس نییە، بەدڵنیاییەوە حکومەت پابەندە بەکەمکردنەوەی ئەرکەکانی لە عێراق[174].

بۆنارلۆ لە ئازاری (1923) فەرمانیدا لیژنەیەکی پەرلەمانی بۆ بەهێزکردنی سیاسەتی بەریتانی لە عێراق پێك بهێنن، لیژنەکە لە راپۆرتێکیدا وتبووی: پشتگیری گەرم بۆ ئەو رایەی کە دەڵێ: لە لای پەرلەمانو جەماوەر بەگشتی بەهۆی پاساوی داراییەوە پاشەکشەی بەپەلە پێویستە لە عێراق، لەگەڵ ئەوەشدا لە کاتی پاشەکشە دەوڵەتی عەرەبی دەکەوێتە بەر چاوتێبڕین، تورکیا هەموو عێراق دەپێچێتەوە، ئەمەش مەترسییەکی گەورە دەبێت لەسەر بوونی بەریتانیا لەکەنداوی فارس.

---

[171] - Harold Nicholson Curzon- The Last Phase 1919-1925. A Study in Post-War Diplomacy (New-Yourk:Hascoumt-Comp. 1939) p.488

[172] -Spencer (The Diplomatic History of Iraq ,p.128.

[173] - House of Commons Parliamentary Debates, 159,p.2134.

[174]- Ibid.pp.2323-2325.

هەروەها راپۆرتەکە دەڵێ: ئەم سەرهەڵدانەوەی جارێکی تری تورکیا، بەو بەهێزییەی بارودۆخی موسڵمانانی ئیمپراتۆریەتی بەریتانی لە هیند دەخرۆشێنێو لە دژی بەریتانیا رادەپەڕن[175]، ئەو ئەنجامەی لیژنەکە بەدەستی هێنابوو، پشتگیری بووە بۆ "جۆرج هال"ی سکرتێری گشتی لە وەزارەتی داگیرکەکان، کە پێشتر لە کانوونی دووەم بە پەرلەمانی وتبوو: پاشەکشەی بەپەلە لە عێراق لادانێکی ئاشکرایە لە:

یەکەم: ئەو بەڵێنانەی بەریتانیا بە عەرەبی داوە، کە بێ دامەزراندنی حکومەتێکی سەربەخۆ بەجێیان ناهێڵێ.

دووەم: ئەو بەڵێنانەی بە مەلیك فەیسەڵ دراوە، کە هەڵبژێردراوی هەموو نەتەوەکانی عێراقە بەولایەتی موسڵەوە، بەریتانیا لەساڵی (1922) بەڵێنی پاراستنی یەکێتی هەموو خاکی عێراقی دابوو.

سێیەم: بەڵێنەکانی بەریتانیا لە بەرانبەر کۆمەڵەی گەلان، کە نابێت بەریتانیا واز لە ئینتیدابی ئەو زەوییانە بهێنێ بەرەزامەندی کۆمەڵەی گەلان نەبێت[176].

هێشتنەوەی دەسەڵاتی بەریتانی لە عێراقو هەرێمی موسڵ بۆ بەرژەوەندییە بەرفراوانەکەی ئیمپریالستی بەریتانی بووە لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست لە بەرانبەر پێشبڕکێی ئەنگلۆ - رووسیی پێویست بوو وەکو پرسێکی پلەدوو سەیری بکرێ. کۆنگرەی لۆزان دەرفەتی بۆ بەریتانیا رەخساندووە پەیوەندییەکانی لەگەڵ تورکیا چاك بکاتەوە، سیاسەتی "لیۆد جۆرج"ی لایەنگر بە یۆنان لە ساڵانی (1921–1922) بێمتمانەیی لە نێوان موستەفا کەمالو یۆنانییەکان درووست کردبوو، ئەمە چارەسەری دەویست بەر لەوەی رووسیای بەلشەفی بەشێوەیەکی کاریگەر بەکاری بهێنێ بۆ فراوانکردنی پێگەی خۆی لە تورکیا، لەگەڵ ئەوەدا "جوزهێل" چەندین جار جەختی کردبووەوە، کە ئاشتی لەگەڵ تورکیا زۆر گرنگە بۆ مەسەلەی کەمکردنەوەی خەرجییەکانی بەریتانیا لە عێراقو لەباریەك بردنی هەوڵەکانی خزینی پێگەی رووسی بە ئاراستەی کەنداوی فارس[177].

---

[175]- FO,371/10097,Intellience Report, No,3,7,feb,1923.

[176] - House of Commons Parliamentary Debates, 159,p.2134

[177] - FO,371/10875Turky annual Report No, 424, 1,Jan,1925.

رازیکردنی تورکیا زۆر پێویست بووە بۆ پاراستنی بەرژەوەندییە ئیمپریالستییەکانی بەریتانی لە رۆژهەلاتی ناوەڕاست، بۆ ئەو مەبەستەش کێشەی کوردستان زۆر بایەخدار بووە، بۆ ئەوەی بکرێتە بیانوو، کیرزۆن لە کانوونی یەکەمی (1922) بڕوای تەواوی بووە، کە حکومەتە کوردییەکەی پەیمانی سیڤەری (1920)، لە ڕواڵەتدا خەون بووەو بەتەواوی بۆتە کارێکی نابەجێ. لە لای خۆیەوە لە هەوڵەکانیدا بۆ هێمن کردنەوەی مەترسییەکانی تورکیا لەسەر کێشەی کورد، حکومەتی بەریتانی پێشنیاری بیرۆکەی دابەشکردنی ولایەتی موسڵی هێنابووە گۆڕێ، بە جۆرێ تورکیا ناوچە شاخاوییەکانی دەست بکەوێ بەشاری کۆیەو ڕەواندزو سلێمانییەوە، بەڵام عێراق ئامێدیو هەولێرو کەرکووکو موسڵ، کە هەموو ئەو خاکەی دەگرتەوە عەرەبو تورکمانی تیدا نیشتەجێن بە عێراقەوە ببەسترێتەوە، کیرزۆن دەیوت: ئەو کارە سوودێکی تری هەیە، ئەویش رزگاربوونی بەریتانیاو عێراقە لە مەترسی کۆمەڵە سەرەتاییە کەللەڕەقەکان، ئەوانەی لە ناوچە ئەستەمەکاندا دەژینو هەتا ئێستاش بەریتانیاو عێراق نەیانتوانیوە هیچ جۆرە رژێمو کارگێڕییەکی نوێی تیدا جێگیر بکەن[178]. حکومەتی بەریتانی پێشنیاری کیرزۆنی لەبەر چەند هۆیەك ڕەتکردەوە، لەوانە:

یەکەم: مەترسی هەبووە ئەگەر ئەو ناوچانە بداتە تورکیا، لە ئاییندە عێراق نەتوانێت لە بەرانبەر دەستدرێژی تورکی بەرگری لە خۆی بکات.

دووەم: ولایەتی موسڵ بداتە تورکیا مانای زیندووکرنەوەی بازرگانی نێوان بەغداو ئێرانە، کە بە خانەقیندا تێدەپەڕێ.

---

[178] - FO,371/6967 Teleg. No, 80, 6,December 1922, Curzon, to Sir E Crowe Documents on British Foreign Policy, Ist Ser, 18 Doc, No, 257, p.271, Jafar Pasha.

جەعفەر پاشا ئەو پێشنیارەی کیرزۆنی بەباش زانیووە، بەڵام نۆیڵ سبنسەر جەختی لەسەر ئارەزووی یەکەم کردەوە، کە ناوچە شاخاوییەکان بدرێ بە تورکیا ـ بە ڕوونی بەدیار دەکەوێ "جەعفەر و کیرزۆن" شارەزایی جوگرافیی ستراتیژییان کەم بووە، چونکە نزیکەی (1200) میل لە خاکی عیراق بە گرد و بەرزایی گوندەکانی بە ئاژاوەچییەکان دەورە دراوە. بڕوانە: ل128-130.

سێیەم: تورکیا ناتوانێت سیستمی کارگێڕی کارا لە ناوچە شاخاوییەکان دابمەزرێنێت، ناوچەکە هەر بە گەڕەلاوژەییو نائارامی دەمێنێتەوەو مەترسی بۆسەر عێراق درووست دەکات[179].

کێرزۆن لە کۆنگرەی لۆزانەوە سەرپشك کرابوو بە تورکان رابگەیەنێت حکومەتی بەریتانی ئامادەیە برگەکانی پەیمانی سێڤەر لاببات، کە داوای پێکهێنانی کوردستانی سەربەخۆی کردووە، ئەم هەنگاوەش مستەفا کەمال–ی خستە سەر ئەو باوەڕەی کە بەریتانیا بە پێکهێنانی دەوڵەتی کوردی لە ئەنادۆڵ و باکووری عێراق سوور نییە لەسەر پارچە پارچەکردنی تورکیا، لە بەرانبەر ئەم سازشە داوای لە تورکیا کرد ببێتە ئەندامی کۆمەڵەی گەلان، ئەمەش بۆ گۆشەگیرکردنی رووسیای بەلشەفی، لێرەدا چارەنوسی کورد لە پێشبڕکێی ئەنگلۆ - رووسی لە ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست بووە مەسەلەیەکی لاوەکی[180].

وتووێژەکانی لۆزان کاریگەری ڕاستەوخۆی هەبوو لەسەر ڕێڕەوی ڕووداوەکانی باشووری کوردستان، هەریەك لە تورکیاو بەریتانیا بۆ بەهێزکردنی هەڵوێستی خۆیان لە وتووێژەکان دەیانوست سوود لە کورد وەربگرن، لە کانوونی یەکەمی (1922) وەزیری داگیرگەکان بۆ بیرسی کۆکسی کۆمیساری باڵای بەریتانی لەبەغدا نووسیووە: (لە ئاییندە وتووێژەکانی لۆزان بڕیار دەدات لەسەر سروشتی سیاسەتی بەریتانیا لە کوردستان)[181].

لەسەرەتای کانوونی دووەمی ساڵی (1923) لەکاتی بەردەوام بوونی وتووێژەکانی لۆزان ئینگلیزەکان زانیان تورکەکان هێزیان لە جەزیرەی ئیبن عومەر بەدووری چەند میلێك لە زاخۆوە کۆکردۆتەوە، ئەم هەواڵە گەیشتە جەماوەری ولایەتی موصلّو کردیانە بەڵگەی لە باریەکچوونی وتووێژەکانی ئاشتی لە لۆزان. تورك لە ئەگەری هێرش کردن بۆ

---

179 - FO,371/7667, Cabinet Committee on Iraq, Teleg No, 160, 8, December 1922, Cab 23/32 Cab, Paper No. 62 The Conclusion of a meeting of the Cabinet 7Dec 1922. BDFP,Ist Ser 18,Dec No. 265, pp.380-381.

180 - W.N. Howell The Soviet Union and Kurds: A study of a National Ministry Problem in Soviet-Policy Un. Pub, Doctoral dissertation Un: V. of Virginia, 1965, p.328. Nicholson, p.315

181 - FO,371/7782. Teleg No, 725, 22, Dec. 1922, Churchill to Cox.

کوردستان بوو، لە راستیشدا بەدرێژایی مانگی شوباتی (1923) بەکردەوە وتووێژەکان وەستابوون، بەڵام هەردوولا رێککەوتن لەسەر دەرهێنانی کێشەی موسڵ لە وتووێژەکان بە شێوەی کاتیو بۆ ماوەی ساڵێك[182].

کۆکردنەوەی هێز لە سەرسنوورو هێرشەکانی ڕاگەیاندنی دژ بە بەریتانیاو بڵاوکردنەوەی پڕوپاگەندە لە لایەن لیژنەی دۆستە نهێنییەکانی دۆستی تورکیا لەکەرکووكو هەولێر کاریگەری گەورەیان هەبووە لەسەر جەماوەر، ئەدمۆنس نووسیویەتی: بەرپرسە فەرمیو سەرکردەکانی دۆستی بەریتانی لە کوردستان لە ژێر باڵی دێوەزمەو مەترسی تورکیدا دەژین[183]، لە لایەکی ترەوە لە مانگی ئازار شێخ مەحمود هەوڵەکانی چڕکردەوە بۆ سازدانی ڕاپەڕینێکی بەرفراوان لە دژی بەریتانییەکان، لە (3)ی ئازاری (1923) سلێمانی لەلایەن فڕۆکەکانی بەریتانییەوە بۆردومان کرا، شێخ مەحمود بە ناچاری هەڵات بۆ ناوچە شاخاوییەکان، سلێمانی بەکردەوە لەلا ژێردەسەڵاتی لایەنگرانی شێخدا مایەوە، لە لیوای سلێمانی لە دەسەڵاتی بەردەوام بوو، شێخ لە پەیوەندی بەردەوەم دابووە لەگەڵ ئوزدەمیری ژەنەراڵی تورکی لە ڕەواندوز بۆ هاندانی کورد لە دژی بەریتانیا، هەردوولا بەڕاستی هەوڵیان دەدا بۆ هاندانی ڕاپەڕینێکی هۆزایەتی گەورە، کە هاوکات بێت لەگەڵ هێرشی گەورەی تورکی، کە پێشتر بەرنامەی بۆ داڕێژرابوو بکرێتە سەر کەرکووك و هەولێر[184].

لەو ماوەیەدا "رۆژی کوردستان" زنجیرەیەك وتاری بڵاوکردەوە لەسەر ڕیسوایی داواکاری عێراق بۆ ویلایەتی موسڵ، لەگەڵ ناڕەزایی لە نەبوونی نوێنەری کورد لە

---

[182]- Elizabeth Burgoyne Gertrude Bell: From Her Personal Papers 11,(London Publisher Earnest Benn 1961) pp.30810, Spencer, The Diplomatic History of Iraq. P.131.

[183] -Edmonds, Kurds Turks and Arabs (London, 1957) p.313 FO, 371/7782 Telg No, 883, 16 Dec. 1922

[184] - Biritish High Commission 13-14 Events Kurdistan, Vol, 5, Memo, 2, 19, March 1923, Air HQBF, Iraq of Chief of Sta Memo No, 535/2 from Air Marshal Sir John M.Sulamond to Sec of Air Mnistry 28, June 1923. Air, Operations in Kurdistan: FO, 371/10098 ,Inteligence Report Iraq, 14,May 1924.

وتووێژەکانی لۆزاندا[185]، هەر لەو ماوەیە شێخ رازی بوو لەسەر داواکاری تورکیا دوو نوێنەری کوردی ویلایەتی موسڵ بۆ پەرلەمانی گشتیی تورکی لە ئەنقەرە بنێرێ، لە پەنا ئەمەوە تورکیا دەیویست هەڵوێستی خۆی لەسەر ئەو پڕوپاگەندانە بەهێز بکات لە وتووێژەکانی لۆزان[186]، هەر بۆیە لە ئازاری (1923) دەسەڵاتدارانی بەریتانی لە عێراق هەستیان کرد پێویستە کاری فەرمیو سیاسی بوێرانە لەکوردستان بگرنە بەر، فڕۆکە جەنگیەکانی مەلەکیو مانۆڕی سەربازی پێویست ئامادە بکرێ بۆ لەناوبردنی پرپشکی ڕاپەڕین، ئەمەش وای کرد، کە ڕێوشوێنی توند لە لیوای سلێمانی بگرنەبەر[187]، هەمان ڕێوشوێن لە دژی شاری رەواندوزیش هەبووە، کە ملکەچی دۆستانی تورکیا بوون، ئەمانیش هەمان بایەخیان هەبووە بۆ ئەوەی تورکیا لەو فێڵو دوژمنکارییەی بەدەرفەتی زانیووە لێی بێبەش بکرێ، کۆنگرەی دووەمی لۆزان دەستی بەکارەکانی کرد، هەروەها وروژاندنەکانی ئۆزدەمیرو شێخ مەحمود لە کوردستان دەستی بەسەردا گیرا، حکومەتی بەریتانی دەیتوانی ماوەی وتووێژەکانی لۆزان درێژ بکاتەوە[188].

لەگەڵ جێبەجێکردنی چالاکی ئاسمانی دژ بەلایەنگرانی ئۆزدەمێر لە ناوچەی رەواندوز و هەولێر بۆردومانی گەورەو بەهێز دژ بەهۆزەکانی دۆستی شێخ محمود دەستی پێکرد، بەمەش ورەی هۆزە شۆڕشگێڕەکان دابەزی، لە نیسانی ساڵی (1923) دوو تیپی هێزەکانی پیادە بە پشتیوانی هێزی جەنگی ئاسمانی مەلەکی هێرشێکی لەناکاویان کردە سەر رەواندوز، ئۆزدەمیر نەیتوانی هێزی تەواو بۆ بەرگری کۆبکاتەوە، لەگەڵ هێزە نانیزامیەکەی تورکی هەڵاتو چووە ناو خاکی ئێران، بەو شێوەیە رەواندوز گیراو شێخ لەلایەن خۆیەوە هەوڵیدا هێزێکی خێڵەکی چالاك لە پیاوانی هۆزی پشدەر ئامادە بکات بۆ بەرگریی لە لیوای سلێمانی، بەڵام لە دوای هێوربوونەوەی ناوچەی

---

[185] -See: No, 6,27,Nov. 1922, No, 5 Dec.1922.

[186] - ئەحمەد تەقی: خەباتی گەلی کورد، بەغدا 1970، ل74.

[187] - BHCF,31/14 Events Kurdistan, Vol, 3, Teleg No,521/1 Situation in Sulaimania 14March 1922.

[188] - BHCF,31/14 Events Kurdistan, Vol, 3, Teleg, No, 5495, 20 March 1922, BFHQ Iraq to Air Ministry: FO, 371/9004, Memo No, E, 3117, Curzon 23 March 1922.

ڕەواندوز هێزەکانی بەریتانیا زۆر بەخێرایی لە دوو لاوە باشوورو باکوور پێشڕەوییان کرد بەرەو سلێمانی، لە مانگی مایس لە ئاسمانەوە بڵاوکراوەیان لە سلێمانی بەردایەوە هەتا جەماوەر ئاگاداربێت لە هاتنی هێزەکانی بەریتانی و بە شێوەیەکی ئاشتی ئینگلیزەکان سلێمانی بگرن، بۆ ڕۆژی دوایی شار داگیرکرا[189] . هۆکاری رووخانی شێخ محمود بەو هێزە خێڵکیەیەوە لە بەرانبەر هێزی بەریتانی دەگەڕێتەوە بۆ نوشستی گەرموگوڕی ئەو پێشڕەوییەی زەبری بەریتانیو بەکارهێنانی کاریگەری فرۆکە جەنگیەکانی سەر بە هێزی ئاسمانی بەریتانی[190] .

بەریتانیا لە دوای تێکشکانی ئۆزدەمیر لە هەوڵی دابینکردنی جۆرێك لە ڕژێمو ئۆقرەیی دابووە، کە پێیان دەوت: (چوارچێوەی ئاشتی، یان ناوچەی دابڕاو outou Sauitair). بەو پێیە شێخ مەحمود بێبەش بوو لەوەی دەست لەکاروباری ناوچەی دراوسێکانی وەربدات، لە بەغدا کۆمیساری باڵا لەگەڵ مەلیك فەیسەڵ ناکۆك بوو لەسەر چۆنییەتی بەڕێوەبردنی کوردستان، بەجۆرێك حکومەتی بەغدا دەیویست کارگێڕی هەرێمەکانی باکوور بە شێوەیەکی بەهێز ببەستێتەوە بە عێراقەوە، ئەمەش لە ڕێگەی بەڕێوەبەرایەتی راستەوخۆ ملکەچ بۆ دەسەڵاتی بەغدا، بەڵام لەلایەکی ترەوە حکومەتی بەریتانیا سەرەڕای ئەوەی بڕوای هەبووە بە ئەگەری سەربەخۆیی، یان حوکمی زاتی بۆ کوردستان، بەگشتی دەیویست ناوچەکانی کوردستان بە قۆناغ و بە هێواشی ببەستێتەوە بە عێراقەوە، ئەمە بە جۆرێك جێبەجێ بکرێ ڕێز لە هەستی نەتەوایەتی کورد بگیرێ[191] .

سەرەڕای ئەمە وتووێژەکانی لۆزان بەردەوام بووە، حکومەتی بەریتانیا نەیویستووە ئەو تێڕوانینە لەلای کورد درووست بێ، کە خواستە نەتەوەییەکانیان تەواو فەرامۆش کراوە[192] . لەگەڵ ئەوەشدا حکومەتی عێراقی ئەوەندە بەهێز نەبووە بتوانێ دەسەڵاتی

---

[189] -bb5, Memo, Air, 535/2 Air Marshal Sir John Salmond to Sec of Air Ministry 26 June 1923. Air, Operation See Edmonds, p.328

[190] -For a detailed account of These Air, Operations See Edmonds, p.328 .

[191] -BHCF,31/14 Events in Kurdistan, Vol,5, Teleg ,No,575, 11May 1923, HC, to S.S, Col, Teleg No, March 1923, Dobbs to Noel.

[192] -BHCF,31/14 Events Kurdistan, Vol,5, Teleg ,No,184, March 1923, Dobbs to Noel.

بگاتە کوردستان، هەتا حکومەتی بەریتانی مەبەستی نەبووە بتوانێ کارگێڕییەکی ڕاستەوخۆ پێکبهێنێ، یان هێزی زیاتر دابین بکات بۆ یارمەتی عێراق لەو ناوچانە، لەو کاتە بە هۆی چالاکییە سەربازییەکان لە کوردستان تووشی ڕەخنەی بەرهەڵستکارانی ئەنجومەنی گشتی بوو بووەو پێیان وابووە، کە بەریتانیا ئەرك و بەرپرسیاریەتی تر لە عێراق زیاد دەکات[193].

لە حوزەیرانی ساڵی (1923)، لەوکاتەی هێشتا شێخ مەحمود لە ناوچە شاخاوییەکانی باکووری ڕۆژهەڵاتی عیراق بوو، حکومەتی بەریتانی داوای لە دۆستانی خۆی و میانەڕەوەکانی ئەنجومەنی ئیدارەی سلێمانی کردووە بە سەرپەرشتی ڕاستەوخۆی کۆمیساری باڵای بەریتانی وەکو لیوایەکی عیراق ئیدارەی سلێمانی بەڕێوەبەرن، دۆستەکانی بەریتانیاش ڕازی بوون لەسەر بەڕێوەبردنی شار بەومەرجەی هێزەکانی بەریتانی لەشار بمێننەوە، کە ئەمەش ئەرکی زیادە بووە لە ناوچەکەو حکومەتی بەریتانی ئامادە نەبووە قبوڵی بکات، بۆیە هێزەکانی بەریتانی لە شار کشانەوەو لە (24)ی حوزەیرانی ساڵی (1923) ئەنجومەنی ئیدارەی سلێمانی دەستی لەکار کێشایەوە، شێخ محمود لایەنگرانی خۆی ناردەوە بۆ بەڕێوەبردنی شار، لە (11)ی تەمووز شێخ مەحموود بۆ خۆی گەڕایەوەو ڕاستەوخۆ وەکو فەرمانڕەواحاکم ڕۆڵی دەبینی[194].

هنری دۆبیسی کۆمیساری باڵای سامی بەریتانی لە بەغدا بڕوای وابووە، هەتا شێخ مەحمود نەکوژرێ، یان نەگیرێ هیچ ئەگەرێك لە عێراق لە بەردەم دەسەڵاتی بەریتانیدا نییە، بێجگە لە ڕازیکردنی بە مامەڵەی کاتی نەبێت، ئەدمۆنسیش ڕەزامەندی لەسەر ئەو بۆچوونە نیشاندا، دەیزانی شێخ مەحمود بەم نزیکانە دەگەڕێتەوە سلێمانی، بۆیە کەوتە ڕێوشوێنی کەمکردنەوەی هەڕەشەکانی شێخ لەسەر کەرکوك‌و هەولێر، ئەم هەنگاوانە

[193] - Great British Colonial Office Report by His Majesty s Government in the United Kingdom of Great Britain and Northrn Ireland to The Council League of Nation of the Progress of Iraq During the Period 1920-1931 Colonial, No, 58. London HMSO, 1930) pp.255-256. BHCF, 13/14 Events in Kurdistan, vol, 5,Letter HC, 12 April 1924

[194] - Report on the Period 1920-1931. p.257. W.Jwaideh (The Kurdish National Movement: Its Origin and Development) 2,vol, Unpub, doctoral dissertation , Susurration Syracuse University. 1960, 11, pp.588-289..

بە تەنیا هەندێ ناوچەی لیوای سلێمانی گرتەوە، ئەدمۆنس لە ئابی (1923) بۆ شێخ مەحمودی نووسی: خاوەن شکۆ کۆمیساری باڵا ئاگادارە بە گەڕانەوەتان بۆ سلێمانی و فەرمانی پێکردووم ئاگادارت بکەمەوە لە بابەت ڕێکخستنەوەی ئیدارەی قەزای ڕانییە و قەڵادزە و چەمچەماڵو هەڵەبجە، ئەوەی تایبەتە بە ناحیەی ماوەت، تکا دەکەم دەست لە کاروباری ئەو شوێنانە وەرمەدە کە ناوم هێنا، خوانەخواستە ئەگەر لەو ڕێنومایانە لابدەی لە ئایندە توندترین ڕێوشوێن لە دژت دەگیرێتەبەر، بەڵام ئەگەر دەست لەکاروباری ئەو ناوچانە وەرنەدەیو هیچ کارێکی دوژمنکارانە ئەنجام نەدەی، خاوەن شکۆ نایەوێ هیچ هەنگاوێك لە دژی تۆ بگرێتەبەر[195].

لە ڕواندوز ئیدارەیەك پێکهات کە پەیوەندی بە لاوازی بەغداوە هەبووە، لە (23)ی نیسانی ساڵی (1923) وەکو قەزایەکی سەر بەهەولێر ڕاگەیەنرا، سەید تەهای سەرۆك دۆستی بەریتانیا لە سنووری عێراق لەگەڵ تورکیا کرایە بەڕیوەبەری ئەو ناوچەیە، تیپێکی سەربازی ئاشووری نێردرا هاوکاری بێت بۆ چەسپاندنی ڕێساو یاسا[196].

بە مەبەستی کەمکردنەوەی ژمارەی هێزەکانی بەریتانیو تێچوونی خەرجییەکانی لە عێراق، سەید تەها ئاگاداریدا، کە چاوەڕوانی زیاتر لە هێزی بەریتانی و پشتیوانی ئیدارەی شارە سنوورییەکەی ناکات، دانانی سەید تەها لە ڕەواندوز هەندێ بایەخی هەبوو، بەوەی ئەم شارە لەسەر ڕێگای بەیەك گەیشتنی ڕۆژهەڵاتو باکوور هەڵکەوتووە، لەو بڕوایەدا بوون ئەو هەنگاوە بە تەنیا دەسەڵاتی حکومەتی عێراقی لەم شارە

---

[195] - Edmonds, p.346

[196] - BHCF,31/14 Events Kurdistan, Vol,5, Teleg ,No,275, March 1923, MC,to S.S, Col.

مەلیك فەیسەڵ بە توندی بەرهەڵستی دانانی سەید تەها بووە وەکو قائیمقام لە لایەن دۆبیسەوە، ئەم کەسێکی تری ئارەزوو دەکرد هێزو پێگەی کەمتر بوایە لە سەید تەها- بەڵام کۆمیساری باڵا سوور بوو لەسەر دانانی ئەو، چونکە زاراوەی "بۆلت برۆف"ە بەرپرسانی تری بەریتانی بەکاریان دەهێنا بۆ کەسێك بە هۆی پەیوەندیی هۆزایەتی بەرگری تێرۆرکردنی هەبێت. هۆی سور بوونی"دوبیس" لەو بڕوایەوە هاتووە سەید تەها دەتوانێ بەسەر ئەو کێشە و نارەحەتییانەدا زاڵ بێت کە تورکیا بۆ ناوچەکەی دروست دەکرد.

-Edmonds, p.326. Jwaideh, pt.2, pp.542.

ستراتیژییه بەهێز ناکات، بەڵکو بەکاردەهێنرێ بۆ کاریگەری چاودێری دژی پڕوپاگەندەی تورکیاو گەڕانەوەی هێزە نانیزامیەکانی بۆ ناوچەکە[197].

ڕێوشوێنە کاتییەکەی شێخ مەحمود، کە ئەدمۆنس پێی دەوت: ناوچەی قوفڵدراو، هەتا ناوەڕاستی تەمووزی (1924) مایەوە، گەرچی شێخ وەکو ڕابردووی ئارەزووی دەکرد فەرمانڕەوای هەموو کوردستانی بێت، لە (16)ی ئاب هێزە خێڵەکییەکەی نارد بۆ دووبارە گرتنەوەی هەڵەبجە، کە پێشتر عادیلەخانم حاکمی بوو، بە مەبەستی دامەزراندنی فەرمانڕەوایەتی، هەمان هێرشی دەست پێکردبوو بۆ چەمچەماڵ، سەرەڕای ئەمەش وەفدی ناردبووە لای سەردارەکانی کورد، هەتا داوای دۆستایەتی ئەو بکەن[198]، لەگەڵ ئەوەدا بۆردومانە چڕە خوێناوییەکانی هێزی ئاسمانی پاشایەتی نەیهێشت سەردارەکانی کورد بچنە پاڵ حکومەتی سلێمانی[199].

بەو ئەندازە رووپیانەی لە دەستی دابوو، لە تشرینی دووەمی ساڵی (1923) شێخ مەحمود لە کوردستان هەموو ڕقی دوژمنایەتی بەرانبەر دەسەڵاتدارانی بەریتانی چڕکردەوە، کە لە ڕێگەی باجی توتن‌و بەرهەمی لیوای سلێمانی کۆی کردبووە، بەڵام بەشێکی تری هۆکارەکەش بە هاندانی دەسەڵاتی تورکی بووە لەسەر سنوور[200]. زۆربەی هۆزەکانی کورد باجیان بە حکومەتی بەریتانی نە ئەدا، ئەمەش بەرەنگاربوونەوەیەکی دیکە بووە، بۆ بەرپەرچ دانەوەی ئەو دیاردەیە، هێزەکانی بەریتانی ئەو گوندانەی بۆردومان کرد، ئەمەش لە چەند بۆنەیەکدا رقی خەڵکی شاری سلێمانی جوڵاندو زۆربەیان بۆ ناوچەکانی نزیك شاریان بەجێهێشت[201].

---

197 - Great British Colonial Office Report by His Majesty s Government on the Periol April 1923-December 1924 (London HMSO, 1925) pp.32-33.

198 - FO,371/10098, Intelligence Report No, 5,Iraq April 1924, (London HMSO, 1925). pp.32-33.

199 -Great British Colonial Office Iraq Administrative Peport April 14,1924. December 1924.(London HMSO, 1925) pp.32-33

200 - FO,371/10098, Intelligence Report Iraq 14,May 1924, Report on The Progress of Iraq 1920-1931 p.258.Iraq Administrative Peport April 1923, December, 1924, p.31

201- لەگەڵ ناوەڕاستی ساڵی (1924) سلێمانی جارێکی تر داگیر کرایەوەو ژمارەی دانیشتوانی شار بە تەنها (20) هەزار کەس مایەوە، دوای دوو مانگ لە داگیر کردنی بەریتانی ژمارەی دانیشتوانی دابەزی بۆ نزیکەی (12) هەزار کەس. بڕوانە:

له مایسی ساڵی (1924) پێکدادانی سەربازی نێوان ئاشووریو دانیشتوانی کەرکووك بووە هۆی پتەوکردنو بەهێزکردنی پەیوەندی شێخ مەحمود بە کوردستانەوە، نوێنەری نارده لای سەرداری هۆزەکانو داوای لێکردن پشتیوانی هەوڵەکانی جەماوەری کەرکووك بن دژی ئەو هێزانەی له لایەن بەریتانیاوە پشتیوانییان لێ دەکرێ، شێخ وتبووی: تاوانباران ئەمەیان دژی مسوڵمانانی شار ئەنجام داوە، بۆیە ژمارەیەکی زۆری سەرداری هۆزەکانی لیوای کەرکووكو سلێمانی وەکو سەرۆکی نەتەوەیی سەیری شێخ مەحمودیان دەکرد[202]. له مانگی حوزەیران هەندێ گرژیو ئاژاوە له بەغدا پەیدا بوو، که عێراقییە نیشتیمانییەکان* ئەنجامیاندا، ئەوانەی ناڕازی بوون له ڕەزامەندی دەربڕینی ئەنجومەنی نیشتمانی عێراقی لەسەر پەیماننامەی عیراق - بەریتانی ساڵی

---

Iraq Administrative Report April 1923, December, 1924, p.31. Edmonds, p.3712. Jwaideh, pt,2.p.590.

[202] - FO,371/10114, Air Staff Note on the Occupation of Sulaimani No, 4459/24, 27 Sept 1924, 10100 Teleg No, 66304, 30,May 1924, Air Office Command Iraq to Air Ministry in May 1924 .

له مایسی ساڵی (1924) له ئاکامی ناکۆکیی نێوان سەربازەکانی ئاشووریی و بازرگانانی شار قەسابخانەیەك له کەرکووك دروست بوو. ئەو دیلانەی دەستدرێژییان کرا بووە سەر گەڕانەوە شوێنی حەوانەوەی خۆیان، هاوڕێکانیان پەیوەندییان پێوە کردنو بەرەو بازاڕ پێشڕەویان کرد، بەبێ سەرو بەری تەقەیان لەو کەسانە کرد، که له قاوەخانەیەك دانیشتبوون، ئەمەش له مانگی ڕەمەزان ڕوویداو بووە شەڕی نێوان موسڵمانانو گاورەکان، له ئاکامدا سێ موسڵمان کوژران و شەشی تریش بریندار بوون، دیلەکانیش شەشیان لێ کوژراو پێنجی تریان لێ بریندار بوون، کۆمیساری باڵا فەرمانی ڕێوشوێنی بەپەلەی دا بۆ ڕووداوەکە، بەڵام کەس سزا نەدرا، ئەمەش ڕقی کوردانی هەڵساندو بەسەدان له پیاوانی فەیلی دەرەوەی شار هاتنە شارو داوای تۆڵەسەندنەوەیان کرد، بەڵام بەهۆی سەرۆکەکانی تاڵبانی بڵاوەیان کرد. بڕوانە:

-FO,371/10098, Intelligence Report No,2, Iraq 28 May 1924, , Intelligence Report, 12 June 1924

*- مەبەست له عێراقییە نیشتیمانییەکان یان نیشتیمانییە عێراقییەکان ڕەوتی ناسیونالیستی ئەوکاتەی عەرەبی عێراقی بووە، که ویستویانە پیرۆزییەك بۆ یەکپارچەیی نیشتیمانی عێراق دروست بکەن بەو شێوەیەی ئینگلیز نەخشەی بۆ دانابوو، کە ولایەتی موسڵیش دەگرێتەوە، له عەرەبییەکەی گوزراشتی "الوطنینین العراقیین" بەکار هاتوە. "وەرگێڕ".

(1922) وەکو دەردەکەوێ شێخ مەحمود زانیاریو تێڕوانینی تەواوی لە بەردەستدا نەبووە لەسەر ئەندازەی هێزی عێراقییە نیشتیمانییەکان لە بەغدا و لاوازی بەریتانییەکان[203].

لە ڕاستییدا شێخ محمود باوەڕی وابووە، بەریتانییەکان بە ڕووبەڕووبوونەوەی نیشتمانییە عێراقییەکانەوە سەرقاڵنو تا ئەندازەیەك ناتوانن لە کوردستان بەرهەڵستی هێزەکەی بکەن، بۆیە بە بیرۆکەی داگیر کردنی کەرکووك دڵی خۆی دەدایەوە و داوای لە هەموو هۆزەکانی کوردی ئێران کرد یارمەتی بکەن بۆ دەرکردنی کاربەدەستانی دۆستی بەریتانیا لە هەڵەبجە و پێکهێنانی سوپایەکی کوردی هەتا بەرەو کەرکووك بڕوات[204].

---

[203]-Iraq Administered Report April 1923- December 1924, p,32

لە (27)ی ئازار ئەنجومەنی دامەزراندنی عێراقی بە فەرمیی لە لایەن مەلیك فەیسەڵەوە کرایەوە، لە وتارێکیدا ئەرکەکانی ئەنجومەنی دانا بە:

1-دابین کردنی دەستوور بۆ پاراستنی مافی تاكو دابین کردنی ئارامیی ناوخۆ.

2-دانانی یاسای هەڵبژاردن بۆ ئەنجومەنو دابینکردنی ئامرازی چاودێری بۆ سیاسەت و بەگەڕخستنی حکومەت.

3-پەسندکردنی ڕێکەوتننامەی ئەنگلۆ ـ عێراقی ساڵی (1924)، کە پەیوەندیی عێراق بە حکومەتی بەریتانیاوە ڕێك دەخات، عێراقییە نیشتیمانییەکان بەرهەڵستی پەیماننامەی ئەنگلۆ ـ عێراقی بوون، بەو بیانووەی پشتیوانو بەهێزکەری داگیرکردنی بەریتانیایە بۆ عێراق، سنوور بۆ مافی نیشتمانی عێراقی وەکو دەوڵەت دادەنێو بارێکی قورسی دارایی دەخاتە سەر. لە2ی نیسان لیژنەکە، کە یاسین هاشمی سەرۆکایەتی دەکرد ڕاپۆرتێکی ڕەخنە ئامێزی گرتە پەیماننامەکەو داوای کۆمەڵێك دەستکاری کردبوو، بەڵام دەسەڵاتدارانی بەریتانی ئامادەنەبوون حیساب بۆ ئەو داواکارییانە بکەن. عێراقییە نیشتیمانییەکان خۆپیشاندانێکی گەورەیان ڕێکخست، لە (29)ی مایسی ساڵی (1924) حکومەتی عێراقی داوای لە سوپا کرد هەزاران کەس لە خۆپیشاندەران بڵاوە پێ بکەن، ئەمەش بەرەنگاربوونەوەی خوێناوی لێ کەوتەوە. بڕوانە:

Iraq Administrative Report April 1923, December 1924, pp.20-21 .

Iraq Administrative Report Iraq, 28 Oct,1924 .

[204] .-FO,371/10098, Intelligence Report Iraq, 10,Baghdad 28 Oct, 1924.

دەسەڵاتدارانی بەریتانیو حکومەت لەسەر سنوور ئاگاداری سەرۆکەکانی کوردە ئێرانیان کردەوە، کە هاوبەشی چالاکییەکانی شێخ مەحمود نەکەن لە دژی بەریتانیا. بڕوانە:

دەسەڵاتدارانی بەریتانی لە عێراق وریایی لە مەترسیی چالاکییە دوژمنکارییەکانی شێخ مەحمود ڕاگەیاند، بەڵام ئەوان لەبەر دوو هۆ دوودڵ بوون لەکاری سەربازی بۆ دەرکردنی لە سلێمانی. یەکەمیان: بەریتانییەکان دەیانویست سوود لە شێخ مەحمود و ئاکامەکانی وەربگرن بۆ ئەگەری جیاکردنەوەی کوردستان لە عێراق، وەکو ڕێگەچارەیەکی فشار بۆ سەر نیشتمانییە عێراقییەکان، بە مەبەستی قبوڵی دانپێدانانی پەیماننامەی بەریتانیی - عێراقیی. دەسەڵاتدارانی بەریتانی بۆ بەرپرسانی عێراقیان روون کردەوە، کە چالاکییەکانی شێخ مەحمود بەشێوەیەکی سەرەکی بە ئاڕاستەی دژایەتی حکومەتی عێراقییە، کورد بە تەنیا لە حکومەتی بەریتانی نیگەرانە، چونکە دەسەڵاتیان کەمدەکاتەوەو دەیانخاتە سەر عێراق[205].

هەورامی لەوبارەیەوە سەرەنجی خۆی بە ڕوونی نووسیووە: هەڵوێستی دوژمنکارانەی کورد لە بەرانبەر حکومەتی تازەی عێراقی بۆ بەریتانییەکان ئاسایی بووە، بەڵکو مانای بە بیرهێنانەوەی بەردەوامو جێگیر بووە بۆ مەلیك فەیسەڵ و هاوڕێیانی، بەوەی بەریتانیا رازییە سەربەخۆیی بە کورد بدات، ئەگەر بارودۆخی عێراق لەگەڵ بەرژەوەندی حکومەتی خاوەن شکۆی بەریتانی تێك بگیرێ[206].

دووەمیان: لەو کاتەی وتووێژەکانی دووەمی لۆزان بەردەوام بوو، هەر کارێکی سەربازی لەلایەن حکومەتی بەریتانی لەکوردستان دەگونجا تورکان وای لێ تێبگەن بە فەرمیی پێشێل کردنی ماف تورکیایە لە ویلایەتی موصڵ، سەرەڕای ئەمە لەو کاتە ناسکە هەر کارێکی سەربازیی دژی شێخ مەحمود خزمەتی هەڵوێستی تورکیا دەکات، چونکە هەردوو لایەنی ناکۆك لە هەوڵی ئەوەدابوون هاوسۆزی کورد بە لای خۆیاندا رابکێشن[207].

لە یەك کاتدا دانپێدانانی ئەنجومەنی نیشتمانی عێراقی بۆ پەیماننامەی عیراقیی - بەریتانیی و وتووێژەکانی لۆزان مانای خۆی هەیە، دەسەڵاتدارانی بەریتانی لەدەستدانی

---

،10098/371Intelligence Report, No, 10 Baghdad, 28 Oct. 549

[205] Gertrude Bell, Letter, 11, (London Oxford Press, 1922) p.549

[206] - Hawramani, (Sheikh Mahmud and The Kurdish Question, 1917-1920) pt.2. Kurdish Journal 3 (1969) p.10

[207] - FO,371/9010 Intelligence Report Iraq No. 23, 1, Dec, 1923

هەرێمی موسڵیان وەکو هەڕەشەیەك قۆستەوە لەلای نیشتمانییە عێراقییەکان هەتا ناچاریان بکەن دان بە پەیماننامەکەدا بنێن. لە حوزەیرانی ساڵی (1924) "دۆبس" داوای ڕەزامەندی لە "تۆماس"ی وەزیری داگیرگەکان کرد هەڕەشە لە مەلیك فەیسەڵ و نیشتمانییە عێراقییەکان بکات، ئەگەر پەیماننامەکە قبوڵ نەکەن لە ئاییندەدا ویلایەتی موسڵ لە دەست دەدەن، "تۆماس" ڕازی بوو لەسەر ئەو داوایە مەلیك فەیسەڵ ئاگادار بکاتەوە، کە دەنگدان لە ئەنجومەنی دامەزراندن لە دژی پەیماننامەکە بەریتانیا ناچار دەکات لەسەر پێشخستنی داواکارییەکەی بۆ کۆمەڵەی گەلان لە بابەت زیادکردنی ویلایەتی موسڵ لە کارنامەی داهاتوو، کە بڕیارە لە (10)ی حوزەیران ڕێك بخرێ[208].

ڕۆژنامەی بەغدا تایمز، کە ڕۆژنامەیەکی فەرمیی بوو لە خانەی ڕاسپاردراو "دار المفوضیة" دەردەچوو نووسیبووی: ئەگەر هەتا (10)ی حوزەیران پەیماننامەکە پەسند نەکرێ ویلایەتی موسڵ لە دەست دەچێ[209].

دەسەڵاتدارانی بەریتانی لە ڕووبەڕووبوونەوەی نیشتمانییە عێراقییەکان نوێنەرانی کوردی ناو ئەنجومەنی دامەزراندنی عێراقیان بەکاردەهێنا، هەریەك لە کۆمیسیاری باڵا و "گاترودبیڵ" تووشی بێئومێدی ببوون لە هەڵوێستی عێراقییە نیشتیمانییەکان لە ئەنجومەن. لە (27)ی حوزەیران "دۆبیس" بە "تۆماس"ی وت: ئەگەری پەسندکردنی پەیماننامەکە لە ئەنجومەنی دامەزراندنی عێراقی زۆر لاوازە، باشترین هەنگاو ناچارکردنی مەلیك فەیسەڵە بۆ هەڵوەشاندنەوەی ئەنجومەن، وەزیری داگیرگەکانیش

---

208 -Iraq Administrative Report April 1923, December 1924.p.22: FO, 371/13034, Desp. 9 May 1924, Dobbs to Amery 11259, Teleg No 12,16 June 1924, Dobbs to Amery, Manchester Guardian 13,June 1924.

لە ڕووبەڕووبوونەوەیەکی لەگەڵ عێراقییە نیشتیمانییەکان بەریتانیا هەڕەشەی کشانەوەی دەکرد لە عێراق کە لە ژێر ڕەحمەتی مستەفا کەمال بەجێیان دەهێڵێ ـ ئەمە فێڵ بوو بۆ ترساندنی فەیسەڵ و نیشتمانییەکان ـ. لە ڕاستیدا بەریتانییەکان نەیاندەویست پێگەی خۆیان لە عێراق لەدەست بدەن و دەسەڵاتیان لە یەدەکی پترۆڵ نەمێنێ ـ.

209 Baghdad Times, 10,June, 1924.

لەسەر ئەوە ڕازی بووە[210]. "دوبیس" داوای لە "بیلّ" کرد پێگەی خۆی لەلای نوێنەرە کوردەکان بەکاربهێنێ بۆ ئەو پێشنیارەی بەریتانیا، کە ڕازی بێت بە دواخستنی پەیماننامەکە بۆ دوای چارەسەری کێشەی ململانێی موسڵ لە وتووێژەکانی لۆزان. دوبیس پێی وابووە، ئەگەر پەیماننامەکە دوابکەوێ دەبێتە پاساوێکی گونجاو بۆ مەیسەڵ لەسەر داوای حکومەت بۆ هەڵوەشاندنەوەی ئەنجومەنی دامەزراندن، ئەوە بوو نوێنەرانی کورد لە بەرژەوەندیی پێشنیاری دواخستنی پەیماننامەکەدا دەنگیان دا[211].

لە لایەکی ترەوە لە (10)ی حوزەیران لە ئاکامی سەنەدێکی نێوان یاسین هاشمی سەرۆکی عێراقییە نیشتیمانییەکان، حکومەتی بەریتانی کە پایەی بەدەست خستنی سەرۆکوەزیرانی بۆ زامن کرد، داوای گرێدانی کۆبوونەوەیەکی لە ناکاوی ئەنجومەنی کرد بۆ پەسندکردنی پەیماننامەکە، ژمارەیەکی زۆری نوێنەران بەشداری کۆبوونەوەکە نەبوون، یان دەنگیان نەدا یان بەرهەڵست بوون، لەگەڵ ئەوەشدا پەیماننامەکە قبولّ کرا، (18) نوێنەری کورد وەکو یەك گرووپ دەنگیان بۆ پەسندکردنی دا[212].

لەگەڵ تەواوبوونی تەمووزی ساڵی (1924) پەسندکردنی پەیماننامەی عێراقی – بەریتانی تەواو بوو، ئەو کاتە حکومەتی بەریتانی هەستی کرد ئێستا پێویستی بەوە نەماوە دەرفەتی شێخ مەحمود بدرێ بەردەوام بێت لە هەڕەشە کردن لە ئیدارەی بەریتانی لەکوردستان، لەبەر ئەوە کۆمیسیاری باڵای بەریتانی بێجگە لە داگیر کردن بەدیلی تری نەبوو. لە تەمووز هێزەکانیان، کە پێکهاتبوو لە چەند تیپێکی عێراقیو فەوجێکی هێزەکانی پۆلیسو کەتیبەیەك سەربازی ئاشووری لەگەڵ هێزە جەنگییەکانی ئاسمانیی پاشایەتی گەیشتنە شاری سلێمانی، یەکەم جار بە فڕۆکە شاریان بۆردوومان

---

[210] - CO,730/60/2655, Teleg, No, 282 ,2June 1924 Dubs to Thomas Minute) 4 June 1924. Dubs to Thomas Niama (Anglo-Iraq Relations During The Mandate) Unpup Doctoral dissertation Wales A derystwyth, 1974,p.162.

[211] - Burgoyne Gertrude Bell: From Personal Papers, 11, p.344, Kurdish deputies in the Assembly Were usally Carefully selected by The British authorities in Iraq.

[212] - Iraq Administrative Report April 1923, December, 1924, p.25.CO, 730/6132/85 Chamberlain to Lindsay.6,June 1924. Edmonds, p.3712. Jwaideh, pp.383-384. Niama, p.165

کرد، شێخ هەڵات بۆ شاخەکان،"چاپمان" بە ناوی یاریدەدەری موتەسەریف لە ئیدارەی لیوا دانرا، ئەمیش ڕاستەوخۆ ملکەچی کۆمیسیاری باڵا بوو[213].

شێخ مەحمود لە بنکە قایمکارییەکانی شاربازێڕ و پێنجوێن لە باشووری ڕۆژهەڵاتو باکووری سلێمانی هێرشە سەربازییەکانی ڕێکخستەوە بۆ ئەوپەڕی ناوچەکانی کەرکووك و سلێمانی، بە دەرفەت وەرگرتن لە شەڕی ناوخۆی میرەکانی خێڵی جاف، لە ئاب توانی دەسەڵاتی بگاتە هەڵەبجە و دەوروبەری[214]، بە تەنیشت لیوای سلێمانییەوە توانی حکومەت درووست بکاو بەسەر زۆربەی هۆزەکانی لیوا باجو سەرانەی بسەپێنیٚ، لە ئابی ساڵی (1924) یاسین هاشمی سەرۆکوەزیرانی نوێی عێراق بۆ سەرکوتکردنی شێخ مەحمود داوای لە حکومەتی بەریتانی کرد هاوکاری بکات، لە ئابەوە بۆ کانوونی یەکەمی ساڵی (1924) چەندین هێرشی سەربازی بۆ دەرپەڕاندنی شێخ مەحمود و لایەنگرانی بۆ سەر سەنگەرەکانی لە شاخەکان دەست پێکرد[215]. سەرەڕای وێرانییەکی بەرفراوان لە ئاکامی بەکارهێنانی هێزی ئاسمانی جەنگی بەریتانی، چەندین گوند سووتان، بەڵام نەیانتوانی بە تەواوی دەست بگرن بەسەر چالاکییە پارتیزانییەکانی شێخ مەحمود، کە شارەزا بوون بە سروشتی ناوچە شاخاوییەکانو دەیانتوانی بە ئاسانی جێگۆڕکیٚ بکەن، دەبوایە سوپای عێراقی لەو هێرشانە ڕۆڵی بەرچاوی هەبێت، بەڵام پێشتر ئاگادار نەبوو بە سروشتی جوگرافی ناوچەکە، هەتا لە کانوونی یەکەم هاشمی سەرۆك وەزیرانی عێراقی بە هۆی بێتوانایی لە دەستبەسەراگرتنی شۆڕشی شێخ مەحمود و ئەو توندوتیژیەش بەکاری هێنا دەستی لەکار کێشایەوە[216].

---

[213] - FO,371/10114, Air Staff Note on The Occupation of Sulaimani Desp 44459/24, 27 Despt, 1924, Edmonds, p.387

[214] - BHCF, 13/14 Events, in Kurdistan Vol, 5, Sheikh Mahmud: Aide Memory by B.H. Bourdillon 3 Great Nov, 1926, by His Majesty s, Government to The Council of Laager of Nationals on The Administration of Iraq for the Years 1925,(Colonial No, 21 London:HMSO, 1926,)p.32 .

British Colonial Office Report by B.H, Bourdillson

[215] - Iraq Administrative Report April 1923, December, 1924, pp.31-32.

[216] - Report on Progress of Iraq 1925, p.258.

س، ا، القيسي: ياسين الهاشمي و دوره في السياسة العراقية، 1922-1936، بغداد 1975، ص279

بەر لە گەیشتنی لیژنەی لێکۆڵینەوەی کۆمەڵەی گەلان بۆ سەردانی کوردستان، بە مەبەستی هێور کردنەوەی لیوای سلێمانی لە ناوەڕاستی کانوونی یەکەمی ساڵی (1924) حکومەتی بەریتانی خۆی کۆکردەوەو ئامادە بوو زۆرترین هێز بەکارهێنانی لە هێزە جەنگییە ئاسمانییەکانی بە شێوەی کاریگەر هێرش بەرن، بۆ ئەو مەبەستە ڕێوشوێنی توندی گرتەبەر و توانای شێخ مەحمودی لە درووست کردنی پەشێوی لە ناوچەکە نەهێشت، یان کەمی کردەوە، شێخ‌و لایەنگرانی هەڵاتن‌و بوونە پەناهێندەی ناوچە شاخاوییەکانی سنووری ئێران[217].

لە تشرینی دووەمی ساڵی (1922) هەتا تەمووزی ساڵی (1924) سیاسەتی بەریتانی بەرانبەر کورد لە زۆربەی بارەکاندا لە ژێر کاریگەری ڕێڕەوی وتووێژەکانی لۆزان دا بووە لەسەر ویلایەتی موسڵ، سەرەڕای ئەمە لەو ماوەیە بەریتانیا پشتگیری خۆی بۆ سەربەخۆیی نەکردووە، کە لە پەیماننامەی سیڤەر بەڵێنی دابوو، ئومێدی بەریتانیا ڕازیکردنی تورکیا بووە، کە ئەوکات پێویستی پێی هەبوو بۆ بەدەستهێنانی ستراتیژیەتی گەورە، کە لە گۆشەگیر کردنی رووس خۆی دەنواند، ئەو ماوەیە کورد لەلایەن هەردوولاوە لەسەر ناکۆکی سنووری ویلایەتی موسڵ هێنرایە گۆ و بەکارهێنرا.

---

[217] - Burgoyne Gertrude Bell, From Her, Personal Papers, 11,pp.369-370.

له نەوەدەکانی سەدەی رابردووەوە هێزەکانی تورکیی سنووری کوردستانی عێراق دەبەزێنن بۆ راوەدوونانی جەنگاوەرانی پارتی کرێکارانی کوردستان، ئەو پارتەی بۆ دروستکردنی دەوڵەتی سەربەخۆی کوردستان لە باشووری رۆژهەڵاتی تورکیا خەبات دەکات. بۆچوونی پیاوەکانی دەوڵەت لەتورکیا و پەرلەمانتار و چاودێرانی سیاسیی "لە ناوخۆ و دەرەوە" ئەوەیە، کە تورکیا دەیەوێت بەهۆی ئەم سنووربەزاندنەوە باکووری عێراق بەخۆوە بلکێنێت. ئەم باوەڕەش لەسەر بنەڕەتی مێژوویی بنیات نراوە، باکووری عێراق لە دوای سەردەمی عوسمانی بە ویلایەتی موسڵ ناسرابوو. سەرەڕای چارەسەرکردنی کێشەی موسڵ لە بەرژەوەندی عێراق، بەڵام هەتا ئێستاش ئەو یەکلاییکردنەوەیە کاریگەری لەسەر پەیوەندییە دووقۆڵییەکانی تورکیا و عێراق درووست کردووە، بەتایبەتی ئەوەی پەیوەندی هەیە بە مەسەلەی کوردەوە. لێرەدا هەوڵدەدەین ریشەی ئەم کێشەیە روون بکەینەوە، چونکە دەشێ وەکو ئاریشەیەکی رۆژهەڵاتی ناڤین بتەقێتەوە*.

لە سەرەتای بیستەکانی سەدەی بیست، هەندێ لە سیاسییەکانی بەریتانی بە دڵنیاییەوە لەو باوەڕەدابوون کێشەی کورد گرنگترین رەهەندە لەناو کێشەی موسڵ. لێرەدا هەوڵدەدەین ئەو باوەڕە دیاری بکەین و روونی بکەینەوە، ئەمەش بە ئاماژەکردن بە ئەندازەی گرنگی شوێنی کورد لەکێشەی ویلایەتی موسڵی ساڵی (1922–1925)و بەراورد لەگەڵ هۆکارەکانی تری پەیوەست بەو بابەتەوە، وەکو بەرژەوەندییە ستراتیژییە "زیندووە"کانی ئیمپریالستی بەریتانی، نەوت "پەترۆڵ"، هەروەها بنیاتنانی دەوڵەتی نەتەوەیی هەریەك لە عێراق و تورکیا. لە کۆتایی ئەم لێکۆڵینەوەیەدا دەچینە سەر بایەخی کێشەی موسڵ و بەرئەنجامەکانی لەسەر پەرەسەندنی مەسەلەی کورد لە عێراق.

* – دەستپێکی ئەم وتارە دەگەڕێتەوە بۆ ناوەڕاستی نەوەدەکانی سەدەی رابردوو. "وەرگێڕ"

## پڕوپاگەندە و دژە پڕوپاگەندە لە نێوان تورکیا و عێراق

لە کۆنگرەی لۆزانی ئاشتی لە (20)ی تشرینی دووەمی (1922) عیسمەت پاشای نوێنەری تورکیا لە نزیکەکانی موستەفا کەمال ئەتاتورکی دامەزرێنەری تورکیای نوێ بوو، وتووێژی لەگەڵ لۆرد کیرزۆنی راسپێردراوی پاشانشینی یەکگرتووی بەریتانیو وەزیری دەرەوەی ئەوکات کرد. وتووێژەکان لەسەر داهاتووی ویلایەتی موسڵ بووە، هەتا بگەنە رێککەوتن. رژێمی تازەی دەسەڵاتدار لە تورکیا پابەند نەدەبوو بە مەرجی واژۆکراوی پەیمانی سیڤەری (10)ی ئابی (1920)، ئەو پەیمانەی دانی نابوو بەدامەزراندنی دەوڵەتی کوردی لە باشووری رۆژهەڵاتی تورکیا. کوردەکانی ویلایەتی موسڵ ئارەزوومەندانە ئازادبوون بدەنە پاڵ ئەو دەوڵەتە.

تورکیا بە چەند بیانویەك داواکاری، یان مافی خۆی لە ویلایەتی موسڵ هێنابووە گۆڕێ:

یەکەم: عەرەب لە ویلایەتی موسڵ کەمینەیە و ئەوەی تر هەمووی کورد و تورکمانن، ئەوانیش لە ڕووی رەچەڵەکەوە لە یەکتر جیا نین.

دووەم: پەیوەندییە ئابوورییەکان، کە زۆربەی بازرگانی ویلایەتی موسڵ لەگەڵ تورکیا بووە، نەك عێراق.

سێیەم: داگیرکردنی ویلایەتی موسڵ لەلایەن هێزەکانی بەریتانییەوە نایاسایی بووە و پێشێلکردنی پەیماننامەی ئاگربەستی مۆندەرۆسی واژۆکراوی ئۆکتۆبەری (1918) بووە.

چوارەم: مافی چارەنووس، تورکیا رایگەیاندبوو کە زۆربەی دانیشتوانی ئەو ویلایەتەی ناکۆکیی لەسەرە دەیانەوێت بخرێنە پاڵ تورکیا، نەك وڵاتی تازە پێگەیشتووی عێراق کە بەریتانیا درووستی کردووە*.

لۆرد کیرزۆن خاڵ بەخاڵ بەرهەڵستی پڕوپاگەندەکانی تورکیای کرد، جەختی کردە سەر زۆرینەی دانیشتوانی ئەو ویلایەتەی ململانێی لەسەرە، کە کوردنو ئەوانیش لە ڕەچەڵەکەوە هیندۆ ئەورووپین، جیاوازن لەگەڵ "ئۆراڵ ئەلتابی" تورکی، لە ڕووی

* - ئەو پڕوپاگەندانە و دژە پڕوپاگەندانە لە بەشی دەیەم لە باسی کورد و لۆزان هەیەو لێرە دووبارەیە، بەڵام لەبەر نارێك کەوتنی تویژینەوەکە نەمانویست بیسڕینەوە. "وەرگێڕ"

ئابووریشەوە لە مێژوودا زۆربەی بازرگانی هەرێمەکە زیاتر پەیوەست بووە بە عێراق نەك بە تورکیا. لە ڕووی یاساییەوە حکومەتی بەریتانی لە لایەن پەیوەندیی نێودەوڵەتییەوە راسپێردراوە عێراق بە ویلایەتی موسڵیشەوە بخاتە ژێر ئینتیدابی خۆیەوە. لە ڕووی ئەخلاقییەوە بەریتانیا پابەندە پارێزگاری لە یەکێتی خاکی عێراق بکات. شۆڕشە یەك لە دوای یەکەکانی کوردیش بە درێژایی ساڵانی (1920–1924) ئەو پڕوپاگەندانە لە گۆڕدەنێن کە کوردەکان حەز بەدەسەڵاتی تورکیا دەکەن[218].

## بایەخەکانی بەریتانیی و عێراقیی

بەرژەوەندییەکانی بەریتانی لە ویلایەتی موسڵ لە لایەن هاوچەرخان و مێژوونووسانەوە جێی بایەخ بووە. "بیتر جێبك" بە ئاڕاستەیەکی روون کورتەی ئەم مشتومڕەی بە هۆکاری زیندوو زانیووە.... لەم نێوەندەدا نووسینگەی کاروباری دەرەوە بواری سەرەکی تایبەت بە ململانێی کورت کردۆتەوە بەوەی ژمارەیەك بەڕێوەبەرایەتی حکومی کاریگەریی لەسەر کێشەکە هەبووە. دەشێت لە تێڕوانینێکی جیاوە لەو مەسەلەیە بڕوانین. بۆ نموونە: ئەم ناکۆکییە لە سکاڵای لۆرد کیرزۆن بەدیار دەکەوێت، کە ئاماژەی بە دەستێوەردانی بەڕێوەبەرایەتیەکانی تر کردووە، ئەوان پێدادەگرنە سەر بایەخی ستراتیژی و جەخت دەکەنە سەر هەڵکەوتنی ناوچەکە لەسەر هێڵی بەیەکگەیاندن لەگەڵ داگیرگەکانی بەریتانی لە ڕۆژهەڵات. ئەم وەزارەتانەی لەکێشەی موسڵ بەشدارییان کردووە: وەزارەتی دەرەوەو وەزارەتی جەنگو دەریایی، ئەوانیش زیاتر جەختیان کردۆتە سەر لایەنی ستراتیژی بەوەی دەستبەسەراگرتنی موسڵ بە زنجیرە شاخێك لە تورکیای جیا دەکاتەوە، ئەمەش بەتەنیا کارکردن نییە بۆ جیاکردنەوەی عێراق وەکو دەوڵەت، بەڵکو زیاتر بۆ زامنکردنی سنوورە، کە لە بەرانبەر ناحەز بەکار دەهێنرێت. ئەمەی دوایی بە مەترسیدار، کە بەریتانیا وەکو دەوڵەتێکی ئیسلامی ناحەز سەیری کردووە، ویلایەتی موسڵ وەکو خاڵی سەرهەڵدانی هێرش بۆ

---

[218] - Great British Foreign Office Lausanne Conference on Near Eastern Affairs,1922-1923, Records of Proceedings and Draft Terms of Peace (CMD. 1814) (London: HMSO, 1923, p.262-264(

سەر عێراق بەکاردەهێنرێ، لە دوای ئەوە بۆ سەر بەرژەوەندییەکانی بەریتانی لە کەنداوی فارس[219].

بە خوێندنەوەی بەندەکانی پەیوەندییدار لە وەزارەتی ئاسمانیو وەزارەتی دەرەوەو نووسینگەی هیند و وەزارەتی کاروباری داگیرگەکان دەردەکەوێت بەرپرسانی بەریتانی لە ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست، ئەگەر لەو حالەتەی کەوتنە دەست تورکان بە زیادەڕۆییەوە راپۆرتیان داوە لەسەر ئاکامە ستراتیژییەکەی ویلایەتی موسڵ، بۆ نموونە: هەوالگری بەریتانی لە ڕۆژهەلاتی تورکیا و باکووری عێراق قسەی لەسەر کابووسی تۆقێنەر "کابوس مروع" کردووە، هەندێجار لێکدانەوەی نادرووستیشی کردووە لەسەر گەورەیی پیلانی کۆمۆنیستی لە ئەگەری گرێدانی تورکیا و ئێران و عێراق بە یەکێتی سۆڤیەت لە ڕێگەی بەکارهێنانی چالاکانەی ئەندامانی بەلشەفی لە ناو کورد. دەسەلاتدارانی بەریتانی رایانگەیاندبوو، کە پرۆژەی رووسی لە دیاربەکر و وان و ئەرزڕۆمی باشووری رۆژهەلاتی تورکیاو تەورێزی باکووری رۆژئاوای ئێرانەوە پیلانی بۆ داڕێژراوەو جێبەجێ دەکرێ[220].

ئەو بەرپرسە بەریتانیانەی زیادەڕۆییان کردووە لە باسی مەترسییەکانی بەلشەفی دوو ئامانجیان هەبووە:

یەکەمیان: درووستکردنی بێمتمانەیی لە نێوان رووسیا و مستەفا کەمال، کە مستەفا کەمال هەتا ئەو کاتەش دوودڵ بووە لە سیاسەتی دەرەوە لەنێوان رووسیاو رۆژئاوا، بەلام ئەو بەزیادەوە باسی ئەگەری نەخشەی رووسی کردووە لە ڕۆژهەلاتی ئەنادۆڵ، چەند بارەی دەکردەوە، کە هەتا ئێستاش تورکیا پێویستی بە هاوپەیمانییەتی کاتی هەیە لەگەڵ رووسیا، ئەمە بەهۆی بێدەرامەتیو کەمی چەکو تەقەنەنی تورکیا لەگەڵ دلنیانەبوون لە مەبەستی بەریتانی، لێرەدا مەبەستی تورکیا لە بەکارهێنانی هێزی رووسیا بووە لە بەرانبەر بەریتانیا لەکێشەی ویلایەتی موسڵ[221].

---

[219])-A Tedious and Perilous Controversy: Britain and The Settlement of Mosul Dispute, 1918-1922), Middle Eastern Studies 17 April 19881,p.257

[220] – FO,371/111 Memo No,E,51/G (Russia s Communist Activities on Iraq Frontier), 4 January 1925, British Embassy, Constantinople.

[221] Toynbee, p.688

دووەمیان: بەریتانیا ئەم گرنگیپێدانەی بە مەبەستی بابەتی ستراتیژی بووە، ئەو ناکۆکیەش زیاتر بۆ "شاردنەوە"ی مەبەستی راستەقینە بووە کە ئارەزووی دەستبەسەراگرتنی پەترۆڵی هەبووە لە ویلایەتی موسڵ. پێداگرتنی بەریتانیا لە دەستەواژەی ستراتیژی لە سیاسەتی ناوخۆیی و نێودەوڵەتی رەخنە و گازاندەی زۆری لێکەوتەوە، ئەوەی جێی سەرنجە لە هەموو قۆناغەکانی کێشەی موسڵ فشارێکی زۆر لەسەر حکومەتی بەریتانی هەبووە بۆ کشانەوەی لە موسڵ و عێراق بە گشتیی، دوای راپەڕینی ساڵی (1920)ی عێراقی دژ بە بەریتانیا. بەرهەڵستکارانی ناو بەریتانیا و بەشێکی گەورەی رای گشتی بەریتانیی ـ عێراق، تایبەت بە ململانێ لەسەر ویلایەتی موسڵ ئەوەی بە ئەنجام گەیاند، کە بێ ئەوەی پێویست بێت باری قورسی لەسەر ئیمپراتۆریەتەکە درووست کردووە[222]. بەتایبەتی بەرهەڵستکاران دەترسان هەڵوێستی توندی بەریتانیا موستەفا کەمال ناچار بکات بۆ هاوپەیمانییەتی پتەو لەگەڵ رووسیا، بەمەش بەرژەوەندییەکانی بەریتانیا لە کەنداوی فارس دەکەوتنە مەترسییەوە[223].

وا دیارە نەوت فاکتەری زیندوو بووبێت لە ناکۆکیی ویلایەتی موسڵ و ئەندازەیەکی زۆر کاریگەریی لەسەر ئەقلیەتی داڕێژەرانی سیاسەتی بەریتانیدا هەبووبێت، بەرپرسانی بەریتانی هاوچەرخ، وەکو لۆرد کیرزۆن و بۆنارلۆ، سی لە لەندەن، ماکدۆناڵد، ئیستین شمبالین لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، ئار.لندسی لە ئەنقەرە و بیرسی کۆکسو ئەدمۆنس

---

[222] - House Commons (Hereafter H.G) Parliamentary Debate 189. 2080. FO,371/10826 (Mosul) Memo No, 840, 16 November 1925, Dudley Heathcoat (Mosul and Kurds). Fortnightly Review 124. (1925) 611Spences William American University Washington 1965, 66-67. (Mosul the Desired) Literary Digest 17 February 1924. p.12. Opposition to the governments, s, Mosul Policy was Widespread throughout the country

بەرهەڵستکاری لە هەموو لایەکی موسڵ زۆر فراوان بوو، کۆمەڵێك گۆڤار و بڵاوکراوە و رۆژنامە لێدوانی خۆیان لەسەر "ئەمیری" ئەندازیاری سیاسەتی بەریتانی دەربڕی لەسەر ویلایەتی موسڵ و بە زیادڕەو لادەرو رووخێنەری باڵەخانە بۆ بنیاتنانی شەقام باسیان کردبوو، هەروەها بە وروژێنەری شەڕ ناویان هێنا بوو.

See: Leo Amery My Political Life 2 Vols (London 1953) 2.328 .

[223] - FO,371/10836 (Mosul) Memo. No, 840. 16 November, 1995, H.C, Parliamentary Debate 189, 2080

لەعێراق لەنکۆڵیان کردووە لەکاریگەری هۆکاری پەترۆڵ لەسەر سیاسەتی ئەوان لە ململانێ لەسەر ویلایەتی موسڵ[224]. لێکۆڵینەوەی تازە لەو بارەیەوە کە پشتدەبەستێ بە بەڵگەنامەو تۆماری دیکۆمێنتەکانی بەریتانی دەیسەلمێنن پەیوەندی هەمیشەییو دانەبڕاو هەبووە لە نێوان بەرژەوەندییەکانی ئیمپریالستی لە پەترۆڵی بەریتانیو هەڵوێستی حکومەت لە ناکۆکیی لەسەر ویلایەتی موسڵ[225]. ئەوەی شایانی باسە لەو رۆژانەدا هێشتا پەترۆڵی موسڵ گەشەی نەسەندبوو، هەندێك لە بەرپرسان هەوڵیان داوە لە دەستکەوتەکەی کەم بکەنەوە، سەرەڕای ئەمە بەرپرسە حکومیەکانی بەریتانیا هاوبەشبوون لەو ململانێیەو وا بەدیاردەکەوێ ئەوان بەتەواوی شارەزابووبن بەکۆگا دەوڵەمەندەکانی نەوتی ویلایەتەکە[226]، بڕوایان وابووە دەسبەسەراگرتنی ویلایەتی موسڵ گرنگە بۆ دەستبەسەراگرتنی عێراق، مانەوەی بەریتانیا لە عێراق پێویستی بە خۆسازدانە بۆ پارێزگاری لە کۆمپانیای پەترۆڵی ئینگلیز لە باشووری ئێرانی ئەو کاتە[227].

[224] .-Cabinet Paper. 24/175 No, 472, Iraq and the Mosul Question 10 November 1925

رۆژنامەکانی دونیا کێشەی موسڵیان بە جەنگی نێوان عێراق و تورکیا لەسەر مەخزوناتی نەوتی ناوچەکە خستبووە ڕوو، بەڵام دەسەڵاتدارانی بەریتانی بە توندی ئەو قسەیان رەتکردەوە، "لسینش ولیام" دەنووسێ: (بەرپرسە ئیدارییە مەدەنییەکانی حکومەت و ئەوانەی لە ڕۆژانی قەیرانی موسڵ، یان دواتر بیرەوەری خۆیان نووسیوەتەوە، هەموویان لەسەر ئەوە کۆکن نەوت لەم قەیرانە بایەخی کەم نەبووە. بڕوانە: فاضل حسین، مشكلة الموصل، مطبعة، الجامعة، 1977، رەزا نووری یاریدەدەری نزیکی عیسمەت پاشا لەکاتی وتووێژەکانی لۆزان، یەکێك بووە لە ئەندامانی سەرۆکایەتی پەرلەمانی تورکی دەنووسێ: بەریتانییەکان سووربوون لەسەر پوچەڵکردنەوەی کاریگەری پەترۆڵ لەسەر هەڵوێستی بەریتانی لە بەرانبەر کێشەی موسڵ.

[225]- H. Micher. Imperial Quest for Oil. Iraq 1910-1928 (London 19760) 131-132 Peter Shuqlett, British in Iraq 1914-1932 Ithaca Press, 1976.79-80?. M.Kent Oil and Empire British Policy and Mesopotamia Oil 1900-1920. (New York: 1976) 127; William Steers, Supremacy and Oil (Ithaca; Cornell Univ, Press, 1982) p.168-169.

[226] - FO,424/256 DBF9, 165

[227]-- Cab 24/175 No, 472, (Iraq and the Mosul Question) 10, November 1925

سەبارەت بە پاراستنی بەشەكانی باكوور هەتا بڵێی پێویست بوو بۆ مانەوەی عێراق بە دەوڵەتێكی بەهێز. مەلیك فەیسەڵ لە بەرانبەر لیژنەی یەكلایكەرەوەی راستییەكان لە ئازاری (1925) وتارێكی داو بە ئاشكرا گوزارشتی لەو خاڵە دەكرد:

(دابینكردنی حكومەتێكی عێراقی هەمیشەییو پتەو پشت دەبەستی بە هێشتنەوەی بارودۆخی ئێستا "الوضع الراهن"، لەو بڕوایەدام لەسەر هەردوو ئاستی ستراتیژیو ئابووری تا سەر پێكەوە ناگونجێن حكومەت لە بەغدا بمێنێتەوە ئەگەر مەسەلەی موسڵی لێ دابڕی... ئەزموونی مەعریفی و ئاگاداریم بە نەفسیەتی گەلی تورك و چاوتێبڕینیان بە درێژایی مێژوو لە فراوانخوازی و داگیركاری.... وای لێ كردم رایبگەیەنم موسڵ بۆ عێراق وەكو سەر وایە بۆ هەموو لەش)[228].

ئەو بایەخدانە بە ویلایەتی موسڵ هەوڵی مەلیك فەیسەڵ و هەموو بەشەكانی حكومەتی عێراقیی بووە بە نیشتمانییە نەتەوەخوازەكانیشەوە، كە لەكاتی قەیرانەكە لەسەر هۆیەكانی راگەیاندن رەنگی دابۆوە[229]. بڕوای پتەوی مەلیك فەیسەڵ و نیشتمانیانی بەغدا ئەوە بووە، نەوتی موسڵ پێویستە بۆ بنیاتنانی قەوارەیەكی ئابووری پەرەسەندو و پێشكەوتوو لە عێراق[230]، لە لایەكی ترەوە وەكو پێشتر سەرەنجمان دا چیاكانی كوردستان بایەخدارترین بەشەكانی ویلایەتی موسڵن بۆ دابین كردنی سنوور بۆ عێراق، بە جۆرێ پارێزگاریی لە باكوورەوە لێ بكرێ دژی مستەفا كەمال، لەكۆتایی دانیشتوانی ویلایەتی موسڵ سەر بە سوننی مەزهەبن، ئەمانە لە مەلیك فەیسەڵ زیادنین، هەریەك لە عێراق و بەرپرسانی بەریتانی لە عێراق چەندین جار جەختیان كردۆتەوە، كە عێراق ئەگەر باشووری لێ جیابكەیتەوە لە (80٪)ی دانیشتوانی وەكو شیعە

---

[228] - Leaguer of Nationals Question of Frontir Between Iraq and Turkey Reports Submitted to the Council by the Commission Instituted by the Council Resolution of September 3ed 1924 (C.400.N.147. 1925.711 .(

[229] - FO,371/Intelligence Report No, 12 November 1923 al-Istiqal No,262, October 1924, Al-Amal. No,33.8. November 1923. Times ((London) 8 August 1925.

[230] -David Lloyd George War Memories of David Lloyd George 4 Voles Boston Brown & Company 1934) 4;1038.

دەمینێتەوە، ئەوکاتە بەڕێوەبردنی بۆ مەلیك فەیسەڵو دەوروبەری گران دەبێت، کە زۆربەیان سوننین[231]، لەبەر ئەم هۆیانە بووە هەڵوێستی عێراق لە بەرامبەر کێشەی موسڵ بە تەنیا بەشێکی لەژێر کاریگەریی پەترۆڵ دابووە، بەڵام دەست پێوەگرتنی ویلایەتەکە وەکو بەشێك لە عێراق گرنگ بووە بۆ مەسەلەی بنیاتنانی دەوڵەت لە عێراق.

## مەترسیەکانی تورکیا

کورد زۆرینەی دانیشتوانی ویلایەتی موسڵ پێك دەهێنێ، وا بەدیار دەکەوێ ئەمە هۆکاری یەکەم - ئەگەر نەبێتە تاکە هۆکار - بێت، لەسەر پێداگرتنی بەردەوامی تورکیا لە هەوڵەکانی بۆ گەڕاندنەوەی ویلایەتی موسڵ، مستەفا کەمال لە ماوەی شەڕی سەربەخۆیی نیشتمانی، توانی زۆربەی هۆزە کوردەکان لە ڕۆژهەڵاتی تورکیا بکاتە پشتیوانی خۆی. پێکهێنانی حەمیدیە لە ساڵی (1918) بەشداری کاریگەریی کرد لە شەڕەکانی ڕۆژهەڵات دژی ئەرمەنو رووس، مستەفا کەمال پشتی بە ئەفرادەکانی دۆستی خەلافەت بەستبوو، لە پاڵ سوود وەرگرتن لە هەستی دوژمنکارییەتی ئەرمەن لە لای هەندێ ئەفراد و سەرکردە تەقلیدییەکانی کورد[232]. لەگەڵ ئەوەدا پەیوەندی نێوان تورکە نیشتمانیی و نەتەوەخوازانی کورد دۆستانە نەبووە، هۆی ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ

---

[231]- British High Commission Fields (Hereafter BHCF) 13/14 Events in Kudistan Vol 2 No, 1072, 14 May 1921. Political Officer (Heartier PO) Sulaimani to High Commissioner Baghdad: FO,371/6346 Teleg No,201.9January 1921. P.Graves, The Life of Sir Percy Cox (London ….? ….1924) 278-279 .

[232] - Report Olson The Emergence of Kurdish National and Shekh Saied Rbelion 1880-1925, (Austin: Unv, of Taxes Press 1989) p.26-27, Bullet Demireps, Mosul Kerkuk Only Ve Osmanli Immature Lugunda Kurt-Measles, (Istanbul Arab Rainstorm Basin 1991) 38-39. During the Period 1918-1921 .

- مستەفا کەمال لە ساڵانی (1918-1921) پشتگیری زۆربەی سەرکردەو شێخە کوردەکانی هەبووە، سەرکردە تەقلیدییەکان بەجدی پێیان وابووە دەوڵەتانی هاوپەیمان پشتیوانی لەئەرمەن دەکەنو کوردیان ناوێ.

Martin Van Bruin Essen Agha Sheikh and the State On the Soclol and Political Organization of Kurdistan (Urecht 1978,) p.375-376.

ڕۆژانی کۆمەڵەی یەکێتی و بەرزی و پێشکەوتن و یەکگرتنەوە "جمعية الاتحادو الترقى و الوحدة و التقدم"، لە بەرایی شەڕی یەکەمی جیهانی ئەندامانی تورکە لاوەکان خزابوونە پیلانو جێبەجێکردنی سیاسەتی بە تورك کردن، کە بڵاوکراوەو یانە کوردییەکانیان داخست[233]. مستەفا کەمال ڕاستەوخۆ لە دوای شەڕ ڕایگەیاند، کە هەواڵگریی بەریتانی لە ڕۆژهەڵاتی تورکیا دەستی هەبووە لە دانانی کۆمەڵەیەك بە ناوی "کۆمەڵەی کوردستان لە پێناو بوژانەوەو پێشکەوتن = Terragi Cemiat , I , Taalive" بۆ هێرش کردنە سەر ئەو هێزەکانی کەمالیی، کە بەشداربوون لە کۆبوونەوەی دووەمی ساڵی (1919) لە سیواس[234]. لەگەڵ ئەوەدا هیچ بەڵگەیەکی بەریتانی یان تورکی نەبووە پشتگیری ئەو بانگەشەیە بێت، ئەو ڕووداوە بە ئەندازەی خۆی بەشداری کرد لە هێنانەدی دوژمنکاری نێوان تورکە نیشتمانییەکان و جوڵانەوەی نەتەوایەتی کورد، هێزەکانی کەمالی لە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی خۆیان لە ساڵانی (1918 ـ 1920) کەوتنە گرتنی نەتەوەخوازانی کورد، ئەوانیش لە ناوچەی دەرسیمی باشووری ڕۆژهەڵاتی تورکیا یەکەم بەرەنگاری ڕژێمی کەمالییەکانیان لە ڕێگەی شۆڕشی "کۆچەری"یەوە دەست پێکردو داوای حوکمی زاتیان دەکرد، ڕووداوەکانی ئەو شۆڕشە هاوکات بوو لەگەڵ پەڕینەوەی یۆنانییەکان لە ڕۆژهەڵاتی تورکیا، تورکە نیشتمانییەکان لەو بڕوایەدابوون موخابەراتی بەریتانیو یۆنانی هاوکاری ئەو شۆڕشەن[235]، ئەم شۆڕشە لە چوارچێوەی خۆی فراوان بوو تا بووە ڕێگر لە نێوان کوردو تورکە ناسیۆنالیستەکان.

---

[233] – Suriya Bader Khan the Case of Kurdistan Against Turkey (Philadelphia. 1928. p.145

بلةج شيركو: القضية الكردية، بيروت دار الكتاب 1986 ص93-94، كمال مظهر: كردستان في سنوات الحرب العالمية الاولى، بغداد، 1984، ص117-119

[234] -Mim Kemal, Oke, Mosul Kurdistan Sorunu 1918-1926 (Istanbul, Izyainclik 1925, pp.78-79 ،

[235] – ئەو شۆڕشە، یان ئەو ڕاپەڕینەی کوردستان بە هاندانی ئەو کۆمەڵەیە بوو، کە لە ئەستەنبوڵ دامەزراو لە دوایی بە (کۆمەڵەی بەرزی و پێشکەوتن، تعالی و ترقی)، یان (کۆمەڵەی لە پێناو بەرزی و پێشکەوتن لە کوردستان) ناسرا. نەتەوەخوازان شانازییان بە پەیمانی سیڤەرەوە دەکرد کە بەڵێنی دابوو بە پێکهێنانی حکومەتی کوردی سەربەخۆ لە باشووری ڕۆژهەڵاتی تورکیا، کە زۆرینەی کوردن، هەریەك لە بەڵگەنامە بەریتانیو تورکییەکان جەخت دەکەنە سەر دەستێوەردانی یۆنان لەو ڕاپەڕینە کە هێزەکانی

سەرەڕای مانەوەی بە ئەنقەنستی هەڵوێستی لێڵی مستەفا کەمال لە بابەت ڕۆڵی کورد لە تورکیای تازەدا، گرنگە ئەوەمان بێتەوە بیر، کە هەتا دامەزراندنی کۆماری تورکیا لەسەر بیرۆکەی کەمالی، ئەو لیلێیە وەکو چەمك مابوو، لە ساڵی (1923) لە سەرەتای دامەزراندنی کۆمار مستەفا کەمال بە ڕێگەی هەڵخەڵەتاندن بێت، یان قەناعەت، وای لە جەماوەر گەیاند حکومەتەکەی جوڵانەوەیەکی رۆشنکەرەوەیە بۆ حکومەتێکی ئیسلامیی، کە دێت لەتورك‌و کوردو پاشماوەی دەوڵەتی عوسمانی، دەتوانین درك بەوە بکەین دارِشتنی بڕوانامەی نیشتیمانی تورکی‌و وتارەکانی مستەفا کەمال نموونەیەکی تر بوون[236]. مالك دوواڵ لە مستەفا کەمالەوە دەگێڕێتەوە کە لە ئەیلولی ساڵی (1919) وتاری بۆ ئەنجومەنی نیشتیمانی تورکی دەداو دەیوت: (لەبەر ئەوەی کەسانێکی پاك‌و خانەدان هەن لە تورك و کورد، بەرێزو گەورەیی ماونەتەوە دەبێت بەردەوام بن لە ژیانی برایانە لەگەڵ یەکتر لە دەوری دامەزراوەی خەلافەت، ئەمە دەبێتە کۆڵەکەی ئاسنینی لە شکان نەهاتوو دژی هەموو دوژمنکارییەکی دەرەکی‌و ناوخۆ)[237].

---

کەمالی بەر لەوەی بڵاوببێتەوە بۆ بەشەکانی تر سەرکوتیان کردو تورکیا زۆر لێی دەترسا. بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: See: Olson, p.33. Kamal Kocqiri Halk Haraket 1919-1921

[236]ـ بڕگەی یەکەم لەبروانامەکە (بڕوانامەی نەتەوەیی) دەڵێ: بە ئەندازەی زەرووری ئەمە چارەنووسی بەشێکە لە ناوەوەو دەرەوە کە بە ناوچەی ئاگربەست "مۆندەرۆس" ناسراوە و زۆربەی دانیشتوانەکەی عوسمانیین، هاودین و هاوڕەگەز و هاوزمانن، ئەوانە لە هەموو لایەکەوە دڵیان ئاودراوە بەرێزی هاوبەش و مافی کۆمەڵایەتی‌و هاوڕەچەڵەکی، ئەو بڕگەیەی (زۆربەی عوسمانیین) ئاماژەیە بە کورد لە ویلایەتی موسڵ. بۆ زیاتر درێژەدان بەبیرۆکەی (Ottoman Majority).

مستەفا کەمال و بڕوانامەی میللی لەسەر کوردو تورك لە ماوەی شەڕی سەربەخۆیی و دوای سەربەخۆیی بڕوانە:See: Ali Fuad Cebesoy, Misak-I Milli Istambul, 11982.

[237] -A Modern History of Kurds (London I-B.Touris,1996) p.187.

## لۆزان و كاروباری موسڵ

وتووێژەكانی لۆزان دەرفەتێك بوو بۆ توركان بۆ ئەوەی جەخت بكەنە سەر یەكێتی توركی ـ كوردی، لەكاتی بەستنی ئەنجومەنی باڵای نیشتیمانیو وتووێژەكان لەسەر كاروباری موسڵ، مستەفا كەمال بە ڕاشكاوی هەڵوێستی حكومەتەكەی دەردەبڕی:

(.. بۆ هەموو لایەك روون بێت سنووری ئێمە لە ڕۆژهەڵات درێژ دەبێتەوە بۆ سلێمانی و كەركووك لە ویلایەتی موسڵ. زۆرینەی دانیشتوانی ئەم ویلایەتە كوردو توركن، بەڵام ئێمە جیاوازییان ناكەین، هەردوولا پەیوەندی هاوبەشیان هەیە، گەلی ئێمە قوربانی زۆری داوە لە پێناو پاراستنی سنووری ئەو زەوییانەی، كە لە بڕوانامەی نیشتیمانی توركی "المیثاق الوطنی الترکی"دا هاتووەو پەشیمانبوونەوە لە كێشەی موسڵ دا نییە)[238].

سەرەڕای ئەمانە "عیسمەت پاشا" لە لۆزان دوو نوێنەری كوردی لە ئەنجومەنی نیشتیمانی لەگەڵ خۆی بردە كۆنگرە، لەوێ نوێنەرە كوردەكان رایانگەیاند توركو كورد دوو رەگەزی یەك گەلنو لێك جیا نابنەوە، ئەوەش كە دەڵێن كورد ئارەزووی سەربەخۆیی هەیە، پڕوپاگەندەی رۆژئاوایەو هیچ بنەمایەكی نییە[239].

لە ساڵانی (1922ز) و (1923ز) ئەنجومەنی باڵای نیشتیمانی لەسەر كاروباری موسڵ چەند وتووێژێكی زیندووی ئەنجامدا، میم ئۆوكەی "MIm Oke"ی توێژەرەوەی

---

[238]- Ataturk Soybev Ve Demecleri 74.

[239] - Ismet Pasha

هەریەك لە برنسی زادە و فەوزی بەگ و دولفی بەگ یاوەری عیسمەت پاشا بوون لە كۆنگرەی لۆزان، ئەمەی دوایی لە كۆنگرەی لۆزان وتی: كورد و تورك بران و یەك ئایین و یەك چارەنووسیان هەیە، كورد ئارەزووی سەربەخۆیی ناكەن، سەرەڕای ئەمە دولفی بەگ دەڵێ: (توركیا نیشتیمانمانە)، بڕوانە: زنار سلۆپی: مژكراتی، دار الكتب 1987، ل71.

لە ساڵی (1924) دۆلفی بەگ دەستی لە پلەی نوێنەرایەتی ویلایەتی دیاربەكر كێشایەوە، لە ئەنجومەنی باڵای نیشتنمانییەوە چووە پاڵ نەتەوەخوازانی كوردی دژ بە توركیا و لە ساڵی (1924) گیراو لەسێدارە درا.

See: Teleq. No, 572.(Constantinople 23 July 1924, Mr., Henderson to Mr., Macdonald cited in ed: Bilad, Simsir Ingliz Belgeleriyla Turkiyede (kurd Sorna) 1924-1938 Sheikh ,Agri Ve Dersim Ayoklammalari(Ankara, 1975) S,3-5.

تورکیو پسپۆڕ لەکاروباری موسڵ، چەند بۆچوونێکی گرنگی هێنابووە گۆڕێ، جەختی کردۆتە سەر موسڵ وەکو مەسەلەیەکی ئاسایشی نەتەوەیی. هەندێ لە نوێنەران فشاریان خستبووە سەر حکومەت هەتا ئەگەر پێویستی کرد ویلایەتی موسڵ بە زەبری هێز وەربگرێتەوە. بڕوایەکی پتەوو هاوبەش هەبووە لە نێوان بەرپرسانو نمایندەی تورکان لە ئەنجومەنی نیشتیمانی بەوەی تورکیا ناتوانێت بەبێ ویلایەتی موسڵ وەکو دەوڵەتێکی زیندوو و گەشەدار بمێنێتەوە. لکاندنی ویلایەتی موسڵ بە تورکیاوە زۆر پێویست بوو بۆ بنیاتنانی پەیوەندی هاوبەشی کوردو تورك، ئەمەش هەستێکی راستەقینەی ژمارەیەکی زۆری نمایندەکانی کوردو تورك بووە[240]. بە مەبەستی راکێشانی سۆزی کوردەکانی ویلایەتی موسڵ، ئەنجومەنی نیشتیمانی تورکی لە شوباتی (1922ز) نامەیەکی بڵاوکردەوەو داوای دانانی ئەنجومەنێکی تایبەت بە کوردانی کردووە بۆ باشووری رۆژهەڵاتی تورکیا. سەرەڕای ئەمە بڕیارەکە دانانێکی سنووردار بووە بەحوکمی زاتیو هاندان بووە بۆ بەکارهێنانی زمانی کوردی[241]. لە کانونی یەکەمی (1923ز) گرژییەکی مەترسییدار هەبوو لە نێوان بەریتانیاو تورکان لەسەر سنووری ویلایەتی موسڵ، مستەفا کەمال لە وتارێکیدا لە ئێزمیت دووبارە حوکمی زاتی داوەتەوە کوردو دەڵێ: (...لە داهاتوو ئەو هەرێمانەی زۆرینەی کوردن کاروباری بەڕێوەبەردن دەدرێتە دەست خۆیان، بەڵام ئەوەی تر هەموو بە تورك دادەنێین...)[242].

هەموو ئەو بەڵێنانەی تایبەت بوون بە حوکمی زاتی مەرجدار و بێ ئاکام بوون، لە کۆتاییدا هیچ هەنگاوی باش و کردەیی بۆ نەنرا، مستەفا کەمال پێویستی بە کوردان بووە بۆ بەرەنگاربوونەوەی دەرەکی، بۆیە بە ئەنقەست لێڵی و ناڕۆشنی بە وتارەکانییەوە دیاربووە، ئەمەش مەسەلەی سیاسیی دیار بووە بۆ کورد.

لەدوای تێکشکانی یۆنانو بەستنی پەیمانی لۆزان لەگەڵ دەوڵەتە سوێندخۆرەکان مستەفا کەمال سیاسەتێکی تری پەیڕەو کردووە، ئەویش سیاسەتی بە رۆژئاواییکردن بووە، لەسەر کۆمەڵگای تورکیو دەوڵەتی تازە، ئەم هەنگاوە چاکسازییانەی بە ناوی

---

[240] - TBMM, Gizli Celse Cilt. 31, January 1923, S.1259. Gizli Celse Zabitlari Cilt. 3.27. February 1923, in, March

[241] TTBMM, Gizli Celse 11,333-334

[242] McDowall: p. 190

"تورکیزم" ناونابوو، دەبێت ئێمە لە ڕوانگەی هەنگاوی تورکیزمەوە سەیری سیاسەتی بەرانبەر بە کورد بکەین. نووسەری کوردی بەتورککراو "زیا کۆك ئاپ" ناسراو بەزیا قوتالیب پێناسەیەکی تازەمان دەداتێ لەسەر بنەماکانی تورکیزم "المبادئ الترکیة"، کە "ماکدواڵ" بەشێکی قسەکانی زیائی بۆ هێناوین، لە زاری ئەوەوە دەڵێ: (...پەیوەندییەك لە نێوان رەچەڵەك‌و کاریگەرییە کۆمەلایەتییەکاندا نابینرێ، هەروەها پەیوەندییەکیش نابینرێ لەگەڵ نەتەوایەتی، کە بریتییە لە کۆمەڵێك تایبەتمەندی کۆمەلایەتی.... هاوکاری کۆمەلایەتی جەخت دەکاتە سەر یەکێتی رۆشنبیری، من دوودڵ نیم لەو باوەڕە کە تورکم هەتا ئەگەر رۆژێك بە دیارکەوت باوك و باپیرانم لە ناوچە کوردییەکانەوە هاتوون)[243].

مستەفا کەمال پێی وابووە کوردستان لە بنەمای ئابووری و کۆمەلایەتی تایبەتمەندی خۆی هەیە، لەگەڵ جیاوازی زمانی کوردی لە تورکی، ئەم دوانەش کۆسپن لە بەردەم بنیاتنانی تورکیای تازە. لە هاوینی ساڵی (1923) لە هەموو بەڵێنە باق‌و بریقەکانی پەشیمان بووەوە لە قبوڵ کردنی بەشداریی کورد لەگەڵ تورکان. سیاسەتی تازە، بە زەبری هێز دەستی کردووە بە تواندنەوەی کورد و بێبەش کردنی لە بەکارهێنانی زمانی کوردی لە قوتابخانە و دادگا یاساییەکان. وشەی کوردستان لە هەموو نەخشەو کتێبەکانی فێرکردن لابرا، هەموو بەرپرسیارێتییە بەرزەکانی حکومەتی وەکو والی‌و بەرپرسی هەرێمەکان درا بە تورکان، یان درا بەو کوردانەی هیچ شوێنەوارێکی نەتەوەیی کوردیان پێوە دیار نەبووە. سەرەڕای ئەمە نوێنەری ویلایەتە کوردییەکان بە فەرمانی

---

[243] - هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل189

لە ساڵانی (1921-1925) لە تورکیا وتووێژی زیندووو رۆشن هەبووە لەسەر چەمکی زاراوەکانی تەرکەسلیك (الترکسیە)و میللیەت (نەتەوە، القوم) فولك (گەل، الشعب). گەرچی لە ساڵی (1924) مستەفا کەمال کەوتبووە ژێر کاریگەریی زیاوکۆك ئەلپ و دکتۆر عەبدوڵلا، کە لەو ماوەیەدا هەردووك رووناکبیری سەرەکی بوون بڕیاریدا دەوڵەتی تورکیای تازەی عەلمانی بنیات بنێت.

See Bernard Lewis The Emergence of Modern Turkey, (Oxford: Univ, Press, 1961) 318-355. S.Shaw, History of Ottoman Empire and Modern Turkey 2Vols. (Cambridge; Univ, Press,1977) 375-378.

ئەنقەڕە دیاری کران، لەوانەی کاریان دەکرد لەسەر ڕێڕەو و ئاسانکاری بۆ بەرنامەی بە تورککردن[244].

عیسمەت پاشای سەرۆکوەزیرانی ئەوکات لە وتارێکیدا لە بەرانبەر ئوجاق ـ یانەیەك بوو لەئەنقەڕە بۆ بڵاوکردنەوەی پروپاگەندە بۆ ڕۆشنبیری تورکی ـ دەیوت: (بەو پەڕی ڕاشکاوی تاکە پەیوەندی نێوان ئێمەی نیشتیمانپەروەران هاونیشتیمانیبوونە، وەکو زۆرینەی تورك لە بەرانبەر هەموو ڕەگەزەکانی تر هیچ کاریگەری نییە، پێویستە بەهەر نرخێك بێت هەرچی دانیشتوانی خۆمان هەیە بیکەینە تورك، بەرەنگاری هەموو ئەوانە ببینەوە، کە دژی سیاسەتی بە تورك کردنن)[245].

ئەم لێدوانەی بەرپرسێکی گەورەو نزیکی کەمال ئەتاتورك بەڵگەی ئاشکرابووە لەسەر ئەندازەی بەهێزو سووربوون لە لای پیادەکارانی ئەو سیاسەتە لە بەرانبەر کورد، ئەوە قسەی عیسمەت پاشای ئەندازیاری کاروباری موسڵ بوو لە سیاسەتی تورك.

ئیدارەی بەریتانی لەکاتی وتووێژەکانی لۆزان لەسەر ویلایەتی موسڵ سیاسەتی هاندانو چاودێری نەتەوەی کورد پەیڕەو دەکرد، ئەمەش پێچەوانە بووە بە بیروباوەڕی جوڵانەوەی جامیعەی ئیسلامیی، کە حکومەتی تورکی لە سەرەتای بیستەکان لەناو کوردەکانی ویلایەتی موسڵ برەویان پێدابوو، سەرەڕای ئەمە سیاسەتی بەریتانیی ـ کوردیی لە ماوەی دوای لۆزان نەرمو سینەفراوان بووە لە بەرانبەر ئەوەی پێی دەوترا مافی روناکبیری کوردی، بەکارهێنانی هێز لەلایەن ئینگلیزەوە دژی بانگەوازکارانی سەربەخۆیی کوردستان یان زیندووکردنەوەی هەستی نەتەوایەتی کوردی لەو سنوورە وەکو کۆسپێکی سیاسیی بووە لە هەرێمەکانی باشووری ڕۆژهەڵات، ئەمە نیگەرانی بووە لای تورکیا، ڕۆژنامەی گاردیان لەکاتی قەیرانەکە سەردانی تورکیای کردووە نووسیویەتی: پاڵنەرێك هەیە لای تورکان حەز لە موسڵ بکەن، ئەوانە دەترسن لە سایەی کارگێڕیی و سەرپەرشتیاری ئێمە دڵفراوانییەك درووست ببێت و ببێتە پەناگە بۆ جوڵانەوەی نەتەوایەتی کورد، کە گەورەترینو دووەم کەمینەی ناو ئەو سنوورەن[246].

---

[244] - Oison, p.43-45.

[245] - FO,424/262 Teleg No,331.28 April 1925, Lindsay to Chamberlain.

[246] - Manchester Guardian, 11,June 1924.

شایانی باسە مێژوونووسی بەریتانی بەناوبانگ ئەرنۆلد تۆینبی لە ساڵی (1925ز) سەردانی تورکیای کردووەو هەمان نائارامی تورکانی باس کردووەو دەڵێ: (تورکیا ئامادەیە واز لە ئیمتیازاتی پەترۆڵی خۆی بهێنێت بۆ بەرژەوەندی حکومەتی بەریتانی، ئەگەر ئەوان کورد بۆ تورکیا لێبگەڕێن)[247]. لندسی و هەندێ لە بەرپرسانی بەریتانی بەجدی وتووێژیان لەسەر ئەمە کردووە، سەبارەت بە تورکیا موسڵ کێشەیەکی کوردییە و وا دەبینن لەسەر ئاسایشی نەتەوەییو بەرژەوەندییەکانی تورکیا کورد مەترسییەکی گەورە درووست بکات لە ویلایەتی موسڵ[248].

بەرپرسانی تورك ئەوکات بە ئاشکرا نەیاندەوت کێشەی موسڵ بۆ ئەوان کێشەی ئاسایشەو هەر مەسەلەیەکی تری وەکو پەترۆل پەیوەندیی پێوەی نییە، یان بایەخی پلەدووی هەیە، عیسمەت پاشا لە لۆزانەوە برووسکەی بۆ حوسێن بەگی جێگری سەرۆك وەزیران ناردووە دەڵێ: (کێشەی موسڵ بۆ ئێمە کێشەی نەتەوەییە و بۆ ئەوان کێشەی پەترۆڵ)[249]، لە وتارێکیدا لە بەرانبەر ئەنجومەنی باڵای نیشتیمانی لە ساڵی (1923ز) دەڵێ: (ئەگەر ئەوان هەر پڕۆژەیەکی گرنگی پەیوەست بە بەرژەوەندی ئابوورییان بەدەستەوە بێت وەکو بارێکی نائاسایی زەمانەی پێویست دەدەین... با شاری موسڵ بپارێزن، پەترۆڵ بۆ ئەوان بێت، هەمان بەشی ئەوانی تری لێ دەدەین، بیدەن بە ئێمە، بەڵام ویلایەتی موسڵ بەشێکە و ناپچڕێ لە خاکی نیشتیمان)[250]، لە (23)ی ئازاری ساڵی (1923ز) جێگری سەرۆکوەزیران لە بەرانبەر ئەنجومەنی باڵای نیشتیمانی جەختی دەکردە سەر هۆکاری کوردی بۆ ویلایەتی موسڵ و بە خاڵێکی بایەخداری داناوە، دەیوت بەریتانییەکان هەوڵی دابڕینی کورد دەدەن لە تورك، کە هەردووکیان

---

[247]- -Ankara and British Empire in East), 686-687, Toynbee has expressed similar views on Mosul dispute in survey of Intercalation Affairs Vol.25. 1927. The Islamic World Slnce Peace Settlement, London 1928, p.471-521.

[248] - Times (London) 12 February 1926 (Iraq and Kurds). H.C. Parliamentary Date 189: 2100.

[249] - Ed. Bilal, Simsir, Lozon Teleqraflani, I;2 Vols, (Ankara: Turk Tarih Kurumu Basimevi , 1990) No, 291, 6 January 1923, 340-342.

[250] - TBMM, Gizli Celse Zabitari, Cilt,3. 2February 1923,S, 1923.

یەك چارەنووسن[251]، لەسەر هەمان بابەت "ئوم رەزاق" نمایندەی ویلایەتی ئەرزرۆم لە پەرلەمان دەڵێ: (لە پەیماننامەی سیڤەر بەریتانییەکان بەڵێنی زۆر شتیان بە کورد دا، کە پەیوەست بوو بە دەوڵەتی کوردی، بەڵام ئەوان نوشستیان هێنا... ئەوانە جارێکی تر بۆ هەڵوەشاندنەوەی یەکێتی نیشتیمانیمان هەوڵی دروستکردنی قەوارەی کوردی دەدەن لە موسڵ... دەتوانین پەترۆڵیان بدەینێ بەڵام کورد نا)[252]، سیری (Sirri) نمایندەی ویلایەتی ئۆزمیر لە لێدوانێکیدا زۆر بە روونیو ئاشکراتر لەسەر موسڵو بابەتە پەیوەندیدارەکانی کێشەی کوردی دەڵێ: (بەریتانییەکان بە تەنیا لەبەر هۆکاری ئابووری بایەخ بە نمایندەی ئۆزمیر نادەن، ئەوان دەیانەوێت تۆوی دووبەرەکیو ناکۆکی لە ناوجەرگەی خاکی ئیسلامیدا بچێنن، لە دوای دروستکردنی حکومەتی کوردی لە ویلایەتی موسڵ کوردەکانی ئێرانیش هانبدەن بلکێن بە ئەوانەوە، بەڵام ئەگەر کوردەکانی تورکیا بانگ بکەن بۆ لکاندنی بەو قەوارەیەوە، ئەوا هەموو ئەو قوربانییە گەورەیەی لە ڕۆژانی سیڤەرەوە داومانە تا ئەمڕۆ بە فیڕۆ دەچێت)[253].

هەرچونێك بێت بەرپرسەکانی تورك لەگفتوگۆکانی لۆزان هۆکاری پەترۆڵیان لە لابیر نەکردو لێی بێئاگا نەبوون، هەوڵیان داوە وەکو کارتی فشار بەکاری بهێنن، وەکو نەرمینواندنی راستەوخۆ لە وتووێژ لەگەڵ بەریتانییەکان یان لەگەڵ لایەنی سێیەم، تورکیا هەوڵی داوە بۆ دووبەرەکینانەوە لە نێوان سوێندخوران بۆ ئەوە فشار بخاتە سەر بەریتانیاییەکان. لە سەرەتای وتووێژەکانی لۆزان عیسمەت پاشا بە لۆرد کیرزۆنی وت: (دەوڵەتەکەی لەو شەڕە کاولکارە دەرچووەو پەترۆڵی ویلایەتی موسڵ کەرەستەیەکی بەنرخە لە بنیاتنانەوەی تورکیا، ئەو بیانووەو واقیعی هەژاریەتی تورکیا، کە چەند پێویستی بە پەترۆڵ هەیە لە چەندین بۆنەدا لە لۆزان باس کراوە)[254]. لەگەڵ ئەوەدا سووربوونی تورکیا لەبەکارهێنانی پەترۆڵ وەکو کارتی پشتیوانیو هاوکاری لە بابەت مەترسییەکانی ئاسایش زیاترە لە پەترۆڵ، کیرزۆن لە نامەیەکی فەرمیدا لە لۆزانەوە بە

---

[251] - TBMM, Gizli Celse Zabitari, Cilt, 4.4-5.

[252] TBMM, Gizli Ceridesi Cilt,3.5.163-.

[253] - TBMM, Gizli Ceridesi Cilt,4. 5.112.

[254] Lozan Telegraflar, 1.546-.

سکالاوە دەڵێ: (لە ڕێگەی هەڕەشە یان قەناعەتهێنان هەوڵە زۆرەکانی عیسمەت پاشا بێئاکام بوو لەسەر ویلایەتی موسڵ، لەگەڵ ئەوەدا ئەو ناوچەیە پەترۆلی تیدایە... دوای ئەوەی زانی سەرناکەوێ وەکیلەکانی پشت منەوەی نارد کە هەندێ لەوانە تەواو بێویژدانن‌و ئەمینداری ئێمە نین... پەیوەندیی کردووە بە دوو کەس لە نوێنەرانی پەرلەمان "واگسن روتر فۆردو میزوبانیت" هەردووکیان قسەیان لەگەڵ کراوە لەسەر وازهێنان لە پەترۆڵ و چارەنووسی ناوچەکە لە ژێر ئینتیدابی بەریتانییی[255]. عیسمەت پاشا قسەی لە هەمان بابەت کردووە، بەوەی لەگەڵ سەرۆکی بەڕێوەبەرایەتی ئەنجومەنی نوێنەران‌و لەگەڵ چەند کەسێکی خاوەن بەرژەوەندی لە بەرهەمهێنانی پەترۆڵ، کە پەیوەندییان بە حزبەکەی ئەوەوە هەیە "واتە پارتی کرێکارانی بەریتانی"و لەگەڵ پیاوە کاراکانی بەریتانی گەیشتۆتە چەند پەیماننامەیەکی کاتی، ئەوانە بەڵێنیان پێداوە فشار بخەنە سەر حکومەت بۆ گرنگیدان بە ئاسایشی تورکیا لە ویلایەتی موسڵ‌و دان بنێن بە هەموو سنووری تورکیای تازەی ناو بڕوانامەی نەتەوەیی[256].

هەڵوێستی ستراتیژی تورکیا لێردا بەدیاردەکەوێ، کە ئامادەی گۆڕینەوەی ویلایەتی موسڵ بووە بە پەترۆڵ، لە چەندین بۆنەدا عیسمەت پاشا هەوڵی داوە کیرزۆن قەناعەت پێبکات، کە ویلایەتی موسڵ بداتە تورکیا لە بەرانبەردا تورکیا بە پێی ڕێنومایییەکانی پسپۆڕانی نەوتی بەریتانی لەو هەرێمە مامەڵە بکات[257].

لە بارەی سەرنەکەوتن تورکیا هەوڵی دا لایەنی سێیەم قەناعەت پێبکات بۆ هاوبەشی لەو ململانێیە، بۆیە لە ڕێگەی ئیمتیازاتی شستر (Chester) هەوڵی داوە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بێنێتە ناوەوە کە مافی دۆزینەوەی نەوتیان هەبێت بە ناوی بانکی عوسمانیی ـ ئەمریکیی، ئەو هەنگاوەش سەرنەکەوت، چونکە بەریتانیا لە ساڵی (1914)وە خاوەنی کۆمپانیای نەوتی تورکییە و ئیمتیازی لە کانە نەوتەکانی موسڵدا هەبووە، بە کردەوە هاوبەشی هەبووە لەگەڵ زۆربەی کۆمپانیاکانی نەوتی ئینگلیزیو

[255] - DBFP, 1/18, 445-446, Cited Lozan Telegraflar,1.380.

[256] -Lozan Telegraflari INO, 177, 3, January 1923, Ismet Pasha to Rauf Hussein, 1: 319

[257] -Hassan Yizldiz, Fransiz Belqelerigle Serve London- Mosul Ucgeninde Kurdistan (Istanbul: Koral, 1990) 318-320, Reza Nur 2,251-253

ئەورووپی، بۆیە نووشستی ئیمتیازاتی شستر (Chester Concessions) بە دیار کەوت[258].

## کێشەی موسڵ لە کۆمەڵەی گەلان

لە قۆناغی یەکەمی وتووێژەکانی لۆزان بە دیار کەوت هەردوولا نەیانەوێ لەسەر کێشەی ویلایەتی موسڵ نەرمی بنوێنن، بۆیە لە (4)ی شوباتی (1923) رێککەوتن بابەتی موسڵ لە کارنامەی گفتوگۆکان دەربهێنن. چونکە لە وتووێژی دووەمی لۆزان، کێشەی موسڵ وەکو کۆسپی بەردەم واژۆکردنی رێککەوتنامەی نێوان تورکیاو دەوڵەتە سوێندخۆرەکان مایەوە. لەگەڵ برگەی دووەمی رێککەوتنامەی لۆزانی (14)ی تەموزی ساڵی (1923) تێکەڵ کرا، بەوەی رێککەوتن نۆ مانگ چاوەڕوان بن لەسەر رێوشوێنی راستەوخۆ بۆ چارەسەرکردنی کێشەکە لە نێوان بەریتانیا و تورکیا[259].

لە دوای ئەو نۆ مانگەش نەگەیشتنە چارەسەر، لەبەر ئەوەی لە ئابی ساڵی (1924) حکومەتی بەریتانی بە کۆمەڵەی گەلانی راگەیاند، کە هەردوولا سەرکەوتوو نەبوون، لیژنەی کۆمەڵەی گەلان بڕیاری دا هێلی برۆکسل (Brussels Line) وەکو جیاکەرەوە بە سنووری نێوان تورکیاو عێراق بمێنێتەوە هەتا دەگەنە چارەسەرێکی کۆتایی لەسەر موسڵ، بڕیاریان دا لیژنەیەك بە ناوی یەکلاکردنەوەی راستییەکان دابنێن‌و سەردانی ناوچەکە بکات هەتا بگەنە بڕیارێك لەسەر بارودۆخی ویلایەتەکە[260].

---

258 - William Strivers, Supremacy and Oil Iraq, Turkey and the Anglo-American World Order 1918-1930 (Ithaca= Cornell Univ, Press. 1982) 168-169 Demiurges= 76-78

259- For text of the treaty see: Great Britain Partiament, Foreign Office Tearty of Peace with Turkey and Other Instruments Signged at Lau same on July 24, 1923, and subsidiary Documents Foreign part of Turkish Peace settlement (CMD 1929) London; HMSO, 1923) Article 3,of the Treaty notes.

دەبێت سنووری نێوان تورکیا و عێراق لە رێگەی رێوشوێنی دۆستانەی تورکیا و بەریتانیای گەورە لە ماوەی نۆ مانگ چارەسەر بکرێت، ئەگەر لەو ماوە دیاریکراوە نەگەیشتنە ئاکام، ئەوە ناکۆکییەکە دەدرێتە کۆمەڵەی گەلان.

260 - League of Nations, (Minustes of the 30th session) Official Journailal 11 Oct, 1924, 1465..64-65

حکومەتی تورکیا و عێراق "بە پشتیوانی بەریتانیا" پێش گەیشتنی لیژنەکە بۆ ویلایەتی موسڵ لە شوباتی ساڵی (1925ن) بۆ چاککردنو بە راستکردنەوەی هەڵوێست لە بەرانبەر کورد چەند هەنگاوێکیان گرتەبەر، لە کانوونی دووەمی ساڵی (1925ن) وەزیری ناوخۆی عێراقی گەشتێکی کرد بۆ هەرێمی باشووری کوردستانو بەڵێنی دا، ئەگەر ئەو هەرێمە لەگەڵ عێراق بمێنێتەوە ئەوە دان بە مافی نیشتیمانی کورد دا دەنرێ[261]. ئەمە کۆنگرەیەکی بەرپرسە سیاسییەکانی بەریتانی بەدواداهات، کە لە هەولێر بۆ کوردیان ئامادە کردبوو، لەو کۆنگرەیە بڕیاردرا:

1ـ ئەندازەیەك لە قەرەبووکردنەوەی ئەو هۆزە کوردانەی زیانیان لێکەوتووە لە ئەنجامی هێرشی هێزەکانی بەریتانی و عێراقی بۆ وریاکردنەوە کورد کردبوویانە سەر شێخ مەحمود.

2ـ مەلیك فەیسەڵ سەردانی ناوچەکە بکات، هەتا لەسەر مافی نەتەوایەتی لە چوارچێوەی عێراق زەمانەت بداتە کورد.

3ـ سەرپەرشتیارەکان "دەسەڵاتدارانی ویلایەت" لە هەرێمە کوردییەکان دەسەڵاتی زیاتریان هەبێت بۆ ئاسانکاری کاروباری هاوڵاتیان.

4ـ بەخێرایی لە قوڵایی کوردستان هێڵی ئاسن دابنرێت، بۆ ئەوەی کورد باوەڕ بکات بەریتانیا مەبەستی نییە ناوچەکە بەجێبهێڵێت.

5ـ لە کۆتاییدا رێککەوتن لەسەر هەندێ رێوشوێنی بەپەلە بۆ بەرەنگاری هەر هەوڵێکی تورکی، کە لە ماوەی کارەکانی لیژنەی بەدواداچوونی لیژنەی کۆمەڵەی گەلان ئارامی لە ناوچەکە تێك بدات[262].

---

لیژنەی بەدواداچوون پێك هاتبوو لە تەلکی سەرۆك وەزیرانی پێشووی هەنگاریا، وای سین، وەزیری سویدی لە بوخارست، باولس کۆلۆنێلی یەدەگ لە سوپای بەلجیکی، هەروەها لیژنەکە لە لایەن بەریتانییەکانو تورکانەوە هاوکاری دەکرا.

[261] - BHCF, 13/14 Events in Kurdistan, Vol, 5, (Minister of Interior s, Tour of Kurdistan) 2 Nov,1924, FO,371/10068, Intelligence Report No,22, Iraq 11, November, 1924.

[262]-- FO,371/10068, Intelligence Report, No, 22, Iraq, Nov, 1,1924, BHCF,13/14, Events in Kurdistan Vol. 5.Desp. No,4455, Oct,18,1924.

سەرەڕای ئەم هەوڵانە هەواڵگری بەریتانی بۆ پێشخستنی کاروباری موسڵ توانی پەیوەندی بکات بە "یانەی ئازادی" لە باشووری ڕۆژهەڵاتی تورکیا بۆ ڕێکخستنی یاخیبوونو هەڵگەڕانەوە لەناو (18) یەکەی هێزەکانی پیادە لەسەر سنوور، ئەمەش لەو کاتە لێدانێکی توندبوو لە نەخشەی تورکیا، کە بەنیازی پێشڕەوی بوو لەکاتی بەدواداچوونی کارەکانی لیژنە لە ویلایەتی موسڵ[263].

بەریتانیا پڕوپاگەندەی ئەوەی بوو کێشەکە تەنیا ناکۆکیی دیاریکردنی سنوورەو پێویست بە ڕاپرسی ناکات[264]، لەگەڵ ئەوەدا لیژنەی لێکۆڵینەوە لەگەڵ تورکیا ڕێککەوت، کە ئەو ناکۆکییە کورت هەڵنەهاتووە لە دیاریکردنی سنوور، بەڵکو مەسەلەی چارەنووسی کۆتایی باری ویلایەتێکە، بەدواداچوونێکی دیاریکراوە لە جیاتی ئەنجامدانی ڕاپرسی، بۆیە چاوەڕوان دەکرا ئەو ڕاپرسییە تووشی کۆسپی هونەری وابێت چارەسەر نەکرێت[265]. لە قۆناغی سەرەتای لێکۆڵینەوە تورکیا پێی چاك بوو، وەکو ڕێگە چارەیەك بۆ ناکۆکیی ڕاپرسی لە ویلایەتەکە بکرێت[266]، بەو بیانووەی زۆربەی دانیشتوانی ویلایەتی موسڵ نەخوێندەوارن و لە پیاوانی هۆزەکانن، شێوازێکی گونجاو نییە بۆ ئەنجامدانی ڕاپرسی بەریتانیا، بەرهەڵستی ئەو رایە بووە، کە هۆزەکان لەو خاکەی ناکۆکی لەسەرە دەورووژێنو ئاژاوە درووست دەبێت، دواتر لە پێناو گەیشتن بە بڕیارێك لەسەر باری ئەو ویلایەتە دانیشتوانەکەی دەنگیاندا[267].

بەریتانیا بە قەناعەتەوە بەرهەڵستی ئەنجامدانی ڕاپرسی بووە، هەستیان کردووە زۆرینەی دانیشتوانی ویلایەتەکە ئاشکرا دەبن، کە کوردنو دەیانەوێت بگەڕێنەوە بۆ

---

[263] - Air 23/411, Desp, No, 1/929 AHQ, B.F, Iraq Baghdad, Nov, 5,1924, to Advisor to Minister of Interior Desp.No, D 16, Nov, 8,1924, 550, Baghdad to AHQ, FO,371/10068, Intelligence Report, No, 22, Oct, 21,1924.

[264] -League of Nations, Question of Frontier Between Iraq and Turkey 17-18: Foreign Policy Association, Editorial Information Service Foreign Policy Report, Vols, 1-2, 1925-1926 (New York, 1966) p.9.

[265] - League of Nations, Question of Frontier Between Iraq and Turkey.p.39.

[266] - League of Nations, Question of Frontier Between Iraq and Turkey.p.18-19.

[267] - C.J. Edmonds, Kurds Turks and Arabs. (London 1957) p.402.

سەر تورکیا، بەرپرسەکانی بەریتانی لەو بارەدا پێداگربوون، کە کورد تەنیا رێزی هێزو دەسەڵات دەگرێت. ئەدمۆنس دەڵێ: (کوردی سادە پێی وایە ئەگەر دەنگ بدات لە دژی بەریتانیا لەوانەیە لێپرسینەوەی لەگەڵدا بکرێ، ئەگەر لە دژی تورکیا دەنگیدا سزا دەدرێت)[268]، لۆرد تامسۆن سکرتێری داگیرگەکان لەسەر هەمان مەترسی دەڵێ: (چونکە کورد بۆ بەرژەوەندی تورکیا دەنگ دەدات، بڕوای وایە پەیوەندیمان لەگەلیدا باش بێت)[269].

کلاك جۆن سۆن هۆکارێکی تری دیاری کردووە لە دوودڵی بەریتانییەکان لە ئەنجامدانی راپرسیو دەڵێ: (تێڕوانینی بەریتانیا پێچەوانەیە لەگەڵ ئەوەی کیرزۆن، ئەویش بە تەواوی سوورە لە سەر قسەی خۆی، پێویستە راپرسی ببێت، ئەوکات دەبێتە کارەسات بۆ سیاسەتی بەریتانی، زۆربەی کورد لە ویلایەتی موسڵ سەربەخۆییان دەوێت، یان هیچ نەبێت مسۆگەربوونی حوکمی زاتی، بەڵام هەرچۆنێك بێت بە دەسەڵاتی عەرەب رازی نابن[270].

ئەو تێڕوانینەی جۆن سۆن لە هەڵوێستی بەریتانییەکان لەسەر راپرسی لە لایەن ئۆگاردین یاریدەدەری راوێژکاری بەریتانیو یاوەری وەفدی لیژنەی لێکۆڵینەوە پشتگیری دەکرێ، کە نووسیویەتی: ئەگەر ئارەزووی کورد بە هێند وەربگیرێ، ئەوە ژمارەیەکی زۆریان دەریان بڕیوە لە سایەی بەریتانیا، یان کۆمەڵەی گەلان کارگێری خۆیەتییان دەوێت[271]. سەرەڕای ئەمە لە تەموزی (1925) راپۆرتی لیژنەکە جەختی لەسەر هەمان تێڕوانین کردۆتەوە دەنووسێت: ئەگەر رەگەز هەژمار بکرێت، وەکو تاکە هۆکار بۆ چارەنووسی ویلایەتەکە ئەوەیە دەوڵەتی کوردی

---

[268])-- South Kurdistan) Journal of Royal Central Asian Society 12, 1925, p.213.

[269] - سەرچاوەی پێشوو، ل2130214.

[270]- Johnson (The Kurdish Question A Study in Nationalism) unpin. M.A. Thesis, Georgetown Univ, 1954.p.809

[271] - FO/108235, Dsp. No, E2731/ 26/65, May 9, 1925. Dobbs to Amery Enclosure No, 1, The Final Diary of the British Assessor to the Commission of the League of Nations

ڕەوابێت[272]، ئەوەی جێی بایەخە تورکەکان هیچ مەترسیان لەو ئەگەرە نەبووە، کە کورد دەوڵەتی تایبەت بەخۆی هەڵبژێرێت، بەشێکی هۆکاری ئەمە ئاگاداری تورکەکانە بەوەی کورد لە ناو خۆیاندا ناکۆکن و دەستەبژێرێکی بچووك بەتەنیا لە سلێمانی هەیە، کە دەڵێن ئەوانیش چەند سەرکردەیەکی لاوازنو هەریەك سەر بە شوێنێکن[273]. گەرچی تورکەکان لەکاتی دەنگدان بۆ بەرژەوەندی تورکیا بەسەر دوولادا دابەش بوون، ئەگەر راپرسی ئەنجام بدرایە ئەوە زیادڕەوی زۆریان هەبوو لەسەر ژمارەی تورکمانەکانی دانیشتووی ویلایەتی موسڵ، بەڵگە بۆ ئەمەش، تورکیا بە بەردەوامی پڕوپاگەندەی دەکرد ژمارەی تورکمانەکانی سلێمانی (32/900) کەسە، کەچی راپۆرتی لیژنە دەڵێ: ژمارەی تورکمان لەوێ تەنیا دوو کەس بووە[274].

ئەو هۆکارە جیاجیانەی باس کران وەکو هۆی نارەزایی بەریتانییەکان لە ئەنجامدانی راپرسی لە ڕاستییەوە نزیك بوو، بەریتانییەکان دەڵێن: زۆربەی پیاوانی هۆزە کوردییەکان نەخوێندەوارن، بۆیە ناتوانن بەشداری لەو راپرسییە بکەن، یان ئامرازێکی پێویست لەبەردەست نییە بۆ ئەنجامدانی راپرسی، بەو شێوەی دانیشتوانی خاکی ململانێ ئارەزووی دەکەن، بۆیە پێویستە هەڵوێستی بەریتانی فەرامۆش نەکەین. لەگەڵ ئەوەدا سەرنج بدەین حکومەتی عێراقی لە ساڵی (1921ز) راپرسی لە هەموو عێراقدا بۆ خۆی ئەنجامدا، بۆ هەڵبژاردنی فەیسەڵی کوڕی حوسێن بۆ پاشای عێراق.

ئەگەر لەسەر ئەو شێوەیە بێت بۆچوونی تورکیاش راستو درووستە، ناوچەکە ملیونێك کەسی تیایە، ئەوەندە دێنێت بۆ دیاریکردنی چارەنووسی راپرسی تیا ئەنجام بدرێت، راستە هەندێ مەترسی هەبووە لای حکومەتی بەریتانی لە ئاکامەکانی راپرسی،

---

[272] –League of Nations, Question of Frontier Between Iraq and Turkey.p.78.: BHCF, 13/14 Events in Kurdistan, Vol. 5.Conference on the Kurdish Question. Feb.10, 1926 Baghdad.

[273] – League of Nations, Question of Frontier Between Iraq and Turkey.p.78.: BHCF, 13/14 Events in Kurdistan, Vol. 5.Conference on the Kurdish Question. Feb.10, 1926 Baghdad.

[274] – League of Nations, Question of Frontier Between Iraq and Turkey.p.77-78..

کە داوای حکومەتێکی کوردی بکەن، داوای کۆبوونەوەیەکی میللی لەو جۆرەی کوردان لە داهاتوو، دەسەڵاتی بەریتانی لە عێراق نایەڵێ. ئەوانە دوودڵ بوون کە پێکەوە بەستنی هەموو پارچەکانی کوردیان پێ چاك بووە.

لەگەڵ گەیشتنی لیژنەکە بۆ کوردستان لە شوباتی (1925ن) چالاکی ئەو کۆمەڵانەی دۆستی تورکیا لەسەر سنووری ویلایەتەکە زیاد بوو، لیژنەیەکی نهێنی دۆستی تورکیا بۆ کاروچالاکی لە سەرداره تورکمانه ناسراوەکانی کەرکووك و هەولێر، وەکو فەتاح بەگ و نازم توتنچی زادە درووست بوو، ئەم دوانە ساڵی (1924) لە ئەنقەرە نمایندەی ویلایەتەکە بوون لە ئەنجومەنی باڵای نیشتیمانی، پێگەی خۆیان بەکار دەهێنا بۆ هاندانی ئەو کەسانەی دۆستی تورکیان، هاوسۆزی خۆیان لەگەڵ تورکیا رابگەیەنن[275].

ژمارەیەك لە سەردارەکانی کورد کەوتنە بەرەنگاری ئاشکرای دەسەڵاتدارانی بەریتانی، بەشێکی رووبەڕووبوونەوەی کورد لەبەر مەترسی کورد لە تورکیا، نەوەکو بگەڕێتەوە و تۆڵەیان لێبکاتەوە، ئەوکات تورکیا بەیاننامەیەکی لە هەولێر بڵاوکرەوە کە تێیدا هاتبوو:

(ئەی مسوڵمانانی کورد، ئەوانەی حکومەتی ئینگیز وا دەزانێ رێزی ئایینو موحەممەد نازانن، بۆ مەبەستی شەڕ و دوژمنکاری لە نێوان ئەو دوو کۆمەڵەیە "کوردو تورك" حوکمی زاتیانی داناوە، ئەمەش بەتەنیا بۆ خزمەتی بەرژەوەندی خۆیانە.... بێ ئاگان کە کوردو تورك برای ئایینی یەکترنو یەك ئومەتن. کاتێك بەریتانییەکان بەم راستییەیان زانی حوکمی زاتیان هەڵوەشاندەوە و بە تۆپ ناو شاری سلێمانیان بۆردومان کرد، منداڵەکانیان کوشتنو شاریان وێران کرد.... تورکان دەگەڕێنەوە بۆ ئەوەی ئێوە رزگاربکەن لە کافران... بە لیژنەکە بڵێن: ئێمە مسوڵمانین، پێکەوە لەگەڵ مسوڵمانە تورکەکان دەژین... ئەوانەی خزمەتی ئیسلام دەکەن، نامانەوێ لەگەڵ عەرەب و کافران بژین،... ئەگەر هاوکاری حکومەتی عێراق بکەن دەبنە هاوپەیمانی عەرەبو کافران.... پەشیمانی دادتان نادات[276].

[275] - Air, 23/163, Dest, No,1726, May 6,1925

[276] - Air 23/308, trans of undated Letter distributed by a certain Hashim Nahid Arbili..

ئەم بەیاننامەیە هەردوو لایەنی وورووژاندووە، سۆزی ئایینی و ئاگاداکردنەوە لە ئاکامە مەترسیدارەکانی پشتگیریی لە دەسەڵاتدارانی بەریتانی، هاوکات لەگەڵ ئەم بەیاننامەیە پڕوپاگەندە بڵاودەکرایەوە. بۆ نموونە دەیانوت: شێخ مەحمود جارێکی تر سلێمانی داگیر کردەوە، ژمارەیەکی هێزەکانی تورکیا لەڕێگەی سنوورەوە هاتنە ناو زاخۆ[277]. وای لێهات ئەمە رەنگدانەوەی گەورەی هەبوو لەناو دانیشتوانی باکووری عێراق، لە ئازاری (1925) میستەر بێڵ نووسیویەتی: کە هەڕەشە و پڕوپاگەندەکانی تورکیا شوێنەواری بەرچاویان لەسەر کورد هەبووە، زۆر کەس بە هاوکاری "پیاوخراپانەوە" چاویان تێبڕیوە[278]، پەیوەندی تورك بە هۆزە کوردەکانەوە لەسەر سنوور بەتایبەتی لە بادینان بەردەوام بوو، سەرۆکە ئایینی و پیاوماقوڵەکان لە سنوورەکانی باکوور رێککەوتن یاخیبوونی گشتیی مەدەنی رابگەیەنن، ئەمەش لە ڕێگەی باج نەدان بە حکومەتی عێراقی، هەندێك لە سەرۆك کوردەکانی ناوچەکە پەیوەندییان کرد بە فەرماندەیی تورکی لەسەر سنوورو ئامادەیی خۆیان دەربڕی، ئەگەر تورکیا لە سنوور بپەڕێتەوە لە پاڵ تورکیا شەڕ بکەن[279]، لەو ماوەیەدا مستەفا کەمال شۆڕشی دژ بە کەمالی، کە شێخ سەعید لە باشووری رۆژهەڵاتی تورکیا سەرۆکایەتی دەکرد دەقۆستەوە بۆ کۆکردنەوەی نزیکەی پێنج هەزار سەرباز و هێزی نانیزامی لەسەر سنوور[280]، بەدیارکەوت تورکیا سیاسەتی شاڵاوی دوژمنکارانەی گرتبووە بەر بە کۆکردنەوەی ئەو هێزە زۆرە نیزامیە بۆ ئەوی فشار بخاتە سەر دوژمن،

---

[277] -Air, 23/163 Arbil Report No,31,May 1925. FO,371/10837, Confide Teleq No, 305 (Constantinople) April 15,1925 Lindsay to Chamberlain -.

[278] - Burgoyne, 2.369

[279] - Air,23/163 Report. No, 28 May 1925,, FO, 37/10837, Confide. Teleg NO, 305 (Constantinople) April 15, 1925 Lindsay to Chamberlain (2978) p.1950-211: Olson The Emergence Kurdish nashnalism and sheikh Said Rebellion.

[280]- For a detailed account of this revolt, see: Report Olson and, W. Turker (The Sheikh Said Rebellion in Turkey (1925) A Study in the Consolidation of a Develop Institutionalized Nationalism and the Rise of Incipient (Kurdish Nationalism) (Die Welt des Islam’s 18/3-3, (1978), 193-211. Olson Emergence of Kurdish Nationalism Sheikh Said Rebellion.

بەشێك لە هێزە نانیزامیەكانی بۆ لێدانو ورووژاندن بنێرێ بۆ ئەودیو سنوور. ئەم شێوازەی توركیا بۆ ناچاركردنی فەرەنسا بووە بەكشانەوە لە ناوچەی غازی ئەنتاب (Gazianteb) لە رۆژهەڵاتی توركیاو ناچاركردنی یۆنان هەتا لە ئەزمیر دەربچێت. توركیا پێی وابووە ناردنی هێزی چەتە "هێزی نانیزامی" لە پشت سنووری باكوورەوە بۆ هێرش، هاوكاتە لەگەڵ هێرشە پارتیزانییەكانی شێخ مەحمود لە سنووری باكووری رۆژهەڵات، ئەمەش بەریتانییەكان ناچار دەكەن لە ویلایەتی موسڵ دەرچن[281]، هەروەها مەبەست لە كۆكردنەوەی هێز بەدیارخستنی بەرنامەڕێژی توركیابووە بۆ پڕوپاگەندە لەسەر ویلایەتی موسڵ، مستەفا كەمال دەیویست كاریگەری مەعنەوی لەسەر وتووێژەكانی لیژنەی لێكۆڵینەوە درووست بكات[282].

حكومەتی بەریتانی لەلای خۆیەوە پەنای بردە بەر یاریكردن بە كورد، بەر لەگەیشتنی لیژنەی لێكۆڵینەوە بەرپرسەكانی بەریتانیا رێككەوتن لەسەر چەند هەنگاوێك لەگەڵ كورد، لە سلێمانی دۆستەكانی خۆیان هاندا كۆمەڵەی پارێزگاری سلێمانی "كۆمەڵەی نەتەوەیی بۆ پارێزگاری لە سلێمانی" پێك بهێنن، لە رۆژنامەی "ژیانەوە" بۆچوونەكانیان بڵاوبكەنەوە، لە سەروتاری ژیانەوەدا هاتووە: لە ڕابردوو كورد ئازارو مەینەتی زۆری لە دەسەڵاتی توركان چێشتووە، هەروەها ئەو رۆژنامەیە پێداگربووە لەسەر دۆستایەتی كورد و بەریتانیا[283]، لەو كاتەی لیژنەی لێكۆڵینەوە لە سلێمانی بوو ئامادەیی خۆی دەربڕی چاوی بە شێخ مەحمود بكەوێ، كەچی بەرپرسانی بەریتانی رازی نەبوونو پێی یان وابووە چاوپێكەوتنی لەو جۆرە پێگەی شێخ لای كورد زیاد دەكاتو كارەكانی لیژنە لە ناوچەكە ئاڵۆز دەكات.

لە كەركووك سەید ئەحمەدی خانەقای دۆستی توركیایان گرت، بەرپرسە بەریتانییەكان سەرۆك هۆزی تاڵەبانیو ژمارەیەك لە پیاوماقوڵ و ئایینی و كەسایەتییە

---

[281] - FO.371/10837, Teleg. No, 511, Confide June 30, 1925, Horace to Chamberlain, Therapies: 108826, (Appreciation of the Situation on Iraq Frontier). Oct,15.1925.

[282] - FO.371/10837, (The Internan Insurrection in the Eastern Vilayets, Press, Summary) April 15 to 21, 1925

[283] - بڕوانە: ژمارە 17ی شوباتی 1925

ناودارەکانیان بانگ کرد، هەتا لە بەرانبەر لیژنەکە نارەزایی دەبڕن لەهەڵوەشاندنەوەی خەلافەتی تورکان. لە هەولێریش هەمان ڕێوشوێنیان گرتەبەر، دەسەڵاتی فراوانیان دایە کابتن "لیون"ی ئەفسەری سیاسیی لە موسڵ هەموو ئەوانەی دۆستی تورکیا بگرێو دووریان بخاتەوە[284]. لە لیوای موسڵ عەرەبە مسوڵمانەکانو گاورەکانو کوردە یەزیدییەکان لە زۆربەی کاتەکاندا سووربوون لەسەر یەکگرتن لەگەڵ عێراق، بەهۆی هەڵوەشاندنەوەی خەلافەت بەشی زۆری کوردەکان لە مستەفا کەمال دوورکەوتبوونەوە[285]، ئەو سەرۆکانەی دۆستایەتی خۆیان بۆ تورکیا ئاشکرا کردو باجیان نەدا گیرانو دوورخرانەوەو گوندەکانیان لەلایەن سەربازە کرێگرتەکانەوە سوتێنران و بۆردوومان کران، شاڵاوی سەرکوتکردن بەشێوەیەکی بەرفراوان دەستی پێکرد، هەتا یەکێکی وەکو شێخ ئەحمەدی بارزان لە (10)ی مانگی ئاداری (1925ز) بۆ حکومەتی عێراقی نووسیبوو: (ئەگەر ئەو شاڵاوە نەوەستێ ژمارەیەك لە هۆزەکان ناچاردەبن بە کۆمەڵ بەرەو تورکیا کۆچ بکەن)[286]، شاڵاوی گرتنو دوورخستنەوە لە ویلایەتی موسڵ گەیشتە رادەیەك لیژنەی لێکۆڵینەوە سکاڵانامەیەکی خستە بەردەم بەرپرسانی بەریتانی و حکومەتی عێراقی[287].

لە ماوەی ململانێ لەسەر موسڵ حکومەتی بەریتانی بە بەراورد لەگەڵ تورکیا لە پەیوەندی زیاتر دابووە لەگەڵ کورد. لەساڵی (1925ز) هەندێ لە کوردان بەرژەوەندیی خۆیان لەگەڵ حکومەتی عێراقیدا دەدیتەوە، ئەمەش لە ڕێگەی هەڵبژاردنی نوێنەرانی کورد لە ناوچە کوردییەکان بۆ ئەنجومەنی نوێنەرایەتی عێراقی، سەرەڕای ئەمە مەلیك فەیسەڵ بەڵێنیدا، ئەگەر کورد لەگەڵ عێراق بمێنێتەوە مافی

---

[284] - D.O, 371/10825, (Extracts from the Diary of Liaison Officer to the frontier Commission Period 17th to 21st feb, 1925) Residence (Baghdad) March 15, 1925, to S.S, Col..

[285] - FO,371/10098, Intelligence Report Iraq, No, 23, 13 November 1925, Intelligence Report, No, Dec, 11,1925

[286] - FO,371/10837 Teleg. No,305 15,April 1923, Lindsay to Chamberlain 10825 End sure No, 1 in No, 1, May 9,1923, Dobbs to Amery.

[287] - League of Nations Question of Frontier, p.7-9.

ڕۆشنبیرییان بۆ دابین دەکات. کەناڵەکانی ڕاگەیاندنی عێراقیو بەریتانی کوردیان ئاگادارکردەوە، کە ئەگەر بچێتە پاڵ تورکیا ئەوە مافە نیشتیمانییەکانی لەدەست دەدات، کە حکومەتی عێراقی بەڵێنی داوە[288]. دوایی بۆ دڵنیا کردنەوەی پیاوماقوڵانی شار، کە بەشێوەیەکی نافەرمی زەوییان بەدەستەوە بووە، حکومەتی بەریتانی بۆ ڕاکێشانی بە لای خۆیدا داوای کرد لە کاتی هاتنی لیژنەکە ئەو تۆمارانە هەڵنەداتەوە[289].

بەڵام ڕووداوی کاریگەری بەرچاو لەسەر هەڵوێستی کورد لە ماوەی ناکۆکی لەسەر موسڵ شۆڕشی (1925ز) بوو، لە کۆنگرەی لۆزانەوە تورکەکان بە هەموو تواناوە سووربوون لەسەر هاوڕەگەزیەتیو هاودینی کوردو تورکو بانگەشەی پەیوەندی بەهێزو هەمیشەیی ئەو دوو نەتەوەیە. شۆڕشی شێخ سەعید لە نیسانی (1925ز)و سەرکوتکردنی بەو شێوە دڕندانەیە ئەو بنەمایانەی هەموو لەباریەك برد، کە تورکیا لە ویلایەتی موسڵ پڕوپاگەندەی بۆ دەکرد، بەتایبەتی ئەو شۆڕشە لە کاتێکی گونجاودا بوو بۆ پشتگیری لە پڕوپاگەندەکانی بەریتانیا، کە کورد دەسەڵاتی تورکیایان ناوێ[290].

لەوکاتەی لیژنەی لێکۆڵینەوە سەرقاڵی گەڕان بوو بە ناوچە سنوورییەکان، بە هەزاران پەناهەندەی کورد سنووری تورکیایان دەبەزاند بۆ ناو خاکی عێراقو لەگەڵ خۆیان سەربووردەی دڕەندەیی تورکیایان دەگێڕایەوە لە دژی کورد، ئەمەش لەناو هۆزە کوردییەکانی سەرسنوور زیانی گەورەی بە کەسایەتی تورکیا گەیاندبوو، کە زۆربەیان لایەنگری تورکیا بوون[291]، هەروەها ڕۆژنامەی "ژیانەوە" هەواڵی کوشتاری بەرفراوانی تورکیای دەگێڕایەوە لە دژی کوردان، لەگەڵ هەواڵی دادگایی و لەسێدارەدانی شێخ سەعید و هەندێ لە کوردانی باکووری کوردستان، ئەو ڕووداوە

---

[288] -Iraq Administrative Report for Year 1927,p.22-23: Edmonds, 401 .

[289] - Iraq Administrative Report for Year 1927,p.97

[290] - FO,371/10869, Desp 6 March 1925, 18824, (Reply to Question XXIII of The Question Sent to High Commissioner by His Excellency President of the Council of the League of Nations under the Cover of his Letter dated 21st January 1925.(

[291] - Edmonds, p.426-427

Se: No,19,Vol, 1,March 2, 1025, No, 35,Vol, 1, 13 August 1925: No, 39,Vol, 2,10, Sept, 1925.

بۆچوونی شێخەکانی ئایینی گۆڕی کە لە ڕابردوودا لە کێشەی ویلایەتی موسڵ بەرگرییان لە هەڵوێستی تورکیا دەکرد[292]. لەڕاستییدا مستەفا کەمال بە هەڵوەشاندنەوەی خەلافەتو سەرکوتکردنی شۆڕشی شێخ سەعید پڕوپاگەندەکانی خۆی زیندە بەچاڵ کرد لە ویلایەتی موسڵ، "جوەیدە" لەوبارەیەوە دەڵێ: سەرهەڵدانی شۆڕشی شێخ سەعیدو سەرکوتکردنی بەم دڕندەییە، بە دڵنیایەوە بە چاکە شکایەوە بۆ چارەسەری مەسەلەی موسڵ بۆ بەرژەوەندیی بەریتانیا[293].

## کورد و بڕیاری دادوەری موسڵ

بە پشتبەستن بە راسپاردەی لیژنەی دادوەری لە (16)ی کانوونی یەکەمی (1925) ئەنجومەنی کۆمەڵەی گەلان بڕیارێکی گەلاڵە کرد، ئەویش لکاندنی ویلایەتی موسڵ بوو بە عێراقەوە، ئەو بڕیارە پەیوەست بووە بەکۆمەڵێك مەرج، کە کاریگەری هەبووە لەسەر سیاسەتی بەریتانی بەرانبەر کورد وەکو:

1ـ دانانی هێڵی برۆکسل. وەکو هێڵی یەکلاکەرەوەی نێوان تورکیاو عێراق.

2ـ داوا لە بەریتانیا کرا رێکەوتنامەیەکی تازە لەگەڵ عێراق ئامادە بکاتو ماوەی ئینتیداب درێژ بکاتەوە بۆ بیستو پێنج ساڵ، ئەگەر عێراق بەو پێیەی لە برگەی (1)ی بڕوانامەکەدا هاتووە، ئەگەر پێش ئەو ماوەیەی کۆتایی دێت لە ئەندامیەتی کۆمەڵەی گەلان وەرگیرا.

3ـ داوا لە بەریتانیا کرا تەواوی ئەو رێوشوێنە کارگێڕییانە بخاتەڕوو. کە بایەخی هەبووە بۆ مافی رۆشنبیری دانیشتوانە کوردییەکان، لەگەڵ دابینکردنی جۆرێك لە کارگێڕی خۆیەتی[294].

---

[292] - بڕوانە: ژمارەکانی 19، ب1، 12ی ئازاری 1925، ژمارە 35،ب1، 13ی ئابی 1925، ژمارە 39، ب19. 2ی ئەیلولی 1923

[293] - Wadi Jwaideh (The Kurdish National Movement Its Origins and Development) 2 Voles unpud. Doctoral dissertation, Syracuse Univ, 1960, 2.61.

[294] - League of Nations Decision Relating to the Turco-Iraq Frontier Adopted by the Council of League of Nations Geneva December 16, 1925. Miscellaneous N.17, 1925. (CMD.2562) (London. HMSO, 1925..(

به سەرنجدانێكی ورد لە مەرجەكانی كۆمەڵەی گەلان، بە ڕووی شوێنەواری كێشەی كورد كە لەو ناكۆكیە دەركەوتووە، بانگەواز بۆ دانانی پەیمانێكی تازە، هەتا ببێتە بنەمایەك بۆ پەیوەندی ئەنگلۆ ـ عێراقی لە ماوەی بیستو پێنج ساڵ، بە مەرجی ژمارە (2)ی ڕێككەوتنی بڕیاری دادوەری، ئەمە لە شوێنی خۆی بە هۆكارێك دەژمێردرێت لەلایەن كۆمەڵەی گەلانەوە بۆ مسۆگەری حكومەتی عێراقی، هەتا بڕگەكانی پەیوەندیدار بە مافی كورد جێبەجێ بكات، ئەو مەرجەش لە ڕاسپاردەكانی لیژنەی لێكۆڵینەوە، بە ئەگەری تێپەڕبوونی ماوەی ئینتیداب لە ساڵی (1928)ەوە دووبارە بۆتەوە، هەروەكو لە پەیماننامەی ئەنگلۆ ـ عێراقی ساڵی (1922ز)دا دیاریكراوە، بەبێ زامنكردنی مافی كورد، لە جیاتی دەسەڵاتی عەرەبی دەسەڵاتی توركی هەڵدەبژێرن[295].

لە (13)ی كانوونی دووەمی ساڵی (1926ز) پەیماننامەیەكی تازە لە ناو بەرهەڵستیەكی فراوان لە نێوان عێراق و شانشینی یەكگرتوودا واژۆكرا. بەی ئیسكین "لاسكین"ی خاوەنی كتێبی "وەرگێڕانی ژیانی مەلیك" دەڵێت: مەلیك ناچار كرا پەیماننامەیەكی تازە پەسند بكات، كە ماوەی مانەوەی بەریتانیا لە عێراق درێژبكاتەوە. بە ئاشكرا بە مەلیك فەیسەڵیان وت: پەیماننامەكە واژۆ دەكات یان كوردستان لە دەست دەدات[296].

ئەمە بەڵگەیەكی ترە لەسەر قۆستنەوەی بیری نەتەوایەتی لەلایەن ئینگلیزەوە وەكو بیانوو بەكارهێنراوە بۆ درێژكردنەوەی مانەوەیان لە عێراق. لەلایەكی ترەوە نەتەوەخوازانی عەرەبیان بەكارهێناوە بۆ چەوساندنەوەی كورد، هەتا ببێتە بەربەست لە بەرانبەر مستەفا كەمال، سەرەڕای ئەوە لیژنەی لێكۆڵینەوە ئاماژەی كردووە، كە كورد بەگشتی حوكمی زاتی لە كارگێڕی بەریتانی بە باشتر دەزانن، دیارە بەریتانییەكان لە لای لیژنەو دواتر لەلای ئەنجومەن پێگەی خۆیان بەكار هێناوە. لە دوای كۆنگرەی لۆزان بەریتانییەكان ویستوویانە داواكاری نەتەوەخوازانی كورد كورت بكەنەوە،

---

[295] -- League of Nations Question of Frontier Between Iraq and Turkey, p.89

[296] - Great British Parliament, Colonial Office, Treaty Between the United Kingdom and Iraq Regarding the Duration of the Treaty Between the United Kingdom and Iraq of October 10, 1922, Signed at Baghdad, January 1, 1926 (London: HMSO, 1926(

له"مەرجی کردەیی"دا، کە بە تەنیا بۆتە ماف رۆشتبیری و ئیداری خۆجێیەتی، هەروەکو ئەو سیاسەتە گونجاو بووە بۆ تورکیا و ئێران[297]. ئەو سەرنجانەی دۆبس لە شوباتی سالی (1926) زیاتر هاوکاربوون بۆ زیاتر تیشك خستنە سەر سیاسەتی دوای لۆزان:

"..... لە ڕاستیسدا ماوەی شەڕ شیاو بووە بۆ واژۆکردنی پەیماننامەی سیڤەر، هەولە زۆرەکانی حکومەتی خاوەن شکۆ لە هاندانی نەتەوایەتی کوردیی ئەنجامی خراپی هەبوو بۆ سەر بەرژەوەندیمان و سیاسەتی ئێستا.... هەرچۆنێك بێ هەولێك بووە بۆ دوورخستنەوەی هەر سیاسەتێکی جوداخوازی لە لای کورد لە عێراق. حکومەتی خاوەن شکۆ پابەندە بەوەی داواکارییەکانی کورد بەگونجاو سەیر بکات، ئەوەی پەیوەندی هەیە بەر بەکارهێنانی زمانی کوردی و دانانی بەرپرسانی کورد لە ناوچە کوردییەکان.. ئەمەش لەلایەن حکومەتی عێراقەوە جێبەجێکراوە"[298].

بەپێی دەقی ژمارە سێی بڕیاری دادوەری حکومەتی بەریتانی داواکارە بە دابینکردنی "زەمانەت"و "ڕێوشوێنی کارگێڕی" بۆ بە ئەستۆوەگرتنی ماف کورد لە عێراق، واژۆکردنی پەیماننامەی ئەنگلۆ ـ عێراقی لە سالی (1926) بەتەنیا دوای سێ هەفتە لە یەکلایکردنەوەی موسل بەریتانیای پابەند کرد سەرپەرشتی ڕێڕەوی جێبەجێکردنی ئەو پابەندیانەی حکومەتی عێراقی بکات، کە پەیوەندییان هەیە بە ماف کورد. یەکەم هەنگاوی ئاماژە بووە بە ئامادەیی حکومەتی عێراقی و بەریتانی بۆ ئەوەی ئەمەکدار بن بەرانبەر بەلێنەکەیان[299].

بە بۆنەی ڕێککەوتننامەی تازەوە لەسەر خوانی بارەگای مەندوبیەتی بەریتانی، "بی بۆدلۆن" کە پێشتر لەلایەن ئەمیری "وەزیری داگیرگەکان"ەوە دەرفەتی درابوویە وەکو نوێنەری بالا وتارێکی دا، لەوێ ئەو بەلێنانەی بەبیر حکومەتی عێراقی هێنایەوە ، کە کرابوونە مەرجی دادوەری موسل:

---

[297] - FO, 371/10826, (Mosul) Dispatch No, 840, Eastern Eest, Nov. 16.1925, 10825, E 2731/32/65. No, 1,May 1925, Enclosure No, 1,S.H, Dobbs to Amery.

[298] - Air, 23/411. Memo. N.,G.O, 118, Secretariat of High Commissioner for Iraq, Baghdad, Feb. 26, 1926. to Air H.Q

[299] - الحسینی: تأریخ العراق السیاسی الحدیث، سەرچاوەی پێشوو، ب2، ل13

ئامانجی حکومەتی عێراقییە هەموو عێراقییەکان هاوولاتی چاك بن، ئەم کارەش لە ڕێگەی هاندانەوە دەبێت نەك لە کەمکردنەوەی شانازیکردن بە زمان و رەچەڵەك وەکو تاك، هیچ کوردێك عەرەب نییە، هەروەکو هیچ ئیسکتۆلەندیەك ئینگلیز نییە، کورد دەکرێتە هاوولاتییەکی باش، بەلام نەك ناچارناکرێت بە عەرەبی قسە بکات، بەڵکو دەرفەتی پێدەدرێتو هاندەدرێت ببێتە هاولاتیەکی باشی کورد[300].

لە وەلامی ئەو وتارە مەلیك فەیسەڵ ئامادەیی حکومەتەکەی دووپاتکردەوە بۆ جێبەجێکردنی هەموو ئەو بەڵێنانەی لە بڕیاری دادوەریدا هاتووە بۆ نیشتیمانەکەی..... هەتا ببن بە ئەندامی چالاك لە ولاتی هاوبەشو جەختکردنە سەر یەکێتی و هاوکاری نێوان خۆیان[301].

سەرەڕای ئەمە لە (20)ی کانوونی دووەمی ساڵی (1926) "موحسین سەعدوون" سەرۆکی وەزیرانی عێراق لە بەردەم ئەنجومەنی نوێنەران وتارێکی دا. ئەو دوو وتارە لە لایەن مەلیك فەیسەڵ و نوێنەری بالاوە دووبارە کرایەوە:

"ئێمە بەوە ئاگادارین... حکومەت سیاسەتی خۆی بەرانبەر بە کورد دیاری کردووە، ئەرکی ئێمەیە بە شێوەیەکی باش و گونجاو لەگەڵ بەرژەوەندی دەوڵەت ماف گەلی کورد بدەین،.... بەرێزان ئەم نیشتیمانە ناتوانێت بژی، ئەگەر هەموو رەگەزەکانی گەلی عێراق ماف خۆیان نەدرێتێ، هەمووماندەزانین حکومەتی تورکی بە دەست ناکۆکیی و دووبەرەکیی و پارچە پارچە بوونەوە دەینالاند، چونکە دەستی گرتبوو بەسەر ماف رەگەزەکانی تر... چارەنووسی تورکان بۆتە وانەیەك بۆ ئەوانەی پەندی لێوەردەگرن"[302].

بە دوای ئەم وتارانەدا، بە مەستی پیادەکردنی سیاسەتی نوێ لە بەرانبەر کورد فەرمانی حکومەت بۆ هەموو وەزارەتەکان دەرچوو، بە وردبوونەوەیەکی گشتیی لەم

---

300 - FO,371/11460 Enclosure No, 3, Letter, Feb, 10, 1926,. Bourdillon to Amery Residency Baghdad

301-FO, 371/11460, Enclosure No, Letter. Feb, 10 1926. Baghdad Times Jan. 22.1926 -

302 - FO, 371/11460, Enclosure No, Letter. Feb, 10 1926. Baghdad Times Jan. 22.1926

سیٚ وتارەی سەرەوە دەردەکەوێت، دەبیٚ کاربکرێت بۆ ئەوەی کورد هەست بە هاونیشتیمانیبوون بکات، بکرێتە عێراقیی بیٚ ئەوەی ترسی لەوەی بە عەرەب بکریٚ. ئایا ئەم وتارانە بە تەنیا بۆ رازیکردنی کۆمەڵەی گەلانە، یان گوزارشت لە سیاسەتێکی دووربینی دەکات؟ ئەمە فاکتەری سیاسیی هەبووە، بەڵام کاریگەریی لەسەر رێڕەوی رووداوەکانی ساڵانی (1927–1931)ی کوردستاندا هەبووە.

لە (21)ی کانوونی دووەمی (1926) حکومەتی بەریتانی دەبینیٚ بەکردەوە بەجێماوە لەوەی زەمانەتی سیاسەتی مافی رۆشنبیری بە کورد بدات، ئەم سستیەش پەیوەندی نەبووە بە مەسەلەی پابەندی بەو مەرجانەی لە بڕیاری دادوەری کێشەی موسڵ دا هاتووە.

بۆ بەرجەستەکردنی ئەو تێڕوانینە لە (24)ی شوباتی ساڵی (1926) حکومەتی بەریتانی یاداشتنامەیەکی بەرزکردەوە بۆ کۆمەڵەی گەلان، کە درێژەی ئەو رێوشوێنە کارگێڕییانەی تێدابوو، کە حکومەتی عێراقی گرتبوویە بەر بۆ رازییکردنی خۆزگەکانی نەتەوەخوازە میانەڕەوەکانی کورد. یاداشتنامەکە ئاماژەی بە شتی تر کردبوو، بەوەی زۆربەی بەرپرسە فەرمییەکان لە هەرێمە کوردییەکان کوردن، حکومەت بە بەردەوامی هەوڵ دەدات بەرپرسانی عەرەب لەو ناوچانە دانەنێت، بە تەنیا لەو حاڵەتەدا نەبێت، کە کەسی شیاوی لە ناو کورد دەست نەکەوێت[303].

303 -FO, 371/11460, Enclosure No, Letter. Feb, 10 1926. Baghdad Times Jan. 22.1926

-Great British Colonial Office Report by His Britannic Majesty S, Government to the Council of the League Nations for the Administratration of Iraq for the Years 1926 (Colonial No,26) (London HMDO,1927),p.14-15: FO, 371/11460 (Memoradum of the Administratration of Kurdish Districts in Iraq) 10 February 1926, cy B.H, Bourdillon, the Acting H.C, Baghdad.

## پوختە

سیاسەتی بەریتانی لەکاتی قەیرانی موسڵ تاڕادەیەکی زۆر لە ژێر کاریگەری ئارەزووی بەرژەوەندی ئیمپریالستی خۆی دا بوو، لە پەترۆڵ و دەست گرتن بەسەر دەروازە زیندووەکانی ناوچەکە. لە لایەکی ترەوە تورکیا بە شێوەیەکی سەرەکی نیگەران بوو، بە هاندانی نەتەوایەتی کوردی لە ویلایەتی موسڵ لە لایەن حکومەتی بەریتانییەوە، کە گوزارشی لە هەڕەشە دەکرد بۆ سەر بەرژەوەندییە نیشتیمانییەکانی و پێی وابووە لێدانێکی ئاڕاستەکراوە بۆ سیاسەتی وریابوونەوەی کورد لەو بەشەی سەر بەدەوڵەتی ناسیونالستی خۆیەتی، کێشەی موسڵ یەکەمجار لە سیاسەتی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست رەهەندی کێشەی کوردی هێنایە گۆڕێ.

ئەو بزووتنەوەی لە شوبات تا نیسانی (1925ز) شێخ سەعیدی باڵو "پیران" سەرکردایەتی کردووە، رژێمی کەمالیی لە تورکیا هەژاندو شوێنەواری قووڵی لەسەر ژیانی سیاسیی تورکیا بە گشتیی و بزووتنەوەی کوردایەتی بە شێوەیەکی تایبەت بەجێهێشت.

لە هەشتاکان و نەوەدەکانی سەدەی بیستەم بە بایەخەوە چەندین لێکۆڵینەوە لەسەر جوڵانەوەی شێخ سەعید کراوە. بە ڕای من ئەم گرنگیپێدانە تازانە دەگەڕێتەوە بۆ دوو هۆکار: یەکەم: لەو ماوەیە لەی کوردستانی تورکیا بەرگری چەکداری نەتەوایەتی پەرەی سەندووە. دووەم: گەرمو گوڕبوونی بەرچاوی جوڵانەوەی رەوتی ئیسلامی لە تورکیا هەبووە، لە کاتێکدا بزووتنەوەی شێخ سەعید پاشخانی هەردوو رەوتەکەی تێدا بەرجەستە بووە.

دوو قوتابخانەی تاڕادەیەك جیاواز هەیە لەسەر شیکاری هۆکارە کاریگەرەکانی سەر بزووتنەوەی شێخ سەعید. یەکەمیان پێی وایە بزووتنەوەیەکی نەتەوایەتی بووەو ئایینی بۆ ئامانجەکانی ئەو خواستە بەکارهێناوە، ئەوەی تر پێی وایە بزووتنەوەیەکی ئایینی بووە بۆ لابردنی زوڵم لەسەر کوردستانو بەرهەڵستی حکومەتی نادینی مستەفا کەمال. ئەم لێکۆڵینەوەیە هەوڵدانێکە بۆ روونکردنەوەی ئەو لێڵییەی لەسەر هۆکارە راستەوخۆو ناڕاستەوخۆکانی بزووتنەوەی شێخ سەعید. دواتر دەچینە سەر لێڵیەکی تر، کە پەیوەستە بە پەیوەندیی ئەو بزووتنەوەیە بە ئیدارەی بەریتانی لە عێراق.

## رووداوەکانی شۆڕش

زەنار سلۆپی "جەمیل قەدری پاشا" یەکێك بووە لە هاوچەرخانی شێخ و لە بانگەوازکارانی بیری نەتەوایەتی کوردی، بەسەرهاتی شۆڕشەکەمان بەم شێوەیە بۆ دەگەڕێتەوە:

(لە دوای گەشتی شێخ سەعید بۆ گوندی پیران، سەرۆکی جەندرمەکان بیٚ ئەوەی حیساب بۆ شوێنو پێگەی شێخ سەعید بکەن، ویستویانە بە زەبری هێز چەند کەسایەتییەك لە یاوەرانی بگرن، هەتا لە نێوان جەندرمەکانو عەبدوڕەحمانی برای شێخ سەعید پێکدادانی چەکداری لێکەوتەوە. لە شوباتی ساڵی (1925ز) چەند

جەندرمەیەکیان کوشتو بریندار کرد، شێخ ئەو کات بڕوای بە دەسپێکردنی ڕاپەڕین نەبوو، چونکە خۆی ئامادە نەکرد بوو، هەتا ڕووداوەکە سیمای ناوچەیی وەربگرێو نەپەڕێتەوە ناوچەکانی تر، یەکسەر پیرانی بەجێهێشت، بەڵام بارێکی دەرونیو هەڵچوون درووست بوو، پڕیشکی ڕاپەڕین بە زوویيو خێرایی لە لیجیو گابالگۆڕ بڵاوبووەوە. شێخ سەعید سەیری بارودۆخو ئەو گۆڕانکارییە خێرایەی کرد، وتی: دیارە ئەمەیە قەدەری ئێمە، لێرەوە هاتە سەر ڕێبەرایەتیکردنی ڕاپەڕینو لە (24)ی شوبات شۆڕشگێران مەڵبەندی ویلایەتی کینج "بنگۆڵ"یان گرت[304].

لە دواییدا موجاهیدانی کورد "کە شێخ سەعید وای پێدەوتن" دەستیان گرت بەسەر کینجو کاربەدەستانی ئیدارەی تورکیان بە دیل گرت، جەندرمەکان هەڵاتن، لە شوێنی ئەوە ئیدارەی کوردییان لە کینج دانا. فەقی ئیحسان "کە زانایەکی ئایینی بوو" کرایە پارێزگاری کینج و کۆمەڵێك یاسای تایبەت بەو کاتەی دەرکرد و ئەو باجانەی هەڵوەشاندەوە، کە لەسەر شانی خەڵکی قورس بوون[305].

شۆڕش لە "کینج"ەوە پەڕیەوە بۆ ویلایەتە کوردییەکانی تر، هەتا موجاهیدان دەستیان گرت بەسەر قەزای خەربووت "شاری ئەلعەزیز" لە ویلایەتی ئەرزرۆم، بۆ ماوەیەکیش ئاگری شۆڕش پەڕیەوە باشوور، هەتا گەیشتە ماردینو دیاربەکر و قەزای "جمێتك گزك" لە مەلاتیە لە بەری ڕۆژئاوا. لەو کاتە شۆڕش گەیشتە لوتکە، کە پێنج هەزار تێکۆشەر هێرشیان کردە سەر دیاربەکر بۆ ئەوەی بیکەنە پایتەختی خۆیان، بەڵام هێرشەکە لەبەر چەند هۆیەك سەرنەکەوت لەوانە: حکومەت لە ناوشار خۆی ئامادەکردبوو بۆ بەرپەچدانەوە، شۆڕشگێران لەگەڵ خەڵکی شار هاریکاری پێشتریان نەبوو، هەروەها نەخشەی تێکۆشەران لەسەر بنەمای سەربازی کۆن بوو.

بڵاوبوونەوەی خێرای شۆڕش بۆ چەند هۆکارێك دەگەڕێتەوە لەوانە: بێزاری و ناڕەزایی کورد لە سیاسەتی حکومەتی ناوەند، بەتایبەتی سیاسەتی بە تورككردنو ئەو زیادڕەویە لە مەرکەزیەت، کە لە لایەن مستەفا کەمالەوە سەپێنرابوو بە سەر ناوچە

---

304 - زنار سلۆپی، فی سبیل کوردستان، بیروت، دار الکتاب، 1987، ص106-107.

305 - م. حسرتیان: کوردستان ترکیا بین الحربین، ترجمه. سعدالدین ملا، بیروت، دار الکتب، 1987، ص57.

کوردییەکان، هەروەها مستەفا کەمال لە هەوڵی ئەوەدابوو لە بەرژەوەندیەکانی سەرکردایەتی تەقلیدیی کورد "شێخ و دەرەبەگەکان" بدات و بێ ئاگابووە لە بەڕێوەبردنی ناوچەکە، سەرەڕای هەموو ئەمانە جەماوەری کورد بێزار بوون لە هەڵوەشاندنەوەی خەلافەتو شەریعەت، وای لێهات حکومەتی ناوەندی لە لایەن موسڵمانانی پەیوەست بە خەلافەت، شەرعیەتی خۆی لە دەست دابوو[306].

دوایی خێرایی رووداوەکانی ناوخۆ و جەماوەریی جوڵانەوەی سۆفیی نەقشبەندیی لە ناوچەکەدا و بیرۆکەی جیهاد و سەرۆکی موجاهیدین، چەندین تەکیە* لە چوارچێوەی کوردستان، بە خێرایی خۆیان رێکخست بۆ ئەوەی بدەنە پاڵ جوڵانەوەکە، بە جۆرێ ئیدارەی تورکی نەیتوانی دژی بوەستێ[307].

حکومەتی ئەنقەرە چەندین ڕێوشوێنی بەپەلەو تۆکمەی گرتەبەر بۆ بەرەنگاربوونەوەی بزووتنەوەی شێخ سەعید. لە (23)ی شوبات هەموو ناوچە کوردییەکانی خستە باری نائاسایی، مستەفا کەمال، فەتحی ئەقیار "سەرۆکی وەزیران"ی لەکارخستو بەلاوازی تاونباری کرد، داوای لە عیسمەت ئینینۆ کرد سەرکردایەتی حکومەتی تازە بکات، ئەویش کۆمەڵێك ڕێوشوێنی ڕاگەیاند، کە بە "ڕاپۆرتی سکون" ناسراوە. شاری ئەدەنەی لە ڕۆژهەڵات کردە مەڵبەندی کۆکردنەوەی ئەو هێزانەی لە باشوور و ناوەڕاستی تورکیاوە کۆدەکرانەوە بۆ سەرکوت کردنی ڕاپەڕین. دەسەڵاتدارانی فەرەنسیش لە سوریاوە ڕێگەیان بە حکومەتی تورکیدا بە گواستنەوەی هەزاران سەرباز لە پشتەوە بە ڕێگەی هێڵی ئاسن بە ناو خاکی سوریا بۆ گەمارودانو هێرشبردنە سەر شۆڕشگێران. لە (27)ی ئازار هەموو هێزەکانی فەیلەقی پێنج و هەشت لە "ئەدەنە و ئەرزنجان" کۆکرانەوە، لە دوای باشبوونی باری ئاووهەوا بە شێوەیەکی فراوان هێرشەکانیان لە باکوور و باشوور و ڕۆژهەڵاتەوە دەست پێکردو توانیان گەمارۆی موجاهیدان بدەن. شێخ سەعید زوو بۆی دەرکەوت هاوسەنگی هێز لە

---

[306] - Report Olson, The Emergence of The Kurdish Nationalist Movement Austin: Texas Univ, Press, 1989, pp.43-44.

* - دەبێت خانەقا بێت، چونکە تەریقەتی نەقشبەندی لە "خانەقا" کۆدەبنەوەو تەریقەتی قادریی لە "تەکیە". شێخ سەعیدیش لە ڕێبەرانی تەریقەتی نەقشبەندیی بووە. "وەرگێڕ".

[307] - Martin Van Bruinessen Agha, Shaikh, and State, Utrecht, 1979, pp. 365.

ڕووی ئامادەکاری‌و تەقەمەنی لە نێوان هێزی حکومەت ئەودا نییە، ناچاربوو هێزەکانی بۆ ناوچە شاخاوییەکانی ویلایەتی گینج بکێشێنێتەوە.

ئیتر شۆڕشی کورد کورت کورتبۆوە لە دۆڵی فوڕات سۆ، ئەمە ئاسانکاریی بوو بۆ حکومەت بە زۆرینەی هێزەکانییەوە روو بکەنە ناوچەکەو گەمارۆی شۆڕشگێڕان بدەن، بەڵام شەڕی گەورە لە نێوان تێکۆشەران‌و حکومەت هەتا 14ی نیسان بەردەوام بوو. لەسەر پردی "جیهاربور" شێخ سەعید لە ئاکامی خیانەتی سەعید بەگی جیرانی خزمی بەدیل گیرا، سەعید بەگ لە سەرەتاوە لەگەڵ شۆڕش دابوو ببووە جێی متمانەی شێخ سەعید، لە نەتەوەخوازانی کورد بووە،[308] بە دیلگیرانی شێخ سەعید کاریگەری گەورەی لەسەر ورەی تێکۆشەران بەجێهێشت، هێزەکانی حکومەت دەستیان گرتەوە بەسەر مەڵبەندی گینج‌و لیجەو باڵوو پیران، بەڵام ئەمە مانای کۆتایی هاتنی شۆڕش نەبوو، بەڵکو موجاهیدان هەتا ساڵی (1928ز) لەگوندەکان بەرگرییان کرد. لەگەڵ بەدیلگیرانی شێخ سەعید بەرگری لە شەڕی بەرەییەوە بووە شەڕی پارتیزانی، تێکۆشەران توانیان بەرپەچی هێرشێکی حکومی بدەنەوە، دەستیان کردەوە بە رێکخستنەوەی خۆیان لەسەر شێوەی کەتیبە، کە "دەستەی جەنگاوەری ـ چەتە"یان پێدەوت.

ئەو دەستە جەنگاوەرییانە توانیان چالاکیی سەربازی بە شێوەی هێرش بردن‌و کشانەوە "الکر والفر" ئەنجام بدەن، لە سەرەتاوە لە ناوچەکانی مودکی سامۆن، خونەیس، فارتۆ، موش، سولەیهان، جەبەق جور، کینج، وەلیجە بڵاوبوونەوە[309]. سەید عەبدوڵای نەهری "کوڕی عەبدولقادری کوڕی شێخ عوبیدوڵلای نەهریی"، کە باوکی لە سێدارە درابوو، شەڕی بەرەنگاری گواستەوە بۆ هەکاری، هەتا لەوێ تێکۆشەران بوونی خۆیان لەسەر سنوورەکانی عێراقیی ـ تورکیی ـ ئێرانیی سەلماند[310]. هاجۆ بەگی سەرۆکی هۆزی هافرنگی وەکو سەرۆکی موجاهیدانی ناوچە سنوورییەکانی تورکیی ـ سووریی ناوی دەرکرد، هاجۆ بەگ لە ڕێبەریکردنی هۆزەکانی ناوچەی "نوسەیبین" سەرکەوتوو بوو، حکومەتی تورکیش زۆر نیگەران بوو لە چالاکییەکانی، داوای لە

[308] -FO, 371\10867 Teleg No, 2497, 27, April, 1925, Lindsay to Chamberlain.

[309] - Air 23\411 Secret No, 1618, Baghdad 22 July 1926

[310] - FO, 371\10867 22 July 1925.

دەسەڵاتدارانی بەریتانی و فەڕەنسی کرد لە عێراق و سوریا پشتیوانی هەوڵەکانی بن، وادیارە هاجۆ بەگ بیری لە فراوانکردنی بازنەی بەرگری کردبێتەوەو جڵەوەی سەکردایەتی گرتبێتە دەست، لە نامەیەکیدا ئەو بۆ ئەمین بەگی رەواندزی بە مێژووی (26)ی حوزەیرانی (1926ز) هاتووە: هاجۆ داوای لە سەرکردە کوردەکانی رەواندز کردووە پشتگیری بکەن، هەروەها داوای لە کوردستانی ئێران کردبوو بۆ پشتگیری لە فراوانکردنی جیهاد پەیوەندیی بە سمکۆوە بکەن، هاجۆ داوای لە شێخ ئەحمەدی بارزانیش کردبوو پشتگیریی هەوڵەکانی بێت، وەکو لە نامەی ناوبراودا بەدیاردەکەوێ ژمارەی تێکۆشەرانی هاجۆ گەیشتبووە (500) تێکۆشەر. هاجۆ دەڵێ: مەحمود ئیبراهیم میللی "کوڕی سەرکردە ئیبراهیم پاشای میللی"، کە لە سەرووکانی لە قەزای "مدیاد" نیشتەجێیە بەڵێنی داوە بە (1500) چەکدارەوە پشتگیری لەو تێکۆشانەی ئەو بکات، لەساڵی 1926زدا بەسەرکردایەتی شێخ عەبدورەحیمو تایەر "برایانی شێخ سەعید" (550) موجاهید هەبوون لە کوردانی زازا، لەو بەڵگەنامە مێژووییە "نامەی هاجۆ" دیارە کە تێکۆشەران ئامادەن درێژە بە خەبات بدەن، بەڵام چەکیان کەمە[311].

هاجۆ بەگ ئومێدێکی گەورەی هەبووە بە هەوڵەکانی شێخ مەهدی برای شێخ سەعید، کە هاتبووە ناو سنووری عێراقو خۆی دابووە دەست دەسەڵاتدارانی بەریتانی. شێخ مەهدی هەوڵیدابوو پشتگیری ئینگلیز مسۆگەر بکات، بەڵام ئینگلیز داوایان لێکردبوو هەموو چالاکییە سیاسییەکانی بوەستێنێو سنووری عێراقی بەکار نەهێنێ لە دژی حکومەتی تورکیا.

شێخ مەهدی بە نهێنی توانیبووی لە ڕێگەی ژەنگارەوە لە سنوور بچێتە کوردستانی تورکیا، لەوێ دەست بە جوڵانەوە بکاتەوە لەگەڵ ئەو خەباتگێڕانەی لە سنوورەکانی تورکیاو سوریا بوون، لە نامەیەکی نووسراوی (31)ی حوزەیرانی (1926ز)، کە ئاڕاستەی ئەمین بەگی رەواندزی کردووە، شێخ مەهدی زۆر بەدرێژی باسی چالاکییە جیهادییە چڕەکانی کردووە لە ناوچەکە، دەڵێ: دەستە چەکدارییەکانی کورد زاڵن بەسەر ئەو گوندانە کە بە"کوردستانی سەربەخۆ" ناوی بردووە[312].

[311] -سەرچاوەی پێشوو.

[312] - هەمان سەرچاوە.

بزووتنەوەی چەکداری هەتا ساڵی (1928ز) بەردەوام بوو، گەرچی بەرەنگاری لەو بەروارەوە ئەستەم بوو، چونکە: هێزەکانی حکومەتی کەمالی فشارێکی یەکجار زۆریان هەبووە لەگەڵ گرتنەبەری سیاسەتی زەوی سووتاندن "الاراضي المحروقة"، دەستبەسەراگرتنی هەموو کەلوپەلەکانیان و سووتاندنی بەرهەمی کشتوکاڵی، لەگەڵ زەوتکردنی سەرچاوەی مەڕداریو چۆڵکردنی ناوچەکە.

تێکۆشەران بێبەش کران لە پشتیوانی دەرەکی و هیچ هاوکارییەکی سمکۆو کوردەکانی ڕەواندزیان پیێ نەگەیشت، بە مۆرکردنی ڕێککەوتنامەی هاوکاریو باشبوونی دراوسێیەتی عێراقو ئێرانو تورکیا لە ساڵی (1926)، رەوشەکە ئەستەمتر بوو، ئەم ڕێکەوتنامە بە دەستپێشخەری ئینگلزو زۆربەی بەندەکانیشی بۆ دژایەتی شۆڕشگێرە کوردەکان بووە، لە ئاکامی ئەو بارودۆخە قورسە سەرکردەکانی کورد ناچار بوون بەرەو پیری بڕیاری لێبووردنەوە بچن، کە حکومەت لە ساڵی (1926) دەریکردبوو[313]. بەمە لاپەڕەیەك لە بەرگری کۆتایی پێهاتو هەر لە دوای شەش مانگی تر، بە سەرۆکایەتی ئیحسان نوری پاشا لاپەڕەیەکی تر لە بەرەنگاری دەستی پێکردەوە.

## هۆیەکانی لە بارچوونی راپەڕین

هۆکاری زاتیو بابەتی پێکەوە رۆڵی هەبووە، نووشستی بزووتنەوەی شێخ سەعید لە بەدیهێنانی دەستکەوتەکانیدا، مەبەست لە هۆکاری زاتی پێکهاتەی بزووتنەوەکەیە لە ڕووی سەرکردایەتیو جەگاوەرەکانی، لەگەڵ شێوازی بەڕێوەبردنی شەڕ، هەندێکی دەگەڕێنەوە بۆ ئەو خاڵەی کە بزووتنەوەکە بەر لە پێگەیشتنی دەستی پێکردووە، بۆیە لایەنی بێسەرەو بەرەیی بەسەریدا زاڵ بووە، لەگەڵ ئەوەشدا زۆربەی جوڵانەوەی خەباتگێڕان کاردانەوەی ئەو بارودۆخە تازەیان پێوە دیار بووە، کە بزووتنەوەکە لە بارودۆخی نائاسایی دەستی پیکردووە، سەرکردایەتی لە ئاست ڕووداوەکاندا نەبوو، سەرەڕای ئەوەی شێخ سەعید کەسایەتیەکی کاریزمایی بووە، لە ڕووی کارامەیی سیاسییو شارەزایی بە ڕوداوەکانی ناوخۆو دەرەوە نەگەیشتبووە ئاستی پێویست.

---

313 - Olson, p.152.

وەکو هەموو جولانەوەکانی تری ڕێبازی سوفیگەری سەدەی نۆزدەهەمی جیهانی ئیسلامی ئەو کات وابووە، لەگەڵ جولانەوەی شێخ عوبێدوڵلای نەهری سەدەی پێشتر هاوشێوە بووە، کەچی لە کاروباری ناوخۆو دەرەوەدا شێخ عوبێدوڵلا لە ئەم شارەزاتر بووە، نە شێخ سەعید و نە ئەوانی تر شارەزای کاروباری سەربازیو هونەریو بەڕێوەبردن نەبوون. بۆ نموونە هەوڵی زۆریاندا هێرش بەرنە سەر شارەکان بەڵام هەردووك سەرکەوتوو نەبوون، بێ ئەوەی چەکی پێویستیان لەبەردەستدا بێت، ئەو مەترسیەشیان هەست پێ نەکردووە چۆن پارێزگاری لێ دەکەن لە بەرانبەر هێزەکانی نیزامی تورکی، کە زیاتر شارەزاو خاوەن چەكو تەقەمەنی بەهێزتر بوون. گەمارۆدانی شاری دیاربەکر لەسەر بنەمای جەنگی هاوچەرخانە نەبووە، لە گەمارۆدانی شارو بێزارکردنی دوژمن لە ناوەوە، دواتر دانانی سیستمی بەرگریی لە شارەکە، لەو کاتەی دانیشتوانی شار بەشێکی تری ناڕەحەتی هەڵسوکەوتی حکومەتی ناوەند بوون، کەچی وەکو بەدیاردەکەوێ تێکۆشەران لەگەڵ ناوەوە هاوکارییان نەبووە[314].

بزووتنەوەکە تاڕادەیەك سیمای دەشتەکی بە ڕێبەرو تێکۆشەرەکانییەوە دیاربووە، "شێخ، زانای ئایینی، مورید، جوتیار، گوندنشین"، لە بەرانبەردا ئەرستۆکراتیەتی شار رولّی گرنگی نەبووە لە سەرکردایەتی و پێکهێنانی جولانەوەی شێخ سەعید، ئەم بەشداریی نەکردنی ئەرستۆکراتیەتی شارە بۆ چەند هۆیەك دەگەڕێتەوە، لەوانە: شۆڕش لەلایەن تەریقەتی نەقشبەندیەکانەوە دەستی بەسەراگیرابوو، چینی بازرگانو دەستەبژێری ناو شار لێی بێ ئاگابوون، یان کەمترین لێك تێگەیشتن لەنێوان ڕێبەرایەتی مەدەنیو ڕێبەرایەتی کلاسیکی گوندنشین دا نەبووە[315]. لەکاتێکدا سەرکردایەتی شار "نوخبە بازرگانەکان" تاڕادەیەك لە ژێر ئالای "ئازادی"دا کۆبوبوونەوە. زاڵبوونی لایەنی لادێی بەسەر شۆڕشەکە نیشانەی لاوازی رۆڵی "ئازادی" بووە، بێتوانایی سەرکردایەتی مەدەنی دەگەیەنێ لە بەشداریکردنی شۆڕش، ئاماژەیەکی روونو ئاشکرایە بۆ لاوازی رۆڵی نوخبە، یان روونتر بڵێین، لاوازی بیرۆکەی نەتەوایەتی کوردیو ڕێکخستنی ناوشار [*].

---

[314]- بلە. شێرکۆ، ص94-95.

[315] - Olson, pp.98-99.

[*]- تێکگیرانێك هەیە لە ڕاڤەی نوسەر بۆ ڕووداوەکان: یەکەم: نوسەر دەڵێ ڕاپەرینی شێخ سەعیدی پیران بێبەرنامەو پێ شوەخت هەڵگیرساوە، کەواتە ئەو ماوە کورتەی ڕاپەڕین زۆر کەم بووە بۆ ڕێکخراوێکی

بزووتنەوەی شێخ سەعید لە بارودۆخێكی زۆر قورسی كۆمەڵایەتیو ئابووری ناوێزە لەدایك بوو، شایانی باسە كوردەكانی توركیا لەو ساڵانەدا لە دوو شەڕی گەورە دەرچوو بوون، ئەوانیش شەڕی یەكەمی جیهانیو شەڕی نیشتیمانی توركی، كاریگەری زۆریان لەسەر كورد بەجێهێشتبووە، بۆ نموونە لە بواری ئابووری هەتا ئەو كاتەش حاڵەتێكی نیمچە برسیەتی هەڕەشەی لە ئارامی و ئاسایش دەكرد، بەجۆرێ زەبتكردنی دانیشتوانی شارو تێكۆشەران ئەستەم بێت، نەدەكرا پارێزگاری ئاسایشی ئەو شارە بكرێ كە دەكەوتە بەر دەستی تێكۆشەران، هەر بۆ نموونە، كە شاری (عەزین) كەوتە دەست شۆڕشگێڕان ئاسایش تێكچوو، گەرەلاوژە لە ناوشار بڵاوبۆوە، دزیو تاڵان زیادی كرد، هەتا خەڵكی ناوشار چوونە ژێر فەرماندەیی سەید موحەممەد "یەكێك بووە لە پیاوە ناودارەكانی شار" بۆ دەركردنی شۆڕشگێڕانو گەڕانەوەی دەسەڵاتی ناوەندی، هۆكارێكی تر لە كەوتنی جوڵانەوەی شێخ سەعید یەكنەبوونی كوردان بووە، ئەوەی پێی دەوترێت هاریكاری نێوان هۆزە ناكۆكەكان.

هەستی نەتەوایەتی لە شۆڕشی "كۆچكری" ساڵانی (1920–1921) كورتهەڵهاتبوو لە دەرسیم و هۆزە كوردە عەلەویەكان، ئەمەش ئاسانكاری بوو بۆ حكومەت دەستبگرێتەوە بەسەر ناوچەكە. جوڵانەوەی شێخ سەعید نموونەیەكی ترە لە لاوازی یەكێتی نەتەوایەتی كوردان، هۆزە عەلەوییەكان نەك هەر پشتگیری ئەو شۆڕشەیان نەكرد، بەڵكو پشتگیری حكومەتی ناوەند بوون بۆ سەركوتكردنی ئەو رابوونە. هۆزە شیعە كوردەكانی كۆلانو خورمك پێیان وابووە جوڵانەوەیەكی سوننی دەمارگیرە. هەوڵەكانی شێخ سەعید لە بەدەستهێنانی دۆستایەتی ئەوان بێئاكام بوو، هۆكاری ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ناكۆكی گەرمی هۆزایەتی نێوان عەلەوییەكانی دەرسیمو سەرۆك هۆزی جیرانی، كە پشتگیری شۆڕش بوون، حكومەت سوودی لەو ناكۆكییە وەرگرتو لە كاتی هاتنی شۆڕشگێڕان بەرەو باكوور و رۆژئاوا، مالاتیە و ئەرزڕۆم و

---

سیاسیی نهێنی ناو شار خۆی كۆبكاتەوەو ئالیەتی هاریكاری لەگەڵ راپەڕینی دەرەوەی شار دابمەزرێنێ، دووەم: هەتا درەنگ "ئازادی" بە راپەڕینی نەزانی بوو، بێئاگا بوو، بۆمان هەیە بپرسین، حزبێكی خاوەن پرنسیپ لەسەر چ بنەڕەتێك بەشداری لەو راپەڕینەدا بكات كە پێشتر لێی ئاگادار نەبووە؟ لەلایەكی ترەوە "ئازادی" هەڵەبووە كە بە نیوەچڵی بەشداری كردووەو ئاكام باجی بە مەرگی "ئازادی" داوە." وەگێڕ".

هۆزەکانی "لۆلان"و "خورمك" چەکیان هەڵگرت، هۆزە شیعەکان هێرشیان بردە شوێنی شۆڕشگێڕانو بەم هەنگاوە ورەیان رووخا[316].

ناکۆکییەکە بە تەنیا لەسەر بنەمای تایفی کورت هەڵنەهاتبوو، بەڵکو ناکۆکییە تەقلیدییەکانیش کوردانی ماندوو کردبوو، حکومەت بە سامان و نازناوی فەخری و چەك توانی دۆستایەتی ژمارەیەکی زۆری سەرۆکە کوردەکان بکڕێ، ئەوانە زۆربەیان بەشداریی شۆڕشیان نەکرد و بە پێچەوانەوە هاوکاری سوپای دوژمنیان کرد بۆ سەر شۆڕشگێڕان[317].

تەریقەتی نەقشبەندی وەکو حزب سەرکردایەتی شۆڕشی کردووە، یەکگرتوویی تیا نەبووە، شێخ سەعید بێ ناکۆکیی نەبوو لەناو سەرکردایەتی جوڵانەوەی نەقشبەندی کوردستانی تورکیا، بۆ نموونە شێخ نورشین لە نزیك هاموش لە شێخە چالاکەکانی ناو تەریقەتی نەقشبەندی پێ باشتر بووە خۆبگونجێنێو بایەخ بەلایەنی روحی بدەن، جیهاد لە کارە پێشینەکانی ئەودا نەبووە، داوای لە موریدەکانی کرد نەچنە پاڵ بزووتنەوەی شێخ سەعید[318].

بارودۆخی بابەتی ئەوکاتەی دەرەوەی کوردستانیش لە بەرژەوەندی شێخ سەعیددا نەبووە، شۆڕشگێڕان لەگەڵ حکومەتێکی ناوەندی شەڕیان کردووە، کە خاوەنی فڕۆکەو چەکی پێشکەوتوو بووە، سوپای تورکی شارەزایی زۆری لە سوپای عوسمانی لێکهەڵوەشاوە بۆ بەجێمابوو، مستەفا کەمال توانی دوو فەیلەقی پێنجو هەشت تەرخان بکات بۆ سەرکوتکردنی راپەڕینەکە، ژمارەی هێزی حکومەت دەگەیشتە (55 ـ 60) هەزار سەربازی نیزامی ئامادەکراو بە چەکی نوێ، لەکاتێکدا لە هەموو بەرەکانەوە ژمارەی موجاهیدان نەدەگەیشتە (10) هەزار جەنگاوەر[319].

مستەفا لەو کاتەی دەستی بەتاکڕەوی کرد، بە دوورخستنەوەی هاوڕێکانی، ساڵی (1925ز) بەرهەڵستیەکی بەرفراوان هەبووە لە ئەستەنبوڵ و ئەنقەرە، هەروەها

---

316 – Bruin Essen, p.400-401.

317 – هەمان سەرچاوە.

318 – حسرتیان، 84.

319 – Bruin Essen, p.4002.

مستەفا کەمال و عیسمەت ئینینۆ پێکەوە خەلافەت و شەریعەتیان هەڵوەشاندەوە، ئەمە موسڵمانانی تورکیای زۆر نیگەران کرد، بە ئاشکرا ئەم نیگەرانییە لە پەرلەمانی تورکی و رۆژنامە تورکییەکان بەدیارکەوت، بەتایبەتی ئەوانەی لە ئەستەنبوڵ دەردەچوون، وەکو "سبیل الرشاد" و "توحیدی ئەفکار" و "وصن تەلگراف"[320].

سەید عەبدولقادری نەهری سەرۆکی پێشووی ئەنجومەنی پیاوماقوڵانی عوسمانی لە پەیوەندی بەردەوامدا بووە لەگەڵ بەرهەڵستکارانی ئیسلامی تورکی و بانگەوازکارانی گەڕانەوەی خەلافەت و پێکەوە ژیانی کوردو تورکی لە سایەی دەسەڵاتی عوسمانیی، کە پێیان دەوت دەسەڵاتی لامەرکەزی.

لە تشرینی دووەمی (1924) شێخ سەعید، شێخ عەلی رەزای کوڕی ناردبووە ئەستەمبوڵ، لەوێ بە میوانی لەلای سەید عەبدولقادر مایەوە، پێکەوە لە بارودۆخی تورکیایان کۆڵیەوە، کە چۆن شێخ سەعید لە بزووتنەوەکەیدا دەتوانێ سوود لە بەرهەڵستکارانی ئیسلامی تورکی وەربگێرێ[321]. هەتا ئێستاش بەڵگەیەك نییە لەسەر رێککەوتنی لە پێشتری نێوان بەرهەڵستکارانی تورکی و بزووتنەوەی شێخ سەعید، هەموو بەڵگەنامەکانی ناو ڕۆژنامەکانی بەرهەڵستکارو بیرەوەری سیاسەتمەدارە بەرهەڵستکاران ئاماژەن، کە هیچ ئاگاداریو تێڕوانینی ڕوون نییە لەسەر جوڵانەوەی شێخ سەعید نەبووە، مستەفا کەمال وای نیشاندابوو شۆڕشی کوردستان پیلانێکی نەتەوەیی جوداخوازییەو هێزی بیانیو دوژمنکار بە تورکو ئیسلام پشتیوانی لێ دەکات، رۆژنامەی "الوقت"ی تورکی لە ژمارەی (18)ی حوزەیرانی (1925) لە زاری یاریدەری داواکاری گشتیی دژ بە شێخو هاوڕێکانی بڵاوی کردەوەو دەڵێ:

یاریدەری عمومی: ئەم شۆڕشەی دوایی ویلایەتەکانی رۆژهەڵات لە گرنگترین بەشی نیشتیمانی تورکی سەری هەڵداوە، لەو گیانە پیسەوە هەڵقوڵاوە، کە پێشتر پاڵی بە "بۆسنە و هەرسك"ەوە نابوو لە بەرانبەر تورك و ئیسلام شۆڕش دژی تورك بکەن، ئەوانەی بۆ ماوەی پێنج سەدە شکۆدار بوون بە نیشتیمانی تورکی و برایەتی عوسمانی، ئێستا توانج لەتورك دەدەن، کە بەسۆزەوە نەبێت مامەڵەی لەگەڵ براکانی نەکردووە، لە پشتەوە شەڕی بەلقان، ئەوەش کە سوورییەکان و فەلەستینییەکانی یاخی کردووە.

---

320 - Olson, pp. 108-109

321 - حسرتیان، ص98-99.

ئەو مەبەستەی ئێستا کوردی بزواند هەمان مەبەستیش بوو ئەو نەتەوانەی بزواند، ئەوانە خیانەتکارنو لە ناوەوەو لە نزیك سنووری نیشتیمان و بە چاودێری دوژمنان "مەبەست ئیدارەی ئینگلیزە لە عێراق" لە دەرەوە لەگەڵ ژمارەیەك لەوانەی نیشتیمانیان نییە یەکیانگرتووە. لە بەرانبەر ئەو بارە شلۆقە هیچ لایەنێکی بەرهەڵستکار نەیتوانی پشتیوانی خۆی بۆ بزووتنەوەی شێخ سەعید دەربڕێ، کازم قەرە بەکری سەرۆکی پارتی کۆماری پێشکەوتوخوازی تورکی بە ئاشکرا رایگەیاند، لەگەڵ حکومەت رێکدەکەوێ بۆ لەناوبردنی "خیانەتکاران"ی نیشتیمان، ئەوانەی ئایین بۆ مەبەستی سیاسیی بەکاردەهێنن[322].

مستەفا کەمال شۆڕشی لە ناوچە کوردییەکان لە دۆڵی فورات گەمارۆ دا، دوایی بە ڕێگەی توندی سەربازیی لە ناوی برد. هۆکارێکی تری ئاسان لەناوبردنی شۆڕش هۆکاری ئیقلیمی بوو، کە لە بەرژەوەندی مستەفا کەمال بووە. لە ساڵی (1922ز) هەریەك لە فەڕەنساو تورکیا رێککەوتنامەی ئاشتیو هاوکارییان واژۆکرد، ئەمەش دەروازەیەك بوو هاریکاری فەڕەنسی ـ تورکی لە دژی بەرژەوەندییەکانی بەریتانی لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، هەر لەو ساڵە یەکێتی سۆڤیەت و تورکیا گەیشتنە رێککەوتنامەی هاوشێوە، هەریەك لە ڕووسیاو فەڕەنسا پەیمانیاندا پشتیوانی هەوڵەکانی مستەفا کەمال بن دژی نەتەوەخوازانی کورد، چونکە وای نیشان بوو بە پشتیوانی بەریتانیا دەجولێتەوە.

لە پێش ئەو ماوەیەدا (1920ـ 1924ز) رەزا شا شۆڕشی کوردی بە سەرۆکایەتی سمکۆ لە ناوبرد، مستەفا کەمال و رەزاشا هەردووك هەستیان بە مەترسی کورد کردبوو، بۆیە هاوکاری یەکتریان دەکرد، کەسایەتی کەمال و سیاسەتی نادینی سەرنجی رەزاشای راکێشا بوو، هەردوکیان کوردیان پێ کۆسپ بووە لە بەردەم چاکسازی نادینی رۆژئاواییو بە گەلێکی دواکەوتوویان دانابوو، ئەوەی شایانی باسە بەریتانیاش لەلای خۆیەوە هانی دەوڵەتانی ئیقلیمی، "ئێران و تورکیا"ی دا لەسەر پشتیوانیو هاوکاری یەکتری لە دژی جولانەوەی کوردی، کە پێی وابووە لە دوای لۆزانی (1923)وە هۆکاری نائارامین لە ناوچەکەدا.

---

322 - Mehmet Bayrak, Kurtler ve Ulusal Democratik Mucadeleri, (Ankara, ABC. Matbacilik, 1993) p.328.

بە کورتی بزووتنەوەی شێخ سەعید لە ژینگەیەکی ئیقلیمی دژوار لە دایك بوو، ویستوویەتی کورد بە ئاڕاستەی دژ بە بەرژەوەندییەکانی رۆژئاوای هاوپەیمان لەگەڵ مستەفا کەمال بڕوات.

مشتومڕێکی ئاشکرا هەیە لە نێوان توێژەرەوان و یەکدەنگ نین لەسەر سەرچاوەکانی ئەو ڕاپەڕینە، زۆربەی توێژەرەوانی کوردی ئاڕاستە عەلمانی وای بۆدەچن بەرهەمی بەرنامەڕێژی جوڵانەوەی نەتەوایەتی کورد بووە بەتایبەتی "کۆمەڵەی ئازادی"و "کۆمەڵەی بەرزی و پێشکەوتنی کوردستان". توێژەرەوە رووسەکانیش ئەمە دووپات دەکەنەوە، بەڵام بەم دواییە هەندێك بەڵگەو لێکۆڵینەوە لە تورکیا پەیدا بوو، ئەوە دەردەخا جوڵانەوەیەکی ئیسلامیی بووەو ویستویەتی خەلافەت بگەڕێنێتەوەو دەستەواژەی شەریعەت بەگەڕ بخاتەوە.

ئەم ئیشکالیەتانەش هۆکاری هەیە، فەرماندەو ئەندامە چالاکەکانی ئەو جوڵانەوەیە لەسێدارە دراونو کەسیان بیرەوەری نووسراویان لە پاش بەجێ نەماوە، هەروەها حکومەتی تورکی هەتا ئێستا (2005ز) هەموو بەڵگەنامەیەکی پەیوەست بە شێخ سەعیدی بە نهێنی و تایبەت بە ئاسایشی نیشتیمانی لە قەڵەم داوە، بە تەواوی بۆ توێژەرەوان نەکراوەتەوە سوودی لێ ببینن، بە تایبەتی تر ئەوەی پەیوەندی کۆمەڵەی ئازادی و بە ڕاپەڕینەکەوە، لێدوانە فەرمییەکانی حکومەت و رۆژنامە فەرمیی و نافەرمیەکانی تورکیا لەگەڵ مەنهەجیەتی رۆژئاوایی لە توێژینەوەی هەندێ لە نووسەران بەشداری کارایان هەبووە لە درووستکردنی ئەو ئیشکالیەتە.

تێکەڵاوبوونی چالاکی کۆمەڵەی ئازادی لە سەرەتای بیستەکانو دواتر لە ساڵی (1924ز)، کە گۆڕا بە"خانەی گەنجان" لەگەڵ جوڵانەوەی شێخ سەعید هۆکاریکی تری گرنگە لە درووستبوونی ئیشکالیەت لەسەر جوڵانەوەی شێخ سەعید.

لە دوای ساڵی (1923) نەتەوەخوازانی کورد هەستیان کرد مستەفا کەمال بەکاریان دێنێت بۆ بەدیهێنانی مەبەستەکانی خۆی، کۆمەڵێك لە ئەفسەرو رۆشنبیرانی کورد لە ئەرزرۆم کۆبوونەوەو کۆمەڵێکی نهێنیان لە پێناو دابینکردنی ئەمانەتی نەتەوەیی کوردی دامەزراند، لە هەرە چالاکەکانی ئەو کۆمەڵەیەو سەرۆکەکەیان عەقید خالید بەگی کوڕی سەرۆکی هۆزی جبرانی بووە. پێشتر یەکێك بووە لە فەرماندەکانی سوارەی حەمیدیە، لەگەڵ یوسف زیا بەگ، ئەویش نوێنەری بەدلیس بووە لە پەرلەمانی تورکی، ئیحسان

نوری پاشاو ئیسماعیل هەقی شاویس ئەمانە لە دامەزرێنەرانی ئازادی بوون. ئازادی یەکەم کۆنگرەی دامەزراندنی خۆی لە ساڵی (1924ز) بەست، لەوێدا رێککەوتن لەسەر بەرەنگاربوونەوەی سیاسەتی سەرکوتکردنو پاکتاوی رەگەزی، کە لەلایەن حکومەتی ناوەندیەوە لە بەرانبەر کورد پەیڕەو دەکرا، ساڵی (1924ز) بارودۆخێکی بابەتیو زاتی هاتە ئاراوە بۆ ئەوەی کوردان کاربکەن دژی مستەفا کەمال، لەو هۆکارانەش:

لە (24)ی ئازاری (1924ز) مستەفا کەمال خەلافەتی هەڵوەشاندەوەو بەدوای ئەوەدا دابونەریتی شەرعی لابرد. هەڵوەشاندنەوەی خەلافەتو راگەیاندنی دەوڵەتی ناسیونالیستی تورکی نادینی نەهێشتنی تاکە رایەڵەی پەیوەندی نێوان کوردو تورک بووە، کە زیاتر لە هەشت سەدە پێکەوەی بەستبوونەوە*، خەلافەتو ناسنامەی ئیسلامی لە دەوڵەتی عوسمانیدا چوارچێوەیەکی بەرفراوانو گشتگیرو سەرکەوتوو بووە بۆ کوردو تورک، ئەمەش لە شەڕە گرنگەکانی بەرگری لە ئەوروپای رۆژهەڵاتو ململانێی نێوان ئێرانی شیعیو عوسمانی سوننییدا بەدیارکەوت، کورد وەکو سوننی مەزهەب رۆڵی بەرچاوی گێڕا لە داشکاندنی تای ترازوو لە بەرژەوەندی عوسمانییەکان.

هەڵوەشاندنەوەی خەلافەت رماندنی تاکە نەوای موسڵمانانی کوردی پەیوەست بە خەلافەت و وروژاندنێکی گەورە بووە، کە لە بەرانبەردا حکومەتی ئەنقەرە بە حکومەتێکی ناشەرعی هەژمارکراوە.

حکومەتی تورکی لە ساڵی (1924ز) بە قانوونی ژمارە (1505) دەستی بەسەر زەوی سەرۆک هۆزە کوردەکانو شێخە ئایینییەکاندا گرت، ئەم بڕیارەش پەردەپۆشێکی بە تورککردنی ناوچەکە بوو، چونکە زەوییە دەستبەسەرگیراوەکان دەدران بەو تورکە دەرکراوانەی بەشە تورکییەکەی ئەوروپا.

قەدەغەکردنی بەکارهێنانی زمانی کوردی لە دادگاو ئیدارەو فێرکردنو لابردنی وشەی "کورد"و "کوردستان" لە هەموو کتێب و نەخشە تورکییەکان، بە تورککردنی ئیدارەی کوردستان، بە دانانی کاربەدەستی تورک، یان ئەو کوردانەی هاوکاری تورکانن، هەتا مستەفا کەمال نوێنەرانی کوردی بۆ ئەنجومەنی نیشتیمانی تورکی بەپێی گوێڕایەڵی لەو کوردانەی هەڵدەبژارد، کە گوێڕایەڵنو سەنگیان نەبووە.

---

* – مەبەست لەو هەشت سەدەیە لەلای خوێنەر روون نییە لە کەیەوە دەست پێدەکات. وەرگێڕ

لەلای کوردو نەتەوەخوازانی بڕوای پتەو هەبووە، کە حکومەت نایەوێ پەرە بە ناوچەکەیان بدات، لەگەڵ ئەوەش چەندان باجی گران دەدرا بە حکومەت، لەگەڵ دزینی سامانی ناوچە کوردییەکان، کورد بێبەش بوو لە دابەشکردنێکی دادگەرانەی ئەو سەروەتو سامانە[323].

لەبەر ئەم هۆیانەی سەرەوە بووە نەتەوەخوازان بڕوای پتەو و ژیرانەیەیان بۆ درووست ببوو، کە ئەگەر دەست بەکار نەبن مستەفا کەمال بەردەوام دەبێت لە سیاسەتی تواندنەوە و سەرکوتکردن. لە ئابی (1924ز) لە شاری دیاربەکر، بە ئامادەبوونی پیاو ماقوڵانی کوردو سەرکردە تەقلیدییەکان و بەرپرسان لە حکومەتی ناوەندی کۆنگریەك گیرا بۆ داواکاری کوردان، سەرکردایەتی کورد ئەم داواکارییانەی خوارەوەی خستەڕوو:

1- کوردستان خاوەن کارگێڕی خۆی بێتو لەلایەن کوردانەوە بەڕێوە ببرێت.

2- قەرزێکی باش بدرێت بە جوتیارانی کوردستان بۆ دەربازبوون لەو قەیرانە ئابووریەی لە شەڕی یەکەمی جیهانەوە تووشی ناوچەکە بووە.

3- راگەیاندنی لێبوردنی گشتی بۆ هەموو گیراوە سیاسییەکانی کورد.

4- گەڕاندنەوەی دادگا شەرعییەکان بۆ کوردستان، کە پێشتر حکومەت هەڵی وەشاندبوونەوە.

5- سەرباز گرتنی بە زۆر بە شێوەیەکی کاتی بوەستێنرێت[324].

بەڵام حکومەتی ناوەند ئامادە نەبوو بە ئاوڕدانەوەی ئەو داواکارییانە، لە بەرانبەردا سیاسەتی تواندنەوەی نەتەوایەتی گرتبووەبەرو هەڕەشەی لە سەرکردەکانی کرد.

بێئاکامبوونی کۆنگرەی دیاربەکر لە نێوان نەتەوەخوازانی کوردو تورك شتی بەدیارخست، سەرکردە کوردەکەکان قەناعەتیان کرد تاکە رێگەی بەردەمیان خەباتی چەکدارییە، بۆیە ئەفسەرانی ئەندام لە ئازادی کەوتنە خۆئامادەکردنی پێویست بۆ راپەڕینی چەکداری، بۆ ئەو مەبەستەش لە شارە کوردییەکان چەند کۆبوونەوەیەکیان رێکخست، لەکاتی خۆئامادەکردن زیا بەگی بەدلیس نامەیەکی بۆ رەزا بەگی برای نارد

---

[323]- Bruin Essen, p. 395

[324] - Olson, pp.44-45. Bruin Essen, p.378-380

كه ئەفسەر بوو لە خانەی گەنجان لە ویلایەتی ماردین، لەو نامەیەدا باری سیاسیی تیدا روونکردبووە. وا دیارە رەزا بەگ بە هەڵە لەو نامەیە تێگەیشتبوو، پێی وابوو دەبێت ئەفسەرە کوردەکانی ئەو کەتیبەیەی خانەی گەنجان هانبدات بۆ بەرەنگاربوونەوە، بۆیە ئیحسان نووری پاشاو ئەفسەرانی هاوڕێی لە کەتیبەی ناوبراو هەڵگەڕانەوە، چەند پارچە چەکێکیان لەگەڵ خۆیان برد بۆ چیاکانی نزیك خۆیان، سەرەڕای چەندان بانگەوازی ئەفسەرانی ئازادی بۆ لقەکانو هۆزەکانی کورد، کەس بە دەنگیانەوە نەچوو، هێزەکانی تورکی گەمارۆیان دان، ئیحسان نووری پاشاو هاوڕێکانی ناچار بوون خۆیان بدەنە دەست ئیدارەی ئینگلیز لە عێراق[325].

لە تشرینی دووەمی (1924ز) دوای لێکۆڵینەوە لە ڕووداوی خانەی گەنجان، حکومەت بۆی دەرکەوت هەردوو ئەفسەری ناوبراو لە پەیوەندی بەردەوام دابوون لەگەڵ خالید بەگی جبرانیو یوسف زیا بەگ. لێرەدا هەردوو سەرکردەی ناوبراوو زۆربەی ئەندامە چالاکەکانی گیران، بە بۆچوونی برۆنسن زۆربەی ئەو سەرکردەو کادیرانەی نەگیرابوون وازیان لە سەرکردایەتی ئازادی هێناو لە ناوخۆیان بوو بەگەڕەلاوژە. وابەدیاردەکەوێ شێخ سەعید ویستبێتی نەخشەی رزگارکردنی خالید بەگی جبرانی دابنێت لە گرتووخانە چونکە خزمی بووە[326].

هەڵگەڕانەوەی سەرنەگرتووی خانەی گەنجان چەندین لایەنی گرنگی هەبوو، بۆ رۆشنبیرو ئەفسەرانی کوردی دەرخست ناتوانن بەشێوەیەکی بەرفراوان جەماوەر بەگەڕبخەن، هەروەها حکومەتی تورکی بەخۆداهێنایەوە لەسەر تۆکمەیی کارکردنی ئازادی لە دژی حکومەت. لێرەوە دەسەڵاتدارانی تورکی زۆر بە وردی کەوتنە چاودێری جوڵانەوەی نەتەوایەتی کوردو تەنگیان بە پیاوماقوڵانو جوڵانەوەکە هەڵچنی، هەتا هەندێکیان لێ دوورخستنەوە بۆ دەرەوەی کوردستان.

---

[325] -- Olson, p.45.

[326] - ,Agha, Shaikh and the State, p.383 سلوبی: ص104-105

## رۆڵی شێخ سەعید لە ڕاپەڕینەکە

بەپێی وتەی هێژا عەبدولمەلیك فوراتی نەوەی شێخ، ڕەچەڵکی شێخ سەعید دەگەڕێتەوە بۆخێزانێکی ئایینی دێرین، کە زیاتر لە (500) ساڵ خزمەتی زانستی ئیسلامیی و تەریقەتی سۆفیەتیان کردووە. نەوەی شێخ علی سەبتی نەقشبەندیە، کە لەگوندی سەبتی نزیك دیاربەکر دانیشتوون، شێخ سەعید هەندێ جار بەناوی سەعید مەحمود عەلی ئامەدیەوە نامەی واژۆکردووە، عەلی سەبتی باپیرەی بۆ گوندی "بالۆ"ی ویلایەتی کینج کۆچی کردووە، لەوێ توانیویەتی دۆستایەتی زازاییەکان مسۆگەر بکات.

لە سەردەستی مامی زانستە ئیسلامییەکانی وەکو فقهەو ئوسوڵی دین و ژیربێژیو ڕێزمان "النحو"و فەلسەفەی خوێندووە، بە زیرەکی خۆی ڕێزو تەقدیری زانایانی ئەو سەردەمەی بۆ لای خۆی ڕاکێشاوە، سەرەڕای زیرەکی کەسایەتیەکی بەگوڕو بە ناوبانگی لێو بەخەندەو روخسار کراوەو زاهید و لە خواترس بووە، باوەڕی وابووە تەریقەتی نەقشبەندی لەبەر ئەوەی لە زەمانە دانەبڕێ پێویستی بە چاکسازی هەیەو دەبێت بە ئاکاری جیهاد خۆی نوێ بکاتەوە، شێخ سەعید لەگەڵ خزمە نزیکەکانی بەشدار بوون لە شەڕی رووسی– عوسمانیدا، سەرەڕای ئەمانە لە خاوەن موڵکە گەورەکانی کوردستان بووە[327].

شێخ سەعید پیاوێکی جولاّوەو هوشیار بوو، زۆری پێی ناخۆش بووە ڕێبازی سۆفیگەری لە مەینەتیەکانی موسڵمانانی کورد دابڕاوە، مستەفا کەمال خەلافەتو شەریعەتی لاداوە، بەشداریکردووە لەوە قەناعەت بە ئەفسەرانی سوارەی حەمیدیە بهێنێ پشتگیری خەباتی "ئازادی" بن لە دژی مستەفا کەمال، لەکاتێکدا ئەفسەرانی حەمیدیە مێشکیان ئاودرابوو بە بیروبۆچوونەکانی سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم لە پشتگیریکردن لە جامیعەی ئیسلامیی و پارێزگاری لە شەریعەت[328].

بیرەوەری ئەفسەرانی بزووتنەوەی خانەی گەنجانو بەڵگەنامەکانی ئازادی، کە ئینگلیز توانیبووی بەدەستی بخا ئەوەی یەکلاکردۆتەوە، کە شێخ سەعید ئەندامی

---

[327]-Girisim, No, 4-1989 -

[328] -Bruin Essen, pp. 278-279

ئازادی نەبووە[329]، بەڵام لە پەیوەندی بەردەوام دابووە لەگەڵ ئازادی، ئەمەش لە ڕێگەی خالید بەگی جیرانی خزمیەوە. برۆنسن پێی وایە شێخ سەعید خۆی لەوە بەگەورەتر زانیووە بداتە پاڵ جوڵانەوەیەك كە كۆمەڵێك ئەفسەر سەركردایەتی بكەن، لەمەدا ڕاستیكردووە، ئەگەر بەراورد بكەین لە نێوان شوێنی شێخ سەعید لەناو ئازادی و شوێنی مستەفا بارزانی لەناو پارتی دیموكراتی كوردستانی عێراقو شوێنی قازی موحەممەد لەناو حیزبی دیموكراتی كوردستانی ئێران، هەرچەندە هەریەك لە قازی مەحەممەد و بارزانی ببوونە سەرۆكی هەردوو حزب، بەڵام خۆیان لە حزب بەگەورەتر زانیووە، چونكە كەسایەتی ئەوان گەورەتر بووە لەكەسایەتی سەرۆكی حزب[330].

لەدوای گیرانی خالید بەگی جیرانیو یوسف زیا بەگ لەكاتی دادگایی كردنیان لەكانوونی دووەمی (1925ز)، داوا لە شێخ سەعید كرا لە بەدلیس ئامادە بێت بۆ وەڵامی چەند پرسیارێك، شێخ زانی ئەمە پیلانە بۆ گرتنو دوورخستنەوەی لە مەڵبەندی دەسەڵاتیو تەكیەكەی لە بالۆ، بیانووی هێنایەوە، كە نەخۆشەو ناتوانی لە بەردەم دادگا ئامادە بێت.

شێخ دەیزانی ناتوانێ تاسەر نەچێت بەپیر داواكاری دادگاوە، بۆیە پەلەی كرد لە گرتنەبەری ڕێوشوێنی جێگرەوە، ئەویش بە ڕاگەیاندنی ڕاپەڕین، لەو ماوەیەدا شێخ سەعید سەردانی چەندین سەرۆك هۆزی كردو هانی دابوون بۆ جیهاد لە دژی ڕژێمی كەمالی، شێخ عەلی كوڕی ناردبوو بۆ حەڵەب هەتا (20) ڕانە مەڕ بفرۆشێ بۆ خەرجیەكانی جوڵانەوەكە، لە دوای گەڕانەوەی لە حەلەب شێخ سەعید ناردی بۆ ئەستەنبوڵ بۆ وتوێژ لەگەڵ هێژا عەبدلقادری شەمزینی "كەسایەتیەكی ناوداری كوردیو سەرۆكی كۆمەڵەی بەرزیو پێشكەوتنی كوردی قەدەغەكراو"، وادەردەكەوێ عەلی ڕەزا پشتگیریو پشتیوانی سەید عەبدولقادری شەمزینی دەست كەوتبێت، لەسەر پێكەوەبەستنەوەی مەزڵومیەتی كوردو گەڕانەوەی خەلافەت[331].

---

[329] - FO, 371\1924 (Ell, 093\11093 A, Report on Kurdish Nationalism Society in East Anatolia

[330] .- Aqha, Shaikh, and State. P354

[331] ـ حسرتیان، 72-73

زیارەتی شێخ سەعید لە بالۆ بۆ پیران لە شوباتی (1925ن) لە چوارچێوەی گرتنە بەری ئامادەکاریدا بووە بۆ ڕاپەڕینو ڕووداوی دەستدرێژیکردنە سەر دوو لە هاوەڵانی، کە بووە هۆی تەقینەوەی شۆڕش بەر لەکاتی خۆی. ئەمە پیلانی حکومەت بووە بە مەبەستی وروژاندنی شێخ هەتا پاڵی پێوەبنێ بەر لەتەواو کردنی ڕێوشوێنی پێویست ببزوێ.

لەگەڵ ئەوەشدا شێخ سەعید لەوەپێش شارەزایی لە کاروباری سەربازییدا نەبوو، دەستەی ئەرکانی جەنگی لە مریدەکانی تەریقەتی نەقشبەندی پێك هێنا بوو، هێزەکانی کردبووە پێنج بەش‌و بۆ هەر بەشێکی فەرماندەیەکی دانابووە، بەم شێوەی خوارەوە:

1ـ کەرتی خەربووت ـ عەزیز ـ لە چۆقەرەوە بۆ شێخ شەریف.

2ـ کەرتی باکوور لە مەلەکانەوە بەفەرماندەی شێخ عەبدوڵلا، زۆربەی موجاهیدانی ناوچەی مووش، فارتۆ، چیاقچۆرە، لە ژێر فەرماندەی ئەودا بوون، شێخ عەلی ڕەزای کوڕی لەو قۆڵەوە لە ژێر فەرماندەی ئەو دابووە.

3ـ کەرتی دیاربەکر، بە فەرماندی شێخ هەقی.

4ـ کەرتی سلێڤان، بە فەرماندەی شێخ شەمسەدین.

موجاهیدەکان بە شێخ سەعیدیان وتووە: "میری موجاهیدان"، بەڵام ئەو ڕێنومایییەکانی خۆی بەناوی خزمەتکاری موجاهیدانەوە واژۆ کردووە[332]. نورەدینی دەرسیمی عەلەوی دەڵێ: لە دوای گرتنی فەرماندەکانی ئازادی شێخ سەعیدیان بە سەرۆکی ئازادی هەڵبژاردووە، ئەوانیش ڕێوشوێنیان داناوە بۆ بەردانی سەرکردەکانی ئازادی، بەوەی هۆزەکان چەکدار بکەن‌و وریایان بکرنەوە لەگەڵ دیاریکردنی (21)ی ئازار بۆ ڕاپەڕینی چەکداری[333]. هێژا ج. بلەشێرکۆ "میر جەلادەت بەدرخان". دەنووسێ: شۆڕش بە نەخشەی شەهید میرئالآ خالید بەگی جیرانی بوو، ئەندامانی ئازادی ناردبوویان بۆ لای سەرۆك هۆزەکان هەتا هانیان بدات بۆ شۆڕش، هەروەها خالید بەگ چەك‌و تەقەمەنی بەسەر شەڕگەکاندا دابەش دەکرد، بەڵام شۆڕش بەر لەکاتی

---

332 - Bruin Essen, p.385

333 - سلوبی.ل108-16، Kurdistan Tarihinda Darasim, (Alepo:Ari Matbasi, 1932) pp.174-175

دیاریکراوی که 21ی ئازار بوو، له 25 رۆژ پێشتر هەڵگیرسا، خالید بەگو کۆمەڵێك لەئەفسەرە کوردپەرەوەکان دوور بوون له شوێنی رووداوەکە، یەکسەر چوون بۆ ویلایەتی کینج، بۆ سەرپەرشتیو بەڕێوەبردنی راستەوخۆی شەڕ، بەڵام بەر لەوەی بگەنە ئەویٚ گیران[334].

هەموو ئەو زانیارییانەی دەرسیمی و جەلادەت و زانیاری زۆربەی نووسەرانی "کوردو غەیری کورد" بۆ هەڵگیرسانی شۆڕش پێویستی به رەخنەو بەدواداچوون هەیە، ڕاستە هەردوو نووسەر له هاوچەرخانی شێخ سەعیدن، بەڵام ئەوانە له داڕێژەرانی پلان، یان ئەنجامدەرانی شۆڕش نەبوون، ئەندامی "ئازادی"یش نەبوون، دابینکردنی زانیاری لەناو رێکخراوێکی نهێنی وەکو ئازادی کارێکی قورسە، میر جەلادەت کاتیٚ دەڵیٚ: عەقید خالید بەگی جیرانیو ئەفسەرانی دی بەرەو شوێنی رووداوەکە رۆیشتن، خالید بەگ پێشتر له مانگی تشرینی دووەمی (1924ز) له دوای جوڵانەوەکەی خانەی گەنجانەوە گیرابوو.

هێژا برۆنسن هەندیٚ زانیاری زارەکی له مەلا حوسێن وەرگرتووە، که کاتی جوڵانەوەی شێخ سەعید تەمەنی بیست ساڵان بووە، بەپێی ئەو زانیارییانە له مانگی کانوونی دووەمی (1925ز) کۆبوونەوەی سەرۆکهۆزەکان بووە له ناوچەی زازا بەر له هەڵگیرسانی شۆڕش به چەند هەفتەیەك. بەپێی شایەدی مەلا حوسێن ئەوە کوبوونەوەی ئەندامانی ئازادی بووە[335].

مەلا حوسێن ئەندامی ئازادی نەبووە، دەگونجێت کۆبوونەوەکانی ئازادیو هی سەرۆکهۆزەکان لەسەر بانگەشەی شێخ سەعیدی لیٚ تێکەڵاو بووبێت، وەکو باسمان کرد هیچ بەڵگەیەکیش نییە لەسەر ئەندامیەتی شێخ سەعید له ئازادی. پرۆفیسۆر "ئۆڵسن" له پەراوێزی بەشی پێنجەمی کتێبەکەیدا دەڵیٚ: (ئەو زانیارییانەی مەلا حوسێن ورد نین، وەکو خۆی دەیەویٚ و باوەڕی پێیەتی وێنەی ئەو شۆڕشەمان بۆ دەگریٚ، به زۆری له قسەکانی تێك ناکاتەوە)[336].

---

[334]- القضية الكردية، ماضي الكورد و حاضرهم. بيروت، دار الكتب 1986، من اصدارات ، جمعية خويبون، ص94

[335]- Agha, Shaikh and State, p.354

[336] - The Emergence of the Kurdish Nationalism and the Sheikh Said Rebellion. P.456

ڕێڕەوی ڕووداوەکانو دەسەڵاتی تەواوی شێخ بەسەر شۆڕش، ئەوە دەسەلمێنن، کە شۆرشەکە بەرهەمی تەریقەتی نەقشبەندی بووە، هەروەها کە بە شۆڕشگێڕانیان وتووە: موجاهید و بە فەرماندەی بەرەکانی شەڕیان وتووە: ئەمیرو شێخ سەعید گوتاری ئیسلامی بەکارهێناوە بۆ هاندانی جەماوەر، ئەمانەش پشتگیریکاری ئەو بۆچوونەن.

خەڵکی رۆشنبیر "ئەفسەر و پیشەوەرانی کورد" لە شار بەشدارییان لە شۆڕش دا نەکردووەو ئەو ناوچانەی لە ژێردەستی ئیدارەی کوردی بە شێوازی ئایینی بەڕێوەچوون، دانیشتوانی شار بەشدارییان نەبووە لە بەڕێوەبردنی ئەو ناوچانە.

شایەدیدانی زنار سلۆپی "قەدری جەمیل" بەرپرسی لقی دیاربەکری ئازادی گرنگە لە بابەت زۆر لەگرێ کوێرەکانی تایبەت بەو بابەتە، سلۆپی دەڵێ: (لە شوباتی (1925ز) لەو کاتەی لە دیاربەکر بووین بیستمان چەند جەندرمەیەك لە گوندی پیران کوژران، ئێمە ئەندامانی ئازادی بەهۆی گیرانی خالید بەگی سەرۆکی کۆمەڵە و ژمارەیەك لە ئەندامە چالاکەکانی کۆمەڵە وەستا بووین، هیچمان لە هۆکارەکانی ئەو ڕووداوە نەدەزانی، ئێمە بێئاگابووین بەوەی جولانەوەکە بە بڕیاری کۆمەڵە دەستی پێکردبێت)[337].

بە شایەدی ئەو هاوچەرخەی ڕووداوەکان دەردەکەوێت ڕاپەڕینەکە لە بەرنامەڕێژی سەرکردایەتی ئازادی نەبووە، ئەگەر دەستەواژەی "بێئاگا بووین بەوەی جولانەوەکە بە بڕیاری کۆمەڵە دەستی پێکردبێت" ئاماژە بێت بۆ ئەو پرسیارەی شێخ سەعید، یان لقی ئازادی، کامیان نەخشەی شۆڕشیان هەڵگیرساند، ئەوە پێشتر وەڵامی ئەو پرسیارەمان دایەوە، کە شۆڕش لە نەخشەی هیچیان نەبووە، بەڵکو نا ئاسایی دەستی پێکردووە.

ئەم خستنەڕووە کورتە بۆمان دەردەخا، کە شێخ سەعید ڕۆڵی هەبووە لە هەڵگیرسانی شۆڕش و ڕاپەڕاندنی، نەك ئازادی، هیچ بەڵگەیەکی یەکلاکەرەوەش نییە لەسەر ئەندامیەتی شێخ سەعید لە ئازادی، لەگەڵ ئەوەدا پەیوەندی لە نێوانیان دا هەبووە. ڕۆڵی ئازادی لە دوای جولانەوەی خانەی گەنجان لەباریەکچووو، بەڵام زۆربەی توێژەرەوان خۆئامادەکردنەکانی ئازادی، یان خانەی گەنجان جیاناکەنەوە لەگەڵ چالاکیەکانی شێخ سەعیدو بزووتنەوەی نەقشبەندی، کە بووە هۆی ڕاپەڕینی پیران،

[337]- سلوبي، في سبيل كردستان، ص113.

لێك جیانەكردنەوەی ئەم دوانەش بۆتە هۆی تێكەڵابوونی ئەم دوو جوڵانەوەیە، ئەمەش تاڕادەیەك لە درووستكردنی ئیشكالیەت بەشدارە لەسەر هۆكارەكانی سەرهەڵدانی شۆڕشی پیران.

لایەنێكی تریش هەیە بۆتە هۆی ئەم تێكەڵاوكردنە، ئەویش لێدانی سەركردە نەتەوەخوازەكانە لە ئەندامانی كۆمەڵەی بەرزیو پێشكەوتنی كوردستان لە ئەستەنبوڵ لەلایەن حكومەتی توركی، ئاماژەماندا كە جوڵانەوەی شێخو خانەی گەنجان مستەفا كەمالی وریاكردەوە رێوشوێنی توند لە بەرانبەر بزووتنەوەی نەتەوایەتیی و رێكخراو و كەسایەتییە كوردییەكان بگرێتەبەر.

لە دوای دیلكردنی شێخ سەعید و فەرماندەكانی پیران حكومەتی توركی هەستی بە بەهێزی خۆی كردووە، پەیوەندی نێوان شێخ سەعیدو شێخ عەبدولقادری قۆستەوە بۆ گرتنی ئەو سەركردەو نووسەرانەی وەكو كەمال فەوزی سەرنووسەری رۆژنامەی "ژین"و "رۆژی كورد"و دكتۆر فوئادو حاجی ئاختی كوڕسەعید بالولو ئەكرەم جەمیل پاشا، هەریەك لەو كەسایەتیانە پێشتر ئەندامی كۆمەڵەی بەرزیو پێشكەوتنی كوردستانو كۆمەڵەی ئازادی بوون، بەڵام هیچ كاریگەریان بەسەر ئەو جوڵانەوەیەوە نەبووە. لە كاتی دادگایی ئەو كەسایەتیانە دەیانووت ئێمە نەخشەسازو راپەڕێنەری شۆڕش نین[338]. لەو قسانەش راستگۆ بوون، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دادگای ئستیقلال لەگەڵ شێخ سەعیدو ئەوانی تر بڕیاری لە سێدارەدانی بۆ دەركردن.

دادگایی ئەو سەركردانەی بزووتنەوەی نەتەوایەتی لەگەڵ سەركردەكانی ئەو جوڵانەوەیە بۆ مەبەستی چەواشەكاری بۆ حكومەت پێویست بوو، هەتا بۆ دابڕینی لە موسڵمانانی تورك بۆیاخی نەتەوایەتی بدات لە بزووتنەوەی شێخ سەعید، بەیاننامە حكومی و رۆژنامەكانی توركی رۆڵی گرنگیان بینیوە لە خشتەبردنی ناسنامەی درووستی راپەڕینەكە، راگەیاندنو لێدوانی بەرپرسانی حكومی ئاماژە بەرۆڵی چاوتێبڕینی بێگانە دەكەن بۆ سەر خاكی توركی، كە ئەوانە بە هاوكاری "خیانەتكارانی كورد" هەوڵی دامەزراندنی دەوڵەتی كوردی دەدەن.

---

338-Bayard, pp. 145, 158, 313: Malmisanij. Bitlisi Kamal Fauzi (Isanbul: Fiat Yayin). p.68

وا دەردەکەوێ ڕاگەیاندنەکانی حکومی لە بەرانبەر جوڵانەوەی شێخ سەعید لە ئاستی ناوخۆ جەختی کردبێتە سەر ڕوخساری نەتەوایەتیو لە ئاستی دەرەوەدا جەختی کردبێتە سەر ڕوخساری ناسنامەی ئیسلامیی[339]. لە بەرانبەر ناوخۆدا ئامانجی بێبەشکردنی بووە لە ژینگەی ئیسلامیی تورکی و کورتهەڵهێنانی لە ناوچە کوردییەکان، لە ئاستی دەرەوەش ویستوویەتی هێزەکانی ئەورووپی بترسێنێت بەگەڕانەوەی کۆنەپەرستیو دەمارگیریو خەلافەت. لە (3)ی مایسی (1925) دوای کەوتنی هەموو سەنگەرە سەرەکیەکانی شۆڕشو بەدیلکردنی فەرماندەکان، ئەنجومەنی ئەرکانی تورکی کۆبوونەوەیەکی نهێنی بەستو دانی نابوو بەوەی کە لە دوای لێکۆڵینەوە لە هەموو هێڵەکانی شۆڕش لە ڕێگەی شایەدانو بەڵگەنامەکان دەرکەوتووە شۆڕشێکی ئیسلامییەو گەڕاندنەوەی خەلافەتو شەریعەتی مەبەستە، ئەم هەڵسەنگاندنەی بە ژمارە (1845) بەسەر هەموو بەڕێوەبەرایەتیە پەیوەندیدارەکانی دەوڵەتدا دابەش کردبوو، "موحەممەد بایراك" نووسەری ناوداری کورد بە شێکی ئەو بەڵگەنامەیەی دەستکەوتووە و لە کیتێبەکەیدا لەسەر جوڵانەوەی شێخ سەعید بڵاوی کردۆتەوە[340]. ئەمەی ڕۆڵی ئاسانکاری بینیوە لەو چەواشەکارییە هاوکاری نێوان دەسەڵاتدارانی ئاسایشی تورکیو قاسم بەگی جیرانی برای عەقید خالید بەگی جیرانی خزمی شێخ بووە.

قاسم بەگ لە کوردە نەتەوەخوازە چالاکەکان بووەو خزمی شێخ سەعیدبووە، ئەمەی بەدەرفەت زانیبوو بۆ ڕاکێشانی متمانەی ئەو بەلای خۆیداو ببێتە هاریکار، بەڵام لە کاتی شۆڕشدا پەیوەندیی بە حکومەتەوە کردووەو ئاگاداری کردوونەتەوە لەسەر هەوڵەکانی شۆڕشو دواتر ڕۆڵی گرنگی بینی لە بەگرتدانی شێخ. وەکو پێشتر باسمان کرد، هۆی خیانەتکاری قاسم بەگ نەزانراوە بەڵام دەگونجێ وەکو سەرکردەیەکی سەربازی لادەر درکی بەوە کردبێت کە شۆڕشەکە لەبار دەچێت، هاوکاری حکومەتی کردبێت لە بەرانبەر بەرژەوەندیو سەلامەتی خۆی.

---

339 -Girisim, NO. 4-1989

340- سەرچاوەی پێشوو، ل407

چەندین بەڵگە هەیە لەسەر هاوکاری نهێنی نێوان ئەندامانی دەستەی دادگای محەلی سەربەخۆ لە دیاربەکر و رائید قاسم بەگ، بەپێی شایەدی عەونی دوغان یاریدەری داواکاری گشتیی لە دادگای ئیستقلال لە دیاربەکر، عیسمەت پاشا ڕۆژانە لە پەیوەندیدا بووە لەگەڵ ئەندامانی دادگا لە دیاربەکر "بە ڕێگەی جفرە"وە ڕینومایی بۆناردوون، داوای لە داواکاری گشتیی و ئەندامانی دەستەی دادوەری کردووە، کە بە ڕێگەی دەست خستنە ناو ئەندامانی بەرهەڵتسکارو کەسایەتی ئیسلامیی ئەنقەرەو ئەستەنبوڵ سەرکردە موجاهیدەکان ببزوێنن[341]. دوور نییە لە کاتی دادگایو هەروەها لە کاتی شۆڕش قاسم بەگ هاریکاری حکومەتی کردبێت، شایەتیدانی لە بەرامبەر دادگای سەربەخۆدا تێبنی ئەو هاوکارییەی قاسم بەگ بۆ حکومەت دیارە، ڕۆژنامەی "الوقت"ی تورکی لە ژمارە(9)ی حوزەیرانی (1925) بۆمان دەگێڕێتەوە کە قاسم بەگ گوتویەتی: (.. لە ڕاستیدا سەید عەبدولقادرو بەدرخانییەکان، ئەوانەی لە ئاستانە دانیشوون پڕوپاگەندەیان بۆ بزووتنەوەی نەتەوایەتی کوردی کردوووە، بەرهەمی ئەو چەند ساڵەی هەوڵەکانیان دامەزراندنی کۆمەڵەی بەرزی و پێشکەوتنی لێکەوتۆتەوە، پێم وایە لە هەرێمەکانی تریش لقیان دامەزراندبێت، لە ماوەیەکی کەمی ڕۆژانی شەڕی گەورە کارەکانی ئەم کۆمەڵەیە وەستا، بەڵام لە دوای ئاگربەست لاوازی حکومەتی تورکیو گەلی تورکیان بە دەرفەت زانیوە سەر لەنوێ ڕێکخستنەکانیان دەست پێکردەوە...).

هێژا بایراك لەکتێبەکەی دا لەسەر بزووتنەوەی شێخ سەعید چەند بڕگەیەکمان لەسەر دادگایی کردنەکەی قاسم بەگ بۆ دەگێڕێتەوەو دەڵێ:

سەرۆکی دادگا: پێ دەچێ سێ هۆکار هەبووبن بۆ هەڵگەڕانەوەی شێخ سەعید: ئایین، ڕۆژنامە، ئۆپۆزسیون، بەتایبەتیش چەند ڕۆژنامەو گۆڤارێکی ئەستەنبوڵ.؟

قاسم بەگ: بەڵێ ئەو هۆکارانەی باستان کرد ڕۆڵیان هەبووە، بەڵام چەخت لەسەر ئەوە دەکەم کە هۆکاری بنەڕەتی بریتی بووە لە ئارەزووی سەرکردەکان بۆ بەدەست هێنانی سەربەخۆیی، کۆمەڵەی ئازادی بۆ ئەو ئامانجە کاری دەکرد، بەڵام نکوڵی لەو مەسەلەیە ناکرێ کە باسمان کرد، بەرهەڵستکارانی ئیسلامیی لەسەر لاپەڕەی ڕۆژنامەکانی "تەوحیدی ئەفکار"و "سەبیلو رەشاد"و "سەون تەلەگراف" کاریگەری گەورەیان هەبووە لەسەر سەرکردەکانی بزووتنەوەی پیران.

---

341 - سەرچاوەی پێشوو، ل407

سەرۆکی دادگا: شێخ سەعید لەوە پێش هەندێ ڕێوشوێنی گرتبووە بەر، ئەمە وایە؟ کێ بەشداری لەو هەنگاوانەدا کرد؟ هۆکارە شاراوەکانی پشت هەڵگەڕانەوەکە چین؟

قاسم بەگ: سەرکردەکانی شۆڕش ئایینیان وەکو ئامرازێك بەکارهێناوە بۆ چەواشەکردنی خەڵکی سادە، بەڵام ئامانج نەتەوەیی بووە.

سەرۆکی دادگا: ئەنجامدەرانی راستەقینەی شۆڕش کێ بوون؟

قاسم بەگ: سیاسەتمەدارو پیاوە ئایینەکان، سیاسەتمەدارەکان ئایینیان بۆ ئەنجامدانی شۆڕش بەکارهێناوە[342].

ئەگەر بەووردی لە گەواهیدانەکەی قاسم بەگ بڕوانین دەگەینە کۆمەڵێك خاڵ کە پەیوەندی هەیە بە هاوکاری نێوان قاسم بەگو ئەندامانی دادگا، قاسم بەگ جەختی لەسەر تێڕوانینی فەرمی حکومەت کردۆتەوە لەسەر راپەڕینەکە. لەوانە لایەنی نەتەوایەتی کوردی بۆ شۆڕشو دەستەواژەی "بەکارهێنانی ئایین وەکو ئامراز"، ئەمانە لە ڕاگەیاندنەکانی حکومەت چەند بارە بوونەتەوە. دەستەواژەی "کورد لاوازی گەلی تورکو حکومەتی بەدەرفەت قۆستۆتەوە" بە ڕوونی بەڵگەیە لەسەر قاسم بەگ، کە خۆی لە شۆڕش بێبەری کردووەو ماستاو بۆ حکومەت دەکات.

شایانی باسە دادگای سەربەخۆ بڕیاری لە سێدارەدانی بەسەر شێخ سەعیدو هاوڕێکانیدا سەپاند، لە کۆی (47) کەس تەنیا قاسم بەگ رزگاری بوو، ئەمەش بەڵگەیەکی ترە لەسەر هاریکاری پێشتری نێوان قاسم بەگو دەسەڵاتدارانی تورکی لەکاتی لێکۆڵینەوە لە بەردەم دادگای دیاربەکر.

زۆر لە نووسەران بێ وردبوونەوە لە قسەکانی قاسم بەگ، دەیکەنە بەڵگە لەسەر ناسنامەی نەتەوەیی شۆڕشەکە.

لە (29)ی حوزەیرانی (1925) دادگای دیاربەکر بڕیاری لە سێدارەدانی بۆ سەرکردەکانی شۆڕش دەرکرد، ئەمە وتاری سەرۆکی دادگایە لە کاتی خوێندنەوەی بڕیارەکە ئاڕاستەی شۆڕشگێرانی کردووە: (هەندێك لە ئێوە ئایینی بۆ مەبەستی ریسوایی تایبەتی خۆی بەکارهێناوە، ئەوانی تر بە هاندانی بێگانە چاویان بڕیوەتە خواستی سیاسیی، لەسەر خاڵێك ڕێککەوتون ئەویش دامەزراندنی کوردستانی

---

[342] - سەرچاوەی پێشوو. ل69-70

سەربەخۆ بووە، سزای ئەو خوێنەش دەچێژن کە ڕشتانو ئەو ماڵانەی ڕوخاندتان، بۆیە بۆ جێبەجێ کردنی دادگەری بەسەر ئەو دارەوە هەڵدەواسرێن[343].

شێخ سەعید وەڵامی ئەو بڕیارەی دایەوە کە "خوا شاهیدە ئەم شۆڕشە نە دەستکردنی سیاسەتمەدارانی کوردەو نە ئاکامی دەستێوەردانی بێگانەیە)، بەڵام هەندێ لە نووسەران ئەوانەی جەخت دەکەنە سەر ناسنامەی نەتەوەیی بەسەرپێیی ئەو بڕیارە دەکەنە بەڵگە، کە دادگای تورکی دەریکردووە بەرانبەر شێخ سەعیدو هاوڕێکانی، ئەوەیان بەهەند هەڵنەگرتووە کە مەسەلەیەکی ئاسایی نییەو ناحەزانە ئەو بڕیارە دەرچووە، ئەوەش نابێتە حوکمدانێکی درووست لەسەر هەڵسەنگاندنی ناسنامەی لایەنەکەی تر لەو ململانێیەدا، لەکاتێکدا جەختی بڕیاری دادگا لەسەر پڕوپاگەندەکانی پێشوو دامەزراوە.

لایەنێکی تری ئیشکالیەتی شۆڕشی شێخ سەعید پەیوەستە بە وەڵامدانەوەی ناوبراو بە ئینگلیزو وردتر بە ئیدارەی ئینگلیز لە عێراق، حکومەتی تورکی بۆ دابڕانی شۆڕش لە سۆزی موسڵمانانی کوردو تورك خۆی ئەو بوختانەی هەڵبەست. بارودۆخی سیاسییی لە ساڵی (1925ز) بەهۆی ململانێی نێوان حکومەتی تورکیو ئیدارەی ئینگلیز لە عێراق لەسەر دەستبەسەراگرتنی ویلایەتی موسڵ، کە لەبار بوو بۆ قبوڵ کردنی ئەو تۆمەتانە لەلای رای گشتیی تورکیا، گەرچی کێشەی ویلایەتی موسڵ دەروازەیەکی تری لێکۆڵینەوەکەمانە، کە دەمەوێ لێرەدا هەندێ لە هێڵەگشتیەکانی ئەو کێشەیە بخەینەوە بیر. بەر لە مۆرکردنی ئاگربەستی مۆندەرۆسی (1918) لە نێوان دەوڵەتی عوسمانی تێکشکاوی شەڕی یەکەمی جیهانیو دەوڵەتە سوێندخۆرەکان، هێزەکانی بەریتانی توانیبوویان بگەنە بەشێکی ناوچە کوردییەکانی باکووری عێراق، کە ئەوکاتە پێی دەوترا "ویلایەتی موسڵ"و شاری موسڵ مەڵبەندی ویلایەتەکە بووە، ئینگلیزەکان بەندێکیان خستە سەر ڕێککەوتنامەی مۆندەرۆس هەتا بتوانن بەردەوام بن لە داگیرکردنی تەواوی باکووری عێراق، لە دوای ئاگربەست بەریتانییەکان، چونکە ئاگاداربوون بە کۆگا نەوتییەکانی باکووری عێراق، ئەم بەندەیان کردە بیانوو بۆ ئەوەی داوا لە هێزەکانی عوسمانی بکەن لە هەموو ناوچەکانی باکووری عێراق "ویلایەتی موسڵی پێشوو"

---

[343] - سەرچاوەی پێشوو، ل322-323، 323-329

بکشێنەوە. عوسمانییەکان توانای بەرگرییان نەبوو بەرانبەر پێداگرتنی ئینگلیز، ناچار ناوچەکەیان بەجێهێشت.

لە دوای هاتنی مستەفا کەمالو سەرکەوتنی بەسەر یۆنان و هاوپەیمانەکانی ئینگلیز، تورکیای تازە لە ساڵی (1922ز) متمانەی بە خۆی پەیدا کردو سەر لەنوێ داوای دەرچوونی ئیدارەی ئینگلیزی کردەوە لە باکووری عێراق. بە بۆچوونی تورکیا بە پێشێلکردنی رێککەوتنامەی مۆندەرۆس داگیرکراوە، ئەم ناوچەیەی بە زۆرینەی کوردو تورك دانا بوو، لەگەڵ ئەو باوەڕەش کە ئەم دوو نەتەوەیە یەك رەگەزن.

رێککەوتنامەی لۆزان لە ساڵی (1923ز) لەنێوان تورکیاو دەوڵەتانی سوێندخۆر واژۆکرا، بەڵام کێشەی موسڵی بۆ یەکلایی نەکرایەوە، لە ساڵی (1924ز) کێشەی موسڵ بۆ یکلایی کردنەوە رەوانەی کۆمەڵەی گەلان کرا، کۆمەڵەی گەلانیش لیژنەیەکی دەولی بۆ یەکلایی کردنەوەی راستییەکان نارد تا سەردانی ویلایەتەکە بکات، لیژنەی ناوبراو لە ئازاری (1925ز) گەیشت، هاتنی لیژنەکە هاوکات بوو لەگەڵ سەرهەڵدانی جوڵانەوەی شێخ سەعید، ئەمە حکومەتی تورکیو راگەیاندنی تورکی تیژکردەوە لەسەر پڕوپاگەندە بۆ شۆرشی کوردی، کە بەشێکە لە هەوڵەکانی ئینگلیز بۆ درووستکردنی ناکۆکی نێوان کوردو تورك، هەتا کورد لە بەرانبەر لیژنەکە لە دژی گەڕانەوەی هێزەکانی تورکی بۆ باکووری عێراق دەنگ بدەن، بۆ نموونە رۆژنامەی "لغازتیە" لەلایەن حکومەتی تورکیەوە بە زمانی فەرەنسی دەردەچوو، لە ژمارەی (19)ی نیسانی (1925ز) واتە مانگێك دوای سەرکوتکردنی شۆڕش نووسیویەتی: (ئەو بەڵگەنامانەی لە قاسم بەگ، کە یەکێکە لە سەرکردەکانی شۆڕش گیراوە دەیسەلمێنێ کاتی خۆی سەرکردەکانی شۆڕش لە پەیوەندی بەردەوام دابوون لەگەڵ ئینگلیز، بەڵگەنامەی تریش هەیە کە پەیوەندی پێشتری شێخ سەعید بەدیاردەخا لەگەڵ ئینگلیزو رازی بوون لەسەر هەڵگەڕانەوە). رۆژنامەی "تەوحیدی ئەفکار" لە ژمارە (5)ی شوباتی (1925ز) بڵاوی کردۆتەوە، کە فرۆکەکانی بەریتانی بەیاننامەی شێخ سەعیدیان لە ناوچە کوردییەکان بڵاوکردۆتەوە. رۆژنامەی ناوبراو لەسەری دەڕواو دەڵێ: (بەداخەوە برا کوردەکان لەم بارودۆخە ناسکەدا، کە یۆنانییەکان لە ڕۆژئاواو ئینگلیز لە باشووری رۆژهەڵاتی نیشتیمان هەڕەشەمان لێدەکەن کوردەکان کێشەمان بۆ دەخولقێنن). راگەیاندنە فەرمیەکانی حکومەتیش بە بەردەوامی ئاماژەیان کردووە بە پەیوەندی شێخ سەعید بە

بێگانەوە. هەروەها لێدوانەکانی بەرپرسانی حکومەتو وتووێژەکانی ئەنجومەنی نیشتیمانی تورکی کاتی قەیرانەکە، سوورن لەسەر پەیوەندی جولانەوەی شێخ سەعید بە پیلانی بێگانە[344].

دکتۆر رۆبەرت ئۆلسن لە لێکۆلینەوەیەکی پشتئەستوور بە بەلگەنامەی تورکیو بەریتانی لەسەر جولانەوەی شێخ سەعید دلنیامان دەکاتەوە، کە هیچ بەلگەیەك نییە لەسەر دەستێوەردانی بەریتانی لە جولانەوەی کوردی. نووسەری ناوبراو دەنووسێ: (لە ڕاستیدا هیچ بەلگەنامە، یان ئاماژەیەك نییە لەسەر پەیوەندی نێوان شێخ سەعیدو ئینگلیز، ئەو بانگەشەی تورکیا تەنیا راگەیاندنە)[345].

نووسەری ئەم وتارە ماوەیەکی زۆری لە لەندەن بەسەر بردووەو چەندین دۆسیەی بەریتانی لە بەڕێوەبەرایەتی بەلگەنامەکانی پاشایەتی پشکنیوە لەسەر ئەو جولانەوەیەو هیچ شوێنەوارێکی نەدیووە لەسەر پەیوەندی نێوان شێخ سەعیدو ئیدارەی ئینگلیز لە عێراق، بەلکو چەندان بەلگەنامەی ئینگلیز هەیە لەسەر چاودێری رووداوەکانو یاداشتنامەی ئالوگۆڕکراوی نێوان بەرپرسانی ئینگلیز لە هەریەك لە بەغداو لەندەن لەسەر هەلسەنگاندنی رووداوی جولانەوەی شێخ سەعید، دەستەوەستانی خۆیان دەربڕیوە لەسەر پالنەرە دروستەکانی ئەو شۆڕشە، هەروەها ئینگلیزەکان سەریان سوڕما بوو لەو پروپاگەندانەی تورکیا کە بە راشکاوی دەیکردە سەر پەیوەندی نێوان ئەوانو شێخ سەعید. رۆژنامە فەرمیەکانی تورکیا چیرۆکی هێژا "تاملۆن"و پەیوەندی بە بالوێزی بەریتانی لە ئەستەنبولو سەرکردە کوردەکانی درووست کردبوو.

بە پشتبەستن بە نامەیەکی نهێنی ئا.لندسوی بالوێزی بەریتانی لە تورکیا، کە ئاڕاستەی جۆزیف سامبرلی وەزیری دەرەوەی بەریتانی کراوە، کەسێك نییە بەناوی "تاملۆن"و پرۆپاگەندەی بەرپرسانی تورك سەرسوڕمانی درووست کردووە، بالوێزی بەریتانی دەلێ: (هەتا ئێستا رۆژنامەکانی تورکی هیچ بەلگەنامەی بەرجەستەیان لەبەردەستدا نییە لەسەر دەستێوەردانی بەریتانی، ئەوەی رۆژنامەکانی تورکی دەیلێن ئەو بەندانەیە، کە لە سالانی (1920و 1921ز) پەیوەست بووە بە پەیوەندی

344 - سلوبي، ص125. شيركو، القضية الكرية. ص100

345 -The Emergence of the Kurdish Nationalism and the Sheikh Said Rebellion.p.128 .

ئینگلیزو کورد، که لەو ماوەیەدا بە کردەوە ئینگلیز دیراسەی دامەزراندنی دەوڵەتی کوردی کردووە، بەڵام ئەمڕۆ "1925ز- نووسەر" حکومەتی شکۆی پاشایەتی بە شێوەیەکی تر بیر دەکاتەوەو پشتیوانی لە دەوڵەتی کوردی ناکات)[346].

"لندسوی" باڵوێزی بەریتانی لە کاتی گفتوگۆی لەگەڵ سەرۆکی ئەرکانی تورکی بە توندی ناڕەزایی دەربڕیوە لە بەرانبەر ئەو لێدوانانەی رۆژنامەکانی تورکی، بەوەی ئینگلیزیان تاوانبار کردووە بە پشتیوانیکردنی شێخ سەعید، وەڵامی سەرۆك ئەرکانی تورکی ئەوە بووە، کە سەرکردایەتی تورکی ئەو پڕوپاگەندانەی بە ڕاستی وەرنەگرتووە[347]. بە چاوگێڕانێك بە لێدوانەکانی عیسمەت ئینینۆ لەسەر ئەو بابەتە، دەبینین لە خۆی رانەدیوە ناوی ئینگلیز بەرێو کورتی کردۆتەوە بە هێزی بێگانە، ژمارەیەك لە توێژەرەوەی تازە لە نووسەرانی تورك گەیشتوونەتە ئەو ئەنجامەی دکتۆر رۆبەرت ئۆڵسن، کە هیچ پەیوەندییەك لە نێوان ئینگلیزو سەرکردەکانی پیراندا نەبووە. "میم ئۆوکە" نووسەری چەپی نەتەوەیی وای بۆ چووە ئینگلیزەکان دوودڵ بوون لە بەرانبەر شێخ سەعیدو گومانیان وابووە شانۆگەرییەك بێت، مستەفا کەمال درووستی کردبێت لە بەرانبەر سەرکردە کوردەکان، هەتا بیکاتە پەردەپۆشی شاڵاوەکانی بۆ سەر ویلایەتی موسڵ[348].

لە ڕاستیدا ئەوەی نابێت خۆی لێ ببوێرینو بەڵگەنامە بەریتانییەکانیش جەختی لەسەر دەکەن، ئینگلیزەکان زۆر دوودڵ بوون لە ئاکامەکانی بزووتنەوەی شێخ سەعید، چونکە سیاسەتی بەریتانی دوای رێککەوتنامەی لۆزانی تەمووزی (1923ز) راگرتنی مەترسی کۆمۆنیستی بووە، لە ڕووسیای سوڤیەتیو پارتە مارکسیە رۆژهەڵاتیەکانی هاوپەیمانی سۆڤیەت، لەو ماوەیە سیاسەتی بەریتانی بەهێزکردنی حکومەتە ناسیونالستەکانی تورکیاو ئێرانو عێراق بووە، هەتا ببنە بەربەست لەبەردەم شاڵاوی کۆمۆنیستی، کە هەڕەشەی لە بەرژەوەندییەکانی بەریتانی دەکرد لە تەنگەبەری دەردەنیلو کەنداوی عەرەبی.

---

[346] -FO, 371\262 No. 468 Constantinople Quoted in Simsir, pp.63-64-

[347] .-FO, 371\1086 NO, Inarch, 9.1925 Lindsay to Chamberlain

[348] .- Musul- Kurdistan Sununu, 1918- 1820 (Istanbul Iz Yaginek, 1925), pp.280-282

سیاسەتی بەریتانی لە دوای لۆزان بریتی بوو لە دابینکردنی ماف رۆشنبیری لە چوارچێوەی عێراقو پشتیوانی بووە لە حکومەتەکانی ناوچەکە بۆ سەرکوتکردنی جولانەوەی نەتەوەیی، کە ئامانجیان سەربەخۆیی بووە، بە بڕوای ئەو کاتەی بەریتانیا هۆکارێك بوون بۆ نائارامی لە ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست[349].

نووسەری تورکی "عومەر کورکجۆ" تەفسیرێکی جوانمان دەداتێ لەسەر ئارەزوو نەبوونی بەریتانیا لە پشتگیری لە جولانەوەی شێخ سەعید. بڕوای وا بووە سەرەڕای ململانێی توند لە نێوان بەریتانیاو حکومەتی تورکی لەسەر ویلایەتی موسلّ، بەلام کاتێ بزووتنەوەی شێخ سەعید ئینگلیز نەیویستوە پشتگیری جولانەوەی کوردی بکات، چونکە تورکیای کەمالی لەسەر هێلّی نوێخوازی رۆژئاوا ڕۆیشتووەو مستەفا کەمال پێشتر بەلّێنی دابوو تورکیا پشتگیری جولانەوەکانی رزگاریخوازی و ئیسلامیی ناحەز بە حکومەتی بەریتانی ناکات.

کورکجۆ ئۆغلۆ لەسەری دەڕواو دەلّێ: (بەریتانیا نایەوێ تورکیا لێك هەلّبوەشێتەوە یان بارێکی سیاسیی قورس بۆ مستەفا کەمال درووست بێت، هانی بدات بۆ هاوپەیمانییەتی لەگەلّ ڕووس، ئینگلیز دوو جار دەردی چێشتبوو لەگەلّ سەرکردە کوردەکانی باکووری عێراق، بەتایبەتی لەگەلّ شێخ مەحمود، کە چەندین جار لە دژیان هەلّگەڕابووە، لەبەر ئەوە ئینگلیز لە سالّی (1925ز) قەناعەتی کرد، کە پشتیوانی سەرکردە جوداخوازەکان بێ ئاکامە[350].

لەڕاستیدا ئەوەی لە بەلّگەنامەکانی بەریتانیدا دەبینرێ ڕەنگدانەوەو پشتگیری کۆرکجۆ ئۆغلۆیە. لە (25)ی ئازاری (1925ز) لندسەوی یاداشتنامەیەکی بۆ وەزیری دەرەوەی بەریتانی نووسیبوو باسی تێڕوانینی خۆی تیدابوو لەسەر جولانەوەی شێخ سەعیدو دەلّێ: (کورد گەلێکی دواکەوتوو پاشکۆی خەلافەتن، سادەنو بە ئاسانی بەکاردەهێنرێن، سەرەڕای ئەوەی ئێستا لە نێوان ئێمەو مستەفا کەمال دا هەیە، بەلام ئەو پیاوێکی هاوچەرخەو لە نوێخوازیدا شوێن ڕۆژئاواو میسر کەوتووە، تورکیا هۆکاری

---

[349] - Air 23\411, Desp. No, 30254, Baghdad, Oct. 21-1926: FO.371\11480-Desp. N.S.B\724 Criminal Investigation Department, Aug. 21-1926.

[350]- Omer Kurkocuoglu, Tuek- inglis ILiskileri- 1919- 1926 (Ankara: University Basim Evi, 1978) pp.311-113.

ئارامیو شورەیەکی بەهێزە بەڕووی "کۆمۆنیستی"، بۆیە ئەوەی لە پێشمانە پشتیوانی لیّ بکەین، بزووتنەوەی شێخ سەعید بزووتنەوەیەکی هێزە کۆنەپەرستو تاریکیخوازە، ئەگەر سەربکەویّ سوپاسی ئەوانە ناکات، کە کۆسپی بۆ درووست دەکەن، بە تایبەتی ئەوانە گەڕانەوەی خەلافەتیان دەویّ[351].

گۆڤاری "جەرشیم"، کە خوێندکارانو لاوانی کورد لە ئەستەنبولّ دەریان دەکرد، چاوپێکەوتنێکی دانسقەیان لەگەلّ عەبدولمەلیك فورات سازداوە، کە ئێستا نوێنەری پارتی رەفایە لە ئەرزرۆم، فورات دەلّیّ: (ئینگلیز نەك هەر پشتوانی لە جولاّنەوەی شێخ سەعید نەکردووە، بەلّکو هەموو هاوکارییەکی حکومەتی ناوەندیان کردووە بۆ سەرکورتکردنی ئەو جولاّنەوەیە، من بەلّگەی زۆرم هەیە بۆ پشتگیری قسەکەم، بەلاّم بارودۆخی سیاسیی رێگە بەمە نادات)[352].

نووسەری ئەم وتارە لە بەلّگەنامەکانی بەریتانی لە لەندەن ئەو پشتگیرییەی عەبدولمەلیك فوڕاتی دەست نەکەوتووە، بەلاّم پێشتر وتمان ئینگلیزەکان بە وردی دیراسەی بارودۆخەکەیان کردووە، نیگەرانی خۆیان لە بەرانبەر رووداوەکانی هەرێمە کوردییەکان دەربڕیوە، بۆیە تێبینی دەکەین چەندین چاوپێکەوتنی راوێژکاری لە نێوان بالّوێزی بەریتانی لە ئەستەنبولّو بەرپرسە تورکەکاندا هەبووە بۆ دیراسەکردنی بزووتنەوەی شێخ سەعید، هێژا "ج.هارنگ" پاشکۆی سەربازی بەریتانی لە ئەستەنبولّ چاوی بە سەرکردە سەربازییەکانی تورك کەوتووە، ئامۆژگارییان کردون بە باشترین رێگە کۆتایی بە بەرگری کوردی بهێنن[353].

سەرەڕای بەشدارییەنەکردنی راستەوخۆی ئینگلیز بۆ پشتیوانی مستەفا کەمال دژی جولاّنەوەکە بەهۆی ناکۆکی نێوانیان لەسەر ویلایەتی موسلّ، بەلاّم لاری نەبووە لەو پشتیوانییەی ئیدارەی فەڕەنسی بە بەکارهێنانی هێلّی ئاسنی "بەعدا–بەرلین" بۆ

[351] – Documents on British Foreign policy, Ser. Vol. 1-819. Feb. 8-1926. Desp No, 570 Memo by R. Lindsay- U.S, Confidential Stat Department, (The Uprising in Kurdistan) No, 371\ Allepo- March, 3,1925 .

[352]Girisim, No. 4-1984 –

[353]–FO, 371\10867, No, 1 March 4-1925, Mr. Lindsay to Austen Chamberlain

ناردنی هێزی تورکی هەتا لە پشتەوە بە ناو خاکی سوریا گەمارۆی تێکۆشەران بدەن[354].

هەڵوێستی بەریتانیا لە دوای هەڵاتنی ژمارەیەك لە سەرکردەکانی جوڵانەوەکە بەدیارکەوت، کە پەنایان بردبووە بەر ئێران‌و عێراقی ژێر دەسەڵاتی ئیدارەی بەریتانی، لەگەڵ پەڕینەوەی شێخ مەهدی برای شێخ سەعید بۆ ناو کوردستانی عێراق، دەسەڵاتدارانی بەریتانی نەیانهێشت پەیوەندی بکات بە سەرکردەکانی کورد لە ناوچە سنوورییەکان و بۆ ماوەیەك لە بەغدا گرتیان[355].

بە ڕێنمایی بەریتانییەکان ڕەزاشا خوێناویترین قەسابخانەی سازدا بۆ (100) کەس لەو تێکۆشەرانەی بە ناچاری سنووری خاکی کوردستانیان لە ئێرانەوە لە ناوچەی "سەلماس" بەزاندبوو، شێخ عەلی ڕەزا بەسەر سوڕماوی لەو قەسابخانەیە ڕزگاری ببوو، دواتر بۆ ماوەیەك گرتیان‌و دوایی ئازاد کرا.[356]

لە (23)ی ئابی (1925) قونسوڵی بەریتانی لە تەورێز لەسەر داوای عەلی ڕەزا نامەیەکی ناردووە بۆ باڵویزی بەریتانی لە تاران، کە دەیەوێ سەردانی بەریتانیا بکات بۆ خستنەڕوی تێڕوانینی کورد لەسەر ڕووداوی پیران، هەروەکو بەدیار دەکەوێ عەلی ڕەزا لەو چاوپێکەوتنەی لەگەڵ قونسوڵی بەریتانی ئامادەیی سەرکردەکانی کوردی دەرخستبوو بۆ هاریکاری لەگەڵ ئینگلیز، ئەگەر بەریتانیا پشتیوانی لە هەوڵەکانی کورد بکات بۆ دامەزراندنی دەوڵەتی کوردی، لە تشرینی یەکەم هێژا "لوراین" باڵیویزی بەریتانی لە وەڵامی نامەی قونسوڵەکەیدا، دەڵێ: (بە عەلی رەزا رابگەیەنە حکومەتی بەریتانی ئاگاداری تەواوی ڕووداوەکانی شۆڕشەکەو بارودۆخی ئێستای کورد هەیە، پێویست بە سەردانی ئەو ناکات بۆ لەندەن، ئاگادارتان دەکەمەوە بۆ سەرکردە کوردەکان ڕوون بکەنەوە، حکومەتی پایەبڵندی پاشایەتی پشتگیری پڕۆژەی دەوڵەتی سەربەخۆی کوردی‌و تەنانەت پشتگیری حوکمی زاتیش ناکات)[357]. هێژا "ئۆڵسن" لە

---

[354] -FO, 371\10867, No, 1 March 9-1925, Mr. Lindsay to Austen Chamberlain

[355] .-- Air 23\411 NO, S.C. 1618. Baghdad. July 22- 1926

[356]-Girisim, No, 4-1989

[357]-FO, 371\108, 35. E. 6730\193\65, NO. Persia Nov, 3, 1925, Percy Loraine to Austen Chamberlain- .

کتێبێکی گشتگیر لەسەر بزووتنەوەی شێخ سەعید بەڵگەنامەیەکی هێناوەتەوە، کە تیایا هەڵوێستی بەریتانیا لەسەر جوڵانەوەی شێخ سەعید بەدیار دەخا، بەپێی ئەو بەڵگەنامەیە لە (18)ی نیسانی (1926)، یانی ساڵێك لە دوای لەناو بردنی شۆڕشەکە و بە بۆنەی واژۆکردنی ڕێککەوتنامەی هاوکاریو دراوسێیەتی لە نێوان عێراق و تورکیا، هێژا لندسەوی عیسمەت ئینۆنۆی سەرۆکوەزیرانی ئەوکاتی دواندووەو دەڵێ: (ئەگەر بمان ویستایە بۆ تورکیا زەحمەتو دەردەسەری درووست بکەین لە سەرەتاوە تورکیامان بە ئاگری یاخیبوون دەسوتاند، بەڵام وامان نەکرد، پێوستە ئەوە ئاگادار بنو عیسمەت ئینینۆ ئەوە بزانێت، ئایا ئەوەی لەبیر نەماوە کە ساڵی رابردوو، ئەو دەمەی یاخیبوونی شێخ سەعید لەو پەڕی دابوو پێموت: گومانی تیدا نییە تورکیا بەڕووی یاخیبووندا دەوەستێتەوەو لە زیندانییەکان لێکۆڵینەوەیان لەگەڵدا دەکات، بەڵام ئێستا دەڵێم، کە شوێنەوارێکی هاندانی بەریتانیا نادۆزنەوە. عیسمەت پاشا بەسەر سوڕمانەوە گوێی لەو پرسیارانە گرتو نەیتوانی هیچ بەڵگەیەك بهێنێتەوە بۆ سەلماندنی دەستێوەردانی ئەوان لە جوڵانەوەی کورد[358].

لەبەر ئەو هۆیانەی باسمان کرد پەیوەندی ئینگلیز بە بزووتنەوەی شێخ سەعید لە مەنهەجیەتی رۆژئاواوە سەرچاوەی گرتووە لە بەرانبەر شۆڕشی کوردو غەیری کورد. شتێکی چاوەڕوانکراوە بەکارهێنانی چەمكو ئامرازی رۆژئاوا جیاوازە، کە لە گیانی ئەو گەلانەوە سەرچاوەی گرتووە، بۆ نموونە دەڵێن: جوڵانەوەکە کۆنەپەرستییە "ئیسلامییە"و کورد بەکارهێنراوە بۆ بەرژەوەندی هێزێکی ئایینی موحافیزکار، یان جوڵانەوەیەکی نەتەوەییەو ئایینی بۆ بەرژەوەندی نەتەوەییو عەلمانی بەکارهێناوە[359].

لەبەرئەنجامی مەنهەجیەتی رۆژئاوا لێکۆڵەرەوان دەگەنە ئەنجامی وا دژ بەیەك، چونکە ئایینو نەتەوە لەلای ئەوان دوو بابەتی دژ بەیەکن، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ رۆژگاری گریك، ناکۆکی هەمیشەیی هەبووە لە نێوان (خوا)و (مرۆڤ)، هەروەها (ئایین)و (زانست). ئایینو کەنیسە لە مێژووی ئەوان کۆسپ بوون لە بەردەم گەشەی نەتەوەیی.

---

[358] -- The Emergence of the Kurdish Nationalism and the Sheikh Said Rebellion.p.130

[359]-Kendal (Kurdistan in Turkey) in People Without Country, ed. Girasol Challiand, London, Zed Pries 1993: B. Lewis, The Emergence of Modern Turky (London, 1961), Blanto, V.G. Ataturk London, 1964

ئارەزووی کورد بۆ رزگاربوون لە زوڵمی نەتەوایەتی، لە ئاکامی سیاسەتی رەگەزپەرستانەی ئەو دەوڵەتانەوە بووە، کە کوردیان بەسەردا دابەش کراوە، پاراستنی ناسنامەی نەتەوایەتی و ئیسلامیی لە مێژووی کوردستان شتێکی تازە نییە، بیروباوەڕی زۆربەی کورد ئیسلامەو چاوەڕێ کراوە بەو بیروباوەڕە گوزارشت لە خۆیی‌و خواست‌و قەوارەکەی بکات، بە ئیسلامەوە زەخیرەیەکی بەرچاوی دەستکەوتووە لە پێکەوەنانی قەوارە بۆ کورد، ئیسلام پاڵنەر بووەو هانیداوە بۆ ئازادی‌و شۆڕش بەسەر دیکتاتۆران، بۆیە نامۆ نییە زۆربەی سەرکردەکانی جوڵانەوەی کوردی لە سەدەی نۆزدەهەم لەو بیروباوەڕە بن[360]. وتارەکەی شێخ عوبێدوڵڵای نەهری لە (1881ز) لە ناوچیا ئەو راستییە بە ڕوونی دەسەلمێنێت، دەڵێ: (باب‌و باپیرانمان زوڵم‌و زۆرداریان قبوڵ نەکردووە، دەبێت ئەمڕۆ ئێمە راپەڕین بۆ ماف خوراوو ئیسلامەکەمان کە لە مەترسیدایە...)[361]، هەمان شێوازی گوتاری میر بەدرخانە (1843–1843ز)و ناوەڕۆکی داواکارییەکانی شێخ عەبدوسسەلامی بارزانییە (1904–1914ز)، کە بریتی بووە لە لابردنی زوڵم‌و زۆرداری ئیتحادییەکان لەسەر کوردو جێبەجێکردنی شەریعەتی ئیسلامی لە ناوچە کوردییەکان، یەکێك لە داواکارییەکانی کۆمەڵەی "ئازادی" لە کۆنگرەی دیاربەکر، لە ئابی (1924ز) بۆ حکومەتی تورکی، دامەزراندنی دادگای شەرعی بووە بۆ کوردستان.

پێویستە لە چوارچێوەی رێڕەوی مێژوویی سەیری جوڵانەوەی شێخ سەعید بکرێ‌و بە درێژەپێدەری جوڵانەوەکانی پێش خۆی دابنرێ. هەردوو هێژایان "ئۆڵسن"و "برۆنسن" بە دووری نازانن شێخ سەعیدو هاوڕێکانی مەبەستیان دامەزراندنی دەوڵەتی کوردی بووبێت، بەڵام بە هەستی ئیسلامیی. ئۆڵسن ئیدارە کاتییەکەی شێخ سەعید لە ویلایەتی کینج بە "خەلافەتی کینج" ناو دەبات[362]. لە چەند سەرچاوەیەکیشەوە ئاماژە بە پەیوەندی نێوان شێخ سەعید و بانگەوازکارانی خەلافەت کراوە لە دەرەوە بەتایبەت

---

360 - گوزراشتی "سەرکردەکانی بزاڤی کوردایەتی لە سەدەی نۆزدە لە پێشەوایانی تەریقەتی سۆفیگەری بوون"، لە ڕاستیدا لە سەدەی نۆزدە بەتەنیا راپەڕینی شێخ عوبێدوڵڵای نەهریمان هەیە، لە ساڵانی (1880-1881)، ئەوانی تر دەکەونە نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەم. وەرگێڕ.

361 - Jwaideh, pt.1, p.283

362 - Agha, Sheikh and State, pp.404-405. The Kurdish Nationalism. Pp.108

لەگەڵ موحەممەد سەلیمو نەوەکانی سوڵتان عەبدولحەمید، کە ئەوکات لە بەیروت دانیشتوون[363]. بەڵام نووسەر هیچ بەڵگەیەکی دەست نەکەوتووە لەسەر پەیوەندی نێوان شێخ سەعیدو لایەنی دەرەکی، شێخ سەعید لە بەرانبەر دادگاش پەیوەندی لەو جۆرەی رەتکردەوە، دەشگونجێت عەلی رەزا لە ماوەی گەشتەکەی بۆ حەلەب پەیوەندی کردبێت بەلایەنە نەتەوەخوازەکانی کورد، یان بانگەوازکارانی خەلافەت. بەڵگەنامەکانی توێژەرەوەی تورکی "بیلال شەمشیر"م کۆکردونەتەوە لەگەڵ ئەوانەی "رۆبەرت ئۆڵسن"و ئەوانەی نووسەری ئەم وتارە هەمووی ئەوە دەسەلمێنن پەیوەندی لە نێوان جوڵانەوەکەو لایەنی دەرەکیدا نەبووە.

لەگەڵ ئەوەدا شێخ سەعید سوور بووە لەسەر نەبوونی نەخشەی لەوە پێشتری بۆ شۆڕش، بەڵام "بایراك" دوو بەڵگەنامەی دەستکەوتووە لەسەر جۆرێك لە نەخشەی دارێژراو لەگەڵ سەرەك هۆزو شێخانی تەریقەت، بۆ خەباتی چەکدارانە دژی حکومەتی تورکی. ناوەڕۆکی هەردوو نامە ئەوە دەسەلمێنن، کە شێخ سعید کانوونی دووەم هەتا شوباتی (1925ن) تەرخانی کردبوو بۆ گەڕان بەناو هۆزە کوردییەکان، بۆ ئەوەی هانیان بدات خەبات بکەن دژی حکومەت، لە یەکێك لەو گەشتانە لەگەڵ ژمارەیەك لە سەرۆك هۆزو شێخەکانی ویلایەتی کینج رێککەوتوون لەسەر چەند بنەمایەك بە ناوی "تعهد نامە" بۆ دەستپێکردنی شۆرشی چەکداری، ئەمە دەقی ئەو بەڵگەنامە مێژووییەیە:

(بە هۆی ئەوەی حکومەتی تورکی کۆمەڵێك کاری دژ بە ئیسلامی ئەنجام داوە، بە تایبەتی دوژمنایەتیو رقو زوڵمی لە خۆشەویستانی ئیسلام، لە کەسایەتییە ئیسلامییەکانی کورد، هەروەها حکومەتی تورکی بیر لەوە دەکاتەوە هەمان مامەڵەی لەگەڵ ئەرمەنی کردووە لەگەڵ کوردیشی بکات، مەسەلەی دوژمنکاری سەرکردە کوردەکانی لە ئەنجومەن هێناوەتە گۆڕێ، بەبێ هۆ دووری خستوونەوە، ئێمەش بە هۆی بڕوای پتەومان بە ئیسلامەتی و شانازییکردن بە کوردبوونمان، ئەوانەی لە خوارەوە واژۆمان کردووە، بڕیارماندا بە دامەزراندنی کۆمەڵەیەکی ئیسلامی کوردی، کە تێبکۆشێ بۆ بەدیهێنانی دەوڵەتێکی ئیسلامی سەربەخۆ- ئامین).

---

[363] -FO,371\10867 Desp. No. 1 march, 1925

له کاتی پشکنینی ماڵی شێخ عەبدوڕڕەحیم لەلایەن هێزەکانی ئاسایشی تورکی لەگەڵ دانەیەکی تر لە ماڵی یەك لە موجاهیدان دۆزراوەتەوە، کە لە دوای شەهیدبوونی کەوتبووە دەست هێزەکانی تورکی. بەڵێننامەکە بەرواری لەسەر نییە، بەڵام بایراك وای داناوە بەر لە ڕاپەڕین ئەنجام درابێت[364]. دەبێت ئەوەی مەلا حوسێن ئاماژەی پێکردووە لەکاتی ڕێککەوتنامەی هۆزە کوردییەکان لە کینج بۆشەڕی حکومەت ئەنجام درابێت، بەڵام لەو بڕوایەدام مەلا حوسێن هەڵە بووبێت، کە پێی وا بووە ئەو کۆبوونەوەیە هی لقی ئازادی بووە[365].

بەدیراسەی وردی ئەو بەڵێننامەیە، ئەنجامەکەی جوڵانەوەی شێخ سەعید جیاوازی نەبووە لەگەڵ جوڵانەوەکانی پێش خۆی، کە پارێزگاری لە مەزڵومیەتی کوردو ئیسلامەتیان پێکەوە گرێداوە.

برۆنسن بزووتنەوەی شێخ سەعیدی لە بازنەی گشتیو درووستی خۆیدا بە بەشێك لە بزاڤی سۆفیگەری جیهادی داناوە، کە لە پێناو دژایەتی ئیستیعمار درووست بوون. لە لای برۆنسن ئەو بزووتنەوەیەو بزووتنەوەی سنووسی لە ڕۆژئاوای عەرەبی دژی ئیستیعماری ئیتاڵی، لە هەردوو حاڵەتدا بزووتنەوەی سۆفیگەری بە بەرگریو ئاراستەکردنی تواناکان لە دژی دوژمنی زەوتکەر خزمەتی باشی کردووە[366].

عەبدولمەلیك فورات لە چاوپێکەوتنەکەیدا هەمان بۆچوونمان دەداتێ لەسەر هەڵسەنگاندنی بزووتنەوەکەی باپیری: (جوڵانەوەکەی باپیرم وێکچووە لەگەڵ جوڵانەوەکانی دی ئیسلامی دژ بە ئیستیعمار، وەکو جوڵانەوەی سنووسی لە لیبیاو مەهدی لە سۆدان و جوڵانەوەی خەلافەت لە هیند. جیاوازییەکە لەوەدا بووە ئەوان

---

[364] - Bayarak, pp.401-402

[365] - دەقی تەعوهدنامەکە بەڵێن وەرگرتنە بۆ پابەندبوون بەکۆمەڵەیەك، دیارە گوتاری ئیسلامی لە تەعوهدنامەکە زاڵە، ئەمەش ئاسایی، چونکە "سەرکردەکانی ئازادی" ئاراستەی ئایینینان هەبووە، لە ئەندامانی پیشتری سوارەی حەمیدیە بوون، من ئەو تعهد نامەیە بەهی لقی ئازادی دەزانم زیاتر لەوەی هی شێخ سەعیدو لایەنگرانی بێت، هەتا لە دەقی بەڵێننامەکەدا هاتووە: بڕیارماندا بە دامەزراندنی کۆمەڵەیەکی ئیسلامی کوردی. کە دیارە شێخ سەعید بەشداری لە دامەزراندنی هیچ کۆمەڵەیەك نەکردووە. وەرگێڕ.

[366] - Agha, Sheikh, and State, p. 404-405

راستەوخۆ دژی ئیستیعمار جەنگاون، بەڵام جوڵانەوەی شێخ سەعید لەگەڵ ئیستیعماری نوێی تورکی بووە، کە لە حکومەتی مستەفا کەمال خۆی دەنواند)[367].

ئەو وتارەی شێخ سەعید، کە لەسەرەتای راپەرین لە گوندی پیران لە (13)ی ئازاری (1925ز) وتوویەتی باشترین بەڵگەیە، کە دەڵێ:

حکومەتی ئەنقەرە قوتابخانە ئیسلامییەکانو ئیدارەو دامەزراوەکانی پەیوەست بە ئیسلامی هەڵوەشاندەوە، بە تایبەت ئەوقاف، ئەو قوتابخانانەی راستەوخۆ بەهی تازەی نەتەوەیی بەستۆتەوە، رۆژانە هەندێك لە بێباوەڕان بەرانبەر ئاینو پێغەمبەر زمان درێژی دەکەن، بۆیە بە گوێرەی توانای خۆم بڕیارمدا جیهاد دەست پێبکەم، بە ویستی خوا هەوڵێکی باش دەدەین[368].

## پوختەی ئەنجامگیری

شۆڕشی شێخ سەعید بایەخی گەورەی هەبووە لەسەر مێژووی بزووتنەوەی نەتەوایەتی کوردی و بزووتنەوەی ئیسلامیی و خواستە دیموکراتییەکان لە تورکیا، لەناوچوونی شۆڕش و دووبارە گەڕانەوەی کوردستان بۆ ژێردەسەڵاتی نێزەی مستەفا کەمال ئازارێکی جەرگبڕ و قۆناغێکی تاڵ بوو لە مێژووی گەلی کورد لە کوردستانی باکوور. دیڤید مەکدواڵ لێکۆڵینەوەی بەنرخی هەیە لەسەر شۆڕشی شێخ سەعید، دەڵێ: مستەفا کەمال شەڕیکی تۆکمەی بۆ پاکتاوی رەگەزی دەست پێکرد، ناوچەکە لەو رۆژەوە کەوتۆتە ژێر فەرمانڕەوایی ئەحکامی عورفی، لە دیارترین سیماکانی تۆقاندن پێکهێنانی دادگایەك بوو بە ناوی "دادگای سەربەخۆ"، دادگایەکی گەڕۆك بوو لە شارە کوردییەکان، بڕیاری لە سێدارەدانی بە سەر سەدان کەسدا سەپاند. هێزە سەربازییەکانی کەمالی وەکو هار تەڕو وشکیان پێکەوە دەسووتاند، ترسو تۆقاندن لەناو گوندو شارە کوردییەکان بڵاوبۆوە، لەگەڵ گرتنو رەشبگیری و دەستبەسەراگرتنی سامانی خەڵکی. وای لێهات رۆژانە هەزاران کەس گوندە وێرانەکانیان بە جێدەهێشت، لە ساڵانی (1925 تا 1935ز) ئەفسەرە کەمالیە تورکەکان بە

[367] - Girisim, No, 4-1989.

[368] - Girisim, No, 4-1989.

موزایەدەی ئاشکرا لە کوردستان کەلوپەل‌و بەرهەمی کشتوکاڵی‌و هەتا مەڕوماڵاتی کوردانیان لە شارە تورکییەکان دەفرۆشت[369]. بە ئاشکراو نامرۆڤانە هەزاران لە هاوڵاتیانی کورد دەبینران بە ناچاری لە باری ئاوو هەوای زۆر قورس دا بە پێ دەرۆیشتن، بەر لەوەی بگەنە ئەو ناوچانەی بۆیان دیاری کرابوو لە رۆژئاوایی تورکیا، لە سەرماو لە برسان دەمردن، هەتا هەندێ لە خاوەن ویژدانی تورك وەکو رەزا نوور لە بیرەوەرییەکانیدا ئەو کارانەی ریسوا کردووەو بە وەحشیگەری ناوی بردووە.

لەسەر ژمارەی کوژراوو بریندارەکان سەرژمێری ورد لە بەردەستدا نییە، بەڵام قوربانیانی ئەو شاڵاوە بە هەزاران کەس مەزندە دەکران، کوردساتی باکوور لە بەردەم نەخشەی پاکتاوی رەگەزی لە مەترسیدا بوو[370]. بەرپرسانی تورك مەبەستی رەگەزپەرستی‌و نازیچێتی خۆیان نەشاردۆتەوە لە بەرانبەر لە ناوبردنی کورد، لە نیسانی ساڵی (1925) عیسمەت ئینینۆی کوردی بەتورککراو و سەرۆکی وەزیران بەراشکاوی لەبەرانبەر یانەی نەتەوەیی تورکی وتی:

(ئێمەی نەتەوەخوازەکان نەتەوایەتی تاکە هۆکارە وەکو ئومەت کۆی کردوینەتەوە، ئەم گەلە زۆرینەی تورکەو هەر دەبێت تورك گەورە بێت، ئەوانی تریش گوێڕایەڵییان لەسەرە، لەسەرمانە بە هەرچی لە توانامان دایە نەتەوەکانی تر لە چوارچێوەی بەتورککردن بتوێنینەوە، ئەوەی بەرهەڵستی ئەو سیاسەتەمان بکات لەناوی بەرین، ئێمە وەکو تورك پابەندین خزمەتی هەموو ئەو نیشتیمانە، ئەوانەش لەناو دەبەین ئایین دژمان بەکاردەهێنن)[371].

"هنری دۆبیس"ی کۆمیساری باڵای بەریتانی لە عێراق لە تشرینی دووەمی (1927ز) لە چاوپێکەوتنێکیدا لەگەڵ تۆفیق روشدی سەراج ئوغلو، وەزیری دەرەوەی تورکیا، لەسەر زاری ئەوەوە بەو شێوە باسی کوردی کردووە: (گەلی کورد گەلێکی سەرەتایی‌و دواکەوتووە، قبوڵی پێشکەوتن‌و شارستانی ناکەن، قورسە لەگەڵ دەوڵەتی

---

[369]- شیرکو. ص104: سلوبی: ص125-127

[370] - FO, 371\10863, R. Lindsay to Austen Chamberlain No, Des, 1.1925

[371] - FO. 424\262, NO.331 R. Lindsay to Austen Chamberlain No, April, 28-1925. Cited in Simsir. Pp.97-98.

تورکیای هاوچەرخ تێکەڵ بکرێن، یان بکەونە پێشبڕکێوە، تورك لە ڕووی شارستانیو ژیریو ئابووری باڵاترنو لە داهاتوو ناچار دەبن کۆچ بکەن بۆ عێراقو ئێران، ئەوەی دەمێنێتەوە لە ناودەچن، یان لە ناو کۆمەڵگای تورکیدا دەتوێنەوە، ئەمە یاسای ململانێیە، ئەنجامێکی چاوەڕێکراوە، مانەوە بۆ بەهێزترینە، چارەنووسی ئەوان زیاتر نابێت لە ئەرمەن یان هێندییە سوورەکانی ئەمریکا)[372].

ئەوەی شایانی باسە هێرشەکانی پاکتاوکردن بە بەرچاوی هێزە ڕۆژئاوایەکانەوە بووە، بە تایبەت بەریتانیاو فەرەنسا، هەریەك لەوانە دەستی هاوکاری ئابووریو سیاسییان بۆ مستەفا کەمال درێژ کردووەو ئامادەیەکی پەنجەشیان نەداوەتێ بۆ وەستاندنی ئەو قەسابخانەو مەرگەساتە، ئەوکات نوخبەی کوردیش لەژێر کاریگەری دروشمە بریقەدارەکانی ڕۆژئاوادا بووە لە بابەت ماف مرۆڤ و ماف چارەنووسی گەلان. بەڵگەنامە بەریتانیو فەرەنسیەکانی پەیوەندیدار بە خۆرهەڵاتی ناوەڕاست ئاگاداری تەواوی شەڕی پاکتاوی ڕەگەزی بوون لە کوردستان و بێدەنگییان هەڵبژاردووە، چونکە مستەفا کەمال ئەوکات ببووە ئەسپی تەڕوادە لە بەرانبەر خزینی کۆمۆنیستی. شاڵاوەکانی ئەنفالو پاکتاوی ڕەگەزی لە کوردستان لە ساڵانی (1985) بۆ (1988ز) مێژووی دووبارە بووەی هەمان رابردووە، کە ڕۆژئاوا بۆ بەرهەڵستی لە خزینی ئێران سەدام حوسێنی کردبووە ئەسپی تەڕوادەو بێدەگی لە بەرانبەر مەرگەساتەکانی کوردستان هەڵبژارد.

لەناوچوونی بزووتنەوەی شێخ سەعید کۆتایی قۆناغێك و سەرەتای قۆناغێکی تازە بوو لە مێژووی جوڵانەوەی کوردی. لێرەوە ڕۆڵی سەرکردایەتی تەقلیدی کوردی "شێخەکانی تەریقەت" کۆتایی هات، ئەو قۆناغە سەد ساڵی خایاند، قۆناغی تازە "ڕۆشنبیران و ئەفسەران و عەسکەرییەکان" بوونە سەرقافڵەی جوڵانەوەی کوردی*.

---

[372] - FO,424\265, Desp. No, 21, Angora, Cited in Simsir. Pp.98-99

* - یەکەم: سەرکردایەتی جوڵانەوەی کوردی لە لایەن شێخەکانی تەریقەتەوە، لە ڕاپەڕینی شێخ عوبێدوڵڵاوە دەستی پێکردووە، هەتا شۆڕشی شێخ سەعید دەکاتە (44) ساڵ نەك سەد ساڵ. دووەم: ئەو وەرچەرخانەی کە کۆتاییهاتنی قۆناغێکەو سەرەتای قۆناغێکی تازەیە لە سەرکردایەتی کردنی بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کوردی، هەر لە زنجیرەی ئەم توێژینەوەیەدا نووسەر بزوتنەوەی یەکەمی بارزانو(1933ز)و دووەمی بارزان (1943-1935ز)و سەرکردایەتی کۆماری کوردستان (1946-1947ز) بە درێژە

ئەوە لەسەرەتای پێکهێنانی خۆیبوونو سەرکردایەتی شۆڕشی ئاگری (ئارارات)ەوە تێبنی دەکەین، لە گرنگترین شوێنەوارێك کە شۆڕشی شێخ سەعید بە جێیهێشت ئەو رێگا سەرکوتکەرانەیە بووە، کە کۆسپی گەورەی خستەبەردەم هاواری برایەتی نێوان کوردو تورك. ئەم دوو گەلە لە ڕووی کۆمەڵایەتیو سیاسییەوە مێژووی هاوبەشیان هەبووە، لە ڕۆژگاری عوسمانییەکان بەشدار بوون لە داڕشتنی شارستانییەتی ئیسلامی، بەڵام لەسەردەمی ئیتیحادو تەرەقی (1909–1918ز)یەوە بە هۆی سیاسەتی رەگەزپەرستانەی ئیتیحادییەکان لە بەرانبەر رەگەزە ناتورکەکان ئەم برایەتیە لە ناوچوو، لە دوای لەباریەکچوونی شۆڕشی شێخ سەعید قۆناغێکی تازە لە سەرکوتکردن دەستی پێکرد، ئەم رەوشی سەرکوتکردنە کاریگەری زۆری هەبوو لەسەر چاندنی بیرۆکەی نەتەوایەتی لەناو کورد. قەدری جەمیل پاشا، کە یەکێك بووە لە پێشەنگانی نەتەوەخوازی کورد دەڵێ: (سەرەڕای زیانی زۆری مادیو مرۆییو بەزۆر کۆچ پێکردن، بەڵام سوودی گەورەی هەبووە لەسەر تەشەنەکردنی بیری نەتەوایەتی. لەو بڕوایەدام ئەگەر نیشتیمانپەروەران چەندان ملیۆنیان خەرج بکردایە ئەو سەرکەوتنە گەورەیان بەدەست نەدەهێنا. زیادەڕەویم نەکردووە ئەگەر بڵێم: سیاسەتی توندو تیژی بەرانبەر کورد نزیکەی نیو سەدە وریا بوونەوەی بەرەو پێش برد)[373].

مستەفا کەمالو عیسمەت ئینینۆ سوودیان لە جوڵانەوەی شێخ سەعید وەرگرت بۆ پتەوکردنی دەسەڵاتی تاکڕەوانەی خۆیان، زەنار سەلۆپی دەڵێ: راپەڕینی شێخ سەعید

---

پێدەری ئەو رێڕەوە دادەنێ، گەرچی من وای نابینم، لێرەوە دەستی پێکردبێت، لە دوای نوشستی راپەڕینی (1925ز) شان بەشانی ئەو سەرکردایەتیەی کە نووسەر ناوی لێناوە "تەقلیدی" رۆڵی نوخبەی خوێندەواری کوردیو پارتو رێکخراوە کوردییەکان پەرەی سەند، شۆڕشی دووەمی بارزانو کۆماری کوردستان ئەزموونی کاری هاوبەشی نێوان ئەو دوو شێوازەیە لەسەرکردایەتی بزوتنەوەی رزگاریخوازی کوردی، شۆڕشی ئەیلول ئەزمونێکی تاڵی ناکۆکی نێوان ئەو دوو ئاراستەیە، کۆتایی شۆڕشی ئەیلول (1975) دەتوانین بە کۆتایی یەکجارەکی ئاراستەی یەکەمی ئەو ئاراستەیەی دابنێین، لەگەڵ یەکلایی بوونەوەی سەرکردایەتی بزوتنەوەی رزگاریخوازی کوردی بۆ پارتو رێکخراوە کوردییەکان، بەڵام بە بۆچوونی من پەرەسەندنی بیری چەپ لە کوردستان، کە رەوتی سەرکردایەتی تەقلیدی خستە خانەی ناو و ناتۆرەی دەرەبەگایەتیو دواکەوتوویيو کۆنەپەرستی زیاتر بزوێنەری ئەو گۆڕانە بووە. "وەرگێڕ"

[373] - سلوبی، المصدر السابق، ص128

وەکو هۆکاری رزگارکردنی مستەفا کەمال وابوو لەکەوتن. لە دوای شەڕی یۆنان مستەفا کەمال لە خۆبایی ببوو، گرنگی بەو هاوڕیانەی نەدەدا، کە لەکاتی خەبات لەگەڵیدا بوون، لەو بارودۆخەدا هەریەك لە ڕەئوف بەگی سەرۆکی سوارەی حەمیدیەی کۆنو عەسکەریە نزیکەکانی رێکخراوێکی بەرهەڵستکاریان بە سەرۆکایەتی کازم قەرە پاشا درووست کردبوو، بە ناوی "پارتی کۆماری پێشکەوتووخواز"، هەر لە دوای دامەزراندنییەوە بەماوەیەکی کەم پشتگیری فراوانی هەبوو، بە شێوەیەك لە شکۆو کەسایەتی مستەفا کەمالی کەمکردبۆوە، مستەفا کەمال دوای ئەوەی راپەڕینی شێخ سەعیدی کردە پەیژەیەك بۆ لێدانی بەرهەڵستکاران، دوو دادگای لە ئەنقەرەو دیاربەکر دانا، دەسەڵاتی زۆری پێدان، لەوکاتە لایەنگرانی پارتی کۆماریشی دوورخستەوە[374]. بە بیانووی پارێزگاری وڵات لە هێزی کۆنەپەرستیو دۆستی ئیستیعمار، عیسمەت ئینینۆ فەرمانیدا هێرش بکەنە سەر بارەگای "پارتی کۆماری پێشکەوتووخواز"و دەستبەسەر کەلوپەلەکانیان و (22) کەس لە سەرکردە ناودارەکانیدا بگرن، هەروەها عیسمەت پاشا بارەگای پارتی ئیتیحادییەکانی داخستو (11) کەسی لە سەرکردەکانی گرت، بۆ دەرباز بوون لە بەرهەڵستکارانە کۆمەڵێك کاری سەرکوتکەرانەیان گرتەبەر لە دژی رۆژنامەگەریەتی و یەکێتی نەقابەکانی کرێکاران، بەمەش دیکتاتۆریەتی تاکە حیزبی جێگیربوو.

ژمارەیەك لە توێژەرەوان جوڵانەوەی شێخ سەعید دەبەستنەوە بە ئەنجامدانی کۆمەڵێك رێوشوێنی مستەفا کەمال، گوایە هەوڵی حکومەت بووە بۆ ریشەکێشکردنی دواکەوتوویی‌و دەرەبەگایەتی‌و رژێمی کۆن "خەلافەت". ئەم هەنگاوانە هەموویان توند بوون بۆ دژایەتی ئیسلامو رەمزی دامەزراوە ئیسلامییەکان. لە (30)ی تشرینی دووەمی (1925ز) حکومەت یاسایەکی دەرکرد، بە پێی ئەو یاسایە تەنگی بە رێڕەوە سۆفییەکان هەڵچنی و تەکیەکانی داخستو دەیان شێخو زانای گەورەی لە کوردستان لە سێدارەدا، ئەم هەنگاوانە بە تەنیا لە ناوچە کوردییەکان نەبوو، بەڵکو حکومەت یاسای دژە ئیسلامەتی دەردەکرد بۆ بە رۆژئاواییکردنی کۆمەڵگای تورکی، لە گرنگترین ئەو یاسایانە "یاسای مەدەنی" بوو، کە لە (24)ی نیسانی (1926ز) دەرچوو لە

[374]- سلوبی، المصدر السابق، ص115-116.

یاسای فەرەنسی و سویسری وەرگیرا بوو، شوێنی یاسای شەریعەتی گرتەوە. لە (25)ی تشرینی یەکەمی (1925ز) یاسای جلوبەرگی مەدەنی "قیافە قانون دیفرمی" دەرچوو، بەم یاسایە بەرگی رێکپۆشی ژنانی قەدەغەکرد و لە جێی ئەوە بەرگی رۆژئاوایی بەسەر ژنو پیاوانی تورکیادا سەپاند، لە (1)ی تشرینی دووەمی (1928) "حرف قانون"ی دەرکرد بۆ قەدەغەکردنی بەکارهێنانی ئەلفو بێی عەرەبی لە نووسینی تورکی و لە جێگای ئەوە مستەفا کەمال بە پشتیوانی هەندی لە رۆژهەڵاتناسانی جولەکە ئەلفو بێی لاتینی دانا بۆ زمانی نووسینی تورکی[375].

جوڵانەوەی شێخ سەعید گەلێك وانەو پەندی گرنگی تێدایە بۆ گەلی کورد بە گشتییو رەوتی ئیسلامیی لە کوردستان بە تایبەت، بەڵام ئێرە جێگای درێژەدان بەم باسە نییە[*].

[375] - David McDowell, A Modern History of the Kurds (London: I-M Tauris, 1996).

[*] – کۆتایی ئەو پوختەو ئەنجامگیرییە زیاتر بەرەو وتارێکی سیاسییی و ئامۆژگاری ئایینی چووبوو، بۆیە بە پێویستمان نەزانی دوو لاصەرەی کۆتایی بگوازینەوە بۆ کۆتایی ئەم توێژینەوەیە.

## دادگاییکردنی شێخ سەعیدی پیران لە بەردەم دادگای سەربەخۆ " ئیستیقلال" لە دیاربەکر (1925ز).

پ: لە کوێ خوێندووتە؟

و: لە خوێندنگای زانستی ئیسلامی لە مووش و مەلازگردو بالۆ.

پ: لە خوێندنگای ئایینی یان میری و لەسەر دەستی کێ خوێندوتە؟

و: لە خوێندنگای ئایینی فێر بووم، یەکەم مامۆستام شێخ حوسێنی مامم بوو، دواتر لە لای موحەممەد ئەمین ئەفەندی موفتی بالۆو شێخ عەبدوڵڵای مەلازگردو شێخ موسا ئەفەندی لە خونس خوێندوومە.

پ: چیت خوێندووە؟

و: ئەنوار "الانوار"، نووسین "موحەڕەر"، رێزمانی عەرەبی "النحو"، سەرف، مەعانی، ئیشارە، بەیان، بەدیعو چەند بابەتێکی تری پەیوەست بە بیروباوەڕ "العقائد".

پ: کەی بیرتان لە یاخیبوون کردەوە، هاندەرێکت هەبووە، یان پەیامتان بۆ هاتبوو؟

و: هیچ پەیامێکم بۆ نەهاتووە، بەڵام لە کتێب خوێندومەتەوە، ئەگەر حاکم شەریعەتی پیادە نەکرد پێویستە لێی یاخی ببیت، ویستم بۆچوونی خۆمان بۆ حکومەت روون بکەمەوە بە تایبەت لەسەر شەریعەت، بەڵام ویستی خوا هاتە سەر ئەو شۆڕشە، هەڵگیرساو نەمانتوانی لێی دەربچین؟

پ: وتتان لە حاڵەتی جێبەجێنەکردنی شەریعەت دەرچوون لە دەسەڵاتی حاکم واجبە، ئەو بابەتە هیچ بنەڕەتێکی هەیە؟

و: نەخێر، دەزانم کە جێبەجێکردنی شەریعەت واجبە، لەوەش ئاماژەت پێکردووە هیچ بنەڕەتێك ئاگادار نیم.

پ: کەواتە تێگەیشتم لەو حاڵەتەی پێشەوا هەڵەی کرد هەموو مرۆڤێك ماڤی هەڵگەڕانەوەی هەیە، مەبەستی ئێوە ئەوە نییە؟

و: نەخێر ئەوە نییە تۆ وتت، بەڵام لە سەرەتاوە مەبەستمان هەڵگەڕانەوە نەبووە، کەوتمە ژێر کاریگەری بارودۆخو بەسەرمدا سەپا، من بە خەڵکم نەوتووە کەی ویستان لە دەسەڵاتی حکومەت دەرچن، بەڵکو وتوومە لە حاڵەتی لابردنی شەریعەت دەرچوون واجبە.

پ: ئایا كە یاخیبوونتان ڕاگەیاند مانای وایە بە تەواوی قەناعەتتان لەم وڵاتە شەریعەت جێبەجێ ناكرێ؟

و: كتێبی خوا جەختی لەسەر ئەو بارودۆخە كردۆتەوە كە ئاماژەت پێدا لەسەر دەرچوون لە دەسەڵاتی حاكم، جێبەجێكردنی شەریعەت مانای قەدەغەكردنی زیناو كوشتن‌و مادە سەرخۆشكەرەكان‌و...هتد. سوپاس بۆ خوا موسڵمانین، نابێ جیاوازی بكەین لە نێوان كوردو تورك، ئەوانە ئێستا هەیەو باوەڕی ئێمە لەسەر قورئانی پیرۆز بنیات نراوە.

پ: سەماحەتی شێخ با لەو بابەتانە بگەڕێین‌و هۆیە ڕاستەقینەكانی یاخیبوونتان بۆمان ڕوون بكەوە؟

و: ئەوەی ڕوویدا لە پیران لە پێكدادانی نێوان هەردوولا "جەندرمەو لایەنگرانی شێخ سەعید. وەرگێڕ"، كە بەرپرسیاریەتی كەوتە سەرشانم، من داوام كرد لە ئەفسەرانی جەندرمەو سوور بووم لەسەر بەردانی گیراوەكان، بەڵام ئەفسەرانی جەندرمە بەهەرسێ تەڵاق سوێندیان خوارد، كە بەزەبری هێز ئەوانە دەگرن.

پ: ئایا بەر لەوەی بچنە پیران بیرتان لە هەڵگەڕانەوە كردبۆوە؟

و: بەڵێ بیرمان لێكردبۆوە، بەڵام ئەوەم بەبیردا نەدەهات سەركردایەتی جوڵانەوەی چەكداری بكەم، بیرم دەكردەوە كە حكومەت بدوێنم لەسەر یەكانگیركردنی ئەو یاسا لەگەڵ شەریعەت‌و مەبەستم بووە ئەو داواكارییانە بنێرم بۆ ئەنجومەنی نوێنەران.

پ: بۆ چی ڕاستەوخۆ نەتتوانی حكومەت بدوێنی؟

و: ئیمام ئەگەر شەریعەتی جێبەجێ نەكرد لە ڕووی شەرعییەوە واجبە لە دەسەڵاتی دەرچی، من هەوڵم دا ئەم ڕاسپاردەیە لە بەرامبەر خوا جێبەجێ بكەم.

پ: بەڵام سەماحەتی شێخ پێشتر فەرمووت موسڵمانان بران، ئایا دەگونجێ بۆ كوشتنی یەكتر هانیان بدەیت؟

و: بڕواداران لە ئاییندا بران، بەڵام لە هەندێ حاڵەتدا دەبێت لە ئیمام هەڵبگەڕێیتەوە، هەروەكو لە كتێبی پیرۆز "قورئان"دا هاتووە.

پ: تێناگەم، نازانم چۆن خەڵك لە دژی یەكتر هاندەدرێن كە ئەوان لە ئاییندا بران؟

و: ئایا ئەوانەی شەڕی "عەلی"یان دەكرد هاودین نەبوون؟ هەندێ جار شەڕ لە نێوان هاودینان ڕوو دەدا.

پ: فەرمووت لەو بارودۆخەی سەرەوە جیهاد واجب دەبێت، بەڵام هەڵوێستت کامەیە لەوکاتەی کافران زاڵ دەبن بە سەر خاکی موسڵمانانو بێرێزی بە قورئان دەکەن؟

و: لەو حاڵەتەش جیهاد واجب دەبێت.

پ: لەو کاتەی یۆنانییەکان هەموو خاکی ئێمەیان گرت، خۆتو چوار هەزار لە پیاوانت بۆچی نەهاتن بۆ شەڕ؟

و: لەوکاتە ئەگەر دەرفەت هەبوایە زۆرمان پێخۆش بوو بێین بۆ شەڕو دوانەدەکەوتین، بەڵام نەیاندەویست، سەرەڕای هەژاریو کۆچەرایەتیمان، ئەگەر داوا بکراینایە لە شەڕ دوانەدەکەوتین.

پ: لەکۆێ نەخشەی هەڵگەڕانەوەتان داناو کێتان لەگەڵدا بوو؟

و: رێوشوێنی سەرەتایمان نەبوو، رووداوی پیران روویداو تێوەگلایین، بەڵام لەوکاتەی گەیشتمە لیجە (گوندێکی کینج. "وەرگێڕ" لەگەڵ کەس بە ئاشکراو نهێنی قسەم نەکردووە لەسەر یاخیبوونو پێش هەڵگیرسانی شۆڕش خۆمان ئامادە نەکردبوو.

پ: بەچەند رۆژ لە دوای گەڕانەوەی عەلی رەزای کوڕت شۆڕش دەستی پێکرد؟

و: نزیکەی بە مانگێك دوای گەڕانەوەی ئەو شۆڕش دەستی پێکرد.

پ: لە بابەت هەڵگەڕانەوەتان لە ئەستەنبوڵ کوڕەکەت لەگەڵ کێ قسەی کردبوو؟ هەروەها چ هەواڵێکی بۆ هێنا بوون؟

و: ئەو بە هیچ شێوەیەك لە ئەستەنبوڵ لەسەر مەسەلەی یاخی بوون نەدوابو، کاتێ گەیشتەوە هەر زوو وام دانابوو خالید بەگ دێت، نەهاتو کوڕەکەی بە نوێنەرایتی ئەو هات کە بابی گیراوە، لەوە پێش لێی ئاگادار نەبووم.

پ: بەڵام لە دوای گەڕانەوەی کوڕەکەت لەناکاو لێدوانی ئێوە لەسەر شەریعەت هات، پێم وایە ئەمەتان لە ئەستەنبوڵەوە پێ گەیشتبێ، وانییە؟.

و: بەڵی میوانی کوردێکی خونەیس بووەو داوای سەردانی هێژا عەبدولقادری ئەفەندی کردووە.

پ: علی رەزا بۆچی چوو بۆ ئەستەنبوڵ؟

و: چەند رانە مەڕێکی بردبوو بە بازرگانێکی حەڵەبی بفرۆشێ

پ: لە دوای گەڕانەوەی لە کوێ چاوت بە کوڕەکەت کەوت؟

و: له"شوشر" چاوم پێی كه‌وت.

پ: وتت جه‌ندرمه هاتنه گوندو رووداوه‌كه روویدا؟

و: ئه‌گه‌ر جه‌ندرمه‌كان نه‌پێكرانایه ده‌متوانی به رێگه‌ی نامه چاره‌سه‌ری بكه‌م.

پ: بۆچی خه‌ڵكت هاندا له جه‌ندرمه‌كان هه‌ڵگه‌ڕێنه‌وه، كه ئه‌وان ئه‌ركی خۆیان به‌جێ ده‌هێنا؟

و: ئه‌وان به‌ئه‌ركی خۆیان هه‌ستاون، بۆ من مه‌سه‌له‌یه‌ك نییه، ئه‌وه كه‌وتنه شه‌ڕه‌وه به‌ڵام من ئامۆژگارییم كردن كه په‌له نه‌كه‌ن.

پ: به ئامۆژگارییه‌كه‌ی ئێوه چ له مه‌سه‌له‌كه گۆڕا؟

و: به‌ڵێ، به‌ڵام شه‌ڕ هه‌ر روویدا.

پ: ئایا ئه‌و شه‌ڕه‌ی رویدا شایسته به‌وه بوو خه‌ڵك له‌سه‌ر یاخیبوون هانبده‌ی؟

و: من گونده‌كه‌م به‌جێهێشت، به‌ڵام دوای من هه‌ڵگه‌ڕانه‌وه روویداو من بوومه سه‌رۆكی ئه‌و جوڵانه‌وه‌یه.

پ: شه‌ڕ روویدا یان نا؟ ئایا ئێوه سه‌ركردایه‌تیتان نه‌ده‌كرد؟

و: پێش ئه‌وه‌ی من بچمه دارهانییه (شارێكه له كینج "وه‌رگێڕ")، شۆڕشگێڕان گه‌مارۆیان دابوو.

پ: گه‌یشتنی جه‌ندرمه‌كان هۆیه‌ك بووه؟ یان پێشتر راگه‌یاندنو نه‌خشه‌یه‌ك هه‌بووه؟

و: ئه‌گه‌ر ئه‌وه رووی نه‌داباو جه‌ندرمه هۆكارێك نه‌بووبان ده‌توانرا له ڕێگه‌ی نامه‌و قسه‌كردنه‌وه له‌گه‌ڵ حكومه‌ت ناكۆكییه‌كان چاره‌سه‌ر بكرایه، یان ده‌توانرا یاخیبوون بۆ شه‌ش مانگ یان ساڵێك دواخرابا، یان هه‌ر رووی نه‌دابایه.

پ: ئه‌گه‌ر رووداوی جه‌ندرمه نه‌بوایه بۆچوونو عه‌زمی پێشتری ئێوه وابوو یاخیبوون دوای شه‌ش مانگی تر هه‌ر رووی ده‌دا، ئه‌مه وانییه؟

و: ئه‌گه‌ر ئه‌وان نه‌هاتبان، ده‌توانرا رێگه بگیرێ له‌وه‌ی روویدا، به‌ڵام له‌گه‌ڵ هه‌موو ئه‌وانه قه‌ده‌ری خوایه‌و روویدا.

پ: ده‌بینم ئێوه هه‌موو شتێ ده‌گه‌ڕێنه‌وه بۆ قه‌زاو قه‌ده‌ر، به‌ڵام ناتوانرێ به‌شێكی بگه‌ڕێنه‌وه بۆ ویستی مرۆڤ؟.

و: بەڵێ مەسەلەی ئارەزوومەندی هەیە، ئێمە مرۆڤین‌و نکۆڵی لەوە ناکەم هەست‌و ویستمان هەیە.

پ: هەر بەتەنیا یاخیبوون؟ پێم وانییە، کێ پشتیوانی لێ دەکردن؟.

و: هیچ کەسێ هانی نەداوین نە لە ناوخۆ و نە لەدەرەوە، مەبەستم لەدەرەوە بێگانەیە، هەروەها لە ناوخۆی تورکیاش هیچ هێزێك هانی نەداوین لەسەر ئەو جوڵانەوەیە.

پ: کەواتە ئەوەی لێی تێگەیشتم ئێوە بە تەنیا شۆڕشەکەتان ئامادە کردووە؟

و: بەڵێ ئەوەم لە خەیاڵ بوو، خۆزگەم دەخواست بە زانایان و پایەداران‌و وەکیلەکان (مەبەست لە پەرلەمانی تورکیە، "وەرگێڕ") گەیشتبام‌و وتووێژم لەگەڵ کردبان‌و داوام کردبان بۆ جێبەجێکردنی شەریعەت‌و خواستی ئایین، ئەو ئاواتەم نەهاتەدی.

پ: راوێژت بە زانایان و وەکیلەکان کرد؟

و: هەوڵمدا بەڵام نەمتوانی، چونکە رووداوەکە روویداو دەرفەتێك بۆ ئەم کارە لە بەردەستدا نەمایەوە؟

پ: لەو نامەی بە ناوی خۆتانەوە واژۆتان کردووە نازناوی ئەمیری موجاهیدانتان بۆخۆتان داناوە، ئایا پیاو دەبێت نازناوی وا بۆ خۆی دابنێت؟

و: لە سەرەتاوە لەکاتی گفتوگۆم لەگەڵ ئەو فەرماندانەی لەژێر فەرمانمدا بوون بەو ناوەوە نامەم واژۆ کردووە، بەڵام دوای ماوەیەك حەزم بەو ناوە نەدەکردو نامەم بەناوی خزمەتکاری موجاهیدانەوە واژۆ دەکرد، چونکە من بوومە خزمەتکاری ئەوان.

پ: ئایا پێش ئەوەی هێرش بەرنە سەر دیاربەکرو دەستی بەسەرا بگرن راوێژتان کرد؟

و: من لایەنێك نەبووم لەو هێرشەو ئاغایەکان ئەمەیان رێکخست.

پ: ئێستا تێگەیشتم نەتانتوانی دیاربەکر رزگار بکەن، بەڵام پرسیارەکە ئەوەیە کێ بۆ ئەو قەناعەتە هانیدان کە رزگارکردنی ئاسانە؟

و: پێمان وابوو چەند شەڕێك روو دەدات‌و دوایی سەرکەوتن بۆ کورد دەبێت بەڵام ئەمە نەهاتەدی.

پ: دەیانوت جەمیل پاشاو نەقیب زادە دۆستی ئێوەن، ئەمە وایە؟

و: من کەسیان ناناسم، بەڵام وەکو گوێم لێ بوو کە ئەکرەم جەمیلو نەقیب زادە لە دۆستانی شەریعەتن، من بۆخۆم نایاناسم بەڵام گوێم لێ بووە ئەوانە لە بانگەوازکارانی شەریعەتن، دەیانوت لەکاتی هێرشکردنە سەر شار هاوکارمان دەبن، بەڵام ئەمەم تەنیا گوێ لێ بوو، نەمزانی ئەمە راست دەرچوو یا نا؟.

پ: بەڵام چاکتر نەبوو دڵنیا بوونایە لە درووستی ئەم هەواڵە؟

و: لەکاتی شۆڕش چەندان قسەو درۆو دەلەسە هەن، کە سنوورو چاودێرییان بەسەرەوە دانانرێ، بۆ نموونە دەیانوت شاری "مۆش" ئازاد کراو شاری "بەدلیس" ئازاد کرا، بەڵام دواتر دەرکەوت پڕوپاگەندە بوو، پۆستەو هۆیەکانی گەیاندنمان نەبوو ئەم پڕوپاگەندانە یەکلایی بکەینەوە.

پ: ئەگەر ئەمە هەموو راست نەبێتو پێوست نەکات ئەدی چۆن پاساوی بەفیڕۆچوونی ئەم هەموو خوێنڕشتنەی ناو نەوەکانی ئومەتی مەحەمەد دەهێننەوە؟

و: بەڵام ئەوەی بوو هێرش کرایە سەر "دارهنی"و راپەڕین لە"خونەیس" روویدا، دەزانم خوێنرشتن مەسەلەیەکی ناشەرعیە، بەڵام من فەتوام دەستکەوتبوو.

پ: فەرماندەی هێرشی سەر شاری عەزیز کێ بووە؟

و: پێشتر شێخ شەریفم بە سەر ئەو بەرەیەوە دانابوو.

پ: فەرماندەکانی تر کێ بوون؟.

و: بەرەی "خارنك"م بە شێخ شەریف راسپارد، کە دەسەڵاتی هەتا بالۆ درێژ دەبۆوە، شێخ "عەبدوڵڵا مليكانلی"م بە سەر کیرفانیو موش دانا بەڵام شێخ حەسەن نەگەیشتە شوێنی خۆیو سەرۆك هۆزەکانو موختاری ناوچەکە ببوونە فەرماندە، من سوپایەکی تۆکمەم نەبووە، بۆیە ناچاربوم بۆیان بنووسم، کە بەردەوام بن لەسەر کاری خۆیان.

پ: گریمان شاری دیاربەکرتان ئازاد کرد، دواتر بەنیازبوون چی بکەن؟

و: لە دوای ئازادکردنی دیاربەکر بیرمان لەوەدەکردەوە کە زانایانو پایەدارانی شار کۆبکەینەوەو حکومەت بدوێنین، سەرەڕای ئەمەش عارەق قەدەغە بکەینو دووبارە خوێندگا ئایینییەکان بکەینەوە.

پ: ئایا ئازادکردنی دیاربەکر هەنگاوێکی سەرەتایی بوو بۆ دامەزراندنی کوردستانێکی سەربەخۆ؟

و: دامەزراندنی کوردستانێکی سەربەخۆ، لە کاتی راپەڕین شتێکی لەوجۆرە بە بیرماندا نەهاتووە، بە تەنیا بیرمان لە جێبەجێکردنی شەریعەت کردبۆوەو سەرۆکی دەوڵەتی کوردییم قبوڵ نەکردووە، ئەمە لە توانای مندا نەبووە.

پ: سەبارەت بەو بابەتە (دەوڵەتی کوردی ـ "وەگێڕ") بەیاننامەیەك هەیە، ئایا تۆ ئاگاداری؟

و: من لەو بەیاننامە ئاگادار نیمو نازانم کێ نووسیویەتی؟

پ: گریمان شاری دیابەکرتان ئازاد کردو حکومەت بەپیر داواکارییەکانتانەوە نەهات، ئایا ئامادەبوون لە شار بکشێنەوە؟

و: بیرم لەو ئەگەرە نەکردۆتەوە، بەڵام دەزانم ئەنجومەنی نوێنەران خەڵکی دیندارن، بۆیە ئومێدی خێرم پێیان هەبووە، کە رازی بن لەسەر داواکارییەکانمانو دووبارە قوتابخانە زانستییەکان بکەنەوە.

پ: ئێوە چۆن جورئەتان کرد بە ڕووی هێزەکانی کۆماری تورکیای مسوڵماندا بچنەوە، ئێوە دەزانن ئەو هێزانە دەتوانن بە تەواوی بەسەرتاندا زاڵ دەبن؟

و: هیچ ئاماژەیەکی ورد یا نیشانەیەکمان نەبووە لەسەر قەبارەی هێزی سوپا، من پێم وانەبوو ئەو هێزە بەو توندیە شەڕمان بکەن.

پ: سەرەڕای ئەوەی پێشتر چاوەڕوانت نەدەکرد بەڵام ئێستا دەزانی؟

و: بەڵێ.

پ: سەماحەتی شێخ تکایە پێمان بڵێ یاخیبوونەکەتان ئاکامی پێشتری بووە یان ڕووداوێکی لەخۆوە بووە؟

و: نازانم کێ لەوە بەرپرسە.

پ: چۆن دەتوانن بەناوی ئەو داواکارییانە بەشێکی نیشتیمان دابڕنو پیلان بگێڕن، باشتر نەبوو لەسەر ئەو داواکارییانە پێش یاخیبوون بچووبانایە لای حکومەت؟

و: کات نەبوو.

پ: لەو حاڵەتەی حکومەت بەپیر داواکانتانەوە نەهاتایە ئێوە چیتان دەکرد؟

و: ئەگەر حکومەت داواکانی پەسند نەکرد، هەر هیچ نەبێت خۆمان لێی بەدوور دەگرت و لە نیشتیمانی خۆمان دادەنیشتین، ئەگەر حکومەت رێگەی نەدابنایە کۆچمان دەکرد، ئەگەر دەرفەتی ئەوەشمان نەبوایە خۆمان لێی بێبەری دەکرد.

پ: لەو نامەی بۆ گوندی لیجەت ناردووە بەدیاردەکەوێ هەندێ ئامادەکاری هەبووبێت بۆ هەڵگەڕانەوە.

و: من ئەو نامەیەم نەنووسیوەو لە ناوەڕۆکی ئاگادار نیم.

پ: وتت دوای سەرهەڵدانی یاخیبوون ئێوە بوونە فەرماندەی، ئەگەر پێشتر نەخشە نەبوایە چۆن ئەوان تۆیان ناسی و بە فەرماندە قبوڵیان کردی؟

و: لە کاتی رووداوی پیران لە ناوچەکە بووم، ئەوە تەقدیری خوا بوو بوومە فەرماندەی راپەڕینەکە، ئەگەر تەگبیری لە پێشتر هەبوایە بەو رۆژە نەدەگەیشتین.

پ: بایەختان بەچ بابەتێکی شەرعی داوە؟

و: قەدەغەکردنی مادە سەرخۆشکەرەکان.

پ: ئێستا یاسایەك نییە بۆ قەدەغەکردنی مادە سەرخۆشکەرەکان؟

و: بەڵێ یاسا هەیە، بەڵام بیستمان هەڵوەشاوەتەوە، هەروەکو لە بابەت سنووردانانی کوشتنو داوێن پیسی و هەڵگەڕانەوە کاری پێناکرێ.

پ: ئەو سەربازانەی هاتبوونە ناوچەکەی ئێوە بۆ بەرەنگاری یاخیبوون چۆنتان دەبینی کافربوون یان موسڵمان؟

و: من وەکو موسڵمان لەگەڵیان دوام.

پ: فەرموودەیەکی پێغەمبەر هەیە دەڵێ: هەر کەسێ شمشێرمان بەڕوودا هەڵکێشێ لە ئێمە نییە، ئەمە راستە؟

و: بەڵێ لەوبارییەوە فەرموودەیەك هەیە.

پ: تکایە بەردەوام بە لە ڕاڤەی ئەو فەرموودەیە.

و: بەڵێ ئەو فەرموودەیە هەیە، بەڵام من لە پێناو مافی خۆم شمشێرم هەڵنەکێشاوە، بەڵکو بەرگریم لەئایین کردووە، فەرموودەکە دەڵێ: هەر کەسێ لە بەرانبەرماندا شمشێر هەڵبکێشێ لە ئێمە نییە.

پ: ئایا لە ناو موسڵمانان کەسێکی لە ئێوە زاناترو دیندارتر نەبووە؟ ئەگەر خەڵی تر هەبووە بۆچی تۆ بەتەنیا بەو کارە هەستاوی؟

و: بەڵێ زاناتر هەبوون ترساون یان هەر هۆیەکی تر من نایزانم.

پ: ئەگەر بەڕاستی ئەو پێشێلکارییە شەرعیانە هەبووە بۆچی زانایانی تریش بەشداریان نەکردووە؟

و: کۆدەنگی هەیە لە نێوان ئەهلی شەریعەتو شاگردەکانیان لەسەر پێویستی گەڕانەوە بۆ شەریعەت بەڵام ئەو زانایانە لە ژیان و بژێوی خۆیان ترساون.

پ: تۆ زاناترو ئازاترینیان بووی، وانییە؟

و: من زاناترینیان نەبووم، بەڵام کەوتمە هیلاکەوە.

پ: کەی "بالۆ"ت بەرەو پیران بەجێهێشت؟

و: لە مانگی کانوونی یەکەمی ساڵی (1924ز)*.

پ: ئایا گۆنجاوە بۆ کەسێکی وەکو ئێوە لە ساردترین کاتی زستان شوێنی خۆتان بەجێبهێڵن؟

و: بەهۆی نەبوونی شوێنی گونجاوو خراپی ئاووهەواو کەمی خۆراك، ناچار بووین تەنیا رۆژانە سێ کاتژمێر بڕۆین.

پ: باشتر نەبوو لە سەرەتای وەرزی بەهار یان لە هاوین، یان پاییز ئەوێ بەجێبهێڵن؟

و: لەسەرەتای هاوین بەزیارەتکارانو میوانو کاری بازرگانییەوە خەریك دەبووین، بەڵام لە وەرزی زستان کاتمان زۆر بەدەستەوە بوو.

پ: یاخیبوونەکەتان چەندی خایاند؟

و: زیاتر لە دوو مانگی خایاند.

پ: کەواتە بەر لە دوو مانگ پێش یاخیبوونتان بە بیانووی سەردان شوێنی خۆتان بەجێهێشتووە، بەڵام دوای ماوەیەکی کەم یاخیبوون، ئایا رێککەوتنێك نەبووە لە نێوان کاتی دەرچوونتانو کاتی یاخیبوون، هەروەکو وتتان بە ماوەیەك بەر لە دەرچوونتان

---

* – پێم وانیە شێخ سەعید رۆژژمێری زایینی بەکارهێنابێ، بەڵام دەگونجێت دادوەر بەو شێوەی نووسیبێت. "وەرگێر"

رۆژنامەی "سبیل الرشاد"تان خوێندۆتەوە، پێت وانییە ئەمە جۆرێك لە ئیلهام و هاندەر بوو بێت بۆ بزووتنەوەی هەڵگەڕانەوەکەتان؟

و: بەڵێ ئەوکات شتی وام بە خەیاڵدا هات، بەڵام لەخۆوە هەڵگیرساو مەبەستم نەبوو ئەو کاتە دەست پێ بکەم،.

پ: کوڕەکەت سەردانی حەڵەبی کرد؟

و: بەڵێ بۆ کاری بازرگانی، کوڕەکەم سەردانی حەڵەبی کرد، دوای ئەوە چووە ئەستەنبوڵ بۆ ئەوەی ئەو پارانە بگەڕێنێتەوە بۆ ئەو شوێنانەی کە لە حەڵەب لێی وەرگرتبوون.

پ: عەلی رەزا لە حەڵەبەوە چووە ئەستەنبوڵ پەیوەندی بەپارەو سامانەوە هەبووە، لەو گەشتەی هەندێ کەسی بینی، ئایا یاخیبوونەکەتان ئاکامی ئەو یەکتر بینینانە نەبوو؟.

و: کاتێ ئەو گەڕایەوە لە بالۆ دەرچووبووم، چل رۆژ پێش شۆڕش لە شۆشر بینیم.

پ: کە پرسیارتان لێکرا بۆچی هێرشتان کردە سەر دیاربەکر، وتتان چونکە شاری ناوبراو دەکەوتە سەر رێگاتان، ئایا ئەمە قسەی ئێوە بووە؟.

و: ویستمان بچینە شاری دیاربەکر چونکە لێمان نزیك بوو، کۆگای تەقەمەنی تیدا بوو، کە ئێمە پێویستمان پێی هەبوو.

پ: لەو کاتەی لە هێرشی سەر دیاربەکر شکانو ناچاری پاشەکشە بوون چیتان کرد؟.

و: گەڕاینەوە "جەبەق گور" لە دارهینی و خەڵکی ناوچەکە هاتنە پێشوازیمانو داوایان لێکردم سەردانی لیجە بکەم، بەڵام مەبەستی سەردانم نەبوو، مۆڵەتی کوردەکانمدا بگەڕێنەوە شوێنی خۆیان، کاتی چوومە ئیجل لەوێ بیستم وانو ئەرغەنی کەوتوونەتە دەستی موجاهیدان.

پ: ژمارەیەکی زۆر تورك لە ئیجین هەیە بۆچی ئەوان بەشداری ئەو هەڵگەڕانەوەیان نەکردووە؟.

و: چوومە نزیك ئیجین لە دەوروبەری ئیرغەنی، دواوام لێکردن، هەروەکو کوردان بەرگری لە شەریعەت بکەن.

پ: تورك لەو ناوچانە لەگەڵتان بەشدارییان کرد؟

و: لە ئەرغەنی شەوقی ئەفەندیو حامید ئەفەندیو حاجی ئەفەندی هەبوون.

پ: ئەوانە تورکن یان کوردن؟

و: ئەوانە تورکنو هەموویان بەشداری شۆڕشیان کرد.

پ: ناوی هیچ کۆمەڵەیەکی کوردستان بیستووە؟

و: ئاگاداری هیچ کۆمەڵەیەك نیم.

پ: کۆمەڵەی تەعالی کورد دەناسی؟

و: ئەو کۆمەڵەیە ناناسمو نازانم کێ بەڕێوەی دەبات.

پ: لەکوێ داوای جێبەجێکردنی شەریعەتتان کرد؟

و: ئەمڕۆ یاساکانی شەریعەت فەرامۆش کراوە، بەڵێ ئەو فەرامۆشکردنە پێشتر لەلایەن هەندێ لە سوڵتانەکانەوە بووە، بەڵام کەس لەوان یاسای شەریعەتی هەڵنەوەشاندۆتەوە، ئایا نابێت بەپیر داوای خواوە بچین بۆ جێبەجێکردنی یاساکانی وەرگیراو لە شەریعەت، ئەم ئەرکە دەکەوێتە ئەستۆی خەلیفەکان.

پ: مەبەستت لە خەلیفەکان کێن؟

و: خەلیفەکان ئەوانەن سەرکردایەتی ئومەت دەکەن بۆ جێبەجێکردنی ئەو یاسایانەی لە شەریعەت وەرگیراوە.

پ: ئایا تۆ دەتەوێ ببیە خلیفە؟

و: خەلیفە زەمانەتێکی بنەڕەتیە بۆ جێبەجێکردنی بنەماکانی ئایینو ئەو بابەتەی شەرع داوای کردووە.

پ: وتتان هیچ دەربارەی "کۆمەڵەی بەرزیو پێشکەوتنی کوردی" نازانن بەڵام پێمان بڵێ ئەو کارانە چی بوون لەکاتی سەردانی یوسف زیا بەگی بەدلیسی گفتوگۆتان لەسەر کرد؟

و: بەڵێ دەزانم یوسف زیا بەگ سەردانی کردم، ئەو سەردانە لەسەر داوای مامۆستای پێشووم حەیدەر ئەفەندی بەدلیسی بوو، ئەو پێی وتم: یوسفو رەشید موشلی دەیانەوێت سەردانت بکەن، هەر ئەو پێی وتم زیا بەگ ئەندامی ئەنجومەنی "نوێنەران"ە لە بەدلیس، میوانەکان چەند کاتژمێر لەلام مانەوە، چایان خواردەوەو رۆیشتن، دوای

ماوەیەکی کورت لە ڕۆژانێکی بەهار یوسف زیا بەگ جارێکی تر گەڕایەوە خونەیس‌و سەردانی کردم، لەوێ وتی: لەگەڵ کۆمەڵێك لە هاوڕێکانم کاردەکەین بۆ دامەزراندنی دەوڵەتی سەربەخۆی کوردی، پێم وت ئەم کارە مەحاڵەو من کاری وا قبوڵ ناکەم.

پ: چۆن دەزانی حکومەت حیساب بۆ یاسای شەریعەت ناکات؟

و: کتێبێکی ئەحمەدو عەبدوڵڵا جەودەتم خوێندەوە، کە بەتەواوی ناوی نازانم، بەڵام ئەو لە ڕۆژنامەی "سبیل الرشاد" نووسیبووی: گەورەمان موسا سەلامی خوای لێبێ لە خۆبایی بووەو عیسا بەناوبانگ‌و موحەممەد ئەمیندار بووە، هەریەك لەوانە ئایینێکی هێناوە، ئایا مەبەستیان ئەوەیە هەموو ئاقڵێکی ئومەت دەتوانن ئایینێکی تازە بهێنن؟. خوێندنەوەی ئەو جۆرە وتارانە زۆر نیگەرانی کردم، هەروەها رۆژنامەی سبیل رەشاد هەواڵێکی نووسیبوو، کە کلیج زادە هەقی پەیامنێری ئەزمیر بۆ رۆژنامەی ناوبراو زمانی درێژ کردووە بەرانبەر پێغەمبەری خوا، حەسەن فەهمی موفتی لە دادگا شکاتی لێکردووە بەڵام دادگا بووختانچی سەر پێغەمبەری بەبێ تاوان نیشانداوەو بە سەد لیرە موفتی بە سزای دارایی غرامە کراوە، کە دەبوایە دەست بەجێ بیدا، دوایی دادگای تێهەڵچوونەوە بێتاوانی کرد و غەرامەکەی لەسەر لابرد، نموونەیەکی تر ئەوە حکومەت خانەی "پیران"ی کردۆتە قوتابخانەی کچان، لەوێدا فێری کەمان‌و پیانۆ دەبن، خوێندنەوەی ئەو هەواڵانە زۆر نیگەرانی کردوم، هەروەها بیستم ئەلیاس سامی نوێنەری موش لە ئەنجومەنی "نوێنەران"و دوو لە هاوڕێکانی کتێبێکیان بە ناوی "هەڵگەڕانەوە" نووسیووە، لەوێ بوختانی زۆریان بە خەلیفەکانی پێغەمبەر کردووە، هیچ ژمارەیەکی رۆژنامەی "سبیل رەشاد" نەبووە رقی هەڵنەستاندبم، سەرەڕای ئەوە لە ڕۆژنامەکانی ئەستەنبوڵ دەیبینم بانگەواز بۆ ماسۆنییەت‌و عەلمانییەت دەکرێ، ئەمە غیرەتی ئیسلامەتیم دەبزێنێ‌و وادەکات بە ئاسانی بێدەنگ نەبم.

سیاسەتی بەریتانی لە کوردستان لە ماوەی سالانی (1927–1931) مەبەستی بووە ناوچە کوردییەکان بەتەواوی بە دەولەتی عیراقیەوە بلکینی، لەگەل بەرەنگاربوونەوەی نەتەوەخوازانی کورد لە دروستکردنی پەشیوی لە ناوچەکەدا. لەو روانگەیەوە دەسەلاتدارانی بەریتانی فشاری بەردەوامیان خستبووە سەر حکومەتی عیراقی هەتا رازی بن لەسەر جیبەجیکردنی بەلینەکانی رابردوو، لەوەی پەیوەستە بەکارگیری خۆجیی لە لیوا کوردییەکان.

حکومەتی عیراقیش بەردەوام بووە لە بەعەرەبکردنی کوردستانو خۆبواردنی لە بەرانبەر مافەکانی کورد، هەتا ئەو مافانەشی وەردەگرتەوە، کە کورد لە سەرەتای بیستەکان بەدەستی هینا بوو، ئاکامی ئەوە هەردوو راپەرینی ئەیلولی (1930) لە سلیمانی بە سەرۆکایەتی شیخ مەحمودو راپەرینی بارزان بە سەرۆکایەتی شیخ ئەحمەدی بارزانی لیکەوتەوە. ئیدارەی بەریتانی بە فرۆکە جەنگیەکانی مەلەکی (RAF) هەردوو راپەرینی سەرکوت کرد، بەمەش پرۆسەی سیاسەتی لکاندنی باشووری کوردستان بە عیراقەوەی تەواوکرد. لەم لیکۆلینەوەیەدا لە هۆیەکانی راپەرینی ئەیلولو بزاڤی سییەمی شیخ مەحمود دەدوین، لەم میانەدا جەخت دەکەینە سەر رۆلی دەستەبژیری نەتەوەخوازی نیگەران لە سلیمانی، دوایی لەسەر راپەرینی بارزان دەوەستین، لەگەل ئەو کیشانەی پەیوەستە بەو راپەرینانە. ئایا ئەو راپەرینانە نەتەوەیی بوون، یان یاخیبوونیکی خیلەکی بوون؟ لە روانگەی بەلگەنامەکانی بەریتانییەوە رۆلی حکومەتی بەریتانی دەخەینەروو لە چەواشەکردنی کۆمەلەی گەلان لەسەر پیشیلکردنی ماف کوردان لەلایەن حکومەتی عیراقیەوە، کە بەندەکانی تایبەت بە ماف کوردانی پیشیل کردووە، کە پیشتر کۆمەلەی گەلان لەکاتی چارەسەری کیشەی ولایەتی موسل لە سالی (1925) بریاری لەسەر درابوو.

## هۆکارەکانی شۆرشی ئەیلولی سالی (1930)

لە دوای چارەسەری کیشەی موسل، هەتا سالی (1930) "ئارامییەکی ریژەیی" هەبووە،[376] بەلام خەباتی کورد لە پیناو بەدەستهینانی حوکمی زاتی، یان سەربەخۆیی

---

[376] - Arnold J.Toynbee, Survey of International Affairs , 1934 (London Oxford University Press) 1935, p.128.

هێورنەبوبووە. لە ڕاستیدا بیرۆکەی نەتەوایەتی کوردی لە ناوەڕاستی بیستەکاندا لە عێراق و تورکیا وریا بوونەوەیەکی بەرچاوی بەخۆوە بینی، بۆ نموونە لە زۆر بۆنەکاندا نوێنەرانی کورد لە"پەرلەمان" وەکو یەك قەوارە، داوای ماف نەتەوایەتی کوردیان کردووە، چەندین کۆمەڵەی کوردی نەتەوایەتی پێك هات، لە نیسانی ساڵی (1926) چینی ئەفەندی لە سلێمانی یانەی زانستی (zanusty) ڕووناکبیرییان دامەزراند، کە ئامانجی بڵاوکردنەوەی ئاکاری عەلمانی بووە لەناو کورد، بەڵام لە ڕێگەی وەرزی خوێندنی ئێواران بەخێرایی گۆڕا بۆ مینبەرێکی راگەیاندن بۆ بیری نەتەوایەتی، هەروەها لە ڕێگەی دەستەی ژیان (Zhyyau) کە لقی لە شارەکانی موسڵ و هەولێر و کەرکووك کردەوە هەمان ئەرکی ئەنجام دەدا، حکومەت لە ساڵی (1927) زانی کە یانەکە گۆڕاوە بۆ مینبەرێکی نیمچە حیزبی بۆ نەتەوایەتی کوردی، لەبەر ئەوەش دایان خست[377].

سەرەڕای ئەمە لە (2)ی شوباتی ساڵی (1926) شەش کەس لە نوێنەرە پەرلەمانتارە کوردەکان لەگەڵ هەندێ لە پیاوماقوڵانی سلێمانیو کەرکووك بەنهێنی کۆبوونەوەو دەقی داواکارییەکیان دووبارە دایەوە بەعەبدولمحسن سەعدون بەگی سەرۆك وەزیرانی ئەوکات، پشتگیری خۆیان بۆ خستەڕوو، بەو مەرجەی مافەکانی کوردی جێبەجێ بکات، کە لە دەقی بڕیاری کۆمەڵەی گەلانی تایبەت بە موسڵ هاتووە بەم ناوەڕۆکەی خوارەوە:

1- زمانی کوردی ببێتە دووەم زمانی فەرمیی لە پەرلەمانی عێراقی.

2- هەموو بەرپرسانی لیوا کوردییەکان کورد بن.

3- یەکێك لە سێ نوێنەرەکەی سەرۆکی وەزیران کورد بێت، هەروەها لەبەرپرسانی حکومەتی ناوەندی کورد هەبێت.

ئەندامە کوردەکانی پەرلەمان ڕێککەوتن، ئەگەر حکومەت داواکارییەکانی جێبەجێ نەکردن لە ئایندە لێی بگەڕێن بۆ پارتی دەسەڵاتدار، لە پارتی پێشکەوتووخواز، کە عەبدولمحسن وەکو کوتلەیەك سەرۆکایەتی دەکرد، سەرۆکایەتی وەزیران لەسەر ئەو

---

[377] - BHCF, 13/14, Events in Kurdistan, Vol. 6.Desp 1/407 March 30, 1927.(The Kurdish Movement) From AHC to S.S. Col, Khawaja, p.41.

داواكارييانه كۆبووەو دڵنياى كردن، كه داواكارييەكانيان له ئاييندە زۆر به گرنگەوە وەردەگيرێ[378].

لەو ماوەيەدا بيرۆكەى نەتەوايەتى كوردى كورتهەڵنەهاتبوو بەتەنيا له ڕووناكبيرانى كورد، ئەو ڕاپۆرتەى وەزارەتى فڕۆكەوانى ئامادەى كردبوو جەختى دەكردەوە، كه سەرۆكى هۆزە بەهێزەكانى وەكو پشدەرو دزەيىو جافو هەورامانو خۆشناو لەهەرە نەتەوەخوازەكانن، له ڕاپۆرتەكەدا هاتووە: (هەموو كوردێك بڕواى پتەوى به بيرى سەربەخۆيى كوردستان هەيەو ئامادەيه لەو پێناوەدا شەڕ بكات)[379]. چەند پسپۆڕێكى بەريتانى له ڕاپۆرتێكدا بەدڵنيايى دەڵێن:

(مەسەلەى سەربەخۆيى كوردستان بەهۆى بێتوانايى كوردو توركو فارس لەسەر پێكەوەژيانى ئاشتيانه هەتا له ئاييندەيەكى دووريش بێ نەبڕاوەتەوە، هەروەكو ڕاپەڕينو رابوونى پوڵندە و چيكوسلوفاكيا له دوا قۆناغەكانى ئيمپراتۆريەتى عوسمانى ديار بووە، مەسەلەى كوردستانيش لەو زەمانه سەرى هەڵدا، كه چاوەڕوان كراوبوو پەرە بستێنێت)[380]. ئەم جوڵانەوەيە به تەنيا كوردەكانى عيراقى نەگرتبۆوە، له ساڵى (1926) ژمارەيەك له كوردانى كۆچەرى پەناهێندەى توركياو عيراقو ئيران پارتى نەتەوەيى كوردى "خوێبوون"يان پێك هێنابوو. له تشرينى يەكەمى ساڵى (1927) خوێبوون به فەرميى له بەيروتى لوبنان ڕاگەيەنرا. مير جەلادەت بەدرخان به يەكەم سەرۆكى كۆمەڵە هەڵبژێردرا. ئەندامانى خۆيبوون شان بەشانى پارتى نەتەوەيى ئەرمەنى كاريان دەكرد، واديار بوو نەتەوەخوازانى ئەرمەن (Dashnak) كاريگەرى گەورەيان هەبووبێت لەسەر پێكهێنانى خۆيبوون.

ئەو پارتە له ساڵى (1928) شۆڕشى له چياكانى ئارارات له دژى توركان بەرپاكردووە، نەتەوەخوازانى كورد له حكومەتى يۆنانى و ئيتاڵى يارمەتييان بەدەست دەكەوت، له بەرانبەردا هەردوولا ئومێديان هەبووە كورد بەكار بهێنن بۆ لاوازكردنى

---

378 - Air 23/411 Desp. No, D/6 feb. 5,1926. s.s.0. Baghdad: FO, 371/468, Intelligence Rep. No, 4 feb 18,1926.

379 - FO, 371/12255 A.H.Q. British Force Baghdad Desp. No, 1/407 (Report Kurdish National Movement) March 30, 1927

380 - Air 23/411 Desp. No, D/6 feb. 5,1926. s.s.0. Baghdad.

حکومەتی مستەفا کەمال. ئەندامانی خۆیبوون لە کوردستانی باکوور و ئێران و ڕەواندز لەناو رەوەندی کوردی لە ئەستەنبوڵ و حەڵەب و تەورێز و بەغدا و قاهیرە و پاریس چالاك بوون[381]، لەگەڵ ئەوەدا خۆییبوون ئەندامی لە کوردستانی عێراق زۆر نەبوو، بەڵام سەید تەهای نەهری‌و هەندێ لە سەرکردەکانی کورد لە پەیوەندییدا بوون لەگەڵ شۆڕشگێڕانی ئاراراتو دوو لە بەرپرسانی سەربازی کورد لە سوپای عیراقیەوە پەیوەندیان بە شۆڕشگێڕانەوە کردبوو[382].

چالاکیەکانی خۆیبوون بەرەنگاربوونەوەیەکی مەترسیداربوو لەسەر دەسەڵاتی بەریتانی لە عێراق و هەموو سیاسەتی بەریتانی پەیوەست بە پاراستنی ئارامی ناوچەکە، کە لە نیوەی دووەمی بیستەکان ئامانجی ستراتیژی بەریتانی بووە لەهەوڵەکانی بۆ ڕاگرتنی مەترسی کۆمۆنیستی، لەو باوەڕەدابوون نەتەوایەتی کوردی ئامرازێکەو هەتا ئێستاش لە قۆناغی سەرەتاییدایە بۆ شۆڕشێکی ڕێکوپێك.

---

381 - FO, 371/13032 Desp. No, 1532, July 4,1928, Secretariat of H. C. to Col.O

نیکتین: الاکراد، ل174

بەهۆی ئەو تاوانەی لەکاتی شەڕی یەکەمی جیهانی دژی ئەرمەن ئەنجام درابوو، نەتەوەخوازانی ئەرمەن هەوڵی بەکارهێنانی کوردیان بوو بۆ تۆڵەسەندنەوە لە تورکان. لێرەشدا دەوڵەمەندو گەورە پیاوانی ئەرمەن وەکو بەترۆس نۆبارو دکتۆر بابازیانی نوێنەری پێشووی شاری "وان" لە باشووری رۆژهەڵاتی تورکیا پەیوەندی دۆستایەتیان لەگەڵ سەرکردە کوردەکانی وەکو ئەمیر جەلادەت بەدرخان‌و مەمدوح سەلیم دامەزراند بوو. بڕوانە: BHCF, 13/14, Events in Kurdistan, Vol, 6,(Kurdish Nationalism) June 14, 1924, AGC, Baghdad.

ئیحسان نووری پاشا ئەفسەری پێشووی عوسمانی، فەرماندەی باڵای هێزەکانی کورد، هێزەکەی لە هەزاران جەنگاوەری کورد پێك هاتبوو، شۆڕشگێڕان ناوچەیەکی بەرفراوانیان ئازاد کردو کارگێڕی کاتییان تێدا دامەزراند، هەتا ئەیلوولی ساڵی (1930) بەردەوام بوو، هێزەکانی کەمالی بە تەواوی دەستیان بەسەرا گرتەوە. بڕوانە: R, How, (Kurds Revolt Against Turkey) Current History Sept 1930, pp.1231-1232. Arfa, pp. 39-40.

Jwaideh, pt, 2. 617. ژیان. ژ252، 21ی تەموزی 1930.

382 - FO.371/13032, Teleg Secret, No, S.O. 1587. Baghdad, July 10. 1928. Secretariat of H. C.to Col .

دەسەڵاتدارانی بەریتانی ترسابوون لەوەی کە خاوەن ئەزموونانی کورد دەرفەتی زێڕینیان بۆ برەخسێتو سەربەخۆیی کوردستان ڕابگەیەنن، باکووری عێراق و باکووری ڕۆژئاوای ئێران و باشووری ڕۆژهەڵاتی تورکیا بخەنە باری نائارامیو کاریگەری مەترسیداری هەبێت لە ناوچەکەدا، ڕووسیا نائارامی لە عێراق و دراوسێکانی درووست بکات، کە مەبەستیەتی ئەو هاوسەنگیەی بەریتانیا لە ناوچەکەدا درووستی کردووە تێکی بدات، لێرەدا بزووتنەوەی نەتەوایەتی کورد باشترین ئامرازی کاریگەر دەبێت[383].

لە ساڵی (1928) هەندێ لە چالاکییەکانی خۆیبوون بۆ پشتیوانی لە شۆڕشی ئارارات سنووری عێراقو تورکیان بەکارهێنا، ئەم چالاکییانە مەترسی درووست کرد لەسەر هەوڵەکانی ئەنگلۆ– عێراقی لە بنیاتنانی پەیوەندیی دۆستانەی نێوان تورکیا و عیراق[384].

لەلایەکی ترەوە چالاکییەکانی خۆیبوون هیوای دایە بەر ئەو کوردە عێراقییانەی زۆر ڕقیان لە عەرەبەکان بووە، لەسەر قسەی دەسەڵاتدارانی بەریتانی لە دوای هەرەسهێنانی شۆڕشی دووەمی شێخ مەحمود بەریتانییەکان کارگێڕییەکی عێراقییان لە کوردستان درووست کردبوو، کە بە شێوەیەکی گشتی لەناو کورد جەماوەری نەبوو، بەتەنیا لای ئەوانە نەبێت، کە پایەی حکومی بەرزیان هەبوو، یان پەیوەندی بازرگانی باشیان هەبوو لەگەڵ عەرەبەکانی عێراق، هەندێ لە کوردانی ئەوکات لە کوردستان ڕازی بوون بەوکارگێڕییە.کەواتە هێزی حکومەتی عێراقی لە ناوچە کوردییەکان بۆ زاڵبوون بەسەر بارودۆخەکە بەتەواوی جەختیان دەکردە سەر ئاگادارکردنەوەی کورد، لەبەرانبەر ئامادەکردنی هێزی مەلەکی بۆ سەرکوتکردنی هەر هەڵگەڕانەوە، یان یاخیبوونێك، شوێنو شارەکانیان بە ئامانج دەگێری[385].

---

383 – FO.371/13032, A.H.Q, British force Iraq, Baghdad, Desp. No, 1/401, The Report on Kurdish Nationalist Movement March 30.1927.

384 – FO.371/13032 Desp No, S.O, 1532, 4 July 1928. Secretariat of H.C.

385 – DBFP, Ser, B.Vol. 6: 198. Memorandum. Secret, A. Dec, 4, 1928: Dobbs to Amery BHCF, 13/14, Events in Kurdistan, Vol,6 Dest, 1/407 Report on the Kurdish Movement) March 30, 1927. A.H. C to S.S. Col .

سەرەڕای ئەمە دامەزراندنی خۆیبون کوردانی عێراقی خستبووە سەر (دروشمی یەکگرتن) لەگەڵ کوردانی تورکیا.. ئەم هۆکارانە بووە، کە ئینگلیز خۆیبوونی بە مەترسیی دانابوو بۆ سەر یەکێتی عێراق، بۆیە هەردولا هەوڵی زۆریان دا سەرکوتی بکەن[386].

حکومەتی بەریتانی لەساڵی (1928) دەسەڵاتدارانی فەڕەنسیان لە سووریا رازی کرد، کە هەندێ لە چالاکییەکانی پارتی خۆییبوون بە هاوکاری حکومەتی تورکیا لە سنووری سوریاوە یارمەتی شۆڕشگێڕانی ئاراراتیان داوە[387]. کۆمیساری باڵای بەریتانی لە بەغدا بەیارمەتی وەزارەتی داگیرگەکان لیستێکی بۆ ناوی ئەو کەسانە ئامادەکرد، کە لەو بڕوایەدا بوون بەهۆی پەیوەندییان لەگەڵ پارتی خۆییبون خۆشەویست نین، بەریتانیا ئێرانیشی ئاگادارکردەوە بۆ چاودێری چالاکییەکانی ئەندامانی خۆیبوون دژی تورکیا[388].

هەرەشەی نەتەوەیی کوردی لەسەر ئاستی ولایەتەکانی باکوور زیاتر بارەکەی ئالۆزکرد، چونکە کوردەکان زانیان حکومەتی عێراقی دوودڵە لە جێبەجێکردنی بەڵێنە یەکلاکراوەکانی ڕابردووی، بە تایبەتی ئەوەی پەیوەستە بەو مافەی لە بڕیاری کۆمەڵەی گەلانی ساڵی (1925) سەبارەت بەکارگێڕی خۆیەتی لەکوردستاندا هاتووە. لە تشرینی دووەمی ساڵی (1926) (هنری دۆبێس) تێبینی کرد حکومەتی عیراقی وەفادار نییە بەرانبەر کۆمەڵەی گەلان، لەوەی کە پەیوەندیی هەیە بە دانانی بەرپرسانی کورد لەو ولایەتانەی زۆرینەی کوردن، ناچار بوو بەڵێنەکانی پەیوەست بەکورد بە بیر حکومەتی عێراقی بهێنێتەوە[389].

---

386 -- BHCF, 13/14, Events in Kurdistan, Vol,3.Memo, Secret March 19, 1928. A.H.Q, British Froce Iraq Baghdad to Air Ministry.

387 - FO, 371/13037, Memo, No, B/L/10, Sept 5,1928, R.A.F. Trans Jordan.

388 - FO, 371/1359. Despt. No, Sept,4.1928. Dobbs to Army. 13032. Desp. S.O.1532, July 1928, Secretariat of H.C.

389- Great British Col, Office, Iraq Administrative Report for the Year 1926, p.96. FO, 371/13759, Letter No, N.P.O, Dobbs to Abd al Muhsin.

دوانزە نوێنەری کورد یاداشتنامەیەکیان دا بە پەرلەمان و خانەی نوێنەرایەتی کۆمیساری باڵای بەریتانی لە بەغدا، کە نیگەرانی خۆیان تیدا ڕوون کردبۆوە سەبارەت بە نەبوونی ئارەزوومەندی حکومەتی بەغدا لە جێبەجێکردنی ئەو بەڵێنانەی بە کورد دراوە، پێشنیاریان کردبوو:

یەکەم: پێکهێنانی "بەشی کارگێڕی کوردی" لە کەرکووك یان لە هەولێر هەتا بەتەواوی بەرپرس بێت لەکارگێڕی هەموو باشووری کوردستان.

دووەم: لیوا کوردییەکان بەتەنیا لە ڕێگەی کۆمیساری باڵاوە پەیوەست بن بە حکومەتی ناوەندی.

داواکاری نوێنەرە کوردەکان بە گشتی بانگەشە بوو بۆ دووبارە پێکهێنانی ڕژێمی ویلایەت Wilayahی عوسمانی پێشوو[390].

سکاڵای کوردەکان لە ماوەی ساڵانی (1928–1929) دژی حکومەت زۆر زیادی کرد، بۆ هاندانی کوردو ناڕەزایی لە دژی بەعەرەبکردنی کوردستان، ئەندامانی یانەی زانستو پێشکەوتن "یانەی نهێنی لە ساڵی (1927) درووست ببوو"، چالاکیان دژی حکومەت دەست پێکرد[391].

نوێنەرانی کورد لە حوزەیران بەسەرۆکایەتی موحەممەد ئەمین زەکی کە کەسایەتیەکی لێوەشاوە بووە، ڕاپۆرتێکیان دایە پەرلەمانو وەزارەتی پەروەردە، کە گوزارشتی لە نیگەرانی کورد دەکرد لە بەرانبەر نوشستیهێنانی حکومەت لە جێبەجێکردنی ئەو ئیلتیزاماتانە، بە تایبەتی مافی فێرکردن لەناو کوردان. ڕاپۆرتەکە ڕوونی کردبۆوە کە بایەخ بە فێرکردنی کوردی نەدراوە، پێشنیاری دانانی "لیژنەیەکی هەمیشەیی" کردبوو لە وەزارەتی پەروەردە و فێرکردن بۆ ئەوەی بەرنامەیەك دابنێ بۆ پرۆگرامی کتێب بۆ قوتابخانە کوردییەکان، هەروەها ڕاپۆرتەکە پێشنیاری دانانی ناوچەیەکی تایبەتی کردبوو بۆ پەروەردەو فێرکردن بۆکورد، کە کاروباری پەروەردەو فێرکردن لە لیوا کوردییەکان ئەنجام بدات[392]. لەو ماوەیەدا هەندێ لە نەتەوەخوازانی

---

[390] - BHCF, 13/14, Events in Kurdistan, Vol,3,. Despt. No, 1/407 March 30, 1927. (Report on the Kurdish Movement) A.H.C. to S.S, Col. Air, 23/411, Desp, No, Feb 3, 1926, Kurdish Affair S.S.O, Baghdad.

[391] - خواجە: ل30-31

[392] - ژیان، ژ118، 21 حوزەیرانی 1928

کوردی نارەزا لە رژێم وەفدیان نارد بۆگوندی پیران لە ئێران بۆ لای شێخ مەحمود، هەتا ئاگاداری بکەنەوە لە سەرهەڵدانی ئەو نارەزاییانە، شێخ مەحمود بە روونی ئامادەیی خۆی دەربری بۆ گەرانەوەی، کە لە دەرفەتێکی گونجاودا سەرکردایەتیان بکات لە دژی حکومەت[393].

لە ساڵی (1929) جلبریت جلایتۆنی نمایندەی نوێی باڵای حکومەتی بەریتانی رایگەیاند، کە بەردەوامی عەرزوحاڵو مەزبەتە "راپۆرت" یان پرۆتۆکۆل، یان یاداشتنامەی فەرمی" پێگەیشتووە، کە حکومەت بەرپرسە ئیدارییە ناکوردەکان بگۆرێ بۆ کورد لە ئیداراتی خۆجێیەتی[394]. لە نیسانی (1929) شەش نوێنەری کورد لە نوێنەرایەتی سلێمانیو هەولێرو کەرکووکو قەزا کوردییەکانی سەر بەموسڵ یاداشتنامەیەکی فەرمیاندا بەکۆمیساری باڵاو حکومەتی عێراقی، کە تێدا هاتووە ئەو بەڵێنانەی بەکورد درابوون "بەشێوەیەکی بەرفراوان" عێراق خۆی لێ گێل کردووە، یاداشتنامەکە پێشنیاری کردبوو:-

1- لیوای موسڵ هەرێمێکی زۆر گەورەیەو لە چواردە قەزا پێکهاتووە، نۆ قەزایان زۆرینەی کوردن، ئەمەش بەرێوەبردنی قورسەو پێویستە ئەو قەزایانەی کوردن لیوایەکی نوێیان لێ پێك بهێنرێت بەناوی دهۆك.

2-ناوچە ئیدارییەکانی کەرکووکو سلێمانیو هەولێر لەگەڵ کارگێرییەکی نوێ بەناوی دهۆك یەك بخرێت لەژێر فەرمانی لێپرسراوێکی کارامەو چاودێر لەکورد.

3- وەزارەتی پەروەردەو فێرکرن سەرکەوتوو نەبووە لە بەدیهێنانی ماف رۆشنبیری کوردان کە کۆمەڵەی گەلان پێی دابوون، بۆیە دەبێت "بەرێوەبەرایەتی"ی پەروەردەو فێرکردنی تایبەت بەکورد درووست بکرێتو ئەرکی کاروباری فێرکردن لەو لیوایانە زۆرینەی کوردن بگرێتە ئەستۆ.

4- ئەو مەرجو رێوشوێنانەی پەیوەستن بە زەوی جێبەجێ بکرێن، هەتا دانیشتوان هاندبدرێن زەوییەکانیان تۆمار بکەن میرانەی تاپۆ بۆ ماوەی دوو ساڵ هەڵبگیرێ.

---

[393] - خواجە: ل26.

[394] - FO, 371/13759, Desp, No, S.O, 8959, April 22, 1929, Residency Baghdad.

5–داهاتی حکومەت لە هەموو ناوچەکانی عێراق بەگوێرەی پێویستی ناوچەکان دابەش بکرێت[395].

سەرۆکی وەزیرانو کۆمیساری باڵا ڕاوێژیان کردبوو لەسەر وڵامدانەوەی داواکاری نوێنەرە کوردەکان، هەردوولا ڕێککەوتن لەسەر ئەوەی درووستکردنی یەکێتی ئیداری یەکگرتوو لەناو عێراق قورسەو دەبێتە زیندووکردنەوەی ئارەزووی جوداخوازی لە ناوچەکە، بیرۆکەی بانگەوازی پێکهێنانی لیوایەکی کوردی لە دهۆك ڕەت کرایەوە. سەبارەت بە پێشنیارەکانی تریش حکومەتی عێراقی و بەریتانی ڕێککەوتن لە داهاتوو جێبەجێ بکرێن[396]. لە سەرەتای ساڵی (1926) جی.هۆل بەرپرسی پایەبەرزی کارگێڕی داگیرگەکان تێبینی کردبوو، کە پێکهێنانی هەر "جیاییەك بۆ کورد" بە مسۆگەری لە ئاییندە یەکێتی خاکی عێراق دەخاتە مەترسییەوە[397].

ڕووداوەکانی ساڵانی (1926–1929) بە ڕوونی دەریدەخەن، کە سیاسەتی حکومەتی عێراقی لە بەرانبەر کورد بە وردی گفتوگۆبووە لەگەڵ دەسەڵاتدارانی بەریتانی بۆ دارشتنی ئەو نەخشەیەی پێویستە، سەرهەڵدانی کۆمەڵە نوێیەکانی نەتەوەیی کوردی و هەروەها چەندین یاداشتنامەی پێشکەشکراو لەلایەن کورد، نیشانەی گەشەسەندنی نەتەوایەتی کوردی بووە، هەروەها زیاتر هەستکردن بووە بەنیگەرانی کورد، ئەم ناڕەزایەش لەکاتی مۆرکردنی ڕێککەوتنامەی هاوپەیمانێتی ساڵی (1930)ی نێوان عێراق و شانشینی یەکگرتوو گەیشتە ئەوپەڕی، بە تێڕوانینی زۆربەی کورد بەریتانیا وازی لە پارێزگاری لە مافەکانی نەتەوایەتی کورد هێنابوو.

---

[395] - ژیان. ژ165، نیسانی1929.

Great British Col, Office Special Report on Progress in Iraq, P.262. FO, 371/13792. Intelligence Report. For, the Forthright ended the 12th of April 1929.

[396] BHCF, 13/14, Events in Kurdistan, Vol,6. No, Do, 139, of April 1929.

[397] - BHCF, 13/14, Events in Kurdistan, Minutes March 20, 1929, Col, O

## کوردو پەیماننامەی ساڵی (1930)

لەگەڵ ئەوەدا پەیماننامەی ساڵی (1926)ی مۆرکراوی نێوان عێراق و بەریتانیا بەو مەرجە بووە، کە ئینتیدابی عێراق بۆ ماوەی بیستو پێنج ساڵ درێژبکرێتەوە، بەڵام لە (4)ی کانوونی یەکەمی ساڵی (1927) حکومەتی عێراقی و بەریتانی پەیماننامەیەکی تازەیان واژۆکرد، بەو پێیە بەریتانیا پابەند دەبوو داوا لەعێراق بکات لە ساڵی (1932) بکرێتە ئەندامی کۆمەڵەی گەلان، بەڵام ناکۆکیەکانی نێوان عێراقو بەریتانیا وای کرد پەیماننامەکە پەسند نەکرێت، ئەمەش بە هۆی:

1–ناکۆکی دارایی پەیوەست بە سەربازگیری ئیلزامی.

2–واژۆکردن لەسەر رێوشوێنی تازەی دارایی نێوان هەردوولا.

3–حکومەتی عێراقی ئەو مەرجەی پەسند نەکرد لەسەر رازیبوونی حکومەتی بەریتانی ببێتە ئەندام لەکۆمەڵەی گەلان، کە پەیوەست بووە بەبەرێوەچوونی کاروباری ناوحۆ، بەمەش لێرەدا دەوڵەت تارادەیەك سەرکەوت لەبەدیهێنانی خواستەکانی دا، لەگەڵ گەیشتنی "جەلبریت کلایتۆن"ی کۆمیساری باڵا لەئازاری ساڵی (1929)، کە هاوسۆزی زیاتری هەبوو لەوەی پێشوو، "هنری دۆبس" لە ڕزگاربوونی عێراق لە ئینتیداب، پارتی کرێکاران لە بەریتانیا هاتە دەسەڵات و چاوی لەوە بووە رزگاری بێت لە تێچوونی سەربازی لە عێراق، ئەمەش بووە هۆی ڕاگەیاندنی تشرینی دووەمی ساڵی (1929) حکومەتی بەریتانی رازی بووە لەسەر ئەندامیەتی عێراق لە کۆمەڵەی گەلان لەساڵی (1932) بە مەرجداریەتی بەریتانی[398].

لە ئازار نوری سەعید پاشا پەرلەمانێکی تازەی لە بەغدا پێکهێناو چاوی بڕیبووە مۆرکردنی ڕێککەوتننامەی تازە بۆ ڕێکخستنی پەیوەندییەکانی نێوان بەریتانیاو عێراقی دوای ئینتداب، پەرلەمانی تازە جەعفەر پاشا عەسکەری بە سەرۆکی کاتی وەزیرانو وەزیری بەرگریو جەمیل مەدفەعی بە وەزیری ناوخۆ دانا، مەلیك فەیسەڵ پەرلەمانی هەڵوەشاندەوەو نوێنەری تازەی پشتگیری بۆ مۆرکردنی ڕێککەوتنامەی تازە هەڵبژارد.

---

[398]--Arnold J.Toynbee, Survey International Affairs for the 1930 (London Oxford University Press 1931) pp.3170320. -Great British Col, Office Report the Council of League of Nation on the Administration of Iraq for the Years 1926.(London H.M. Stationary Office 1930) p.2.

له (1)ی تەمووز لەناو بەرهەڵستكارییەكی میللی بەرفراوان له هەموو عێراق ڕێككەوتنامەی نێوان هەردوو وڵات واژۆكرا.[399]

واژۆكردنی پەیماننامەی تەممووزی (1930) دووبارە كێشەی كوردی هێنایەوە گۆڕێ، لەكاتی گفتوگۆی پەیماننامەكە له شوبات بۆ تەمموز بارودۆخی كوردستان گرژبوو، دووڵی لەناو كوردان بە هەمیشەیی ئەو پرسیارەی دەهێنایە گۆڕێ، بە كۆتایی هاتنی دەسەڵاتی بەریتانی لە كوردستان چی ڕوودەدات؟[400].

ئەم نیگەرانییە كۆمەڵێ ڕاپەڕینی بچوكی لەناو نەتەوەخوازانی كورد لە شارە گەورەكان درووست كرد، هەروەها چەندین كۆمەڵەی نهێنی كۆنو تازە سەریان هەڵدا، وەكو: "یانەی سەركەوتن"و "یەكێتی گەلی كوردستان"و "یانەی بەرزی كوردی"، ئەمانە كەوتنە چالاكی لە دژی حكومەتی عێراق و بەریتانیا، كوردیان هاندەدا داواكاری بنووسن بۆ كۆمەڵەی گەلان، هەروەها بڵاوكراوەیان دابەش كرد لەسەر خیانەتی بەریتانی لە بەرانبەر كورد[401].

له شوباتی ساڵی (1930) مارف چیاوك نمایندەی كوردی هەولێر لە پەرلەمان پرسیاری لە نوری سەعید كردبوو، كە ئایا پەیماننامەی تازە هیچ دەقی تیدایە سەبارەت بە پاراستنی مافی كورد[402]. لە مانگەكانی پێش واژۆكردنی پەیماننامەكە

---

399 - Sluglett, pp.181-182.

ئەو هاوپەیمانیەتەی لە نێوان هەردوو وڵات واژۆكرا زۆر مەرجی نابەجێی تێدا بوو، نەتەوەخوازانی عێراقی "نیشتیمانییەكان" بەدڵیان نەبوو، بڕیار وابوو ئەم ڕێكەوتنامەیە لە ساڵی (1932)ەوە دەست پێبكات، كە مافی دابووە شانشینی یەكگرتوو دەسەڵاتی تەواوی هەبێت بەسەر سیاسەتی دەرەوەی عێراق بۆ ماوەی بیستو پێنج ساڵی ئایندە. هەروەها ئەو ڕێكەوتنامەیە مافی بەكرێگرتنی بنكەی ئاسمانی عێراقی مسۆگەر كردبوو بەبێ بەرانبەر، ئەمەش لەگەڵ سەربەخۆیی راستەقینەدا نەدەگونجا.

400 - C.o, 730/157/5. Extract From. Intelligence Report, No, 8, May 14,1930. Great British Colonial Office Report the Council of League of Nation on for the Years 1930.(London H..M. Stationary Office 1930.(

401 - مأساة البارزان، ص65

402 - Great British Special Report, PP.262-264. C.O, 730/157/5, Teleq from notables to Sulaymania to S.S. Col July 10,1445 ،62 وTeleg. No, 257, oct. 18, 1930. Office of the Council of Ministers to. J.H. C. Baghdad. Ahmad Zaki.

خانەی کومیساری باڵا لە بەغدا پڕبوو لە پرسیار و نووسراو و داواکاری نێردراوی سەرۆك و پیاوماقوڵانی کورد، کە داوایان کردبوو حکومەتی بەریتانی لە گفتوگۆکانی لەگەڵ حکومەتی عێراقی خۆ لە مافی کورد گێل نەکات، لە (8)ی نیسان، کومیساری باڵا چاوی کەوت بە هەندێ لە خاوەن داواکارییەکان و پێی وتن. کە دەتوانن بە پشتبەستن بە پێگەی خۆیان مافەکانیان لە عێراق بەدەست بهێنن[403].

هەروەها بۆ هێورکردنەوەی ئەو بارە گرژە "مێجەر یانگی" کۆمیساری باڵای کاتی ئەو کات نوری پاشای رازی کرد، ڕاگەیاندنێکی سیاسییی ڕابگەیەنێ لەسەر سیاسەتی عێراق لە هەمبەر کورد، سەرۆکی وەزیران دووبارەی کردەوە، کە دەیەوێ هەموو ئەو بەڵێنانەی بەکوردی داوە جێبەجێ بکات، هەروەها بەڵێنیدا بە سیاسەتەکانی خۆیدا بچێتەوە، لەوەی پەیوەندی بەکێشەی گۆڕینی بەرپرسانی غەیری کورد هەیە لە بەڕێوەبەرایەتیەکانی کوردستان[404].

لە (1)ی تەمموز پەیماننامەکە بڵاوکرایەوە بەبێ هیچ باسێك لە مافی کورد، هەریەك لە بەریتانیا و عێراق ڕایانگەیاند، کە تەنیا مەبەستی پەیماننامەکە ڕێکخستنی پەیوەندی نێوان هەردوو دەوڵەتی خاوەن سەروەرییە لە دوای کۆتاییهاتنی ماوەی ئینتداب[405]، نەتەوەخوازانی کورد ئەو بۆچوونەیان قبوڵ نەکرد، چونکە دڵنیابوون بەڵگەنامەی کانوونی یەکەمی ساڵی (1925)ی کۆمەڵەی گەلان داوای دابین کردنی "زەمانە"ی کردووە لە حکومەتی بەریتانی، کە حکومەتی عێراقی ئیلتزاماتەکانی بەرانبەر بە کورد جێبەجێ بکات[406].

لە ئاکامی ئەوەدا نەتەوەخوازانی کورد کەوتنە ڕێکخستنی گرژی و خستنە ڕووی داواکاری، لە (16)ی تەمووز ئەنجومەنی خۆجێیەتی لە سلێمانی بەشداری

---

صباح غالب: دوو دەلاقەی بێ سوود ، لەندەن، 1984 1984. ل23

403 - CO, 730/157/8, 144562. Teleg. 2957, Oct,18,1930, 144350, Kurdish Madhbata August 24, 1930

404 - CO,730/157/8, Extract From. Intelligence Report, No, 8, May 14,1930.

405 - Iraq Administrative Report, 1930,p.25

406 - BHCF, 13/14, Events in Kurdistan,Vol.6.Press coverage of Kurdish Situation from Jounce 1st to December 4th 1930. A.H.Q. British force Baghdad.

هەڵبژاردنەکانی نوێنەرایەتی کوردی نەکرد، کوردەکانی لیوای هەولێریش هەمان هەنگاویان نا[407]. لە (22)ی تەموزی ئەو ساڵە نەتەوەخوازانی کورد داواکارییان دا بە کۆمەڵەی گەلانو ناڕەزاییان دەربڕی لە پەیماننامەکە لە بەرانبەر ماڤی کورد، ئەو داواکارییانە پشتگیری و پشتیوانی بەهێزی لەناو سەرکردە پێگەدارەکانو کەسایەتییە ئایینییەکانی کوردستاندا هەبووە، سەرکردەکانی کورد لەو سکاڵانامانەدا داوای حوکمی زاتیان کردووە، چونکە پێیان وابووە لە ساڵی (1925) کۆمەڵەی گەلان ئەمەی پێداون[408]. پیاوماقوڵانی سلێمانی داواکاری تایبەتیان بۆ کۆمەڵەی گەلانو سکاڵانامەی تایبەتیان لەسەر بەپەیماننامەکە دووبارە کردبووەوە، ڕایانگەیاندبوو دەسەڵاتدارانی ئیداری لە کوردستان زۆربەیان کورد نینو تەنگ بەکوردان هەڵدەچننو دەیان ترسێنن واز لە داواکاری ماڤی نەتەوایەتی خۆیان بهێنن، لە داواکارییەکانیاندا هاتووە:

" ئەگەر سەیری هەڵسوکەوتی بەرپرسانی عەرەب دەکەین بەدیاردەکەوێ، کە هەتا ئێستا ئینتیداب کاریگەری هەرماوە، دەبێت چاوەڕێی ئەوە بین لە کوردستان کارگێڕی خۆجێیەتی لە دوای ئینتداب ئیدارییەکی خراپتر دەبێت".

جگە لەمەش سەرکردەکانی سلێمانی وایان دانابوو بڕیاری کۆمەڵەی گەلان لەسەر ولایەتی موسڵ ئەو مافەی پێداون حکومەتی کوردی دابمەزرێنن[409]. وادیارە خاوەنی ئەو داواکارییانە بە ئەندازەیەك کەوتوونەتە هەڵەوە لە بابەت لێکدانەوەی بەڵگەنامەی پەیوەیست بە بڕیاری چارەسەری مەسەلەی موسڵ، لەناو کورد قەناعەتی بەربڵاو هەبووە بە ڕادەیەك کە بڕیارەکانی کۆمەڵە ماڤی دامەزراندنی حکومەتی سەربەخۆی کوردی لە باکووری عێراق تێدابووە، ئینگلیزەکان پێیان وابوو بڵاوبوونەوەی ئەو باوەڕە لەناو کورد بە مەبەست لەلایەن نەتەوەخوازانی کوردەوە بڵاوبۆتەوە، ئەوانەی گەلەکەی خۆیان بەرەو ئەو باوەڕە بردووە، کە لەگەڵ کۆتایی هاتنی ئینتداب حکومەتی بەریتانی بڕیاری وایە حکومەتی کوردی لە باکوور پێك بهێنێ، یان بەردەوامبوونی خۆی لە

---

[407] - C.O, 730/1157/5, 144350, Sulimaniya Petition to the League of Nations, July,26, 1930.

[408] - Ibid. CO, 730/1157/5. 144350 Sulaimaniya Petition to the League of Nations July 26, 1930

[409] - خواجە: ل55-56.

کوردستان بەهێز بکات[410]. دەسەڵاتدارانی بەریتانی و عێراقی جەختیان لەسەر ئەوە دەکردەوە، کە تا ڕادەیەك ئەو شرۆڤە هەڵەیە بۆتە نیگەرانی کوردان، لەسەر نووسینی داواکاریو سکاڵانامەو پێشکەشکردنی بە کۆمەڵەی گەلان. سەرەڕای ئەو باوەڕە کە بەریتانیا خەریکی پێکهێنانی حکومەتی کوردانە، بۆتە گرژی لەگەڵ دەوڵەتانی دراوسێ لە تورکیا و ئێران. ئەو دوو وڵاتەی بەهۆی مەسەلەی کوردەوە زیاتر تووشی ئاریشە بوون، بۆیە بەریتانیا پابەندبووە بەو قەناعەتە هەڵەیە و لە زووترین کاتدا بەتەواوی جێبەجێی دەکات[411].

بۆ جێبەجێ کردنی ئەو سیاسەتە دوای گفتوگۆی تێروتەسەل لە نێوان کۆمیساری باڵاو حکومەتی عێراقی، مێجەر یونگو جەعفەر پاشا ڕێککەوتن لەسەر ئەنجامدانی گەشتێك بۆ هەرێمە کوردییەکان، مێجەر یونگ توانی پەرلەمانی عیراقی رازی بکات، کە سوودمەند بێت بەوەی سیاسەتی خۆی بەرانبەر بەکورد ڕابگەیەنێ، ئەو سیاسەتەش لە دەرکردنی بریارێك خۆی دەبینێتەوە بۆ جێبەجێ کردنی بڕیارەکانی تایبەت بە بڕیاری کۆمەڵەی گەلانی ساڵی (1925)، کە پەیوەندی هەبووە بە کوردەوە، ئەمەش بەوە دەبێت زمانی کوردی بکرێتە زمانی فەرمی ئیداری لە دادگا، کە پێی دەوترێت یاسای زمانی کوردی412. لە10 تا13 ئاب لەوکاتەی مێجەر یونگ بە یاوەری جەعفەر پاشا لەگەشتی ویلایەتەکانی باکووردا بووە، دەقی ئەم بەیاننامەی بۆ سەرۆکە کوردەکانی کەرکووكو سلێمانیو هەولێر خوێندەوە:.

(وەکو بۆم بەدیاردەکەویَ، هەندێ کەسی نابەرپرس پڕوپاگەندەیان بڵاوکردۆتەوە، کە حکومەت هاندەری نەتەوەخوازیەتی کوردبووە، ئەمە بەتەنیا حکومەتی عیراقی تووشی ئاریشە ناکات بەڵکو ئێرانو تورکیای دۆستیش دەخاتە قەیرانەوە، ئەمە زۆر لە

---

[410] - C.O, 730/1557/6.1446350, J. Hall.

لێدوانی حکومەتی خاوەن شکۆی پاشایەتی یەکگرتووی بەریتانیاو باکووری ئێرلەندە لەسەر ئەو داواکاریانە بە مێژووی (26)ی تەمووز، بابازیانی ئەرمەنیی و دۆستانی مەزبەتەیان پێشکەش کردووە.
Oct,22,1030

[411] Ibid- -

[412] - CO, 730/157/8, 144562. Teleg. No, 280, August,12.1930. A.H.C. to S.S. Col 144350 Letter August 6, 1930 .

ڕاستیەوە دوورەو کەس نییە لەبەرانبەرم تا بۆ ئاییندەش سیاسەتی لەو جۆرەمان بداتە پاڵ، بڵاوکەرەوەی ئەو پڕوپاگەندەیەش هەڵەیەکی گەورەیە)[413].

جەعفەر پاشا دەیوت: سیاسەتی حکومەتەکەی لەسەر مافی کورد بەهۆی مۆرکردنی پەیماننامەی ساڵی (1930) گۆڕانی بەسەردا نەهاتووە، هەروەها وتی:

(حکومەتی عیراقی سوورە لەسەر ئەو بەڵێنانەی بە کوردی داوە، بە کردەوەش بە هێندی هەڵدەگرێ، ئەمەش بە مەبەستی ڕەزامەندی خواستی بە برایانمان.. ڕایدەگەیەنم بە کردەوە یاسای زمانی کوردی دەست پێ بکرێت، دەبێت بە دڵنیایی هەست بکەین بەریتانیاو حکومەتی عێراقی بە تەواوی ڕێککەوتوون لەسەر ئەو سیاسەتەی ئێستا من ڕامگەیاند[414].

گەشتی هاوبەش نەك کاری نەکردە سەر هێوربوونەوەی بارودۆخەکە، بەڵکو زیاتری ئاڵۆز کردو وەکو وزەپێدان وابوو بۆ بارودۆخی هەڵچوو، پێشوازیکردنی سەرۆکوەزیرانی کاتیو کۆمیساری باڵا لەلایەن کوردەوە دوور بوو لە سۆزی دۆستایەتی. پێش گەیشتنی جەعفەر پاشاو مێجەر یونگ دەسەڵاتدارانی سلێمانی هەڵوێستی هەراسانکارانەیان گرتبووەبەر، لە ناو سلێمانیو دەوروبەری سوپا خڕببوونەوەو بە چەك و چەکی ریزەوە لە سەنگەر دابوون، مێجەر یونگ داوای لە جەعفەر پاشا کرد فەرمان بدات بە کشانەوەی سوپا، ئەمە خەراپترین کاریگەری هەبوو، شێوازی میواندارەییەکەش لە سلێمانی بەبێ میهرو پێشوازی بووە[415].

بارودۆخەکە زیاتر گرژبوو، کە جەعفەر پاشا داوای لە نەتەوەخوازانی کورد کرد چالاکیەکانیان بووەستێنن، ئەگەرنا ئەو قەسابخانە ڕوو دەدات، کە لە ڕابردوو لە نێوان هێزەکانی دژە پەیماننامەو هێزەکانی کوردی رووی دابوو، ڕەمزی بەگی زمانحاڵی نەتەوەخوازانی کورد لە وەڵامی ئەمەدا وتی: ئەگەر پشتگیریو پشتیوانی بەریتانیا نەبێت سوپای عیراقی نەیدەتوانی بگاتە سلێمانی.

413 - U.S. State Department Confidential, U.S. Diplomatic post Records Middle East 1925-1941. Teleg, August 12,1930..

414 -Ibid.

415 - C.O,730/157. Teleg. No, P.O. 165, August 15, 1930, Residency to the Council of Ministers 144350, Letter From Brooke _ Pop ham to S.S. Col. Sept. 10,1930

هەروەها وتی: مادام ماف كورد بەشێوەیەكی میللی لەگۆڕێ دا نییە یاخی دەبین و لە ئایندە باج نادەین[416]. بۆیە لە ماوەی هەموو گەشتەكە ناڕەزایی دژی سیاسەتی حكومەت بە ئاشكرا هەبووە، لە سلێمانی خۆپیشاندانی خوێندكاران بوو، لە لیوا كوردییەكانی تر كۆكبوون داوا لە مێجەر یونگ بكەن بۆ پێكهێنانی دەوڵەتی سەربەخۆی كوردی، كە لە ژێر ئینتدابی كۆمەڵەی گەلاندا بێت، مێجەر یونگ وەڵامی دابوونەوە كە: (حكومەتەكەی بەتەنیا پشتگیری ئەوانە دەكات بڕوایان بە یەكێتی خاكی عێراق هەیە)[417].

جەمیل مەدفعی وەزیری ناوخۆ لە دوای گەڕانەوەی لەو گەشتەی كە یاوەری جەعفەر پاشا بوو بۆ ناوچە كوردییەكان فەرمانیدا تۆفیق وەهبی موتەسەڕیفی سلێمانی لە پۆستەكەی لابەرێ، بەو بیانووەی ئەم كارە "بێ توانایی" ئەو بووە. لە نێوان میانەڕەوانی نەتەوەخوازانی كوردو حكومەتی عیراقی ناكۆكی پەیدا بوو، چونكە تۆفیق وەهبی لە سلێمانی خاوەن جەماوەر بووەو بە پاڵەوانی میانەڕەوەكان ناسرابوو، لە بەرانبەر دۆستایەتی شێخ مەحمود بۆ توركیا[418].

حكومەتی عێراقی موتەسەڕیفی ڕابردووی بەوە تاوانبار كرد، كە دەستی هەبووە لەو خۆپیشاندانەی لەكاتی گەشتە هاوبەشەكە ڕووی داوە، هەروەها بەهێز بەشداری نەكردووە لە هەڵبژاردن و هاوكار بووە لە نووسینی داواكاری بۆ كۆمەڵەی گەلان.. لابردنی تۆفیق وەهبی لە گۆڕەپانی خواستە نەتەوەییەكان ئاماژەیەكی تر بووە بەوەی حكومەت نایەوێ سیاسەتێكی نەرم پیادە بكات، كە لەمیانەی ئەو گەشتە

---

[416] - C.O,730/157/5. 144350. Intelligence Report dated for the Period ending August 12, 1930,Dest, No, 115/1/111.

خواجە: ل77. جیاوك، ل104-105.

[417] - C,O, 730/157/7. 144350. Desp. Secret. No, D.O.S. 450. Aug,11,1930. G. Kitching A.I.Arbil: 144350, Teleg No, 373, Aug 13, 1930, A.H.C to S.S. Col.

[418] - ژیان. ژ159مارە 159ی. 4ی ئەیلولی 1930.

C.O, 730/157/6.144350. Extract from Gazette No, 891, Aug, 28. 1930.(Al Waqai Iraqi .(

ڕاپانگەیاندبوو[419]. نەتەوەخوازان توانیان پشتگیری پیاوماقوڵانی کورد لە لیوا کوردییەکان بەدەست بهێنن بۆ نووسینی داواکاری و ناردنی بۆ خانەی کۆمیساری باڵا هەتا داوای گەڕانەوەی تۆفیق وەهبی بکەن بۆ پایەکەی خۆی[420].

گەشتی هاوبەشی (10–13) ئاب بێئاکام مایەوە لە هێمنکردنەوەی گرژی، لابردنی هەستی زوڵملێکراوی لانەبردو بە پێچەوانەوە بارودۆخەکە زیاتر گرژ بوو، کاتی گەشتەکە "زۆر دواکەوت"، کە پێویست بوو وەکو نموونەیەکی تری سیاسەتی بەریتانی هەژماری بکەین، کە لەسەر بنەڕەتی تاقیکردنەوەو بەهەڵەداچوون داڕێژرابوو[421].

ئایا حکومەت بەڕاستی هەتا ئەیلولی ساڵی (1930) سەرکەوتوو نەبوو لە جێبەجێ کردنی ئیلتزاماتەکانی لەگەڵ کورد، کە چەندین داواکاری پێشکەش کراوی کوردان پشتگیری ئەوە دەکات؟ ئەو پاڵنەرو بایەخ پێ دانە چی بووە، کە هەڵوێستی حکومەتی لە لیوا کوردییەکان لە ساڵانی (1927–1930) پێك هێنابوو؟ حکومەتی بەریتانی بەو سیفەتەی هێزێکی ئیمپریالیزمیە چێ کردووە بۆ پاراستنی وەفاداری حکومەتی عیراقی بەو بەڵێنانەی دابووی بە کورد؟

بۆ گفتوگۆی یەکەم وا باش بوو بەو بەڵێنانەدا بچێتەوە، کە بەر لە ساڵی (1930) لەلایەن هەریەك لە بەریتانیا و عێراق درابوون بەکورد وەکو:

یەکەم: نەخشەی بیرس کۆکس لە مایسی (1921) بەڵێنی حوکمی زاتی دابوو بەکورد، لەگەڵ درووستکردنی لیوایەك لە دهۆك بۆ قەزا کوردییەکانی موسڵ.

دووەم: ڕاگەیاندنی (24)ی کانوونی یەکەمی ساڵی (1922)ی هاوبەشی حکومەتی بەریتانیو عێراق، کە بڕیار درابوو بەپێکهێنانی حکومەتی کوردی لە باشووری کوردستان.

---

[419]- چیاوك: 210.

[420] - C.O, 730/157.5, Extract from Intelligence Report, No, 18, August 23, 1930

ژیان.. ئابی 1930

[421] - Confid U.S. Diplomatic Post Records Teleq. No, 54. Nov.14.1930.Baghdad American Consulate: P.O.730/157/8. 144350. Hall. To Flood,Oct,13. 1930.

سێهەم: بڕیاری ئەنجومەنی وەزیران لە کاتی هەڵبژاردنی ئەنجوومەنی دامەزراندن لە (11)ی تەموزی ساڵی (1923) کە ڕوونی کردۆتەوە حکومەتی عیراقی نیازی دانانی بەرپرسانی عەرەبی نییە لەو ناوچانەی زۆرینەی کوردن.

چوارەم: وتاری ڕۆژی (21)ی کانوونی دووەمی ساڵی (1926)ی عەبدولمحسن سەعدون کە بەڵێنی دابوو حوکمی زاتی بەکورد بدات.

پێنجەم: ئەو بڕیارەی لە بابەت کێشەی موسڵەوە دەرچوو لە (15)ی کانوونی یەکەمی ساڵی (1925) لەلایەن کۆمەڵەی گەلانەوە، کە لەسەر بەڵگەنامە "گرەنتی"و "پێوەری ئیداری" بۆ کوردان لەناو عێراق دابین کردووە.

وا بەدیار دەکەوێ دەسەڵاتدارانی بەریتانی لە عێراق لە ساڵانی (1927–1930) وێنەی تەواو جیایان لەمەڕ سیاسەتی حکومەتی عیراقی لە بابەت باکوورەوە پێشکەش کردووە، بەکۆمەڵەی گەلانیان وتبوو حکومەتی بەریتانی لەندەن بەدیاری دەخا حکومەتی عێراقی پابەند نییە بە بەڵێنەکانی بەرانبەر بە کورد.

بە کردەوە تێبینی دەکرێ کە لە ساڵی (1926) حکومەتی بەریتانی ڕاپۆرتێکی داوە بە کۆمەڵەی گەلان، کە تێدا دەڵێ: حکومەتی عیراقی "تەواو پابەندە" بە بڕوانامەی کۆمەڵەی گەلانی تایبەت بە ماڧ کورد، حکومەتی بەریتانی لە ڕاپۆرتی ساڵانەی خۆی بۆ کۆمەڵەی گەلانی ساڵی (1927) لەسەر سیاسەتی عیراقی بە تایبەت سیاسەتی فێرکردن بۆ ئەو ناوچانەی زۆرینەی کوردن دەنووسێ: کە پوختەی دوا ڕاپۆرت "ماوەتەوە بەبێ هەموارکردن"[422].

ڕاپۆرتی ئیداری ساڵی (1928) لەسەر عێراق باسی لیوای سلێمانی کردووە لە"ڕووی ئیدارییەوە باشترین ناوچەیەو کەمترین کێشەی تیدایە". لەگەڵ ئەوەدا ڕاپۆرتەکە هەندێ لە ناڕەزاییەکانی حکومەتی عیراقی باس کردووە لەمەڕ سیاسەتی فێرکردن لەگەڵ کوردان، بەڵام پشتی بۆچوونی حکومەتی عیراقی دەگرێ، لەوەی کە پێی وایە داواکاری کورد نابەجێیە، چونکە حکومەتی عیراقی باری دارایی باش نییە هەتا بتوانێ پەیمانگای ڕاهێنانی جیاو قوتابخانەی باڵا بۆ کورد دابمەزرێنێ، هەروەها ڕاپۆڕتەکە ئەوەی باس کردووە، کە حکومەتی عیراقی هەموو هەوڵی خۆی خستۆتە گەڕ

---

[422] - Iraq Administrative Report for the Year 1927, p.26.

بۆ وەرگێڕان و چاپکردنی سەرچاوەی کتێبی بڕیار لەسەر دراو[423]. ڕاپۆرتی کارگێڕی ساڵی (1930) دەڵێ: حکومەت لەوە بووەتەوە بەرنامەیەك جێبەجێ بکات "لەسەر بنەمای" تێرکردنی خواستەکانی کوردبێت[424]. ڕاپۆرتی ئامادەکراوی حکومەتی بەریتانی بۆ کۆمەڵەی گەلان لەسەر پێشکەوتنی عێراق لە ساڵانی (1921-1931) بە گشتی لە لاپەڕە (327) جەختی کردۆتە سەر دۆزینەوەی چەند ناتەواوییەك لە هەڵوێستی حکومەتی عیراقی "ئەوەی تایبەتە بەجێبەجێ کردنی بڕوانامەی کۆمەڵەی گەلانی پەیوەیست بە مافی کورد"[425]. سەرەڕای هەموو ئەمانە دەسەڵاتدارانی بەریتانی لە تشرینی یەکەمی ساڵی (1930) لە تێبینییەکانیاندا لەسەر ئەو داواکارییانەی کورد، کە ئاڕاستەی کۆمەڵەی گەلان کراوە هەوڵی ئەوەیان داوە ئەو بانگەشەیەی کورد، کە زۆربەی بەرپرسانی لیوا کوردییەکان کورد نین، ئەمە "هیچ ڕاست نییە"، وەزارەتەکەی نوری پاشا زۆر هاوسۆزە لەگەڵ کورد و زۆربەی بەرپرسانی میری لە باکوور کوردن، یان ئەوانەن بە زمانی کوردی قسە دەکەن، یاداشتنامەی بەریتانی لەسەر داواکاری گەیشتە ئەوەی پشتگیری هەڵوێستی حکومەتی عیراقی بکات لە جێبەجێ کردنی بڕوانامەی کۆمەڵەی گەلان، چونکە زۆربەی لەو بڕوایەبوون دواکەوتوویی کورد و نەبوونی زمانی یەکگرتووی کوردییە بۆتە کۆسپ لەبەردەم جێبەجێی کردنی ئەو بەڵێنە، ئەوەش کە پەیوەیستە بە زیادەی ئیدارییەکانی غەیری کورد لە لیوا کوردییەکان یاداشتنامەی ناوبراو باسی کردووە، جەختی لەسەر ئەوە کردووە، کە فراوانبوونی خزمەتگوزاری لە باکوور لەگەڵ نەبوونی کادیری ئەکادیمی کوردی شایستە بۆ کارگێڕی ئەو ناوچانە بوونەتە کۆسپ[426]، بە پشتبەستن بەو زانیارییانەی بەریتانیا بەشێوەیەکی سەرەکی، لیژنەی هەمیشەیی ئینتداب لە خولی نۆزدەهەمی تشرینی دووەمی (1930) بڕیاریدا

---

[423] -- Iraq Administrative Report for the Year 1928, p.18.

[424] -Iraq Administrative Report for the Year 1930, p.132

[425] - Special Report Progress in Iraq, p.261.

[426]- C.O, 730/157/6, 144350.Hall-.

"لێدوانی حکومەتی خاوەن شکۆ لە پاشانشینی بەریتانیای گەورە و باکووری ئێرلەندە لەسەر داوکارییەکانی بەرواری (26)ی تەموزی بابازیانی ئەرمەنیی و هاوکارانی".

گوزارشت لە ڕازیبوونی ئەوان بکات لە حکومەتی عێراقی، کە بەشێوەیەکی درووست پەیڕەوی سیاسەتێکی باشی کردووە لە بەرانبەر کێشەی کورد[427].

لەگەڵ پەیوەندییە نهێنییە تایبەتیەکانی دەسەڵاتدارانی بەریتانی چەندان جار هەستیان بەبێ ئومێدی کردووە لە سەرنەکەوتنی حکومەتی عێراقی لە وەفاداری بە بەڵێنەکانی ڕابردوو، لەوەی پەیوەندی بە بەلگەنامەی کۆمەڵەی گەلانی پەیوەست بە کوردەوە هەیە، لە نیسانی ساڵی (1930) چەندین سکالانامە دراوەتە خانەی کۆمیساری باڵا "کەنان کورنوالیس"ی ڕاوێژکار لە وەزارەتی ناوخۆ، ئەو راپۆرتانەش لەسەر کارەکانی حکومەتی عیراقی بووە لە باکوور. ئەو ڕاپۆرتەی کە ئەنجامی چەندین گەشتی مەیدانیو لێکۆڵینەوەی دەسەڵاتدارانی بەریتانیا بووە.

427 - BHCF, 13/14, Events in Kurdistan. Vol. 10, (A Note on Kurdish Situation) by K. Cornwallis Adv, to Min. of Interior Feb 4.1931.

ئەم خشتەیەی خوارەوەش بۆ دیارییکردنی بەرپرسانی کوردو غەیری کوردە لەو لیوانەی زۆرینەی کوردن.

بەیاننامەی نافەرمی

| c/j | A | T | K | |
|---|---|---|---|---|
| 12 | 40 | 107 | 29 | کەرکووك |
| – | 34 | 23 | 95 | هەولێر |
| 12 | 12 | 14 | 90 | سلێمانی |
| 35 | 43 | 8 | 46 | قەزا کوردیەکانی موسڵ |

بەیاننامەی نافەرمی*

| c/j | A | T | K | |
|---|---|---|---|---|
| 2 | 18 | 11 | 16 | کەرکووك |
| 1 | 4 | 15 | 18 | هەولێر |
| 2 | 1 | 8 | 9 | سلێمانی |
| 4 | 14 | 3 | 11 | قەزا کوردیەکانی موسڵ |

هەروەکو لەو خشتەیەدا بەدیار دەکەوێ دامەزراندنی ئەو ژمارە زۆرە لە غەیری کورد "لادانێکی ئاشکرایە لە بەڵێنەکان"، لە میانی ئەو سەردانەدا دەرکەوتووە هەموو دانیشتوانی سلێمانی کوردن، لەگەڵ ئەوەدا (30٪) یان زیاتر لەو رێژەیە لە بەرپرسان کورد نین. لە بەرپرسانی لیوا کوردەکان (324) کورد و (165) عەرەب و (180) تورکمان، یان کریستیان و جولەکەن، ژمارەی بەرپرسانی غەیری کورد لە لیوا کوردییەکان لە ژمارەی بەرپرسە کوردەکان زیاترە بە (93) کەس، سەرەڕای ئەمە هەموو ئەو بەردەست و پەیوەندییانە زمانی دادگاکانی ناوچەکە بە عەرەبی بووەو هیچ

* - کریستان یان جولەکە C!J. عەرەب=A. تورک=T. کورد= K.

وەرگێڕانێك بۆ زمانی كوردی لە سیستمی یاساییدا نەبووە. پوختەی ڕاپۆرتەكە بەمە هاتووە: "ناتوانرێ هیچ منداڵێكی كورد بە شێوەیەكی گونجاو فێری زمانی كوردی بكرێ"[428]. ئەدمۆنس وەكو یاریدەدەری وەزیری ناوخۆ كاری دەكرد، لە كارەكانی حكومەت لەمەڕ ئیلتزامەتەكانی بەرانبەر كورد ڕازی نەبووە، نووسیویەتی: لە ساڵی (1928) بۆ ساڵی (1929) وەزارەتی پەروەردەو فێركردن چەندین جار هەوڵی داوە لە بەندەكانی بڕوانامەی كۆمەڵەی گەلانی تایبەت بەفێركردنی كوردی لابدات. بۆ نموونە لە ساڵی (1929) وەزیری پەروەردە هەوڵی داوە خەڵكی سلێمانیو هەولێر ڕازی بكات زمانی عەرەبی وەكو هۆكاری فێركردن بخوێنن، لە دوای سەرنەكەوتنی لەو كارە، مۆڵەتی كتێبی قوتابخانەكانی دواخستووەو ڕازی نەبوو وەرگێڕی تایبەت لە وەزارەتەكان دابمەزرێنێ، ئەدمونس دەڵێ: (بەگشتی هەموو بەشە كارگێڕییەكان هەمان سیاسەتیان پەیڕەو كردووە)[429]. لە كانوونی یەكەمی (1930) "فرەنس هەمفیری" كۆمیساری باڵا ڕاپۆرتێكی بۆ وەزیری داگیرگەكان بەرزكردۆتەوە، لەوێدا ڕوونی كردووەتەوە كە چەندین جار نووری پاشای ورياكردۆتەوە بەڵام حكومەت سیاسەتی ئاشكرای بەرانبەر كورد جێبەجێ نەكردووە، بۆ نموونە نووسیویەتی: سەد بەرپرسی ناكورد لە لیوا كوردییەكاندا هەیە، كە لادانێكی تەواوە لە بڕوانامەی كۆمەڵەی گەلان، كە دەبێت ئەمانە بچنە شوێنی تر فێری زمانی كوردی بكرێن[430].

ئەم ڕاستییانە بووە هۆی وتووێژی توند لە نێوان حكومەتی بەریتانیو دەسەڵاتدارانی عێراقی، توندیی ئەم وتووێژانەش ناكۆكی نێوان هەردوولای بەدیارخست، بەڵام دەسەڵاتداران لە وەزارەتی دەرەوەو كاروباری داگیرگەكان دوودڵ بوون فشاری توند لە بەرانبەر حكومەتی عێراق بگرنەبەر لەسەر مافی كورد، ئەمەش بەهۆی مەترسی لە وەزارەتی نووری پاشای دۆستی بەریتانیا، كە ئەگەر بڕوخێ پێگەی نیشتمانییە عەرەبەكان لە بەغدا زیاد دەكات، ئەوانەی بەگومانەوە دەڕواننە بایەخی بەریتانیا بە

[428] -C,O, 730/157/5. 144360. (Note) by Sir. Cornwallis, Desp, No, 68338/9 April 23, 1930.

[429] - BHCF, 13/14, Events in Kurdistan,Vol,6.C.J.Edmonds (A Note on the Kurdish Situation) May 11, 1929.

[430] - BHCF, 13/14, Events in Kurdistan,Vol,10.Residency Baghdad, Dec,19.1930.

مافی کورد[431]. گوزارشتەکەی "هەمفری" ئاشکرایە کە ئیدارەی بەریتانیا لە عێراق بەرژەوەندی لەوەدابوو بە بەردەوامی فشار بخاتە سەر بەرپرسانی حکومەت بۆ دڵنیاکردنەوە لەسەر مافی کورد: (هەر لێدوانێکی حکومەتی خاوەن شکۆ "بەریتانیا" بیری لێ بکاتەوەو بەگونجاوی ببینێ لە زیادکردن یان سڕینەوە لە ڕاپۆرتی ساڵانەی بۆ کۆمەڵەی گەلان، ئەوە کۆمیسارانی باڵا یەك لەدوای یەك بۆ جارێکیش بێت لەگەڵ مەلیك فەیسەڵ، یان سەرۆکوەزیران نەیان شاردۆتەوە، کە بەڵگەنامەی کۆمەڵەی گەلان وەکو جێی ڕەزامەندی بێت جێبەجێ ناکرێت)[432].

لە تشرینی یەکەمی ساڵی (1930) "هوڵ" لەوەزارەتی داگیرگەکان یاداشتنامەیەکی نووسی بۆ خانەی کۆمیساری باڵا لە بەغدا و هاوسۆزی خۆی لەگەڵ ئیدارەی بەریتانی لە عێراق دەربڕی بوو، دوودڵی خۆی ڕاگەیاندبوو لەسەر رژد نەبوونی حکومەتی عیراقی لە جێبەجێکردنی ئیلتزاماتەکانی، هەروەها "هوڵ" نووسیبووی: سەرنەکەوتنی حکومەتی عیراقی لە وەفاداری بەڵێنەکانی ناتوانرێ تا سەر پەردەپۆش بکرێ، یا بشاردرێتەوە، بایەخنەدانی تەواو بە خواستە رەواکانی کورد ناتوانرێ بەم نزیکانە کۆمەڵەی گەلانی لێ ئاگادار بکرێتەوە، سەرەڕای ئەمە "هول" دانی نابوو بەوەی، کە ئەگەر حکومەتی بەریتانی لێدوان و سەرنجەکانی خۆی بنێرێ بۆ کۆمەڵەی گەلان لەسەر داواکارییەکانی کورد بۆ ئەوە حکومەتی عیراقی بە ئاشکرا بە هۆی لاوازی ئەو کارەی سەرناگرێ[433].

---

[431] - Confil. U.S. Diplomatic Post Record. Teleg No, 605, May, 1930, U.S. Consulate Baghdad, Iraq Administrative Report,1930, p.26.

ئەندامانی پارتی گەل، لە ئەنجومەن لەئەوانە بوون بەرهەڵستی پەیمانی ئیمزاکراوی (1930) بوون لە ڕێگەی بڵاوکردنەوەی پڕوپاگەندە، بەوەی عێراق خەریکە هۆی دابڕانی کوردستان لە عێراق هەڵدەوەشێتەوە هەوڵیان دەدا حکومەتی نوری سەعید بڕوخێنن. ئیدارەی بەریتانیا لە سودانیش ڕێگەیەکی هاوشێوەی گرتەبەر لە دابڕینی سودان لە میسر. بڕوانە:

Air 23/411 Memo.(Kurdish Affairs) No, 16, Feb,6,1930.

[432] - BHCF, 13/14, Events in Kurdistan, vol,10, Dec, 19,1930.Letter from H.C.Baghdad to S.S ,Col.

[433] - C.O, 730/157/6, 14435, Desp.No, 783/5/35. Oct, 23,1930. Hall to A.C, Iraq.

وتووێژەكانی نێوان حكومەتی بەریتانیو عیراقی زۆر توند بوو، بەشێكی دەگەڕایەوە بۆ بێمتمانەیی هەردوولاو بەشێكی تری بۆ ناكۆكی سیاسیی، كە دەبوایە لە باكوور پەیڕەو بكرایە، سیاسییەكانی عێراقی بڕوای تەواویان هەبووە بە ئەندازەیەك كە ئەو كێشەیەی بەرپرسانی بەریتانی دەیوروژێنن. ئەم گومانە لەناو سیاسییەكانی بەغدا برەوی پێدەدرا، سەرەڕای ئەمە مەلیك فەیسەڵ و نووری پاشا پێیان وابووە بەریتانیا كورد هاندەدات دژی حكومەت دەیەوێ ئەندامێتی عێراق لە كۆمەڵەی گەلان بخاتە مەترسییەوە، حكومەتی عیراقی لە چەندین بۆنەدا گلەیی كردووە كە ترسی ئەوەی هەیە هەواڵگری بەریتانی دەستی هەبووبێت لە هاندانی كوردان زیاد لە پێویست، یان داوای قورس لە حكومەت بكەن[434].

ئەم گومانەی عیراقییەكان فرە رەهەند بووە، هەروەكو لە ڕابردوو باسمان كرد بەریتانییەكان بە بەردەوامی نەتەوایەتی كوردی هەڕەشەیان لە یەكێتی خاكی عێراق كردووە، هەتا حكومەت ناچار بكەن بە واژۆكردنی پەیماننامە، یان سازشی بازرگانی لە بەرژەوەندی بەریتانیا، لەو كاتەی شێخ مەحمود لە ئێران بوو، لە ساڵانی (1928–1929) دەسەڵاتدارانی بەریتانی بەنهێنی پەیوەندییان پێوەكردووە.

بەپێی ڕاپۆرتی هەواڵگری بەریتانی لە (1928) شێخ مەحمود هاتوچۆی سنوورەكانی كردووە، چەند چاوپێكەوتنی لەگەڵ سەرۆكەكانی كورد ئەنجام داوە، سەرەڕای ئەوەش لە بەهاری (1929) نوسینگەی هەواڵگری بەریتانی لە سلێمانی سەد چەكی "خەرتووشە"ی بەدیاری بۆ ناردووە، لە تشرینی دووەم كابتن "گاون" ئەفسەری ئیداری لیوای سلێمانی جارێكی تر لەگەڵ شێخ مەحمود كۆبووەتەوە، شێخ بە ئاشكرا داوای ئەندازەیەكی زۆری هاوكاری كردووە[435]. "بیتەر سلوگلیتن" لەسەر كاریگەری ئەو

[434] - Special Report in Iraq. P. 264, C,O, 730/151/ 6 Letter No, S.A 491, July 19. 1930, A, D, Min of Interior to S.S, Col: 157/5, Memo No, D. O, S. 492, Adv. Minister of Interior. July 27, 1930: BDFP. Ser. B, Vol. 6: 373, Memo E2553/ 151/44, April 29.1930.

چیاوك: ل100. حسن.ج، ص1949

[435] -Dehli BHCF,13/22. Sheik Mahmud , vol 2,Teleg No, 504, 5.1929.Clayton to Sheikh Mahmud:Sheikh Nahmud, Vol, 3,Teleq, No, 4217, Jan 4,1930.p.185.

پەیوەندییانەی ئەنگلۆ– عێراقی بە ئاشکرا نووسیویەتی: روون نییە تا چەند بەرپرسانی عەرەب لە بەغدا ئاگاداری ئەم گفتوگۆو پەیوەندییە دۆستانەیە هەن، بەڵام عەرەبەکان بەگومانن سیاسەتی نهێنی بەریتانیا لەکوردستان، ئەگەر نەڵێن هاوپەیمانییەتی بۆ چارەسەری ناکۆکی بەشێوەیەکی باش لەگەڵ شێخ، ئەم گومانە هاوکاریمان دەکات بۆ ڕوونکردنەوەی هۆکارە ئاشکراکانی سیاسەتمەدارانی بەغداو ئیدارییەکانی حکومەت لەسەر هەر سازشێك لەمەڕ کوردستان[436].

دەتوانین هەوڵی دەسەڵاتدارانی بەریتانی بۆ ماوەی پەیوەندی دۆستانە لە پشت سنوورەوە لەگەڵ شێخ مەحمود دیاری بکەین، کە بەشێکی بۆ مەبەستی متمانە بووە، هەتا هەڵوێستی دوژمنکارانە دژی عێراق نەگرێتەبەرو نائارامی لەسەرسنووری ئێران درووست نەکات، لە سالآنی (1926–1927) هەولێکی زۆریاندا بۆ بەدیهێنانی ئارامی لە ناوچەکەدا، هەروەکو پێشتر ئاماژەمان پێکرد، دەسەڵاتدارانی بەریتانی پێیان وابووە، کە مادام شێخ مەحمود لەسەر سنوور ماوەو لە پەیوەندییدایە لەگەڵ کوردان، جوڵانەوەی نەتەوایەتی کوردی بە زیندووی دەمێنێتەوە، هەڕەشەی دابەشکردنی یەکێتی خاکی عێراق لەجێی خۆیدا بووە، هۆکارێکی تری ئەوە بووە، مەلیك فەیسەڵ و نوری پاشا لە گرنگی یارمەتی بەریتانی ئاگادارنب و سازش بۆ نیشتمانییە عەرەبەکانی عێراق نەکەن.

شێخ مەحمود بەوە ئاگادار بوو، دەیویست بەکاری بهێنێ بۆ بەرژەوەندی خۆی، لە مایسی (1929) "جەلبرێت کلایتۆن" هەندێ پارەی لەگەڵ وتەیەك بۆ شێخ مەحمود ناردو داوای لێکردبوو لە دەرەوەی بازنەی سیاسیی گوێڕایەڵی حکومەت بێت، شێخ وەڵامی دابۆوە کە: "لەو بڕوایە دانیم گوێڕایەڵیم بۆ حکومەتی بەریتانی لە پێناوی سوودی من بێت.. گوێڕایەڵیم بۆ حکومەتی بەریتانی نەك بۆ عێراق تکایە بیر لەم خاڵە بکەوە– ئەگەر ئێمە بە شێوەیەکی تەواو گوێڕایەڵی عێراق بووین ئەوە لە بەرژەوەندی بەریتانیادا نییە[437].

[436] - Iraq, p.185.

[437] -New Delhi BHCF,13/22, Sheikh Mahmud Vol, 2, Sheikh Mahmud Clayton, May 27, 1929. Cited in Slaglett, p.184.

حکومەتی بەریتانیاش لە مەبەستی حکومەتی عیراقی دڵنیا نەبوو لەبەرانبەر کورد، لە ئەیلوولی (1930) وەزیری دەوڵەت بۆ کاروباری داگیرگەکان بۆ کۆمیساری باڵای کاتی لە بەغدا نووسیوە: (من بە گومانم لە حکومەتی عیراقی و کاتی ئەوە هاتووە بەڵێنەکانی بە تەواوی جێبەجێ بکات)[438]. لە چەندین سەرنجدا بەشێوەیەکی ڕوون دەسەڵاتدارانی بەریتانی لە وەزارەتی داگیرگەکان هەستی خۆیان دەربڕیوە لە ناڕاستگۆیی حکومەتی عیراقی لە هەمبەر کوردستان[439]. چەندین جار گلەییان لە مەلیك فەیسەڵ و نوری پاشاو زۆربەی وەزارەتەکان کردبوو، لەسەر دواخستنی بە ئەنقەست لە جێبەجێکردنی بەندەکانی کۆمەڵەی گەلانی تایبەت بە مافی کورد[440].

هەریەك لە عێراق و بەریتانیا تێگەیشتن و سیاسەتی جیاوازیان هەبووە بۆ کێشەی کورد، سیاسەتی حکومەتی پەیوەست بەکورد لەژێر کاریگەری یەکێتی نیشتمانی عیراق‌و هەستی نەتەوەخوازانی عەرەبدا بووە بەرانبەر بە نەتەوەخوازانی کورد، لەگەڵ کاریگەری پەیوەندی وڵاتانی دراوسێ لە تورکیا و ئێران، وەکو لە پێشەوە باسمان کرد نەتەوەخوازانی عەرەب و کورد نەیاندەتوانی ئامانجیان یەك بخەن.

نەتەوەخوازانی سلێمانی ڕازی نەبوون خۆیان بە عێراقی ناو ببرێن‌و ناڕەزاییان دەربڕی بوو لە بەرانبەر ڕۆژنامەی "بەغدا"، کە وتبووی سلێمانی لیوایەکی عێراقە، "هنری دوبیس" لە ساڵی (1926) سەرنجی ئەوەی دابوو، کە سیاسییەکانی عەرەب سەرەڕای دەمارگیرییان بۆ نەتەوەی خۆیان لە قبوڵکردنی هەمان هەست لەلای کوردان سەرکەوتوو نەبوون[441].

دوایی نیشتیمانییە عێراقییەکان لە دژی هەموو سازشێك بوون بۆ کورد، چونکە پێیان وابووە کورد هەڕەشەیە لە ناسنامەی عێراقی عەرەبی، هەڵوێستیان لە نێوان

---

[438] - C.o,730/157/5, Teleg. No, 333,Sept, 3.1930.

[439] - C.O, 730/157/6, (Note) by Hall, No, 75,Aug 27.1930. 157/6, (Note) May 5,1930 Col, O.

[440] - BHCF, 13/14, Events in Kurdistan, vol,8,Teleg No,38, Aug,18, 1930, A.H.C to S.S Col: Teleg. No, 93. Feb. 1930. H.C. to S.S. Col, 730/157/5, Teleg. No, 340. July 23. 1930

[441] -FO,371/11460, Desp Ea7714, March 2, 1926, Dobbs to Spring Rice.Col. O .

وازهێنان لە کورد و جیابوونەوەدا بووە لە عێراق، هەتا هەندێکیان تێڕوانینی هەڕەشە ئامێزیان هەبووە وەکو لە سێدارەدان بەهۆی خیانەتەوە[442].

لە ساڵی (1927–1930) جەمیل مەدفەعی و عەبدولعەزیز تەیب وەزیر بوون لە وەزارەتی ناوخۆ، لە توندترین دوژمنانی کورد بوون. یەکەمیان لەژێر کاریگەری یاسین هاشمی ناودارترین نیشتمانی عیراقی دابووە، کە هەمیشە پێی باش بووە هێزی سەربازی لە دژی کورد بەکاربهێنرێ، بەڵام مەدفەعی سوور بووە لە پەیڕەوکردنی سیاسەتی لێبوردەیی لەگەڵ باکوور[443].

ئەو دەسەڵاتدارانەی بەرپرس بوون لە پەروەردەو فێرکردن لە ناوچەی موسڵ، هەر ئەوانیش بەرپرس بوون لە بەڕێوەبردنی پەروەردەو فێرکردن لە هەولێر و قەزا کوردییەکانی موسڵ، کە هاوسۆز نەبوون لەگەڵ کورد[444]، مەلیك فەیسەڵ دوا کەس نەبوو بەوانەی ڕەزامەندی کوردییان نەویستووە، بەپێی بۆچوونی ئەو ئەوانە دەرفەتیان بۆ بڕەخسێ لە ئاییندە دەچنە پاڵ براکانیان لەودیوو سنوور لە تورکیا و ئێران، سەرەڕای ئەوە فەیسەڵ و نووری پاشا هاوبەش بوون لەسەر هەر سازشێك بۆ کورد بکرێ لە ئاییندە هانیان دەدات بۆ داواکاری زیاتر[445]. سیاسەتمەدارانی بەغدا لەگەڵ ئەوانیش کاربەدەستە باڵاکانی دەوڵەت بەگشتی سەیری کوردیان کردووە بە "برای عەرەب"، ئەوانەی لەو نێوەندەدا تۆوی دووبەرەکیان چاند بۆ لاوازکردنی عێراق، یان کورد: "بریتین لەچەند هۆزێکی بەربەری لەسەر سنوور"، ئەوپەڕی میانەڕەوە عێراقییەکان پێیان وابووە، ئەگەر ئەوان "ڕێڕەوی ئاکارێکی باش‌و جوانیان گرتە بەر"

---

[442] - BHCF, 13/14. - BHCF, 13/14, Events in Kurdistan. Memo, by, Cornwallis ,Adv. Min, of Interior No, S.A.321. May,12,1929

[443] - C.o,730/157/5, Teleg. No, S.A.492, July 7.1930.From Adv. Min, of Interior to A.H.C. Teleg S.O.1372. June 25. 1926.Dobbs to Cornwallis.

[444] - BHCF, 13/14. - BHCF, 13/14, Events in Kurdistan. Vol, 6.Memo,by, C.J. Edmonds, May 11.1929.

[445] -BHCF, 13/14, Events in Kurdistan, vol, 6.Teleg, No, S.A, 321.May, 12, Adv to Minister of Interior C.O, 730, 15715, 14450, 144350 (Note of Interview of His Excellency King on 20th May 1930

بەهۆی چەند ئیمتیازێك كە ئێستا هەیانە نزمترین پلەی هاوبەشی ئەویە لەگەڵیاندا نەرم بن[446].

حكومەت دەترسا ئەگەر ئەو بەڵێنانەی زۆربەی بەسەریدا سەپێنرابوو لە بەرانبەر كورد پەیڕەو بكرێ لە ئاییندە زیان بە یەكێتی نیشتمانی دەگەیەنێ و بەتەنیا دانانی بەرپرسانی كورد لە لیوا كوردییەكان لە داهاتوو كار دەكاتە سەر هەستی جیابوونەوەی باكوور[447]، هەروەها عێراق دوودڵ بووە لەو سیاسەتە لە كوردستان كاردانەوەی خراپی دەبێت لەسەر پەیوەندییەكانی لەگەڵ ئێران و توركیا، حكومەتی ئێرانی لە كانوونی یەكەمی ساڵی (1929) دانپێدانانی فەرمی خستە بەردەم حكومەتی عێراقی، هەردوو وڵات نوێنەری هەمیشەییان بۆ ئەو مەبەستە دانا لەگەڵ پێكهێنانی لیژنەیەكی هەمیشەیی بۆ سنوور، ئەمەش لە دوای پێكهێنانی لیژنەی هاوبەشی سنووری توركی و عێراقی بووە.

كێشەی سمكۆ لەسەر سنووری عێراقی– ئێرانی وەكو كۆسپێك وابووە بۆ پەیوەندییەكانی ئەو دوو وڵاتە، هەتا ئێران لە ساڵی (1930) دەستی بەسەر سمكۆدا گرت، كە سەرچاوەی پەشێوی ناوچە سنوورییەكان بووە[448]، حكومەتی ئێرانی هەمیشە بێمتمانە بووە لە بەرانبەر حكومەتی بەریتانی لە كوردستانی عێراق، چەندین ئاگاداركردنەوەی ناردووە بۆ حكومەتی عێراقی و نیگەرانی خۆی دەربڕی بوو لە نەرمیینواندن لەگەڵ كورد، ئەمەی بە هەڕەشە زانیووە بۆ سەر ئاسایشی نەتەوەیی ئێرانی[449].

---

446 - C.O. 730/1611/1. 144277. Extract from (Near East) March 5,1931.

447 - C.O. 730/157/5, 144350. Memo, No, 2422, Council of Ministers, to AHC, Aug, 17,1930.

448 - FO, 731/13782, Persia Confide E20118/279/34. Teleg No, 166. April 22. 1929. Edmonds to A Chamberlains Toynbee, Survey of International Affairs for the Year 1938. p.293-294

449 - FO, 731/13791. Intelligence Report No, 17 For Fotnight Ending August 16,1929. F. Gunleff - Owen, “Note on Iran-Turkey of Alliance” Journal of Royal Central Asian Studies, Vol, 17, 1930, p.387, J. Walter Collins “Modern Turkey” JCRAS, pt, 11, April 1932, p.234, Iraq, Administrative Report for Year 1928, p.29.شەمزینی: ل93-94

له سالآنی (1928–1930) پەیوەندییەکانی تورکی– عێراقی هەمان پێشکەوتنی بەخۆوە بینی، لە حوزەیرانی ساڵی (1928) تورکیا شوێنی نێردراوی نوێنەرایەتی خۆی لە بەغداد لە قونسوڵیەوە بەرز کردەوە بۆ پایەی خوار پلەی باڵیۆز. لە ئەیلول عێراق "سوبحی نەشئەت"ی وەزیری پێشووی بەتەواوی دەسەلآتەوە بەباڵیۆز دامەزراند[450]، لەو کاتەوە پەیوەندییە دوو قۆڵیەکانیان پێشکەوت، حکومەتی عێراقی سوور بوو لەسەر تێکنەدانی ئەو پەیوەندییە گرنگ و ناسکەی نێوان هەردوو وڵات، کە بە هۆی گرژیی کێشەی کوردەوە تێك نەچێ. بەرپرسێکی کاروباری عێراقی لە ئەنقەرە وتوویەتی: (بەرژەوەندی عێراقی و تورکی بە تەواوی رێك بووە لەسەر مەسەلەی کورد)[451].

سیاسەتی نەرمی عێراقی لە ساڵی (1930) لە باکوور تووڕەیی ئەوانەی وروژاند کە "ڕەق" بوون لە بەرانبەر چارەسەرکردنی کێشەی کوردو دەیانوت پێویستە لەسەر بەریتانیا نائارامی بۆ تورکیا درووست نەکات، ئەوەی شایانی باسە تورکیا هەر سازشێکی بۆ بەرژەوەندی کورد بە"کارێکی نادۆستانە" هەژمارکردووە[452]، حکومەتی عێراقی دەبوو ڕەخنەکانی تورکیا بە جددی وەربگرێ، چونکە تورکیا سەرقاڵی سەرکوتکردنی شۆڕشی کورد بووە لە ناوچەی ئاراراتی شاخاوی، لەو کاتەی نوور پاشا لە (1)ی ئەیلولی (1930) لە ئەنقەرە بوو سەرۆکوەزیرانی تورکی داوای لێکرد رازی بێت لەسەر پەڕینەوەی هێز بۆ ناو خاکی عێراقی بۆ گەماڕۆدانی شۆرشگێڕانی کورد لە ئارارات، نوری پاشا بە مەبدەئی داوای تورکی پەسندکرد، بەڵام داوایەکی ئەوها دەبوایە بە نووسراو بوایە، نوری پاشا ڕاوێژی بە بەرپرسانی بەریتانی کرد لە بەغدا، وڵامیان دایەوە، کە تورکیا کەوتۆتە پاکتاوکردنی کورد، ڕێگە پێدانی حکومەتی عێراقی بە هێزەکانی تورکی بۆ بەکارهێنانی زەوی عێراقی ئاکامی خراپی دەبێت لەسەر ناوبانگی عیراق، ئەمەش کاریگەری دەبێت لەسەر داواکاری عێراق بۆ ئەندامێتی لە کۆمەڵەی

[450] - Iraq Administrative Report for the Year 1928, p.28.

[451] - FO,371/13032, Iraq Charged Affairs April 1, 1928, Letter R. Chadirchi to Nurl.

[452] - C.O,730/157/5, Teleg No, 2271, Aug 2,1930, 157/7. Teleg No,343. July 21.1930.

گەلان، بۆیە نوری پاشا داواکاری تورکیای ڕەتکردەوە[453]. ئەوەی شایانی باسە لە ساڵی (1930) تورکیاو ئێران هەوڵەکانیان یەکخست بۆ سەرکوتکردنی شۆڕشگێڕانی ئارارات، ئێران ڕێگای بە تورکیادا هێزەکانی بنێریتە ناو خاکی ئێرانی بۆ گەمارۆدانی شۆڕشگێران، لە هەمان کاتدا هێزەکانی ئێرانی بۆ یارمەتیدانی هێزەکانی تورکی بەرەو سنوور رۆیشتن[454].

حکومەتی بەریتانی لە ساڵانی (1927–1930) تێڕوانینی تەواو جیاوازیان داڕشتبوو لە ڕێڕەوی ڕووداوەکانی لیوا کوردییەکان، عێراق باوەڕی وابوو زۆربەی کورد بێجگە لە هەندێ کەسی خوێنگەرم ئەوانی تر باوەڕیان بە سیاسەتی حکومەت هەیە، ئەوەتە وەزیری بەرپرس لەکاروباری کوردان پێی وایە هەرچی ئاژاوەیەکی لە لیوا کوردییەکان ڕوودەدات بەهاندانی بەرپرسانی بەریتانیایە کە سوورن لەسەر "لاواز"کردنی عێراق. بەرپرسانی بەریتانی لەلای خۆیانەوە هەستیان کرد ئەو ناوچە کوردییانەی بە عێراقەوە گرێدراون "ئەڵقەیەکی زۆر لاواز"ەو مەترسیەکی جدی هەیە ئەویش تێکچوونی ئەو پەیوەندییەیە ئەگەر حکومەت هاوسۆزی و نەرمی لە کوردستان نەگرێتە بەر[455].

لەسەر ئەوە سیاسییەکانی عەرەب پێیان وابوو بەتەنیا بە هۆی زەبری دڕندانە دەتوانن دەست بەسەر لیوا کوردییەکاندا بگرنو سیاسەتی هاوڕابوو ڕەت بکەنەوە، بۆ نموونە لە جەمیل مەدفەعی دەگێڕنەوە وتبووی: "یەکلاییکردنەوە لەگەڵ کورد ئەگەر بدەینە دەست ئەنجومەنی وەزیران، بەو شێوەی لێ دێت کە دەمانەوێت". لەلایەکی ترەوە بەریتانییەکان جەختیان دەکردەوە، ئەگەر تەواو هەراسان بکرێت، نەتەوەخوازانی کورد بەشێوەی بەرفراوان لە باکوور ئاژاوە دروست دەکەن. سەرەڕای ئەمە بە ڕای حکومەتی بەریتانی نەتەوەخوازانی کورد بەسەر دوو سەربازگەدا دابەش

---

453 -C.O. 730/157/5. 144396, (Memo on a conference held at Angora Between Nuri Pasha and as-said Turkish Prime Minster) Very Secret. Dest No, 3013, Sept 20,1931. Sept 20, 1930: F,O, 371/1932. Desp. No, 350, G. Clerk Angora to Henderson (F.O) SEPT. 4.1930

454 Collins, pt, 2 19324-3ل :شەمزینی.

455 - C.O, 730/157/6, Desp, No, S.A. 492. July 27. 1930. Cornwallis to Holt

بوون: توندڕەوەکانی دۆستی شێخ مەحمود، ئەوانەی ئەوکاتە کوردستانی سەربەخۆیان دەویست، لەگەڵ کۆمەڵی میانەڕەوەکان، ئەوانەی پێیان وابووە لە چوارچێوەی عێراقی یەکگرتوو دەتوانن ماف کورد بەدەست بهێنن، حکومەتی بەریتانی هەوڵی بۆ دەدا ئەم رەوتەی دوایی بەلای خۆیدا ڕابکێشێ[456].

لەبەر ئەم هۆیانەی سەرەوە بوو حکومەتی عێراقی بەرهەڵستی هەموو جۆرە "قەوارەی تایبەتی" یان "حوکمی زاتی" بوون، سووربووون لەسەر پەیڕەوکردنی دەسەڵاتی ڕاستەوخۆ لە لیوا کوردییەکان، لەکاتێکدا حکومەتی بەریتانی بەرهەڵستی سیاسەتی لکاندنی خێرا بووە، سیاسەتی لکاندنی کوردستان هەمان شێوازی حەزی بەریتانیا بووە لە بەرانبەر لکاندنی ئیسکتۆلەندا بە شانشینی یەکگرتووەوە.

لە جیاتی لکاندنی کوردستان بە زەبری هێز بە ناوخۆی عێراقەوە بەریتانیا پەیڕەوکردنی سیاسەتی لکاندنی قۆناغبەندی و ڕاکێشانی دۆستایەتی نەتەوەخوازانی کوردی پێ چاکتربووە، ئەمەش بە سوود وەرگرتن لە ئەزموونی ئیسکتولەندا کە لە ئاییندە دەبووە هێشتنەوەی ناسنامەی کوردی لە باکوور، لە کۆتاییدا کاری دەکردە سەر بەهێزکردنی یەکێتی عیراق، حکومەتی عێراقی باوەڕی وابووە ئەو دوو بارودۆخە بەراورد ناکرێت[457].

ئەمەیە ناکۆکی بنەڕەتی سیاسەتی هەردوو حکومەت، تێکگیرانی پەیوەندییەکانیان بووە لە بەرانبەر کورد، حکومەتی بەریتانی بە بەردەوامی سیاسەتی فشاری گرتبووە بەر لەسەر عێراق هەتا ناچاری بکات سیاسەتی میانەڕەوانە بگرێتە بەر، بەڵام عێراق گەڕابۆوە بۆسیاسەتی خۆخافلاندن لە جێبەجێکردنی بەڵێنەکانی، لە بەهاری ساڵی (1928) کۆمیساری باڵای کاتی گلەیی لە حکومەتی عێراقی کردووە، هیچ نیشانەیەکی پێوە دیار نییە ئەو سیاسەتە جێبەجێ بکات، کە کۆمەڵەی گەلان داوای لێ کردووە، بۆ نموونە هەتا ئێستاش نوسینگەی وەرگێڕانی پێك نەهێناوەو هیچ هەنگاوێکی جددی نەبڕیوە، بۆ ئامادەکردنی کتێبی بڕیار لەسەردراوی خوێندن بە زمانی کوردی.

---

456 - C.O, 730/197/5. 144360. (Note) by Cornwallis, Aug 18,1930. DBFP. SER. B. Vol, 16,191. Teleg. No, 206, Dec. 4.1928. Dobbs to Avery.

457 - C.O, 730/197/5. 144360. (Note on Kurds) by J.Hall March 20.1930. DBFP. SER. B. Vol, 16,191. Teleg. No, 206, Dec. 4.1928. Dobbs to Amery.

پڕوپاگەندەی حکومەت لەسەر نەبوونی زمانی ستاندار هەتا نەوەدەکانیش کۆسپی سەرەکی بوو لە بەردەم فێرکردنی کوردی، بۆیە نووسەرانی کورد بە زمانی عەرەبی، یان تورکی، یان فارسی دەیان نووسی، جەختی لەسەر ئەوە دەکرد، هەتا ئێستا بە زۆری ئارەزووی کورد بۆ نووسینی کوردی بەهۆی هەوڵەکانی ئیستعماری بەریتانی بووە لە عێراق[458]. دەسەڵاتدارانی بەریتانی نارەزا بوون لەو هەموو پرسیارانەی حکومەتی عێراقی لەسەر فێرکردنی کوردی دای ناوە، ئەدمۆنس نووسیویەتی: (کەس نییە نکۆڵی لەوە بکات جێبەجێکردنی زانستیانەی مافی رۆشنبیری بۆ کوردی کۆسپو تەگەرەی هەیە، بەڵام هەموو هەوڵێك بۆ ئەوەیە بتوانرێ بەسەر ئەو کۆسپانە زاڵ بن). بۆ نموونە لە چەندین بۆنەدا دەسەڵاتدارانی عێراقی دەیان وت: کە مامۆستای کوردی کارامە نییە، بەرپرسانی بەریتانی وەڵامی ئەم پڕوپاگەندەیان دەدایەوە بەوەی، کە هەتا ئێستا حکومەتی عێراقی راهێنانی بەکەس نەکردووە[459]. سەرەڕای ئەمەش دەسەڵاتدارانی بەریتانی لەو بڕوایەدابوون هەوڵەکانی حکومەتی عێراقی بۆ بە عەرەبکردنی کارگێڕی لە ئایندە دەبێتە هۆی بەهێزکردنی رەوتی جیابوونەوە، ئەدمۆنس لە ساڵی (1930) دەڵێ: (بەر لە دوو ساڵ ئاریشەی نەبووە بەناوی ئاریشەی کوردی، بەڵام ئێستا لەهەموو کوردستان جوڵانەوەی نەتەوایەتی و جوداخوازی دەبینرێ)، مادام بە حیکمەت مامەڵەی لەگەڵدا ناکرێ، هەروەها دەیووت: (لە ئایندە ئەمە دەبێتە راپەڕینێکی چەکداری، وەکو ئەوەی ئێستا لە ئاراراتدا هەیە)[460].

لە نیسانی (1930) یاداشتنامەیەکی تێروتەسەل لەسەر رای حکومەتی بەریتانی لەمەڕ کێشەی کورد لەلایەن "کۆرنوالیس" ئامادەکراوەو دراوەتە حکومەتی عێراقی، کورنەوالیس وەکو ئەدمۆنس ترسی هەبووە لە ئەگەرە مەترسیدارەکانی لیوا کوردییەکان، بە ڕوونی ئاماژەی بە سیاسەتی حکومەت کردبوو لە دانانی تورکمان، کە هاوسۆزنین لەگەڵ کارگێڕی ناوچە کوردییەکان، بۆ نموونە کورد پێویستیان بە

---

[458] - Iraq Administrative Report for the Year 1928, p.132, BHCF 13/14, Events in Kurdistan, vol, 6, D.S.A, 232 May 9,1928, Sluglett, p.184..

[459] - BHCF, 13/14, Events in Kurdistan. Vol.5.Teleq.No, D.O.S.A.322, May,9.1928 .

[460] - C.O, 730/157/6, 144350, (Note) by J.Hall. Oct. 13.1930.

دوورخستنەوەی عەبدولمەجیدی تورکمانە کە کراوە بە موتەسەڕیفی هەولێرو کورد ئەمە پەسند ناکات، ڕاوێژکاری وەزارەتی ناوخۆ سکاڵای هەبوو بەوەی کورد نوێنەرایەتی تەواویان لە بەغدا لە پایە باڵاکانی حکومەتدا نییە، بۆ ئەوە مەبەستە پێشنیاری کردبوو ئەم هەنگاوانە بگرێتەبەر:

یەکەم: کاروباری فێرکردن لە کوردستان لە هەریەك لە بەغدا و موسڵ کەسانێکن ناشایستەن و هاوسۆز نین لەگەڵ کورد، ئەوەی پێویستە پێکهێنانی ناوچەیەکی فێرکردنی کوردییە، کە بەڕێوەبەری کوردی بۆ دابین بکرێ و بە سەرچاوەی دارایی دیاری کراو پشتیوانی لێ بکرێت.

دووەم: بڵاوکردنەوەی یاسای زمانی کوردی، کە جەعفەر پاشا لەکاتی گەشتەکەی ئابدا خستیە ڕوو.

سێهەم: دامەزراندنی بەڕێوەبەری یاریدەدەری گشتی کوردی لە وەزارەتی ناوخۆ.

چوارەم: کردنەوەی دوو قوتابخانەی کوردی لە هەولێر و سلێمانی.

کۆرنەوالیس لە پوختە و کۆتایی ڕاپۆرتەکەیدا دەڵێ: (بەر لە ئێستا بیستم کورد کێشەی نییە، دڵنیام ئەمە دوورە راستییەوە، ئەگەر بە بەردەوامی ڕێی لێ نەگیرێ و چارەسەر نەکرێ، من دڵنیام دەبێتە کێشە)[461].

ئەم پێشنیارانە لەلایەن حکومەتەوە لەبەر چەند هۆیەك ڕەت کرایەوە:-

یەکەمیان: کردنەوەی چەند قوتابخانەیەکی کوردی لە باکوور نابێتە بیانوو بۆکردنەوەی ناوچەیەکی فێرکردنی کوردی.

دووەمیان: گەنجینەی عێراقی لە قەیرانی دارایی دایە..

سێیەمیان: ئەگەر ئەم شتانە بدرێ بەکورد، ئەوە سیاسەتی حکومەت لە تورکیا و ئێران شرۆڤەی خراپی بۆ دەکەن.

چوارەمیان: مەلیك پێی وابوو، ئەگەر ئەو پێشنیارانەی کۆرنوالیس پەسند بکرێت، ئەوە وەزارەتی حکومەتەکەی کە لە نەتەوەخوازانی عەرەب پێك هاتووە، لێی دووردەکەونەوە، بۆ ئەم زەحمەت دەبێت وەزارەتێکی نوێی دۆستی پەیمانەکە پێك بهێنێ[462].

---

[461] - C.O, 730/157/6, 144350, Desp. No, 6837/79. April. 23.1930.

[462] - C.O, 730/157/5, 14435, Teleg. No, 274. July 22, 1930, A.H.C. to S.W. Col.

کۆمیساری باڵا بە بیانووی حکومەت لە ڕەتکرنەوەی پێشنیارەکانی کورنوالیس رازی نەبوو، میجەریونگ نووسیبووی: نوری پاشا "دڵسۆز نییە"و هۆکاری دارایی دەکاتە بیانوو بۆ نەکردنەوەی ناوچەی فێرکردنی کوردی، لەکاتێکدا حکومەت ڕازی بووە لەسەر دانانی چاودێری کوردی بۆ پەروەردە و فێرکردن.. جیاوازیان لەسەد ڕوپیە زیاتر نابێت،کە ئەرکی "چاودێری کوردی" لە بەڕێوەبەرایەتیەکی یەك بەشدا زۆر کەمە، بەڵام ناوچەیەکی فێرکردنی کوردی میزانییەکی تایبەتی دەوێ و کارەکانیشی بەڕێوەبردنی کاروباری فێرکردنە لە چەند ناوچەیەکی جیا[463].

لە مانگی تەمووز و ئاب بارودۆخی کوردستان بەهۆی نیگەرانی کورد لە پەیماننامەی ساڵی (1930) بەخێرایی بەرەو گرژی دەچوو، وەکو لە پێشەوە باسمان کرد، جارێکی تر حکومەتی عێراقی شرۆڤەی جیای هەبووە لە حکومەتی بەریتانی بەرانبەر گرژییەکان، حکومەتی عێراقی باوەڕی وابوو، کە شۆڕشەکانی کوردو نووسینی داواکاری بۆ کۆمەڵەی گەلان ئاکامی بێزاری کورد بووە، حکومەتی بەریتانیش لەلای خۆیەوە جەختی لەسەر ئەوە کردەوە کە گرژییەکان چاری ناچارییە بەهۆی ڕەتکردنەوەی حکومەتی عێراقی لەگەڵ ئەو هەموو ورياکردنەوەی بەریتانیا لە جێبەجێکردنی سیاسەتی ئازادانە لە بەرانبەر کورد.

لە دوای ئابی (1930) ناکۆکی گەورە کەوتە نێوان هەردوو حکومەت لەسەر چۆنییەتی مامەڵە لەگەڵ ئەو بارە گرژە، جەمیل پاشا دەیویست سیاسەتێکی توندڕەوانە پیادە بکات لەکوردستان، کە بریتی بوو لە:

یەکەم: لابردنی خێرایی تۆفیق وەهبی لە موتەسەڕیفیەتی سلێمانی.

دووەم: هەموو ئەوانەی لەکاتی گەشتەکەی جەعفەر پاشا و مێجەر یونگ لە (10-13)ی ئاب بۆ لیوا کوردییەکان خۆپیشاندانیان ڕێکخستبوو بگیرێن و دادگایی بکرێن.

سێهەم: سەرۆکی پۆلیس لە سلێمانی کوردەو لابرێتو بگۆڕدرێت بەکەسێك کورد نەبێت.

---

[463] - C.O, 730/157/5. 14435. Teleq. No, 274. July.21. Secretary of HC. To the Council of State, Baghdad teleg, no, 240, July 23, 1930. A.H.C.to S.S.Col, teleq. No,274.July 22.1930, A.H.C. to S.D. Col: Teleg No, 240, July 22, 1930. S.S. Col to A.H.C

چوارەم: لابردنی هەموو ئەو بەڕێوەبەرە سیاسیی و قائیمقامانەی بۆچوونی سیاسییان لەگەڵ بۆچوونی حکومەت تێك ناکاتەوە.

پێنجەم: پیادەکردنی سیاسەتێکی بەهێز لەگەڵ هەموو ئەو سەرکردە کوردو ناودارە ئایینیو کاربەدەستە ئیدارییانەی کە بیرۆکەی جوداخوازییان هەیە[464].

هەردووك کۆمیساری باڵای کاتی "کورنوالیس"و "میجریونگ" دوای مردنی لەناکاوی "کلایتن" بەرهەڵستی سیاسەتی "جەمیل مەدفەع"یان دەکردو لێی ناڕازیبوون، چونکە ئەو هەنگاوانەی ئەو لەناو کورد ئاکامی پێچەوانەی دەبوو، لەجیاتی هێورکردنەوەی بارودۆخەکە ئەم سیاسەتە دەبووە هۆی تەقینەوە، کورنەوالیس سەرنجەکانی خۆی بە دیارخستو وتی: پێویستە لەسەر حکومەت بڕیار بدات، ئایا بە زەبری هێز دەیەوێ حوکمی کورد بکات لە دژی خواستەکانی، یان بە نیازپاکی بەسەریاندا سەربکەوێ؟ ئەگەر شێوازی یەکەمی هەڵبژاردووە، ئایا هێزی تەواوی لەبەردەستدایە بۆ ئەم کارە؟ دەسەڵاتدارانی بەریتانی لەو باوەڕەدا بوون، حکومەتی عێراقی لاسایی ئیتیحادییەکان دەکاتەوە، کە لە مەسەلەی کورد سەرنەکەوتووبوون، هێزی چەکداریان ناردووە بۆ ئەو گوندانەی ڕووبەڕووی ڕژێم دەبوونەوەو دەستو برد ڕێوشوێنی خێرایان لەگەڵ شۆڕشگێڕان پەیڕەو کردووە[465].

لەکۆتاییدا حکومەتی بەریتانی دوودڵ بوو لە تەقینەوەی بارودۆخی کوردستانی عێراق نەوەکو لە ئاییندەدا ببێتە شەرمەزاری بۆ حکومەتی بەریتانی لەبەردەم کۆمەڵەی گەلان، ئەوەی شایانی باسە بڕیار وابوو لە تشرینی دووەمی ساڵی (1930) لیژنەی هەمیشەیی ئینتیداب گفتوگۆ بکات لەسەر داواکاری کوردان، بەریتانییەکان دەترسان گرژییەکانی لیوا کوردییەکان و هەروەها ئەو هەنگاوانەی حکومەتی بەریتانی بە مەبەستی سزا گرتبوویەبەر، کورد لە جنێف وەکو "لایەنی مەزلۆم" کورد بەدیار بکەوێ، ڕەزامەندی و هێمنی "لیژنەی هەمیشەیی ئینتداب" زۆر پێویست بوو بۆ ئاسانکاری

[464] - BHCF, 13/14, Events in Kurdistan, vol, 10, Memo, No, 5/631, Oct, 6, 1930. Insp, Mosul to Adv, Minister or Interior.

[465] -C.O.730/157/6.144360. Note by Adv, to the Minster of Interior Aug 18.1930, BHCF, 13/14, Events in Kurdistan. Memo, No, Aug. 13. 1930 Cornwallis .

وەرگرتنی عێراق لەکۆمەڵەی گەلان، کە چاوەڕوان دەکرا لە خولی حوزەیرانی (1931) گفتوگۆی لەسەر بکرێ[466]، حکومەتی بەریتانی بڕیاریدا پشتگیری داواکاری عێراق بێت لە بەدەستهێنانی ئەندامێتی لە کۆمەڵە، لەگەڵ ئەوەی عێراق سیاسەتێکی میانەڕەوانە پەیڕەو بکات لە بەرانبەر کورد. لە (18)ی ئاب مێجەر یونگ جەعفەر پاشا و نوری پاشاو مەلیك فەیسەڵی ورياکردەوە، ئەگەر پابەندی پێشنیارەکانی "کورنوالیس" نەبن لە بابەت سیاسەتێکی دیاری کراو لە باکوور، حکومەتی عێراقی بەڵگەی باوەڕپێکراو نەدات لەسەر یاسایی زمان و لابردنی بەرپرسانی ناکورد لە لیوا کوردییەکان، لەگەڵ سنووردانان بۆ ئەو وەزیرانەی دژی کوردن، وەکو جەمیل مەدفەعی لە ئەنجومەن، ئەوە حکومەتی بەریتانی خۆی بە بەرپرسیار نازانێ لە "جنیف" لە بەرانبەر سیاسەتی عێراق لە کوردستان[467].

لە ئاکامی فشاری بەردەوامی بەریتانیا، حکومەتی عیراقی لە ناوچە کوردییەکان دەستی کرد بە ئاساییکردنەوە لە ڕێگەی:

یەکەم: پەسندکردنی ئامۆژگارییەکانی کورنوالیس، کە پێشنیاری جەمیل مەدفەعی لەمەڕ سزادانی نەتەوەخوازانی کورد جێبەجێ نەکرێت.

دووەم: دامەزراندنی ساڵح زەکی "کورد" بە بەڕێوەبەری گشتی وەکو یاریدەر لە وەزارەتی ناوخۆ، بەرپرس بێت لەکاروباری کورد، لەگەڵ دامەزراندنی دوو کەسی تر بۆ ئەوەی وەکو وەرگێڕ کاربکەن.

سێ هەم: دامەزراندنی سەعید نوری بەرزنجی وەکو چاودێری کاروباری کوردی لە وەزارەتی پەروەردەو فێرکردن[468].

---

[466]-- C.O.730/157/5.144350. Note by Adv. To the Minister of Interior. Aug,18.1930..

[467] - BHCF, 13/14, Events in Kurdistan, vol.9.Desp, No, 333.Sept. 2,1930.Minustes Surges Residency Baghdad C.O. 730/157/5. 144350, teleq No, 38, Aug, 18. Young to S.S. Col. Teleg No, 366. sept. 20, 1930, Pass field (S.S. col) to Brooke- Pop ham, Residency, Baghdad.

[468] - Special Report p.263, BHCF, 13/14, Events in Kurdistan, vol.10.Desp, Secret A.Oct.23,1930. Baghdad. A.H.C.to S.S. Col. R.S.M. Sturgis. (Notes on Promises Made to Kurds) Oct,10.1930.

له میانەی فشارخستە سەر حکومەتی عێراقی بۆ پێکهاتنەوە لەگەڵ کورد، دەسەڵاتدارانی بەریتانی هانی جوداخوازانی کوردیان نەدەدا، گەرچی هەندێ لە سیاسییەکانی عێراق وا گومانیان بردووە، لە ڕاستیدا حکومەتی بەریتانی لە پشت پەردەوە تەواو پێچەوانە جووڵایەوە، ئەوان لە پەیڕەوکردنی سیاسەتێکی میانەڕەو بەئومێدبوون بتوانن "بەرە لەژێر پێی توندڕەوەکان دەربهێنن"[469].

وا بەدیاردەکەوێ بیرۆکەی کوردستانی سەربەخۆ لە ساڵی (1930) مەسەلەیەکی دڵگیر نەبووبێت و "خەونێکی ناکردەیی" بووبێت. لەسەر حوکمی زاتیش لە تشرینی یەکەم "مێجەر یونگ" بۆ وەزارەتی کاروباری داگیرگەکانی نووسیوە: ئەگەر حوکمی زاتی بدرێ بەکورد ئەوە کوردستان دەبێتە "شوێنی چەتەگەری"، ئەوانە ژیانیان لەسەر دزی شارە عەرەبیەکانی نزیك عێراقە و لە ئاکامدا وەکو بارودۆخی خاکی باکووری ڕۆژهەڵاتی هیندی لێ دێت پێش داگیرکردنی وەزیرستان[470]. "نیگل دافیدسون"ی ڕاوێژکاری یاسایی مەلیك فەیسەڵ لە عێراق دەڵێ: بیرۆکەی حکومەتی کوردی، یان حوکمی زاتی هەتا نیمچە حوکمی زاتیش لە لای بەرپرسانی بەریتانی بوونی نییە، تا ئەو ڕادەیەی "دافیدسۆن" ڕایگەیاند: (ئەمە ڕاستیەکی ژیرانەی بەهێزە نەك سیمای مەیل بێت بە لای خواستەکانی عەرەب، بەدیارکەوتووە چارەسەرێکی وا کردەیی نییە)[471]. ئەو کارانەی جێی سەرنجە بەریتانییەکان لە میانەی ئەزموونی خراپی خۆیان لە وەزیرستان سەیری کوردستانیان کردووە، تایبەتمەندی وەزیرستان و کوردستانیان وەکو یەك بینیووە، ئەمەش ئاماژە بووە بۆ بەردەوامی لە سیاسەتی حکومەتی بەریتانی، هەتا ئیدارەی بەریتانی لە عێراق کەوتە ژێر کاریگەری ئەزموونی هیندییەوە.

له دوای ڕازیکردنی حکومەتی عێراقی لە گرتنەبەری سیاسەتێکی میانەڕەوانە لە کوردستان دەسەڵاتدارێتی بەریتانی بڕیاریدا پشتگیری تەواوی عێراق بکات لەگفتوگۆکانی تشرینی دووەمی ساڵی (1930)ی خولی نۆزدەهەمی لیژنەی هەمیشەیی

[469] -C.O,730/157/6, 144350,Desp. Very Secret. Aug 19.1930. Desp, D.O.S.A.No,492.July,7.1930

[470] - C.O,73/157/6. 144356 (Iraq and Frontier Provinces) Oct, 16.1930.A.C.to S.S.Col.

[471] - Iraq The New State JRCAS, Vol. 39, (1932) p229.

ئینتداب لە "جنیف"[472]. لە پێشەوە بەرپرسانی بەریتانی و عێراقی ڕێککەوتن لەسەر وەرگرتنی هەڵوێستی هاوبەش لە بەرانبەر داواکارییەکانی کورد، مێجەر یونگ بە توندی داوای لە لیژنەی هەمیشەیی ئینتداب کرد، بە دروستکردنی دەوڵەتی کوردی رازی نەبێت، چونکە لە بەڕێوەبردنی خۆیاندا شارەزا نین، ئەو داواکارییانە کە لە تێگەیشتنی هەڵەوە هاتووە بەوەی کۆمەڵەی گەلان ویستوویەتی دەوڵەتی کوردی پێك بهێنێ، بەریتانییەکان جەختیاتیان کردەوە، ئەگەر ئەم تێڕوانینە هەڵەیە نەبوایە لەسەر بڕیارەکانی کۆمەڵەی گەلانی (1925)ی تایبەت بە کورد ناڕەزایی خوێناوی لە باکوور بەردەوام دەبوو[473]، لەسەر داواکاری کوردان لەکۆمەڵەی گەلان بە پشتیوانی بەریتانیا بڕیارێك دەرکرا، کە ئەمە دەقەکەیەتی: ((هیچ بڕیارێك نییە کۆمەڵەی گەلان پشتی پێببەستێ بۆ شرۆڤەکردنی پێکهێنانی حکومەتی کوردی لەژێر سەرپەرشتی کۆمەڵەی گەلان)).

لیژنە درووستی ئەو بڕیارانەی تایبەتە بە کورد بە هێند وەردەگرێ و دابینی دەکات، بەپێی زانیارییەکانی هێزی ئینتداب بەدیار کەوتووە گرەنتی تەواو نییە بۆ کارگێڕی خۆجێیەتی، بۆیە لیژنەی هەمیشەیی ئینتداب ئەم بڕیارانەی دا:-

یەکەم: رازی نییە پەیوەندی کردن بە سەرکردەکانی کوردەوە بکرێ، کە ئامانجی ئەوان درووستکردنی حکومەتێکی کوردییە لە سایەی کۆمەڵەی نەتەوەکان.

دووەم: داواکاری تەواوی هێزی ئینتداب ئەوەیە ڕێوشوێنی یاسایی و ئیداری هەبێت بۆ پەیڕەوکردنی خێراو گونجاو بۆ دڵنیابوونی کورد، لەسەر ئەوەی بۆی دیاری کراوە، ئەگەر کاتی گوجاو هاتە پێش بەزوویی جێبەجێ دەکرێت.

سێیەم: پێداچوونەوە بکرێ بە رێوشوێنەکان، هەتا کورد دڵنیابن، واقیعی ئەوان چاك دەبێ، هەتا ئەگەر لەکۆتاییدا عێراق لەژێر سەرپەرشتیاریەتی بەریتانیای گەورە دەرچوو[474].

---

[472] - League of Nations, Permanent Mandate Commission Minutes of the nineteenth Session Held in Geneva, Dec,29,1930.

[473] - C.O,730/157/6, 144350, Memo, by J, Hall. Oct ,13. 1930.C.O.

[474] - League of Nations, PMC, Minutes of the Nineteenth Session, pp.84-86, BHCF, 13/14, Vol, Teleg. No, 623, Dec, 31,1930.H.C, Baghdad, S.S.C

لەبەر ئەو هۆیانە لە ماوەی سالآنی (1927) بۆ (1930) زەمینەی ڕەخساو هەبوو بۆ راپەڕین، کە ڕێگەیان خۆش کرد بۆ راپەڕینی کوردستان لە سالّی (1930)، بەهۆی هەستی بەهێزی نەتەوایەتی لەناو کورد، لەگەڵ خۆدزینەوەی حکومەتی عێراقی لە بەڵێنانەکانی ڕابردووی، کە بەشێکی سەرنەکەوتنی حکومەت لە جێبەجێکردنی بەڵێنەکانی دەگەڕێتەوە بۆ کاریگەری وەزارەتەکانی حکومەت و فشاری ئەو واقیعە، کە کاریگەری هەبووە بۆ تێکچوونی پەیوەندی لەگەڵ دەوڵەتانی تورکیاو ئێرانی دراوسێ و دۆست، پەیوەندییە بێمتمانەییەکانی نێوان دەسەلآتدارانی بەریتانی و عێراقی بووە هۆی نووشستیهێنانی هەردوو حکومەت لە سیاسەتی هێمنکردنەوەی ئەو بارەی لە تەقینەوە دابوو، گەشتە هاوبەشەکەی جەعفەر پاشا و مێجەر یونگ نەك هەر نووشستی هێنا لە هێورکردنەوەی بارودۆخەکە، بەڵکو ئاڵۆزتری کرد.

بە درێژایی ئەیلوول بار گرژ لە ناوچە کوردییەکان پێویستی بەگرێك بوو بتەقێتەوەو بڕیاری ئەنجامدانی هەڵبژاردن بووە ئەو گرەو تەقیەوە.

## ڕاپەڕینی ئەیلوولی سالّی (1930) لە سلێمانی

ئەندامانی نەتەوەخوازانی کورد دەستیان گرتبوو بەسەر ئەنجومەنی خۆجێیەتی لە سلێمانی، بڕیاریان دابوو بەشداری هەڵبژاردنی گشتی نەکەن بۆ نوێنەرایەتی عێراق، پشکنەری ئیداری بەریتانی لە سلێمانی و حکومەتی عێراقی بەبێ ئەوەی حیساب بۆ هەستی کوردان بکەن، پێکەوە بڕیاریان دا هەڵبژاردن بکرێ، لە (6)ی ئەیلوول بە پێی یاسای هەڵبژاردن سی کەس لە پیاوماقوڵانی سلێمانی بانگ کران بۆ بارەگای حکومەت بۆ دیاریکردنی لیژنەی چاودێری، لەو کاتەی لە "سەرا" هەڵبژاردن بەردەوام بوو، هەندێ لە هاوڵاتیان کە لەسەرەتاوە ژمارەیان دەگەیشتە دووسەد کەس "دواتر زیادی کرد بوو بۆ سەدان کەس" بە شەقامەکاندا دەهاتن و دروشمی دژی هەڵبژاردنیان دەوتەوە، لەوکاتەی بەرەو خانەی میری "دار الحكومة" دەچوون، پۆلیسی پاسەوانی بینا حکومییەکانیان دایە بەر بەرد.

دەسەلآتدارانی بەریتانی داوای هێزی عیراقیان کرد بگەنە ئەو شوێنە، پۆلیسێك بریندار بوو، بەو شێوەیە لەگەڵ خۆپیشاندەران تێك گیران. لە ئاکامی کوژرانی

ژمارەیەك لە خۆپیشاندەران و لە هێزەکانی حکومەت، برینداربوونی ژمارەیەکی تری لێکەوتەوە[475]. " میستەر ئەلبان" فەرمانیدا سەد کەس لەوانە بگرێ، کە دەوریان هەبووە لەو خۆپیشاندانە، لەوانە هەشتاو نۆ کەسیان پێ ئازادکردن و یازدە کەسیان هێشتنەوە، گیراوەکان لە ئەندامانی لیژنەی نەتەوایەتی بوون و ڕەوانەی کەرکووك کران، هەندێکیان دادگایی و هەندێکیان ئازاد کران[476]. نەیانتوانی بەڵگە لەسەر شێخ قادری برای شێخ مەحمود دەست بخەن، کە ئەندامێکی چالاکی لیژنەی نەتەوەیی بوو، بڕیاریاندا دادگایی نەکەن، بەڵام بە شێوەی کاتی بەرەو باشووری عیراقیان گواستەوە. لە دوای دە ڕۆژ هەڵبژاردن لە سلێمانی و لیوا کوردییەکان لەژێر ڕەحمەتی پاسەوانی هێزەکانی عێراقی و بەریتانی ئەنجام درا، سەرچاوە ڕۆژئاواییەکان دەڵێن ئەم هەڵبژاردنە هێمنانە بووە[477].

حکومەتی بەریتانی و عێراقی زیاتر لە کورد بەیاننامەی جیاوازیان لەسەر ڕووداوی ڕاپەڕینەکە دەرکردووە، بەو پێیەی "ئەلبان" کە لە ئاب لە دوای لابردنی تۆفیق وەهبی لە پایەی موتەسەڕیفی کاری کردووە، دەگێڕێتەوە: کە هەوڵی داوە شێخ قادرو ئەندامانی لیژنەی نەتەوەیی رازی بکات بەشداری هەڵبژاردن بکەن، بەڵام ئەمە بێئاکام بوو، سەرکردە کوردەکان وریا کرانەوە، لە ئاکامە خراپەکانی کۆسپ درووست کردن بۆ هەڵبژاردن، ڕازی بوون ئەوانە لەکاروباری هەڵبژاردن دوور بکەونەوە، لە دوای ئەوەی نووشستیان هێنا لە ڕازیکردنی خەڵك بۆ بەشداری لە هەڵبژاردن، سەرکردە کوردەکان بڕیاریاندا کۆسپ بخەنە بەردەم هەڵبژاردنەکانەوە، بەپێی گێرانەوەی "ئەلبان" ئەو بازرگانانەی بەشدارییان لە خۆپیشاندان نەکرد، بە توندی مامەڵەیان لەگەڵدا کردن)[478].

---

[475]-- C.O, 730/157. 144350, (Note), Oct,13,1930, Hall to Flood.

[476] - C.O,730/157/6, 144350, Memo, Secret Urgent No,C/235/D/6, Sept. 11.1930 (Report on the Riot al-Sulaimani Town on 6th September 1930) by A. Sulaimani.

[477] - C.O. 730/161/1, 144272. Trans Letter. No, C/117. Jan 4.1931. Ministers of Interior to the Secretary of the Council of Ministers Baghdad

[478] -C.O,730/157/6, 144350 (Report on the Rion Sulaimani Town on the6th September 1930). Letter Secret A.I. Brook-Pop ham to pass field Sept 10, 1930.Special Report. P.265

ئەو راپەڕینە چەند هۆکاری تری هەبوو، لەوانە: پێشەنگێك هەبووە کاربەدەستانی پێشووی کارگێڕی تورکی بیرۆکەی نەتەوایەتی کوردیان بڵاودەکردەوەو بانگەوازیان بۆ سەربەخۆیی دەکرد، هەروەها هەندێ لە بەرپرسانی سەربازی توانیبوویان خوێندکاران بەلای خۆیاندا ڕابکێشن، ئەمە لە ڕابردوو هەبووە، لە (16)ی تەمووز لەکاتی سەردانەکەی سەرۆکی وەزیران بۆ شاری سلێمانی روویدا، لە ئابدا بەهۆی گەشتەکەی مێجەر یونگ و جەعفەر پاشا خوێندکاران بڕبڕەی پشتی ڕاپەڕینەکان بوون، ئەو پێشەنگە نەتەوەخوازەی ڕاپەڕینەکانی ڕێکخست بوو، ئێستا ئەمانە بەپێی لێدوانی دەسەڵاتدارانی بەریتانی زیاتر ئامادەن هەمان بەرنامە پەیڕەو بکەن بۆ کۆسپ خستنە بەردەم هەڵبژاردنەکان[479]. سەرەڕای ئەمە ڕاپەڕینەکانی ئارارات ڕەنگدانەوەی هەبووە لەسەر ورەی کوردەکانی عێراق، هەواڵەکانی شۆڕش لە لایەن نەتەوەخوازانی کوردەوە بڵاو دەکرایەوە[480].

بە بۆچوونی بەریتانییەکان بەکارهێنانی سوپا بۆ گرتنی سەرکردەکانی کورد لە لیژنەی نەتەوایەتی بڕوبیانووی گەورە بووە، لە پێشەوە ئەگەر بەم شێوە یەکلاکەرەوەیە مامەڵە لەگەڵ ڕاپەڕین نەکرایە، لە ئاییندە ئاژاوە بۆ هەموو بەشەکانی کوردستان و بەشەکانی تری عێراق درووست دەبوو، کە هەمان هەستی دژایەتییکردنی هەڵبژاردن و پەیماننامەی (1930) هەبوو، بۆیە بەپێویست زانراوە لە ناوچە کوردییەکان، وەکو دەوریەی ئاسمانی بۆ قەڵاچۆکردنی ئەو گرژیە ڕێوشوێنی بەرگری بگرنە بەر[481].

---

[479] - C.O, 730/157. 144350 (Report on the Rion Sulaimani Town on the6th September 1930.(

[480] - BHCF, 13/14, Events in Kurdistan. Vol.16. Desp. No, 5/621.Oct.6.1930

[481] - C.O, 730/157/6, 144350, (Report on the Riot at Sulaimani Town on the $6^{th}$ September 1930 .

سەرەڕای ئەمە ترسابوون لە بڵاوبوونەوەی ئاژاوە بۆ لیوا کوردییەکانی تر، کە هەوڵەکانی بەریتانی بۆ یارمەتیدانی تورکان تێك بدات لە هێمنکردنەوەی کۆمەڵە ئیسلامیەکانی تورکیا، ئەوانەی سەرقاڵی شۆڕشی ئارارات بوون[482].

ڕاپەڕینی ئەیلول ئاماژەی ئاشکرابوو لەسەر شێوازی یەکلاکەرەوە لە مامەڵەی دەسەڵاتدارانی بەریتانی لەگەڵ سەرکردەکانی کورد، بەوەی بەریتانییەکان سوورن لەسەر چەسپاندنی رژێم لە ناوچە کوردییەکان، هەروەها گومانی هەندێ لە سیاسییەکانی عێراقی ڕەواندەوە لەسەر سەلامەتی مەبەستی بەریتانیا[483]. دوایی کۆمیساری باڵا دڵنیایی دا، کە ئەو ڕێوشوێنەی لەلایەن چاودێری ئیدارییەوە وەرگیرابوو بەرگری بووە، چونکە خۆپیشاندەران خەنجەرو دەمانچەیان پێ بووە، هیچ بەڵگەیەکیش نییە "سوپای عێراقی" هێزی زیاتری بەکارهێنا بێت بۆ گەڕاندنەوەی دەسەڵات[484].

نەتەوەخوازانی کورد لەلای خۆیانەوە جەختیان کردە سەر ڕووداوی شەشی ئەیلول، کە بەهۆی خواستی حکومەتەوە بووە لە فەرزکردنی هەڵبژاردن بەسەر سلێمانی دا، لەگەڵ ئەو ڕێوشوێنە هەراسانکارانەی بۆ گرەنتی گیرابووونە بەر. بەپێی گێڕانەوەکان ژمارەیەکی زۆر لە هێزی پۆلیس لە هەموو لایەکی شار بڵاوکرابوونەوە، ئەنجومەنی شارەوانی سلێمانی و پیاوماقوڵانی شار لەمە بێئاگابوون، لەکاتێکدا داوا لە"هەندێ کەسی بێ شەخسیەت" کرابوو بەگاڵتەجاڕی سەرپەرشتی هەڵبژاردنەکان بکەن[485].

بۆ سەلماندنی ئەو بۆچوونە نەتەوەخوازان ئاماژەیان بەوەدا، کە هیچ کەسی لەو نوێنەرانەی داواکارییان نووسیبوو بۆ کۆمەڵەی گەلان هەڵنەبژێردرانەوە[486]، بەپێچەوانەی

---

[482] - Confid U.S. Post Diplomatic Records Desp, No,123.Sept, 18.1930. (Electron Disurbances: Serious Riot in Sulaimani) C.O.730/157/5. 144350, Teleq No,347, July 21.1930. A.H.to S.S. Col.

[483] - C.O. 730/157/6. 144350, (Report on the Operation in Southern Kurdistan Against Sheikh Mahmud Speclan on Progress in Iraq p.265.

[484] - C.O,730/157/6. 144350,Letter,Secret Sept. 17.1930. Brook-Pop ham to Pass field.

[485] - خواجە: ل84.

[486] - Times (London) Sept 12.1930 (Kurdish battle With Iraq Troops) C.O, 730/157/6. Letter Secret. Sept. 10. 1930. Brook-phoham to Pass-fail.

پڕوپاگەندەی بەریتانییەکان ڕاپەڕینەکە توندڕەوانە بووە، یەکەم پۆلیسی عێراقی بە چەکی برادەرەکەی خۆی پێکراو خۆپیشاندانەکە ئاشتیانە بووە و خۆپیشاندەران چەکدار نەبوون، وەکو ئەو کوردەی دەڵێ: ژمارەی زۆری پێکراو لەناو خۆپیشاندەران شاهیدە بۆ ئەو قسەیە[487].

لە ڕاستیدا چەند پێکراوێك لە هێزەکانی عیراقی بەڵگەیە بۆ ئەوەی کوردان دەیلێن، خۆپیشاندانەکە هێمنانەیە ڕاست نییە. قبوڵکردنی هەڵوێستی بەریتانی بۆ ئێمە گرانە، چونکە ئەوان چۆن هەڵبژاردن لە سلێمانی بەو شێوە دەسەپێنن بەسەر کورد، لەکاتێکدا لە پێش ئەیلول لە چەندین بۆنەدا ناڕەزایی هەبووە لەسەر سیاسەتی حکومەت، لەگەڵ ئەوەدا دەبێت لە هۆکارە شاراوەکانی ئەو ڕاپەڕینە بکۆڵینەوە، کە هۆکاری ناڕاستەوخۆن، ئەمە لە باوەڕی دیارو پتەوی پێشینەکانی نەتەوەخوازانی کورد دەبینرا، کە بەشێکی بۆ ئەو شروڤە هەڵەیە دەگەڕێتەوە، کە لەسەر بەڵێنەکانی کۆمەڵەی گەلان لە بەرانبەر کورد بنیات نرابوو. هەروەها بۆ هەوڵەکانی نەتەوەخوازانی کورد لە بەرانبەر سەرلێشێواندنی گەلەکەیان لەسەر نەخشەی ڕیسوایی بەریتانیا بۆ دامەزراندنی دەوڵەتی کوردی.

نەمانی متمانەی ئاشکرای نێوان حکومەتو کورد بە ڕوونی لەو داواکارییانە بەدیار دەکەوێ، لەگەڵ زیادبوونی سکاڵای کوردان بەهۆی نوشستی حکومەت لە جێبەجێکردنی تەواوی بەڵێنەکان، هەروەها سەرسوڕمان و نیگەرانی کورد لە دوای مۆرکردنی پەیماننامەی ساڵی (1930)ی نێوان حکومەت و بەریتانیا، دەسەڵاتدارانی بەریتانی نەیانتوانی بارە گرژەکەی کوردستان هێمن بکەنەوە، ئەمانە چەند هۆکارێکە، کە ڕووبەڕووبوونەوەی 6ی ئەیلولی هێنایە گۆڕێ، کە "هیچ دەرفەتێکی تر نەبووە". ڕێڕەوی مامەڵەی حکومەتی بەریتانی بەڵگەیە لەسەر پابەندی ئەوان بە یەکلاکردنەوەی ئاکامی سیاسەتیان لەمەڕ موسڵ لە کوردستان، فشار لە پێناو جێبەجێکردنی سیاسەتی ڕازیکردنی میانەڕەوانی نەتەوەخوازانی کورد بەردەوام بوو، بەریتانییەکان ئەوەیان

---

بۆ نموونە ئیسماعیل ڕەواندزی و مەعروف چیاووك، بە هۆی نووسینی ئەو داواکارییانەوە جاری دووەم هەڵیان نەبژاردنەوە. لە ئیسماعیل ڕەواندزی دەگێڕنەوە وتوویەتی: (من بۆ جاری دووەم خۆم کاندید ناکەم چونکە شەعبیەتم نەماوە) See: Hamilton, p.298.

[487] - خواجە: ل82-84.

یەکلایکردبۆوە کە جوداخوازانی کورد سەرکوت بکرێن، چونکە هەڕەشەن بۆ سەر بەرژەوەندییەکانی بەریتانیا لە عێراق و تورکیا و ئێران، لەبەرئەنجامە ڕاستەوخۆکانی ڕاپەڕینی ئەیلول گەڕانەوەی شێخ مەحمود بوو بۆ سەرکردایەتی سێیەم شۆڕش و دوا شۆڕشی خۆی لە دژی حکومەت.

## شۆڕشی سێیەمی شێخ مەحمود

شێخ مەحمود لە (27)ی ئەیلولی (1930) جارێکی تر بەسەد کەس لە هاوکارانی هاتەوە ناو خاکی عێراق، لە ئەیلولی ساڵی (1930) بۆ مایسی (1931) ئینگلیز خزایەوە ناو شەڕی پارتیزانی، شۆڕش بە دوو قۆناغدا تێپەڕی:

یەکەم: لە ئەیلولی ساڵی (1930) بۆ شوباتی (1931)، کە گرژییەکان بەشێوەی سەرەکی تایبەت بوون بە بەشەکانی باکووری ڕۆژهەڵاتی لیوای سلێمانی.

قۆناغی دووەم: لە ئازار دەستی پێکرد و لە مایسی ساڵی (1931) بە خۆبەدەستەوەدانی شێخ مەحمود کۆتایی هات.

لە قۆناغی یەکەم شێخ مەحمود کەوتە ڕێکخستن و تۆکمەکردنی پارتیزانەکانی لەگەڵ هێرشی پڕوپاگەندەی سیاسیی چڕ، کە دەیویست خۆی ساز بدات بۆ پشتیوانی لەکێشەی کورد، لەگەڵ بەدەستهێنانی هاوسۆزی کۆمەڵەی گەلان و هەوڵەکانی بۆ بێلایەن ڕاگرتنی دەسەڵاتدارێتی بەریتانی لە ناکۆکی لەگەڵ حکومەت، وەکو پێشتر ئاماژەمان پێدا، هەر لە ساڵی (1929) وە شێخ لە پەیوەندی بەردەوامدابوو لەگەڵ نەتەوەخوازانی کورد لە سلێمانی و هەولێداوە پشتگیری بن لە شۆڕش دژی حکومەت. لابردنی تۆفیق وەهبی موتەسەڕیفی میانەڕەو لە (18)ی ئاب لەلایەن جەمیل مەدفەعی، کە سەرکردە میانەڕەوەکانی وەکو شێخ قادر پشتگیریان لێ دەکرد، وای لە نەتەوەخوازانی سلێمانی کرد بچنە پاڵ سەرکردایەتی شێخ مەحمود[488].

شێخ مەحمود لە دوای بەدەستهێنانی پشتگیری سیاسیی لە سلێمانی گەڕایەوە ناو خاکی عێراق و یەکسەر سەردانی پشدەری کرد، لەوێ پشتگیری سیاسیی زۆربەی

[488] - C.O. 730/157/5. Sec. Teleg No.11.Jan 10,1931

سەرکردەی هۆزە بەهێزەکانی بەدەست هێنا، لە تشرینی یەکەمەوە لایەنگرانی شێخ لەسەر سنوور هێرشی پارتیزانیان دژی هێزەکانی حکومەت دەست پێکرد[489].

لە ئاکامدا حکومەتی عێراقی زۆر بە گەرمی هێرشی برد بۆ چارەسەری هەڕەشەی ئەم جارەی شێخ مەحمود، لە (22–27)ی تشرینی یەکەم سێ لیوای سوپای عێراقی لە سلێمانی دابەش کران، دوایی زیادی کرد تا گەیشتە پێنج لیوا، لەگەڵ شەشسەد کەس لە هێزی پۆلیسی جولاوە، کە چەکی سووکیان پێبوو بۆ بەرەنگاری یاخیبوون، شۆڕشگێڕان چەند شاری سەر سنووریان داگیرکرد، وەکو پێنجوین، بەڵام دواتر ناچار بوون لەژێر فشاری لێدانی چڕی هێزی ئاسمانی وازی لێ بهێنن. لە تشرینی یەکەمی ساڵی (1930) هەتا ئازاری (1931) هێزەکانی حکومەت چەندین هەوڵی بێئاکامیاندا بۆ گەمارۆدانی شێخ مەحمود[490].

لە ماوەی تشرینی یەکەم هەتا کانوونی یەکەم شۆڕش گەیشتە زۆربەی بەشەکانی وڵات، چالاکییەکان لەسەر حکومەت بووە هەڕەشە، لە ناوچە شاخاوییە ئەستەمەکان گەیشتە دەشتەکان و لە چیا و دۆڵەکان هاتووچۆی سەربازەکان بەزەحمەت بوو، شێخ مەحمودو لایەنگرانی شارەزای "هەموو بستێکی ئەو ناوچەیە بوون"، چەندین جار ڕێگایان بە شالاوی حکومەت گرت[491].

زۆربەی دانیشتوانی ئەو ناوچانە و هەتا هەندێ لە بەرپرسانی حکومەتیش هاوسۆزی شۆڕشگێڕان بوون، ئەمە بووە هۆی بەدەستهێنانی زانیاری ورد لەسەر هەموو نەخشە و جوڵانەوەیەکی هەوالگری حکومەت، بەڵام حکومەت دەستەوەستان بوو لە بەدەستهێنانی زانیاری پێویست لەسەر ئەوان[492].

لەگەڵ ئەوەدا لەسەرەتاوە دەسەڵاتدارانی بەریتانی هیچ هەنگاوێکی کاریگەریان لە دژی شۆڕشگێڕەکان نەهاویشت، "بروك ببهام"ی کۆمیساری باڵای کاتی بێهەڵوێستی

---

489 - C.O,730/163/5. 14463/5. (Report on Operation Against Shaikh Mahmud from 17th September to 30th May 1931.(

490 - C.O, 163/6. 144637 Secret S.10648. Oct,16.1931.

491 - C.O. 163/6. 144637. (Report on the Operation Against Sheikh Mahmud from 17th. -Sept, 1930, to 14th, May, 1931, by Robinson

492-.Ibid, pp,203

بەریتانی بۆ ئەم بنەڕەتانە لێکدایەوە: لە دوای مۆرکردنی پەیماننامەی (1930) سیاسەتی بەریتانی ئەوە بووە بەرپرسیاریەتی ئەمنی ناوخۆیی لە کوردستان بۆ حکومەتی عێراقی لێبگەڕێ، هێزەکانی بەریتانی بە تەنیا لە کاتی تێکچوونی بارودۆخەکە بێن‌و پشتیوانی لە هێزەکانی حکومەت بکەن.

ئەمە بەشێکی سیاسەتی بەریتانی بووە هەتا عێراق ئامادەبێت بۆ سەربەخۆیی، بۆ هێزەکانی بەریتانی ئاسان نەبوو لە سەرەتاوە بڕیاری ڕێوشوێنی گونجاو بدەن لە دژی شێخ مەحمود، بۆیە شێخ بەئانقەست چالاکیەکانی لەسەر سنووری ئێرانەوە دەست پێکرد، بەکارهێنانی فڕۆکە لەکاتی چالاکییەکانی شێخ مەحمود لە ناوچە سنووری و چیا سەختەکان سوودی نەبووە[493].

لەگەڵ هەوڵە سەرەتاییەکانی شێخ مەحمود بۆ پەیداکردنی پشتگیری کورد لە هەموو کوردستان، توانیبووی پشتگیری باش بە تایبەتی لەناو چینی ئەفەندی لە سلێمانی بەدەست بهێنێ، کە ئامادەی ڕووبەڕووبوونەوەی خوێناوی بوون لە ئەیلوول و خێرا پشتیوانیان لە شێخ کرد. حەپسەخانی خێزانی شێخ قادر لە چالاکترین ئەو ئەندامانە بووە، عەقلێ نایبرێ چۆن بەشداری لە جوڵانەوەی نەتەوایەتی کردووە لە سلێمانی و سەردانی شار و گوندەکانی کردووە لەسەر ئەو کوشتارە دواوە، کە حکومەت لە (6)ی ئەیلوول ئەنجامی دابوو، بەمەش یارمەتی شێخ مەحمودی دا بۆ شۆڕشی تازەو دابین کردنی ڕای گشتی کوردی[494]. سەرەڕای ئەمەش ڕاستەوخۆ دوای گەڕانەوەی شێخ سێ لە ئەفسەرانی کورد لە سوپای عێراقی پەیوەندییان پێوەکرد[495]. لەسەر ئەوە حکومەت پێش سەرکردەکانی کورد کەوت و کارگێڕییەکی ڕاستەوخۆی لە ڕێگەی هەندێ کاربەدەستی کوردو هەندێ غەیری کوردەوە دامەزراند، ئەمە بووە گۆشەگیرکردنی ئەو

---

[493] - C.O.730/157/6, 144350, Teleq, No, 123. September 26,1930. Residency Baghdad From Brook-Popham to pass field.

[494] - C.O, 730/157/6. 144350.Extract from Summary of Intelligence dated 15th. September,1930.

[495] - C.O,730/157/6, 144350, Extract from Summary of Intelligence dated 15th September 1930,S.S,O.

سەرکردە کوردانەی بە"بیانووی نەتەوایەتی"یەوە پابەندبوون بە شێخ مەحمودەوە[496]، ئەم بانگەوازەی دوایی شێخ بە تەنیا لە سەرکردەو کاربەدەستان کورت هەڵنەهاتبوو، بەڵکو ئەو بەیاننامانەی لیژنەی بەرگریی گەلی کورد ئیمزای کردبوو بە شێوەیەکی بەرفراوان دابەش کرا، داوای کۆبوونەوەی پشتگیری دەکرد لە ولآنەوەی شێخ مەحمود، کە ئامانجی وەکو گەلانی تر بەدیهێنانی مافی چارەنووس بووە بۆ گەلەکەی، شێخ دەیویست بەرگێکی شەرعی بەبەر جولآنەوەکەیدا بکات[497]، هەتا لە چاوپێکەوتنە فەرمیی و تایبەتی و پەیوەندییەکانی لەگەڵ سەرکردە و پیاوماقولآنی کورد دەیویست ئەوە لەبیر خۆی بەرێتەوە، کە بەریتانیا پشتیوانی لێدەکات بۆ کوردستانێکی سەربەخۆ. شێخ ئەحمەد لە بارزان لە یاریدەدەری ئیداری بەریتانی پرسی بوو: ئایا پڕوپاگەندەکانی شێخ مەحمود ڕاستە بەریتانیا بەنهێنی پشتیوانی لێدەکات؟[498]

لەبەر ئەو هۆیانە بووە لە مانگەکانی تشرینی یەکەم هەتا ئازاری ساڵی (1931) لە هەموو لیوا کوردییەکان سەرکردەو پیاوماقولآن نامەیان بۆ کۆمیساری باڵاو کۆمەڵەی گەلان نووسی و پشتگیری و پشتیوانی خۆیان بۆ شێخ مەحمود دەربڕی، هەتا پشتگیری سیاسیی گەیشتە کوردەکانی لیوای موسڵ، بۆ نموونە لە (17)ی تشرینی دووەم یاریدەدەری ئیداری لە موسڵ کۆمیساری باڵای ئاگادارکردۆتەوە، کە زۆربەی سەرۆك هۆزەکانی لیوای موسڵ پشتگیرییان لە کێشەی شێخ مەحمود کردووە[499].

دەتوانین لە میانەی ئەو داواکارییانەی کورد ناردبووی بۆ کۆمەڵەی گەلان تێبینی ئەو پشتگیرییانە بکەین. لە (10)ی تشرینی یەکەم داواکارییەك پێش کەش کراوە، کە زۆرترینی هۆزەکانی کورد لە سلێمانی و هەولێر و کەرکووك ئیمزایان لەسەر کردووەو

[496] - C.O,730/157/6, 144350, Extract from Summary of Intelligence deted 15th September 1930, Sulaimaini 92خواجە: ل .

[497]-- C.O, 730/763/5. 144637, Extract From Intelligence Report No, 14,Feb,18,1931.

[498] - C.O.730/153/5. 144350, Extract from of Intelligence Report,No, 26,Dec,25.Operation Against Shaikh Mahmud by Ludith- Hewltt.

[499] -- BHCF, 13/14, Events in Kurdistan. Vol.6. Desp. S/711.Dec.13.1930.

گلەییان هەبووە، کە حکومەت نایەوێ ئەو بەڵێنانە جێبەجێ بکات، کە بەکورد دراوە، لە نووسینەکانیاندا داوای وەستانی سیاسەتی دامەزراندنی غەیری کوردیان کردبوو لە لیوا کوردییەکان، بەڵام حکومەت لە ئەیلول وەڵامی دابوونەوە، لەسەر لابردنی موتەسەڕیف، "لەو کاتەی جەماوەر خۆپیشاندانی ئاشتیانەی دەکرد، عەرەبەکان وەڵامی داواکارییەکەمانی بەکوشتار دەدایەوە لە دژی بێتاوانان". داواکاران داوایان کردبوو هەتا وەڵامی کۆمەڵەی گەلان دێتەوە بۆ پێکهێنانی دەوڵەتی کوردی با باری لیوا کوردییەکان بەجیا بخرێتە ژێر دەسەڵاتی ڕژێمی ئینتداب[500]. لە ئازاری (1931) کورد چەندان داواکارییان نارد بۆ کۆمەڵەی گەلان، کە لە لایەن سەرۆك و کەسایەتیە ئایینییەکانەوە نووسرابوون، هەندێ لە سەرکردەکانی کوردی ئێرانیش بەشداربوون، ئەو داواکارییانە داوای دەوڵەتی کوردیان کردووە بە سەرۆکایەتی شێخ مەحمود[501].

وەکو پێشووی شێخ هەوڵی دا پشتگیری دۆستایەتی ڕووکەشانەی خۆی بۆ حکومەت دەربڕی، بە تایبەتی بۆ دەسەڵاتدارانی بەریتانی، لەگەڵ گەیشتە ناو خاکی عێراق خێرا نامەیەکی نارد بۆ کۆمیساری باڵای کاتی و ئاماژەی بەوەدابوو، کە لە ئاییندە بە دۆستێکی گوێڕایەڵ دەمێنێتەوە، لە هەمان کاتدا ڕەخنەی لەو "کوشتار"ە گرتبوو، کە لە سلێمانی ڕووی دابوو. دەڵێ: (ئەیلولی (1930) ئەو ڕایەی سەلماند، کە مەحاڵە لە سایەی حکومەتی عێراق عەرەب و کورد پێکەوە بە ئاشتی بژین، هەروەها شێخ دەسەڵاتدارانی بەریتانی ئاگادارکردەوە، کە بە ڕێگاوەیە بۆ ناوچەی پشدەر، بۆ ئەوەی بەشداری سەرەخۆشی یەك لەو هۆزانە بکات[502].

دەسەڵاتداریەتی بەریتانی داوای لە شێخ مەحمود کرد بە زووی خاکی عێراق بەجێ بهێڵێ، بەڵام ئەم خۆی بێئاگا کردو بەردەوام بوو لە پەیوەندی بە سەرۆکە کوردەکان. شێخ چەند نامەیەکی نارد بۆ خانەی کۆمیساری باڵاو ئامادەیی خۆی نیشاندا بە

---

500 - C.O,730/157/8. 14452. trans. Letter sent by Kurdish Notables Sulaimani to Secretary of the League of Nations Geneva Oct,10.1930-88ل: ئەحمەد خواجە . 91

501 - C.O. 730/161/3. 144272. March 28.1931.

502-- BHCF, 13/22, Shaikh Muhmud, vol, 3, Letter Trans. Shaikh Muhmud. To A/H.C.Sept,17.1930. Cited in Slugett, p.192: Special Report, p.266 .

فەرمانی دەسەڵاتداریەتی بەریتانی لە عێراق کاربکات، بۆ نموونە لە مانگی کانوونی دووەمی ساڵی (1931ز) داوای لە کۆمیساری باڵا کاتی کرد نوێنەر بنێرن بۆ چاوپێکەوتن، بەڵام ئەو بەچاکی زانی خۆی لە داواکانی شێخ گێل کرد، پێی چاك نەبووە لە بەرچاوی کورد رەوایەتی بدات بە شۆڕش و پڕوپاگەندەکانی شێخ مەحمود، کە دەسەڵاتدارانی بەریتانی پشتیوانی لێدەکەن[503].

لە کانوونی دووەمی ساڵی (1931) کۆنگرەیەك لە خانەی کۆمیساری باڵا لە بەغدا گیرا بۆ پێداچوونەوە بە کاروباری باشووری کوردستان، دەسەڵاتدارانی بەریتانی هەموویان پێیان وابوو مادام هەنگاوی کاریگەر نەنراوە بۆ چاودێری بڵاوبوونەوەی شۆڕش، لە هەموو لیوا کوردییەکان بڵاودەبێتەوە، ئەمەش ڕیسوایی گەورەیە بۆ عێراق لەکۆمەڵەی گەلان، هەتا شێخ ئەحمەدی بارزانی هەڵوێستی ڕەقتری وەرگرت لە بەرانبەر حکومەت لە لیوای موسڵ، ئەمەش حکومەتی بەریتانی هاندا سیاسەتی یەکلاییکەرەوە بگرێتەبەر، دڵنیاییاندا مادام شۆڕشی شێخ مەحمود سەرکوت نەکراوە ناتوانرێ هیچ هەنگاوێکی سەربازی لە دژی شێخ ئەحمەد بهاوێژرێ، بەڵام بەهۆی ئاووهەوا کۆنگرە پێشنیاری کرد، هەتا کۆتایی بەهار کاری سەربازی ئەنجام نەدرێ[504].

لە ئازار لەبەر چەند هۆیەك شۆڕشی کوردستان گەیشتە قۆناغێکی هەستیار، لەوانە:

یەکەم: شێخ مەحمود هەوڵیدا چوارچێوەی شۆڕشەکەی فراوانتر بکات بۆ لیوا کوردییەکانی ترو داوای لە سەرکردەکانی کورد کرد بدەنە پاڵ ڕاپەڕینی نەتەوایەتی.

دووەم: لە سەرەتای ئازار شێخ مەحمود چالاکی بەرەو باشوور بە ئاراستەی قەرەداغ لە بەشی باشووری لیوای سلێمانی دەست پێکرد، لەگەڵ تێپەڕبوونی ئازار لایەنگرانی شێخ گەیشتنە کفری لەسەر زێی سیروان و وای لێهات هەڕەشەیان لە خانەقین دەکرد، کە دەیویست هۆزی توانای جاف چەکدار بکات[505]، ئەو هۆزەی

---

[503] - Special Report p.266. BHCF, 13/14, Events in Kurdistan. Desp.43872. Nov.15.1930.

[504] - C.O. 730/163/5. (A Conference held in Residency in Baghdad on Kurdish Question. Jan, 13.1931.

[505] - C.O,730/163/5. 144637. Extract from Summary of Intelligence Report No, 8, March 18, 1931. - Iraq Administrative Report for the Year 1931.p.17.

(2500) چەکداری هەبووە، لەگەڵ بێزاری لە هەوڵەکانی ئەوکاتەی حکومەت لە سەپاندنی دەسەڵاتی ڕاستەخۆ، لە جیاتی ئەو سەرۆکە تەقلیدیانەی سەرۆکاری هۆزەکەیان دەکرد ساڵانە ئەندازەیەکی دیاری کراویان دەدایە حکومەت، لە ناوەڕاستی ئازار پیاوانی هۆزی جاف داواکاریان کرد لە موتەسەریف و چاودێری کارگێڕی بەریتانی لە کەرکووک، بۆ ڕەتکردنەوەی هەوڵەکانی حکومەت لە کۆکردنەوەی باجی ڕاستەوخۆ، حکومەت ئەم داواکارییەی بەدەستی شێخ دەزانی، بۆیە سوپای بەکارهێنا هەتا باجی "کۆدە" بە زەبری هێز کۆبکەنەوە، کە بەسەر خاوەن ئاژەڵەکاندا سەپێنرابوو.

ئەو ڕووداوە نیگەرانی زۆری لەناو هۆزی جاف درووست کرد، پیاوانی ئەو هۆزە ویستیان یەك لە سەرکردەکانیان بەناوی موحەممەد بەگ بمێنێتەوە لە جیاتی ئەوەی حکومەت بۆی دیاری کردوون، هۆزی جاف پشتیوانیان لە شێخ مەحمود و لایەنگرانی کرد لە ناوچەکەی خۆیان، ئەمەش دەرفەتێکی تازە بوو بۆ بڵاوبوونەوەی ڕاپەڕین لە بەشی ڕۆژهەڵاتی ڕووباری سیروانی نزیك بەغدا[506].

سێیەم: شۆڕشگێڕەکان لەو خاکەی دەستیان بەسەراگرتبووکارگێڕییەکی بنکە فراوانیان دامەزراند، لە باکوور لە سنووری ئێران درێژ دەبۆوە هەتا باشووری ڕۆژهەڵاتی شاری کەرکووك، فەرمانیان نارد بۆ هەولێر هیچ کوردێك باج نەدات و هاوکاریکردنی حکومەت خیانەتێکی گەورەیە[507].

لەبەر ئەو هۆیانە بوو لە (25)ی ئازار لە بەغدا کۆنگرەیەك گیراو نەخشەی کۆتایی پێهێنانی شۆڕشی لە لیواکانی باکوور داڕێژرا، ئەو سیاسەتە هەوڵە ڕێکوپێکەکانی حکومەتی لە گۆڕنا، کە بەریتانییەکان پشتگیری شێخ مەحمود دەکەن، بۆیە نامەی بۆ هەموو سەرۆکەکانی کورد نارد و ڕوونی کردەوە، کە شێخ مەحمودو کۆمەڵەکەی قاچاغن و لەسەر هەمووان پێویستە گوێڕایەڵی حکومەت بن، کە "پشتگیری تەواو"ی لێ دەکرێ

[506] - C.O, 730/163/6. Desp, S.!0648, Report by Office Command Iraq Operation Against Shaikh Mahmud. Ludith-Hewltt.

[507] - C.O,730/163/5. 144637. Extract from Intelligence Report, No, 6.March 3.1931: Air 23/311 Desp. No, Ref. 1/A/38. s.s.p. April .

لەلایەن حکومەتی بەریتانیاوە[508]. بۆ ڕەواندنەوەی گومان لە بیری پیاوانی هۆزەکان لە مەبەستی حکومەتی بەریتانی لە بەرانبەر شێخ مەحمود دانیشتوانی گوندەکان لە ڕێگەی فڕۆکەی هێزی ئاسمانی پاشایەتی بەریتانییەوە بە بڵاوکراوە ئاگادار کرانەوە، ئەگەر هاوکاری شۆڕشگێڕان بکەن ئەوە گوندەکەیان تۆپ باران دەکرێت[509].

حکومەتی بەریتانی لەدوای دانانی نەخشەی سەربازی بە گەرمی بڕیاریدا کە دەبێت چالاکیە سەربازییەکان لە دژی شۆڕشگێڕان یەکلاکەرەوەو خێرا بێت و پێویستە کەمترین هێزی سەربازی بەکاربهێنرێ هەتا نەبێتە هۆی فراوانبوونی شۆڕش، چونکە بڕیارە کۆمەڵەی گەلان لە مانگی حوزەیرانی ساڵی (1931) سەیری ئەو داواکارییانە بکات کە لەلایەن کوردەوە نێردراوە، لەگەڵ داوای عێراق بۆ ئەندامیەتی لە کۆمەڵەی گەلان، حکومەتی بەریتانی جەختی کردەوە، کە پێویستە سنوورێك بۆ سەرکەوتنی شۆڕشگێڕان دابنرێت، هەروەها پێویستە حکومەت لە ئەنجامدانی هەر هەڵەیەك دووربکەوێتەوە، کە ببێتە هۆی زیاتری هەڵگەڕانەوە و یاخیبوون، چونکە بە گشتی شۆڕش پێویستی بە ئەنجامدانی کاری سەربازییە لە چوارچێوەیەکی بەرفراوان، لەگەڵ بەشداری بەریتانیا دەسەڵاتدارانی بەریتانی، زۆر دوودڵ بوون لە ڕووبەڕووبوونەوەی سەربازی، چونکە کۆمەڵەی گەلان وا حاڵی دەکات عێراق ئارام نییەو هاوبەشی هێزەکانی بەریتانی ئەو ڕاستییە دەخاتە بەردەم داواکاران بەوەی هێزی بەریتانی بۆ هاوکاری حکومەتی عێراقە لە جێبەجێکردنی ئەو سیاسەتەو بەمەش شۆرەتی خۆی لەدەست دەدا[510]. لە نامەیەکدا نووسینگەی وەزارەتی دەرەوە ئەم سەرنجانەی ناردبوو بۆ وەزارەتی کاروباری داگیرگەکان: (پێویستە لە جنێف ئەو تێڕوانینیە بگۆڕین، کە سیاسەتمان لە ڕێگەی قەمەو ناپاڵمەوە بەسەر کوردا جێبەجێ کردووە)[511].

---

[508] - C.O, 730/163/5. 133637. (Extract from Intelligence Report No, 8) April 8.1931.

[509] - C.O,730/163/5. 144369.Teleq. Secret, A.Jan. 19.1931.

[510]-- C.O. 730/161/2. 144396. Teleg Secret March 26 1931. Col. To H.C, Baghdad Desp 88069/Iraq. March 20, Hall to Cardigan Baqhi Residency.

[511] - C.O.730/163/5, 144637. E1239/3/43. March 18.1931. Hall to C.O.

بۆردومانی چڕی فڕۆکەکانی هێزی مەلەکی بەریتانی بە بەردەوامی شێخ مەحمودی لە جوڵە خستو دوایی ناچاری کرد مەیدانی شەڕ بەجێ بهێڵێ. لە 5ی نیسان لە گوندی "ئاوباریك" بە دووری بیست میل لە باکووری ڕۆژهەڵاتی توزخورماتووی لیوای کەرکووك کەوتنە شەڕەوە، تابوورێکی هێزی پیادە لە چوارسەد سەرباز بە پشتیوانی کارای یەکەی فڕۆکەی ئاسمانی لەو گوندە هێرشی لە ناکاویان کردە سەر شێخ مەحمود.

لە دوای ڕۆژێکی تەواوی شەڕ لەگەڵ ئەوەشدا شێخ مەحمود و زۆربەی پیاوەکانی لە دوای شەڕەکە ڕزگاریان بوو، بەڵام 16 کوژراو چەند بریندارێکیان دا، هێزەکانی حکومەت و فڕۆکە جەنگیەکان پێڕاگەیشتن و شۆڕشگێڕەکانیان دەرکرد.. زیانە مەعنەوییەکانی ئەو شەڕە لە زیانە مادییەکانی زیاتر بوو، زۆربەی پیاوەکانی وازیان لە شێخ هێنا. بۆردومانی بەردەوامی فڕۆکەو خزینی هێزەکانی حکومەت شێخی ناچار کرد بەرەو باکوورو باکووری ڕۆژهەڵاتی لیوای سلێمانی پاشەکشە بکات، لە دوای ئەوەی خەڵکی پشدەری پێ ڕازی نەکرا بۆ کردنەوەی بەرەیەکی نوێ لە دژی حکومەت، لە 21ی نیسان بە ناچاری ئاوارەی ئەو دیو سنووری ئێران بووەو لەگوندی پیران دانیشت[512].

لە دوای واژۆکردنی هاوپەیمانییەتی لەگەڵ عێراق، حکومەتی بەریتانی بڕیاریدا بە تەواوی دۆسیەی شێخ مەحمود هەتا هەتایە دابخات.. پێی وابوو مادام شێخ مەحمود لە باشووری کوردستان یان لەناو سنووری ئێران ماوە ئاشتی لەکوردستان نایەتە دی، چونکە مەترسی لەسەر ئارامی سنوورەکانی ئێرانی– عێراقی درووست دەکات، بۆ نموونە "فلود" بەرپرسی گەورە لەکاروباری داگیرگەکان نووسیویەتی: (لە ئێستا بەدواوە هەتا لە ژیانداوماوەو لەسەر لەسنوورە کاریگەری دەبێت لەسەر بزاڤی جیاخوازی لە عێراق، بۆیە پێشنیاری دوورخستنەوەی کرد لە کوردستانو هەتا لە عێراقیش)[513]. بەگەیشتنی شێخ مەحمود بۆ ئێران دەسەڵاتدارانی عێراقی لە ڕێگەی دبلۆماسی کەوتنە وتووێژ لەگەڵ حکومەتی ئێرانیو داوایان کرد شێخ دەست بەسەر

[512] -C.O. 730/163/6. S10648. (Report by Air Office command Iraq on Operation Against Shaikh Mahmud) Ludith-Hewitt: Teleg Secret. May 5.1931 .

[513] - C.O,730/163/5.133637.Letter. Secret. May 21. 1931

بکرێ، ئەوانیش ئامادەیی خۆیان نیشاندا لەسەر هاوکاری هەوڵەکانی عێراقی بۆ کۆتاییهێنان بە جوڵانەوەی شێخ مەحمود. لەگەڵ تێپەڕبوونی مانگی نیسانی 1931 پەیوەندی ئێرانی– عێراقی بە بەردەوامی باش دەبوو[514]. شێخ لە ئێران بە ڕەگەزێکی هەڕەشە دەژمێردرا بۆ سەر ئاسایشی ناوخۆیی وڵاتو هۆکاری دروستکردنی نائارامی لە پەیوەندی تازەی بنیاتنراوی ئێران لەگەڵ عێراق. هەندێ لە سەرکردە کوردەکانی سنووری ئێرانی بە هاندانی شێخ مەحمود شۆڕشیان کرد، ڕەزاشاو حکومەتەکەی ورپاکردەوە لە مەترسی بارودۆخەکە، لەو کاتەی مەلیك فەیسەڵو کۆمیساری باڵای بەریتانی لە ئێران بوون، دەسەڵاتدارانی ئێرانی لە نیسانی 1931 سکاڵانامەیاندا بە بەرپرسانی بەریتانی و عێراقی لەسەر بەکارهێنانی خاکی ئێرانی لە لایەن کوردانی عێراقیەوە دژی هێزەکانی ئێرانی، بۆیە هەردوولا ڕێککەوتن لەسەر چالاکی سەربازی هاوبەش لە دژی سەرکردە هەڵگەڕاوەکانی هەردوو دیوی سنوور[515].

حکومەتی عێراقی لە 25ی نیسان پێشنیاری بۆ حکومەتی ئێرانی کرد خالید زەکی بەگی فەرماندەی بەشی ڕۆژهەڵات لەگەڵ هاوتا ئێرانییەکەی لە ناوچەی سنوور کۆببنەوە، لە ئاکامدا هەردوو فەرماندە لەگەڵ چاودێری گشتی بەریتانی بۆ سوپای عێراقی کۆبوونەوەو نەخشەی سەربازییان داڕشت لە دژی شۆڕشگێڕەکان. بڕیار درا لە 16 مایس چالاکییە سەربازییەکان دەست پێ بکەن، لە 13ی مایس هێزەکانی ئێرانی لە مەریوان کۆبوونەوە بۆ هێرش کردنە سەر پیران، کە هەشت میل لە ڕۆژهەڵاتی ئەو شارەوە دوور بوو، هەروەکو وەکیلی یاریدەری سەرۆکی هێزەکانی ئاسمانی عیراقی نووسویەتی: (ئەمەش دوا لێدان بووەو پشتی حوشتری پێ شکا)[516]. شێخ لە2ی مایس خۆی دایە دەست ئەو ئاگادارکردنەوە هاوبەشەو هەریەك لەهمفوریو مەلیك فەیسەڵ

---

[514] - C.O,730/163/5. 144637. teleg. No, 23.April 24.1931. Humphreys British Minister in Tehran.

[515] - سویدی: ص208-209.

Cof, U.S. Diplomatic Post Records U.S. Legation Baghdad desp.No, 2. July 11,1931.

[516] - C.O. 730/163/6. S10648.Dest.No,5/10648. Report by Air Office command Iraq on Operation Against Shaikh Mahmud-.

پێشوازییان لێ کرد، لە بەرانبەر مانەوەی بە سەلامەتی داوایان لێ کرد خۆی بداتە دەست "کابت هولت"ی سکرتێری ڕۆژهەڵاتی کۆمیساری باڵا، کە چاودێری جوڵانەوەی شێخ مەحمودی دەکرد لە پێنجوین[517].

لە پاشکۆی ئەم وتارە ڕاپۆرتێکی "کابتن هولت" بڵاودەکەینەوە لەسەر چۆنییەتی خۆبەدەستەوەدانی شێخ مەحمودو هەڵوێستی ئەو ناوچانەی پێدا تێ پەڕی لە پێنجوینو شاربازێر لەگەڵ بۆچوونی "هولت" خۆی لەو بارەیەوە.

کۆمەڵێك هۆکار هەبوون بۆ تێکشانی شۆڕشگێڕان. "سی ڕۆنسون"ی چاودێری گشتی سوپای عێراقی جەخت دەکاتە سەر ئازایەتیو هۆشاریو ئارامگری لەگەڵ ئەدەبی سوپای عێراقی لە بەرانبەر ئەو کوردانەی دوژمنکارنەبوونو هاوکاربوون بۆ دەست بەسەراگرتنی شۆڕش[518]. هەوڵی بەرچاوی جەنگاوەرە ئاسمانییەکانی بەریتانی تا ڕادەیەکی دیار کاریگەری هەبوو لەسەر یەکلایکردنەوەی شۆڕش، هەروەها نووسوویەتی: سەرکوتکردنی ڕاپەڕینی لیوا کوردییەکان زیاتر دەگەڕێتەوە بۆ هەوڵی فڕۆکە جەنگیەکانی بەریتانی، کە بەڕژدی پشتیوانی هێزەکانی عێراقی بوون[519]. "ئای ئار. کودیت"ی فەرماندەی یاریدەر لە هێزەکانی مەلەکی سوپای عێراقی ئەو ڕێوشوێنە دەداتە مێجەر "ئیف سی" ئەفسەری بەریتانی ڕاسپێردراو "الموکول" لە هێزەکانی عێراقی لە کوردستان[520]. مەلیك فەیسەڵ وتبووی: شۆڕشی شێخ مەحمود "یەکێك بووە لەکێشە گەورەکان"، کە بەهۆی هاوکاریو هاوئاهەنگی دۆستانەی نێوان هێزەکانی بەریتانیو عێراقی کۆتایی پێهات[521].

---

517 - C.O,730/163/5. 144637.Letter Secret May 29, 1930, Humphreys to Pass field.

518 - C.O,730/163/5. 144637. Report by Air Office command Iraq on Operation Against Shaikh Mahmud. Sept 17.1930.to 14 May 1931.p.30.

519 - C.O,730/163/6, 144637, Letter N,Ya/25. May 14.1931.Faisal to Humphreys.

520 - C.O,730/163/6, 14463, Desp. No, p.185. May.29.1931..Faisal to Humphreys .

521 - C.O,730/163/6, 144637, Letter N,Ya/25. May 14.1931.Faisal to Humphreys.

سەرەڕای هاوئاهەنگیو هاوکاری هەردوولا چەندین گومانو ناکۆکی هەبووە لە نێوان بەرپرسانی بەریتانیو حکومەتی عێراقی، ئەم ناکۆکیەش بەگەرمی لەکاتی ڕووداوەکان بووە هۆی ڕاپەڕینی ئەیلولو بەدرێژایی شۆڕشەکە بەردەوام بوو، کە پەیوەندی هەبوو لە جیاوازی لە تێگەیشتنی هەردوو لا لەسەر شۆڕشو لە باشترینو ئاسانترین ڕێگەچارەی هێمنکردنەوەی کورد، دەسەلاتدارانی بەریتانی ڕایانگەیاندبوو،کە تاڕادەیەك هەلگەڕانەوەی شێخ مەحمود دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی دەسەلاتدارانی عێراقی سەرەڕای وریاکردنەوەو بەئاگاهێنانەوەی چەند جارەی بەریتانییەکان بە خێرایی وەلامی داواکارییەکانی کوردیان نەداوەتەوە.[522]

سیاسییەکانی بەغدا لە سەرووی هەموویانەوە بەرپرسە گەورەکان گومانیان دەبرد کە ڕووداوەکانی کوردستان حکومەتی بەریتانی سازی داوە، لە پێناو درووستکردنی نائارامی لە باکوور ئەمەش بە یارمەتی شێخ مەحمود، هەتا ببێتە بیانووی مانەوەیان لە عێراق[523]. سەرکردەکانی سوپاو بەرهەلستکارو ڕاگەیاندنەکان نیگەران بوون لەو شێوازەی دەسەلاتدارانی بەریتانی سەپاندبوویان بەسەر سوپای عێراقی بۆ گەمارۆدانی شۆڕش. مەلیك فەیسەلٚ متمانەی بە ڕۆلّی ڕاوێژکاری سەربازی بەریتانی نەبوو لە چالاکیەکانی دژی شۆڕشگێڕانی کوردو باوەڕی وابوو ئینگلیز کۆسپ دەخاتە بەردەم هەولّی سوپای عێراقی لە کۆتایی پێهێنانی شۆڕشی کورد[524]. نوری پاشاو وەزیرەکان ڕاگەیاندنی ئەحکامی عورفیان بە پێویست دەبینی، هەتا حکومەت بەشێوەیەکی یەکلاکەرەوە مامەلە لەگەلٚ شۆڕشگێڕان بکات. سەرۆك وەزیران بە مەلیك فەیسەلّی ڕاگەیاندبوو، کە حکومەت دوو ئەگەری لە پێشە: یان دەبێت دەسەلاتی عەسکەری ڕابگەیەنیٚ هەتا سنوورێك بۆ شۆڕش دابنیٚ، یان لیوا کوردییەکان واز لیٚ بهێنیٚ، کە وای لیٚ هاتووە بۆی بەرێوەناچیٚو بارێکی گەورەی لەسەر خەزێنەی کورت هەلّهاتووی

---

[522] - BHCF, 13/14, Events in Kurdistan. Desp. No.D.O.S.A.627, Dec,10.1930.

[523] - C.O, 730/161/1. 1442272, Private and Confil. March 6,1931. Humphreys to Williams editor of Near East and India.

[524] - C.O. 730/163/5. 144637.Letter Humphreys to Faisal, March 31.1931

عێراقی درووست کردووه[525]. له نوری پاشا دهگێڕنهوه وتبووی: (ئێمه لهگهڵ شۆڕشگێڕهکان پابهندین به پهیڕهوکردنی مامهڵهی بهدواداچوونو سهرنجدانی ئهوروپیانه "دادگای ـ بینین.. هتد" له جیاتی سزادانی به کۆمهڵ[526].

ئهم بایهخپێدانهی مهلیك فهیسهڵو نوری پاشا له سهر ئهندامانی بهرههڵستکار ڕهنگدانهوهی دیاره، ههروهها چهند وتارێك له سهروتاری ڕۆژنامهی بهغدا لهسهر شۆڕش بڵاوکرابۆوه، ڕایگهیاندبوو، که پێگهی بهریتانی نهك ههر بهرپرسه له شۆرشی چهکداری بهڵکو بهرپرسه لهو کۆسپانهش که دهخرێنه بهردهم حکومهت له دهستبهسهراگرتنی بارودۆخهکه، بۆ نموونه جهلیل خهلیل و سالم جهبری ئهندامانی پهرلهمان چهند لێدوانێکیان دا لهوانه: هێزی شێخ مهحمود توانی له"کهسانی غهیری پشتیوانانی خۆی" پشتیوانی بکرێت یان پڕوپاگهندهیان کردبوو شێخ مهحمود "ئامرازی دهستی بێگانهیه"یه[527].

ڕۆژنامهی عێراقی نووسیبووی: "به ئهندازهیهکی زۆر سهرمان سووڕماوه له بێدهنگی بهردهوامی حکومهت لهوهی پهیوهندی ههیه به پیلان له دژی عێراق لهلایهن بهکرێگیراوهکانی سیاسهتی بێگانه.. چۆن حکومهتی تورکیو ئێرانی بههێز دهبن به چالاکی سوپا دلێرهکانمان.. کۆمهڵو ڕێکخراو ههیه له ئینگلتهرا یارمهتی شۆڕشگێڕان دهدا.. بۆ درووستکردنی ناکۆکی دهستێکی چالاك له پشت پهردهوه ههیه[528].

حکومهتی بهریتانی لهلای خۆیهوه سوور بوو لهسهر پیادهکردنی سیاسهتی ئاشتهوایی لهگهڵ کورد، ههموو ههوڵێکی بهپێویست دهبینی بۆ گۆشهگیرکردنی شێخ

---

[525]-- C.O.730/163/5. 144637.Desp. No, v/99.Secretariat of the Council of Ministers to Reis of Royal Diwan March 25.1931.

[526] - C.O.730/163/5.144637.

ئهو کۆنگرهیه لهبارهگای کۆمیساری باڵا له21 تهمووز گیرا بۆ وتووێژ لهسهر ئهو ڕێگاچارانهی بگیرێته بهر له بهرانبهر شێخ مهحمود.

[527]-- C.O.730/163/5. 144637, Extract from Intelligence Report No, 7.dated 1st April 1931.

[528] - C.O,730/163. 144637. Extract from Iraqi Press dated February 27th to March 1931.

مەحمود لە ڕەوتی سەرەکی جولانەوەی کوردی میانەڕەو خاوەن پێگە. لە30ی ئابی ساڵی 1930 دەسەلاتدارانی بەریتانی فشاریان خستە سەر حکومەتی عێراقی هەتا سیاسەتی میانەڕەوانە ڕابگەیەنێ. دەیانووت: ئەگەر دەرفەتی دەسەلاتداریەتی عێراقی بدرێت بە ئازادی هەڵسوکەوت بکەن لەگەڵ شۆڕشگێڕانی کوردو سیاسەتی سزادانی بەکۆمەڵ بگرێتە بەر لەگەڵ هەڵگەڕاوەی هۆزەکان، بە گرتنی کوێرانە، ئەمە "هەزاران کورد" پەیوەندی بە جولانەوەی یاخیبوونو شۆڕشەوە دەکەن[529].

سەرەڕای ئەمە حکومەتی بەریتانی بە پێشنیارەکەی نوری پاشا ڕازی نەبوو، کە سوپایەکی خێڵەکی هەر وەکو ئەوەی تورکیا درووست بکرێت بۆ دژایەتی شۆڕشگێڕان، ئەمە کارێکی کردەیی نابێت، پێکهێنانی سوپای لەو جۆرە لەوانەیە ببێتە هۆی فراوان بوونی شۆڕشو هۆکارێکی تری پێشبڕکێی خێڵەکی بەردەوام بۆ گرژی لە ناوچەکەدا[530].

شۆڕشی سێیەمی شێخ مەحمود هەر لەدەست پێکردنەوە هەتا کۆتایی هەندێ لایەنی وێکچووی تێدایە لەگەڵ شۆڕشەکانی ڕابردووی. ئەو شۆڕشەش وەکو ئەوانی ڕابردووی بەبێ ویستی خۆی ناچار کرا سەرکردایەتی شۆڕش بکات. هەروەها شۆڕشەکانی ڕابردوو لەگەڵ ئەم شۆڕشە بە شێوەیەکی سەرەکی لە لیوای سلێمانی کورت هەڵهاتبوو. بەهۆی لاوازی هەستی نەتەوایەتی لەناو کورد هەوڵەکانی شێخ بێئاکام بوو، لەوەی بێتە شۆڕشێکی نەتەوایەتی، هەروەها وەکو ئەوانی تر هێزە جەنگیەکانی ئاسمانی ڕۆڵی سەرەکی بینی لە لەناوبردنی شۆڕش.

گەرمو گوڕی شۆڕشی 1930ـ1931 شۆڕشێکی نمونەییو جیاواز بوو لەگەڵ هەموو ئەو شۆڕشانەی پێشوو، کە شێخ مەحمود سەرکردایەتی کردووە، بە زۆری لە ژێر کاریگەری وروژاندنی تورکیاو هەڵچوونی خەڵك دابووە، ئەمەش بەهۆی کاریگەری بیرۆکەی جامیعەی ئیسلامی، بەلام ئەم شۆڕشە ئاکامی تێکگیرانی ئامانجی نەتەوایەتیو ئامانجی هاوپەیمانییەتی ئەنگلۆ– عێراقی بوو. هەروەها لە کاتی شۆڕش سوپای عێراقی هەمان ڕۆڵی ڕابردووی هێزی لێڤی ئاشوورییەکانی گێراوە.

---

[529] C.O.730/183/6 144637. Desp. No,51684.(Report by Air Office Command Iraq on Operation Against Shaikh) Ludith-Hewitt.

[530] --C.O.730/163/5. 144637.

## جولانەوەی شێخ ئەحمەدی بارزان

حکومەتی عێراقیو ئیدارەی بەریتانی لە عێراق درکیان بەوە کرد، بەبێ لەناوبردنی شۆڕشی بارزان دەستبەسەراگرتنی بزاڤی سێیەمی شێخ مەحمود نابێتە زامنکردنی سەپاندنی حکومەتی عەرەبی بەغدا بەسەر کوردستان. لە ساڵی 1927ەوە حکومەتی عێراقی شێخ ئەحمەدی بارزانی بەمەترسی زانیبوو، هەتا ساڵی 1932 لە دوو رووەوە ئەو مەترسیە بەردەوام بووە:

یەکەم: مەترسیەکانی سەرکەوتنی شێخ ئەحمەد بەسەر حکومەتی ناوەندی دەگوازرێتەوە بۆ هەموو بەشەکانی کوردستانو دەبێتە کۆسپی گەورە لەسەر قبوڵکردنی عێراق لە کۆمەڵەی گەلان، چونکە دابینکردنی ئاسایش و ئارامی لە عێراق مەرجی کۆمەڵەی گەلان بوو بۆ ئەندامیەتی عێراق لەکۆمەڵە، کە لەکۆبوونەوەی چاوەڕوانکراوی مانگی ئەیلولی ساڵی 1932 گفتوگۆی لەسەر دەکرێ.

دووەم: هاوکات پەیوەندییەکانی نێوان عێراقو تورکیا باش نابێتو لەسەر بنەڕەتێکی لەرزۆك دادەمەزرێت، دەسەڵاتدارانی بەریتانی دەترسان بزاڤی بارزان کاریگەری هەبێت لەسەر کوردستانی تورکیاو پەیوەندییەکانی تورکیاو عێراق بخاتە مەترسیەوە[531].

هێژا مەسعود بارزانیو وادی جوەیدە بەدرێژی باسی جولانەوەی شێخ ئەحمەدیان کردووە، نامانەوێ لێرەدا ئەوە دووبارە بکەینەوە، بەڵکو لە ڕوانگەی ئەو بەڵگەنامانەی بەریتانیا کە لەم دواییە ئاشکرا کرانو لەبەردەستی ئەو دوو بەرێزە دا نەبوون، هەندێ خاڵی تر زیاد بکەین، لەگەڵ وەرگرتنی هەندێ لە برگەکانی کتێبەکەی مەسعود بارزانی.

لە ساڵی 1931 ئەو ناوچەیەی ژێردەسەڵاتی شێخ ئەحمەد بووە 150 میل درێژو 80 میل پان بووە، ئەو بەشە سێیەکی سنووری عێراقو تورکیاو ئێرانی پێك هیناوە، بارزان لە زنجیرە شاخی ئاستەمو دابڕاو پێك هاتووە، لە هۆزەکانی: شیروان، مزوری باڵا، باروش پێك هاتوون، مریدیەکان لەوێ بەدێوانە ناسراون، وادی جوەیدەو ئەوانەی لەو بابەتەیان توێژیوەتەوە کردوویانەتە دوو بەش: یەکەمیان، ئەو گرووپەی پێی وابووە

[531]- C.O. 163/5. 144637 Humphreys to Pass field February 6. 1931 Longrigg Iraq 1900-1950. p.217

ئەو بزاڤە هەڵقوڵاوی مامەڵەی دوژمنكارانەی شێخ ئەحمەد بووە بەرانبەر دەسەڵاتی ناوەند لە سەپاندنی باوەڕی نامۆ بەسەر كوردانی بارزانو زێبارو برادۆست "ئەو گرووپەش ئەفسەرانی ئیدارەی بەریتانی لەكوردستانو بەرپرسانی عێراقین". دووەم: "نووسەرانی كورد بەگشتی" باوەڕیان وابووە بزاڤی بارزان سەرئەنجامی ویستی حكومەت بووە بە زەبری هێز بەسەر ناوچەی بارزانو هەوڵدان بۆ نیشتەجێكردنی ئاشوورییەكان لە برادۆستی باشووری ناوچەی بارزان، لەگەڵ ئەوەدا جوەیدە پێی وابووە هەردوو گرووپ جێی باوەڕن، بەڵام ئەوە بەلای قەناعەتی نووسەرە كوردەكانەوە بووە، كە بزاڤی شێخ ئەحمەد دەرئەنجامی ئارەزووی حكومەتی ناوەندی بووە بۆ كۆتاییهێنان بەو دەسەڵاتە خۆجێیەی ناوچەی بارزان[532]. ئەو بەڵگەنامانەی بەریتانی كە لە دوای توێژینەوەكەی جوەیدە "1960" بڵاوبوونەتەوە پشتگیری ئەو بۆچوونەیان كردووە، بۆ نموونە ئەگەر رای دیڤید مەكدواڵ وەربگرین دەچێتە خانەی گرووپی یەكەم. مەكدواڵ پێی وایە جوڵانەوەی بارزان ئاكامی ناكۆكی نێوان حكومەتو نەرێتی هۆزایەتی بووە، پوختەی تێڕوانینی مەكدواڵ لەسەر جوڵانەوەی شێخ ئەحمەد لەم گوزارشتە كورت دەبێتەوە: (بەهیچ شێوەیەك ئەو جوڵانەوەیە ئاكامی هوشیاری نەتەوەیی نەبووە.. هیچ ئاماژەیەك نییە شێخ ئەحمەدی بارزانی بایەخی بە بارودۆخی كوردانی دەرەوەی بارزان دابێت، لە ڕاستیدا شێخ رازی نەبووە بەپیر داواكاری شێخ مەحمودەوە بچێت لە جوڵانەوەی سێیەمیدا، لە ناوچەی بارزان پیاوێك بەناوی مەلا عەبدوڕڕەحمان "لەوانەیە مەلا جورج بووبێت" پەیدا ببوو، داوای پێغەمبەرایەتیو خوایەتی كردووە بۆ شێخ ئەحمەد، هەتا دوایی شێخ موحەممەد سادق كوشتوویەتی، چونكە ئەو مەلایە هەوڵی دابوو ناوی شێخ ئەحمەد بخاتە ناو بانگدانەوە... لەو كاتە پەیوەندی لەگەڵ حكومەت ئاڵۆز بوو، حكومەت لە ساڵی 1927 هەوڵیدا پەناهێندەكانی ئاشووری لە برادۆست نیشتەجێ بكات، شێخ ئەمەی بە هەڕەشە زانیووە بۆ سەر پێگەی خۆی)[533].

لە ساڵی 1928 حكومەتی عێراقی شێخ ئەحمەدی تاوانبار كردووە بە نەدانی باجی "زستانە"، كە حكومەت لەسەر داهاتی كشتوكاڵی زستانەی دانابوو، هەروەها حكومەت

---

532- The Kurdish Nationalist Movement), pt.2. pp.644-647

533 -Modern Kurdish Nation Movement, pp.178-179

هەوڵیدا شێخ ڕەزامەندی دەربڕێ لە دانانی چەند یەکەیەکی سوپاو پۆلیس و لێڤی لە بارزان و برادۆست بۆ ئەنجامدانی سەرژمێری گشتی حکومی لە بارزان. شێخ ئەو هەنگاوەی بەکارێکی هەراسانکار داناو بڕیاریدا بەرهەڵستی بکات[534].

حکومەتی عێراقی خۆی بۆ هێرشکردنە سەر بارزان ئامادەکردو نوێنەری باڵای بەریتانی پێی وابوو ئەگەر چالاکی سەربازی دژی شێخ ئەحمەد ئەنجام بدرێ تورکیا هاریکاری شێخ ئەحمەد دەکات، بۆیە داوای لە حکومەتی عێراقی کرد پەلە نەکات هەتا ناکۆکیەکانی لەگەڵ تورکیا یەکلایی دەکاتەوە، بەڵێنی بەشێخ ئەحمەد دا دڵنیا بێت مەبەستێك نییە بۆ سەپاندنی ئیدارەی عێراقی بەزەبری هێز[535].

لەکۆتایی ساڵی 1931 بەهۆی کۆمەڵێك فاکتەری ناوخۆییو دەرەکی حکومەتی عێراقی بڕیاریدا هێرشی سەربازی بکاتە سەر بارزان، نیگەرانی ناوخۆیی بەهۆی سەرهەڵدانی شەڕ لە نێوان لایەنگرانی شێخ ئەحمەدو لایەنگرانی شێخ ڕەشیدی نەقشبەندی لۆلان "دوژمنی تەقلیدی شێخی بارزان" هەڕەشەی لە ئارامی ناوچەکە دەکرد، هەروەها حکومەت بانگەشەی ئەوەی دەکرد هۆزە هاوپەیمانەکانی دوژمنی بارزان لە ئاکرێ نیگەرانن لەو بارودۆخەو بیر لە هێرشی جدی دەکەنەوە بۆ سەر بارزان، ئەو کات زیانی گەورە لە ڕووی مادیو مەعنەوەی بە ناوچەکە دەکەوێت، حکومەت دەیوت: شێخ ئەحمەد هەڕەشەی لەو ئاشوورییانە کردووە کە لە تورکیاوە هەڵاتوونو دەیانەوێ لە برادۆست نیشتەجێ بن[536].

لە کۆتایی ساڵی 1930ەوە حکومەتی عێراقی داوای لە شێخ ئەحمەد دەکرد باجی مەڕو ماڵات "باجی کۆدە" بدات (کە بەپێی ژمارەی مەڕ دیاری دەکرێت)، شێخ ئەحمەد ڕازی نەبوو دەیوت: (بارزان بەبارودۆخێ تایبەتدا تێپەڕیووە، بەهۆی کۆچی بەردەوامی

---

[534]- Air/23/184 xc 145167 Report on the Meeting held at Bileh on 31 st March 1928 between Administrative Inspector Mosul and Shaikh Ahmed Barzan.

[535]-Air 23/184 Dispatch 5/1086 July 28, 1928, Iraq Administrative Report for the Year 1928 pp.52-53

[536]- R. Ludlow- Hewitt, Air HQ. Iraq Command (Report On Operation Again ion Barzan Carried Out by the Iraq Air from and Royal Air Force, D December 9th 1931, Honaidi 17th February, 1932.

شوانکارەو دانیشتوان ژمارەی پێویست مەڕو ماڵات لە ناوچەکەدا نییە، ئەمە پێچەوانەی ئەو نەریتەیەکە لە کۆنەوە لە ناوچەی بارزان پیادەکراوە، پێشەکی باجێکی دیاریکراو دراوە بە ناوی باجی سنووردار)[537].

هۆکاری تری ناوخۆیی هەبووە بۆ هێرشکردنە سەر بارزان، ئەویش ئارەزووی ئیدارەی بەریتانی بووە، هەتا سوپای عێراقی بۆ پرۆڤەی شەڕی ناوچە شاخاوییەکان بکەوێتە ناو شەڕی بارزان. نوێنەری باڵای بەریتانیو ئەفسەرانی ئینگلیز ویستوویانە پێش ئەوەی ئینگلیز لە ساڵی 1932 عێراق بەجێبهێڵێ سوپای عێراقی مەشقی پێویستی کردبێت، هەروەها بەپێویستی دەزانی بەر لەوەی وڵات بەجێبهێڵن بەرێگەی هێزی زەبری کوردو دروشمەکانی حکومەتی ناوەندی بترسێنن[538].

مەسعود بارزانی لەو بارەیەوە بۆچوونی "هاملتۆن" لە کتێبی "طریق في کوردستان" دەگێڕێتەوە، کە رای هاوشێوەی هەبووەو دەڵێ: (لەوکاتەی لە ساڵی 1931 حکومەت شاڵاوی کردبووە سەر شێخ ئەحمەد، من بەو بۆچوونە بەرەنگاری بوومەوە:– "باشە چی بکەین بە سوپای عێراقی، کە بۆ چەکدارکردنو ئامادەکردنی پارەیەکی زۆری لێ خەرج کراوە، ئەگەر نەتوانێ بیان نێرێ بۆ رێگەی رەواندز، هەتا لەوێ فێری هونەری جەنگ بنو بە شەڕی سەر کوردان پرۆڤە نەکەن؟"، ئەو وەڵامەی زۆر بەپێکەنینەوە وەرگرتەوە: باشتر لەوە لە عێراق لە ڕێگەی نێوان بەغداو موسڵ سنوورێکی بەرفراوانی بیابانی چۆڵ هەیە گونجاوە بۆ تاقیکردنەوەی چەكو تۆپو بزاوندنی دەبابەو فرۆکە، با لەوێ تۆپیان بتەقێنێ مەترسی بۆ سەرگیانی کەس نییە، با ئەوانە نەنێرێ بۆ کوردستان، عەرەبیش هەن لە باشوور، ئەوانیش دەپێکرێن"[539].

---

[537]- Air 25/184 xc/145167 Transient of Qaimaqam of Amadiya s Letter No, 632 dated 6th February, 1928 Addressed to Mutasarrif of Mosul.

[538]- C.O, 730/174/11 144637 Air. Iraq Command Hinaid E.R Ludlow Hewitt (Extract from personal Letter. S. 1037/4 dated 6th April 1932 from A.O.C. Iraq to the Chief of the Air Staff.

[539] - مسعود البارزاني: البارزاني و الحركه التحرريه الكرديه، انتفاچه بارزان الاولى، 1931-1932،ص30

حکومەت بۆ دەستبەسەراگرتنی پێگەی شێخ ئەحمەد لە برادۆستو بارزان پەنای بردە بەر درووستکردنی بیانوو هێنانەوە بۆ خەڵکی ئەو ناوچانە، ئەفسەرانی هەواڵگری بەریتانی لە شارەکانی کوردستان شالاوێکی پروپاگەندەیان دژ بەشێخ ئەحمەد دەست پێکرد، دەبینن لادانی شێخ ئەحمەد لەئیسلام بەشێك بووە لەو پڕوپاگەندانە، لەناو کێبەرکێی تەقلیدی لەسەر پێگەی دەسەڵات هەندێ جار ناکۆکی لەو شێوەیە لەنێوان ئەو دوو شێخەی تەریقەتی سۆفیگەری رووی داوە، بەتایبەت کە هەردووکیان پێگەی دەسەڵاتیان لە یەکتر نزیك بووە، یان لە ناوچەیەك بوون.

نەقشبەندییەکانی کوردستان لەو ماوەیە گەیشتبوونە قۆناغێکی بەپیرۆز گرتنی شێخەکانیان، کە لە ڕووی شەرعیەوە درووست نەبووە، ئەمەش لە ناوچە دوورە دەستەکان، کە خەڵك تێگەیشتوو نەبووە، دەبینین هەریەك لە مامۆستایانی رەحمەتی: "عەباس عەزاوی"و "سەعید دملۆجی" لە باسی مەسەلەی بارزانی رۆژانی شێخ ئەحمەد قسەیان لەو بابەتە کردووە.

لێرەدا دەمانەوێ سەرنجی خوێنەر رابکێشن بۆ ئەوەی کە شێخ ئەحمەد یەکەم کەسی شێخەکانی بارزان نەبووە تاوانی کافربوونی بدرێتە پاڵ، پێشتر هەمان تاوان ئاڕاستەی شێخ عەبدوسسەلامی باپیری شێخ ئەحمەد کرابوو، هەروەها ئاڕاستەی شێخ موحەممەدیش کرابوو، لە هەموو بارەکاندا فاکتەری سیاسیی هەبووە بۆ لەکەدارکردنی ئەوان، زانایانی موسڵ ئەو تاوانەی ئاراستەی هەردوو شێخ کرابوو کاتی خۆی بەدرۆیان خستبۆوە. هاملتۆن لە شێخ ئیسماعیلی کوڕی شێخ عەبدوڵلای رەواندزی نەوەی میرانی سۆران، کە ماوەیەك قائمقامی رەواندزیش بووە دەگێڕێتەوە: "شێخ گەنج بووە، هەندێ بۆچوونی هەبووە دژ بە ئیسلام، بۆ ماوەیەکی کەم ئاراستەی مەیلەو نیمچە مەسیحی بووەو داوای هاوپەیمانییەتی کوردو ئاشووری کردووە، هەر زوو ئەو پڕوپاگەندەیە لەناو کورد بڵاوبووەوە، کە شێخ لەگەڵ مەسیحیەکان دەیەوێ پیلانی چەوسانەوەی مسوڵمانان دابڕێژێ"، ئەوە بوختانێکی ئاشکرا بووە، بەڵام ئەو قسانە بارێکی لەباری درووست کردبوو بۆ ئەوەی شێخ رەشیدی لۆلانی دەمارگیری دراوسێی بە ئاماژەی هێزێکی شاراوەی سیاسیی ببزوێ "مەبەست لە دەزگا هەواڵگرییەکانی بەریتانیایە لەکوردستان" بۆ هێرش کردنە سەر لایەنگرانی شێخ ئەحمەدو ناویان بە"کافر" بهێنن،

شێخ ڕەشید زۆر ساویلکە بووە، پێی وابووە ئاگری چەکی هێزەکانی بارزان وەکو ئاگرەکەی حەزرەتی ئیبراهیم سارد دەبێتەوە، بەڵام ئەوە پێچەوانە دەرچوو، بە خراپترین شێوە تێکشکان، هێزەکانی عێراقی هاتنە هانایو ئەوانیش تێکشکان، ئەوە پاڵی بە ئینگلیزەوە نا بە چالاکی ئاسمانی بەشداری بکاتو تەڕو وشك پێکەوە بسووتێنێت[540].

ئەو کاتەی ئینگلیز ویستی شێخ مەحمود گۆشەگیر بکاتو گومان لەسەر ڕاستگۆیی درووست بێ پەنای بردە بەر ناوزڕاندنی وەکو شێتو سەرەڕۆو ساویلکە، هەتا دەمارگیری ئایینی، زۆر کەس پێی وابووە تاوانبارکردنی شێخ ئەحمەد دەستی بەریتانییەکان بووە، ویستوویانە بەو قسانە یاری بەهەستی مسوڵمانان بکەنو لە خزمەتی خواستەکانی خۆی بەکاری بهێنێت.

ئەفەسەرێکی هەواڵگری بەریتانی لە هەولێر دەڵێ: شێخ ئەحمەد لە 29ی تەموزی ساڵی 1931 نامەیەکی بۆ شێخ ڕەشیدی برادۆست دانیشتووی گوندی لۆلان ناردووە، داوای لێکردووە بۆ سەر ئایینی تازە، لەو کاتەی شێخ ڕەشید ڕازی نەبووە، شێخ ئەحمەد هێزێکی 300 کەسی بە فەرماندەیی مستەفا بارزانی ناردووە، بۆ ئەوەی بە زەبری هێز ملکەچیان بکات[541].

هێژا مەسعود بارزانی وای دەبینێ کە حکومەت ئەو قەیرانەی درووست کردبێت، برادۆستیەکان دەستپێشخەر بووبن بۆ سەر لایەنگرانی شێخ ئەحمەدی بارزانی:

(لە هاوینی ساڵی 1931 برادۆستیەکان هێرشیان کردە سەر ناوچەی بارزان، سامانی خەڵکی گوندەکانی "کرکاڵ، کۆلەك، بابکی" لە هۆزی شیروانی بەتاڵان بردو ماڵەکانیان سوتاندن، لەو کاتە بارزانی سەردانی ئەو ناوچەیەی کردووەو ژمارەیەك پیاوی کۆکردۆتەوەو بەدوایان کەوتووە، هەتا لە "دەشتی هیرت" پێیان گەیشتوون، لە دوای پێکدادانێکی خێرا سامانو مەڕوماڵاتەکەی لێوەرگرتنەوە، شاڵاوەکە لە 1931/11/25 دووبارە بۆوە، ئەو جارەش بارزانییەکان وەڵامی شاڵاوەکەیان دایەوەو شێخ ئەحمەد هێزێکی بەسەرۆکایەتی وەلی بەگ لە ڕۆژی 1931/11/27 نارد، لە

---

540- Road Through Kurdistan. P.299

541 - Air, 23/311 Memorandum From. S.S O. 29-7-31

یەکەم تێکگیران هەڵاتن‌و برادۆستیەکان سامانە تاڵانکراوەکەیان بەجێهێشت، وەلی بەگ وازی لێ نەهێنان هەتا ماڵی خۆیان بەدوایانەوە بوو، برادۆستیەکان لەو شەڕەدا خراپ شکان"[542].

هەروەها حکومەت هۆزەکانی زێبارو رێکانی رازی کرد دوژمنکاری شێخ ئەحمەد بکەن، هەروەها هۆزەکانی تری هاندا بەرانبەر شێخ ئەحمەد بوەستنەوە، لەکاتێکدا شێخ لە ساڵی 1928 توانیبووی هەموو هۆزەکانی بادینان یەك بخات دژی نەخشەی حکومەتی ناوەندی، هاوپەیمانییەتی شێخ ئەحمەدو فارس ئاغای زێباری حکومەتی ناچار کردووە سازش بکات بۆ سەرۆکە کوردەکانی ناوچەکەو هەتا ساڵی 1931 هێرشەکانی دوابخات، بەڵام ئەمجارە حکومەت بەهەر رێگەیەك بووبێت شێخ ئەحمەدی لە شێخەکانی تر دوورخستەوە[543]، شێخ ئەحمەدیش ئاگاداری مەبەستی ئینگلیز بوو، هەوڵی زۆری دا هاوپەیمانییەتی ساڵی 1928 تازە بکاتەوە، نوێنەری نارد بۆ لای سەرۆکە کوردەکان‌و مەترسی پیلانی حکومەتی لە لێکترازاندنی رێزەکانی کوردی بۆ روون کردبوونەوە[544]. بەپێی راپۆرتی ئەفسەری هەواڵگری لە موسڵ کە لە 13ی کانوونی دووەمی ساڵی 1932 ئامادەکراوە، شێخ وەکو دەستپێشخەری نمایندەی خۆی ناردووە بۆ لای شێخ رەشیدی لۆلان بۆ ئاشتەوایی و هەندێ لەو سامانەی برادۆستیەکانی گەڕاندبۆوە، کە لە شەڕەکانی رابردوو لەگەڵ بارزانییەکان دەستی بەسەرا گیرابوو[545].

هەندێ لە نووسەران نیشتەجێکردنی ئاشوورییەکانی هەکاری‌و ورمێ لەکاتی قەیرانی شەڕی یەکەمی جیهانی، کە هاتبوونە ناوچەی برادۆست بە بایەخەوە وەردەگرن لەسەرهەڵدانی قەیرانی بارزان، هەروەکو روونمان کردەوە حکومەتی عێراقی رایگەیاندبوو، کە شێخ ئەحمەد خەڵکی بۆ شەڕ دژی ئاشوورییەکان هانداوە، دۆسیەی

---

[542] - انتفاضة بارزان الاولى، 1932-1933، ص26

[543]- Air 23/184 xc/145167 Translation of Qaimaqam of Amadiya s Letter No, 632 dated 6th February 1928 Addressed to Mutasarrif of Mosul.

[544]- CO, 174/11 144637 Intelligence Report No, 4. 22 February 1932 .

[545]-CO, 174/11 144637 Intelligence Report No, 1 January 13 1932 S.S.O, Mosul .

ئاشوورییەکان لە عێراق لە ژێر رۆشنایی بەڵگەنامە تازەکانی بەریتانیو رووسی دۆسییەکی تایبەتەو پێوستی بە لێکۆڵینەوەی تر هەیە، لێرەدا لەگەڵ جوەیدە هاوڕام، کە ئەو مەسەلەیە هۆکاری تەقینەوەی ناکۆکیەکانی بارزان نەبووە[546]. لە ڕاستیدا 20 هەزار پەناهێندەی ئاشووری هەبوون، حکومەتی عێراقی ویستوویەتی لەو گوندانەی جێی ناکۆکین لە برادۆست لە نێوان شێخ ئەحمەد و حکومەتی عێراقی نیشتەجێیان بکات، شێخ بە راستی پێی وابووە حکومەت بە هاوکاری هەندێك لە سەرکردە ئاشوورییەکان کاردەکات بۆ بەکارهێنانی ئەوان لە برادۆست بۆ بەهێزکردنی دەسەڵاتی حکومەت، لەکاتێکدا ئەو پەناهێندە ئاشوورییانە، یان سەربازی لیڤی گوێڕایەڵی ئینگلیز بوون، یان چەکدار بوون، هاتنیان بۆ ناوچەکە هاوسەنگی هێزی تێك دەدا[547].

ئەوەی جێی سەرنجە کوردو شێخ ئەحمەد یەك نەبوون لە شرۆڤەی مەبەستی حکومەت لە بابەت نیشتەجێکردنی ئاشوورییەکان لەکوردستان، ئەفسەری هەواڵگری بەریتانی لە موسڵ نیگەرانی خۆی دەربڕیوە لە هەمبەر هەڵوێستی لیوای موسڵ بە ئاگادارکردنەوەی شێخ ئەحمەد، کە ئەگەر ئاشوورییەکان لە عێراق نیشتەجێ بکرێن ئەوە مەترسیەکی چاوەڕێکراو بەرێوەیە بۆ عێراق[548]. لەکۆبوونەوەی پەرلەمان لە بەغدا لە ساڵی 1932 ساڵح جەبر یەکێك بووە لە ئەندام پەرلەمانە بەرهەڵستکارەکان، نیگەران بووە بەهەڵگیرسانی شەڕ دژی شێخ ئەحمەد، بەقسەی ئینگلیز بەمەبەستی چوڵکردنی بارزانو نیشتەجێکردنی ئاشوورییەکان بووە[549]. هیچ گومان لە بەردەم شێخ ئەحمەد نەمابۆوە بەوەی پەیوەندی هەیە لە نێوان سووربوونی حکومەت لەکۆکردنەوەی هێزی سەربازی زیاتر لە بارزانو برادۆستو ئەو هەوڵانەی دەدرێ بۆ دەستبەسەراگرتنی ئەو، لۆنگریك لەو بارەیەوە دەڵێ: ئەو هەستەی لازیادبوو لەوکاتەی هەندێك لایەنی بەرهەڵستکار لە دەسەڵاتی بەغدا کێشەی نێوان کوردو ئاشوریان دەورووژاندەوە،

---

[546] -Kurdish Nationalist Movement , pt.2. pp.654-655 .

[547]- FO, 730/178 Department. Residency Baghdad August 3.1932.

[548]- FO, 371/16045, Extract from Intelligence Report E. 3952/179/93 December 8.1931.

[549]- CO, 174/11 144637 Residency Baghdad April 4,1932 Intelligence Report No, 7 .

بەمەش بە رێگەی هەندێك سەرەداوو هاندان بۆ مەبەستی بەدەستهێنانی ئامانجی تایبەتی سیاسیی[550].

گوزارشتە دەرەکیەکانیش رەهەندێکی تری دیاریکردنی کاتی هێرشەکان بوون، حکومەتی عێراقی لەو بڕوایە دابووە، کە حکومەتی تورکی بەنهێنی هاوکاری شێخ ئەحمەدی کردووە، چونکە تورکیا نیگەرانو نارەزا بووە لە دانانی سەید تەهای نەهری کوڕی شێخ موحەممەد سادقی نەهری بە قائمقامی رەواندز، لەکاتێکدا شێخ تەها رکابەری تەقلیدی شێخ ئەحمەد بووە لە ناوچە سنوورییەکان، حکومەتی عێراقی گومانی وابووە بۆیە تورکیا بۆ لاوازکردنی پیگەی سەید تەها پاڵپشتی شێخ ئەحمەد دەکات[551]، شێخ ئەحمەدیش پەیوەندیەکانی خۆی نەدەشاردەوە لەگەڵ تورکان، لەو چاوپێکەوتنەی لەگەڵ پشکنەری بەریتانی لە موسڵ دەڵێ: (ئەگەر حکومەتی عێراقی بەکەمێك نەرمی مامەڵەمان لەگەڵدا بکات ئاوڕ بەلای تورکیادا نادەمەوە)، هەتا ساڵی 1928 تورکیا بەگومان بووە لە مەبەستی ئینگلیز، لەو بڕوایەدابووە حکومەتی بەریتانی لە هەوڵی نیشتەجێکردنی ئەو ئاشوورییە پەناهێندانەی تورکیایە لە بارزان، هەتا بیکاتە نیشتیمانێك بۆ ئاشوورییەکان و پێگەیەك بۆ بەریتانیا، هەروەها حکومەتی عێراقیو تورکی لێك دابڕی[552]. هەواڵگری بەریتانیش لەلای خۆیەوە بە وردی چاودێری جوڵانەوەی شێخ ئەحمەدی کردووە لە سنوری تورکیا، لە نیسانی ساڵی 1928 لە نامەیەکدا موتەسەڕیفی موسڵ بۆ قائمقامی هەکاری ناردووەو گلەیی لێکردووە بەوەی شێخ ئەحمەد چەکی لە شەمدینان کڕیوەو پەیوەندی بە قائمقامی شەمدینانەوە کردووە هەتا دالدەی بدات لەکاتی نوشوستی هێنانی شۆڕشەکەی، شێخ ئەحمەد، شەریف ئاغای زیباری ناردووە بۆ شەمدینان، وادیارە بەڵێنی بەدەستهێنانی چەكو تەقەمەنی لە حکومەتی تورکی وەرگرتووە[553].

---

[550]- Iraq 1900-1950. p.198.

[551] - Iraq 1900-1950.. p.198.

[552]-Air 23/184 xc 145167 s.s.o Mosul No, 1.14 June 1928. Air 23/184 xc/ 14516 Administrative Inspector Mosul Liwa 3,1928 N.c/488 .

[553] - Air 23/184 xc/ 14516 Administrative Inspector Mosul Liwa 3,1928 N.c/488 .

له ڕاستیدا بەپێچەوانەی بۆچوونەکانی حکومەتی عێراقی، تورکەکان بەگومانەوە له شێخ ئەحمەدیان ڕوانیوه، له ئەیلولی ساڵی 1930 نووری سەعید، سەرۆك وەزیرانی عێراق سەردانی تورکیای کردووه، له میانەی ئەو سەردانه تورکەکان نیگەرانی خۆیان له بەرانبەر شێخ ئەحمەد نیشان دابوو، بەوەی پشتیوانی شۆڕشگێڕانی "ئورامار"ی کردووه له کوردستانی تورکیا، له چاوی تورکانەوه شێخ ئەحمەد تاوانباربووه بەناردنی سەدان جەنگاوەر بۆ پشتیوانی شۆڕشگێڕانی ئارارات، تورکەکان دەیانوت بارزان بۆته پەناگه بۆ ئەو کەسانەی لەلایەن حکومەتی تورکیاوه داواکراون، تورکیا داوای له سەرۆکوەزیرانی عێراقی کردووه ڕێگه به هێزی تورکیا بدات بێته ناو خاکی عێراقەوه بۆ ڕاوەدوونانی ئەونەی پێیان دەوتن یاخی بووه کوردەکان، نوری سەعید بمه ڕازی نەبووەو وتبووی: حکومەتەکەی نەخشەی سەربازی بەدەستەوەیه بۆ دەستبەسەراگرتنی شێخ ئەحمەد[554]. له شوباتی ساڵی 1931 پشکنەری گشتی هێزه چەکدارەکانی بەریتانی له عێراق سەردانی تورکیای کردو نەخشەی سەربازی حکومەتی عێراقی دژی بارزان خستبووه بەردەم تورکیا، که هەردوو حکومەتی عێراقیو تورکی ئەنجامی دەدەن، بەڵام دوایی هۆکارەکانی دیار نییه بۆچی حکومەتی عێراقی وازی لەو نەخشەیه هێناوه[555].

بەپێچەوانەی باوەڕی مەکدواڵو هاوڕاکانی که دەڵێن: شێخ ئەحمەد بایەخی بەکێشەی کورد نەداوه، بەڵام شێخ ئەحمەد وەکو تورکان دەڵێن زۆر بایەخی به بزاڤی کورد له کوردستان داوه، لەڕاستیدا بڕوای پتەوی هەبووه به هەریەك له شێخ مەحمودی حەفید و خەسرەوی کوڕی سمکۆ و شۆڕشگێڕانی ئارارات، بۆ پاڵپشتی بزاڤی کوردایەتی کاری کردووه، بەڵام بەشێوەیەکی ژیرانەو لەسەرخۆ، ئەو هەمیشه ڕایگەیاندووه، که پیاویی ئایینیو سادەیەو قوربانی فێڵی ئەوانی تره، هەروەها له ڕووکەشدا خۆی بەگوێڕایەڵی حکومەتی ناوەندی نیشان داوه، پەیوەندییەکانی به شێخ مەحمودەوه هەتا ئێستاش هەندێك لێڵه، چیاووك دەڵێ: لەوکاتەی شێخ مەحمود داوای لێکردووه

[554]- CO. 730/174/11 144637 Extract from Personal Letter No, S/10371 dated April 6.1932.

[555]- CO, 730/163/5 144837 Dispatch No, 880. 88069 February 6, 1931 Humpy's to Pass field.

پەیوەندی بەشۆڕشی 1930یەوە بکات وتبووی: (من شانازی دەکەم ببمە خزمەتکاری شوفێرەکەت، بەڵام خۆم تەرخان ناکەم بۆ جەنگی برا عەرەبە مسوڵمانەکان)[556]، ئەگەر ئەو قسەیە راست بێت ئەوە دیارە، کە شێخ ئەحمەد لە شوێنێك ئەو قسەی کردووە متمانەی بەخەڵکەکەی نەبووە وای داناوە، کە بەکرێگیراوی ئینگلیزن، ویستویەتی پەیامێك بداتە ئینگلیز کە دوورە لە بزوتنەوەکەی شێخ مەحمود، یان دەگونجێت شتی وا هەر نەوترابێت، هەتا ئێستا کەس ئەو نامەی نەدیوە، ئەگەر نامەی ناردووە، یان بەزارەکی بووە یا نا؟ ئێمە زیاتر لە شاهیدێکمان نییە گوێبیستی ئەو قسەیە بووبێت، بەڵام ئەفسەرە هەواڵگرییەکانی بەریتانی لەکوردستان تێبینی چەندان جار پەیوەندی نێوان شێخ ئەحمەدو شێخ مەحمودیان کردووە، کۆمیساری باڵای بەریتانی لە بەغدا لە هەواڵێکیدا دەریخستووە، کە شێخ مەحمود داوای لە شێخ ئەحمەد کردووە پشتیوانی لێ بکات بۆ پرۆژەی دەوڵەتی کوردی، دەڵێ: ئینگلیز بەنهێنی پاڵپشتی لێ دەکەن، کۆمیساری باڵا ناچار بووە نامەیەك بۆ شێخ ئەحمەد بنێرێتو پێی رابگەنێت، کە ئەو پڕوپاگەندەیەی شێخ مەحمود بنەڕەتێکی نییە[557]. لە نامەیەکی هەواڵگری بەریتانی لقی سلێمانی دا هاتووە، کە شێخ مەحمود نامەیەکی بۆ شێخ ئەحمەد ناردووەو داوای لێ کردووە بە زوویی بۆ راگەیاندنی شۆڕشی کوردی ببزوێ[558]، ئەو پەیوەندییانە بەردەوام بووە هەتا شێخ مەحمود بە رێگەی قادربەگی سەرۆکی هۆزی خۆشناو لە شەقڵاوە نامەیەکی بۆ شێخ ئەحمەد ناردووە، ئەویش نامەکەی گەیاندۆتە بارزانو لە ڕێگەی میرزایەکەی بە ناوی رەسوڵ عەلی ئەفەندی وەڵامی لە شێخ ئەحمەدەوە بەئەرێیی وەرگرتۆتەوە، لە ئازاری ساڵی 1931 شێخ ئەحمەد نامەیەکی بە"خالیس بەگی حەیدەرانلی"دا ناردووە بۆ ئەوەی بەنهێنی چاوی بەشێخ مەحمود بکەوێ بۆ ئەوەی وتووێژ بکەن لە بابەت ئەو بزاڤە کوردییەی شێخ مەحمود سەرکردایەتی دەکات، لە دوای گەیشتنی خالیس بەگ شێخ مەحمودیش هەریەك لە قالە کۆرو سەعید دەنێرێ بۆ

---

[556] - معروف جیاوك، مأساة بارزان، ص9 .

[557] - CO, 163/5 144637 (Extract from Intelligence Report) No, 5 March 4, 1931

[558] - CO, 163/5 144637 (Air Staff Operation & S.S.O. February 4, 1930 Sulaimani (Southern Kurdistan(

لای شێخ ئەحمەد هەتا لە بابەت ئایینده‌ی بزاڤی کوردەوە گفتوگۆ بکەن[559]. توێژەر هەتا ئێستا ناوەرۆکی ئەو نامانەی نەدیوە بەلاّم ئاگادارین شێخ ئەحمەد بەشداری شۆڕشی شێخ مەحمودی نەکردووەو هۆکارەکانی دیار نین، لەوانەیە بگەڕێتەوە بۆ سووربوونی بەریتانیا لە دابڕینی شێخ ئەحمەد لە سێیەم جولاّنەوەی شێخ مەحمود، بەلاّم بە هەمیشەیی ئەفسەرەکانی بەریتانی ئامۆژگاری فەرماندەکانی سوپای عێراقیان کردووە پێش ئەوەی دەست بگرن بەسەر جولاّنەوەی شێخ مەحمود، ڕێگەنەدەن بارودۆخ لە بارزان بتەقێتەوە، چونکە سوپای عێراقی توانای نییە لە یەك کاتدا لەو دوو بەرە شەڕ بکات، دەگونجێت شێخ ئەحمەد چاوەڕوانی دەرفەتی کردبێت بچێتە پاڵ شۆڕشی کوردی لە دوای گەیشتنی شۆڕش بە لیوای هەولێرو بادینان، کە وەکو بەدیارکەوت ئەوەش نەهاتەدی، ئەو پەیوەندییە زۆرانەی نێوان ئەو دوو شێخە بەڵگەی بۆچوونو متمانەی هاوبەشی نێوانیان بووە.

شێخ ئەحمەد بەتەنیا بایەخی بە بزاڤی کوردی کوردستانی عێراق نەداوە، بەڵکو بارزان جێگەی دالّدەی هەموو ئەوانە بووە، کە بەشداری بوون لە بزاڤی کوردایەتی، شێخ ئەحمەد هەموو پشتیوانییەکی لێکردوون، لە ڕاپۆرتە هەواڵگرییەکانی بەریتانیدا هاتووە، کە لەدوای کوشتنی سمکۆ لە نیسانی ساڵی 1931 شێخ ئەحمەد سەرۆکایەتی کۆبوونەوەیەکی کردووە بۆ سەرۆکە کوردەکان لە بارزان، لەوێدا خێزانی سمکۆو خەسرەوی کوڕی سمکۆو فارس ئاغای زێباریو یەکێك لە کوڕەکانی سیتۆ ئاغای وارماری "سیتۆ سەرۆکی هۆزی وارماری کوردستانی تورکیای هاوسنووری بارزان" ئامادەی بوون.

شێخ ئەحمەد بەڵێنی داوە 400 جەنگاوەر بنێرێ لەگەڵ ناردنی نامە بۆ سەرۆکە کوردەکان بۆ پاڵپشتی شۆڕشی کورد لە ئێران، لەناویاندا سەید موحسینی برای سەید تەها داوای لێ کردووە پشتیوانی لەشۆڕش بکەن لەکوردستانی ئێران بۆ تۆڵەسەندنەوەی خوێنی سمکۆ[560].

---

[559] - Air 23/311 1445295 Intelligence Report No, 3.March 17, 1931

[560]-CO. 730/161/1 144272 (Extract from Intelligence Report), No, 7.April, 1, 1931, Aor 23/311 1445295 , S.S,O, Mosul to Aviation to Baghdad No, Y, 202 August 13,1930 .

شێخ ئەحمەد رۆڵی گرنگی گێڕاوە لە پاڵپشتی شۆڕشگێڕانی ئێران لە رووی مەعنەوەیو سەربازی، کوردە بارزانییەکان خزمەتێ گەورەیان کردووە، بارزان ببووە شوێن دالّدەی شۆڕشگێڕان، لە مانگی ئابی ساڵی 1930 شێخ ئەحمەد 100 جەنگاوەری بۆ پشتیوانی شۆڕشگێڕانی وارامار ناردو بەشدارییان لەشەڕ کرد، هەروەها لە ئەیلولو تشرینی یەکەم چەندان جەنگاوەری نارد بۆ بەشداری شەڕ، کۆبوونەوەی بەسەرۆك هۆزەکانی بادینان کرد، جەختی کردەوە لەسەر پاڵپشتی کردنی شۆڕشگێران، لە تشرینی یەکەمی ساڵی 1930 [561]، لەو کاتەی هێزەکانی تورکیا لە سنووری کوردستانی باشوور نزیك ببوونەوە، شێخ ئەحمەد کۆبونەوەیەکی تری بەست بۆ پاڵپشتی شۆڕشگێڕانو هەوڵدان بۆ راگرتنی شالاّوی تورکان. ئەو هاوپەیمانییەتیە هۆزایەتیەی بە سەرۆکایەتی ئەو 1500 چەکداری کۆکردەوە، کە 300 لەوانە بارزانی بوون[562].

لەو کاتەی شێخ ئەحمەد زانی نوح بەگی برای موسابەگ دەستی لەگەڵ حکومەتی تورکیا تێکەڵ کردووە بۆ کوشتنی کور حەسەنو خیانەتی لە شۆڕشگێڕانی ئارارات کردووە حوکمی کوشتنی داو بڕیارەکەی جێبەجێ کرد[563]، هەروەها شێخ ئەحمەد نزیکەی 100 کوردی پەناهێندەی شۆڕشگێڕانی وارامارى دالّدەدا، نامەی بۆ کەسایەتیە کوردەکانی عێراقی نارد، لەناویاندا ئیسماعیل بەگی رەواندزو سەید حیسام، داوای لێکردن پشتیوانی لە براکانیان بکەن[564]. هەندێك لەو پەناهێندانە سەرکردەی سەربازی بوون، بەشداری شۆڕشیان کردبوو ناچاربوون بێنە ناو خاکی کوردستانی باشوور، کە

---

[561]- FO, 371/16045 No, 295 (Operation Ageist Sheikh of Barzan) August 21, 1932, From G Clerk (Angora) Air 23/311 145295) 0ctober 15, 1930, H.M Burton Air Staff Intelligence, Iraq Command.

[562] -FO, 730/161/1 Intelligence Report No, 5 April 1,1931 S.S.O Mosul, CO, 730/161/1 144272 (Extract from Intelligence Report) No7,April 1,1931. Air 23/311 145295 S.S.O Mosul to Aviation Baghdad No, Y, 202 August 13,1930.

[563]-FO, 730/161/ 1 Intelligence Report No, 3 February 25, 1931 s.so, Mosul

[564] -- FO, 730/161/ 1 Intelligence Report No, 3 February 25, 1931 s.so, Mosul

یازدەیان لەلایەن دەسەڵاتدارانی حکومەتی تورکیاوە لێ لەسێدارە درابوون، کاتێك شێخ ئەحمەد چووە ناو خاکی کوردستانی تورکیا، ئەوە هەڵوێستێکی ئازایانە بووە، پێشتر حکومەتی تورکی چەندین جار سکاڵای لای حکومەتی عێراقی کردبوو لە شێخ ئەحمەد، هەروەها حکومەتی عێراقی لە ڕێگەی فشارخستنە سەر ئەفسەرانی ئینگلیز لەکوردستان هەوڵی زۆریدا شێخ ئەحمەد رازی بکات ئەو پەناهێندانە بداتە دەستەوە، هەتا بیانداتەوە تورکیا

بەو گوزارشتە ناوخۆییو دەرەکیانەی ئەو ماوە کورتەی نێوان تشرینی یەکەمی ساڵی 1931 هەتا ئاداری ساڵی 1932 حکومەتی عێراقی دەستی کرد بوو بەفشارێکی زۆر بۆ سەر شێخ ئەحمەد، هەتا رێگە بدات هێزو یەکەی عێراقی " لە پۆلیس و سوپای لێڤی" لە بارزانو دەورووبەری نیشتەجێ بن، بەڵام بێ ئاکام بوو، بەپێی ئیدارەی بەریتانی شێخ لە ڕواڵەتدا رازیبوونی خۆی نیشان دا، لە ڕاستیدا هەوڵی بۆ چەڵکردنەوەی ئەو داواکارییەی حکومەتی دەدا..

لەو بارەوە ئەنجومەنی وەزیرانی عێراقی بڕیاریدا:

(بەهۆی بەردەوامی شێخ ئەحمەد لە یاخیبوونو بەرەنگاری لەگەڵ ئەو هۆزانەی گوندەکانیان ملکەچی پێگەی ئەو نابن، هەروەها باج ناداتو نایەڵێ کارگێڕیەکی مەدەنی لە ناوچەی بارزان دابمەزرێنێت، ئەنجومەنی وەزیران لە کۆبوونەوەی رۆژی 1932/1/12ی بڕیاریدا ناحیە بۆ هەریەك لە ناوچەکانی شێروانو باروش و بارزانو مزوریی باڵا دابمەزرێنێت، لە هەریەك لەو ناوچانە بینایەك بۆ ناوەندی ناحیەو بنکەیەکی پۆلیس بۆ ئەنجامدانی چالاکی دژی شێخ ئەحمەد درووست بکات، ، هەردوو وەزارەتی بەرگریو ناوخۆ لەسەر جێبەجێ کردنی ئەو بڕیارە رێك کەوتن).

حکومەت لە نیسانی 1932 بڕیاریدا هێرش بکاتە سەر بارزان، ناجی شەوکەت وەزیری ناوخۆ بە هاریکاری ئەفسەرەکانی بەریتانی لە عێراق نەخشەکەیان دانا، بەپێی ئەو نەخشەیە دەبوایە هێرشی بەرفراوان لە سێ لاوە بکرایەتە سەر بارزان، ئەوانیش رەواندزو ئاکرێو ئامێدی، ئەو هێزەی ئامادەکرابوو نیوەی هەموو هێزی عێراقی ئەوکاتە بووە، لە بابەت ئامادەکردنی سوپای عێراقی بۆ سەر بزاڤی بارزان حەسەن مستەفا، کە ئەوکات فەرماندەی سەربازی بووە دەڵێ: "ئەو هێرشەی سێ مانگو پێنج رۆژی خایاند،

بەڵام بەرئەنجامەکانی لەوە زیاتر بوو، لەو شەڕەدا شەش تیپی پیادەو دوو "بطریتان جبلیتان"و کەتیبەیەك لە سوارە بەشداری تێدا کرد، لەگەڵ هەندێ یەکەو خزمەتگوزاری تر، کە ئەوکات نیوەی سوپای عێراقی پێك هێنابوو، کۆی بەشدارانی ئەو کردە سەربازییە پێك هاتبوو لە 205 ئەفسەرو 4437 پلەداری تر، زیانەکانی 48 شەهید بووە، کە سێ لەوانە ئەفسەر بوون، لەگەڵ 78 بریندار، ئەمە بێجگە لەو زیانانەی لە ڕیزی پۆلیس کەوت، لەکاتێکدا زیانی یاخیبوان گەیشتە 350 کوژراوو بریندار، سوپای عێراقی توانی سەرکەوتنی تەواو بەدەست بخاتو ئامانجی حکومەت بە زیانێکی کەم کۆتایی هات)[565].

هێژا مەسعود بارزانی وێنەیەکی تەواو جیاوازمان دەداتی لەسەر ئەو واقیعە، کە لێرەدا هەندێکی لێ وەردەگرین: (لە10/ 1932/3 وەزارەتی ناوخۆ بەر لە 14/ 3/ بۆ بەدیارخستنی گویڕایەڵی بۆ حکومەت ئاگادارکردنەوەیەکی دابووە شێخ ئەحمەدی بارزانی، کە لەبەردەم قائیمقامی زێبار ئامادە بێت، هاوکات حاکمی سیاسیی بەریتانی نامەیەکی زارەکی هاوشێوەی بۆ شێخ ئەحمەد نارد، شێخ رازی نەبوو، چونکە بەتەواوی دەیزانی دەیگرن، زانیاری لەلابووە لەسەر مەبەستی حکومەت، بارزانییەکان لەلای خۆیانەوە پلانو ڕێوشوێنی ئامادەکاری خۆیان هەبووە بۆ پوچەڵکردنەوەی دوژمنکاری، هێزەکەیان کردبووە سێ بەش، بەم شێوەیە: هێزی سەرەکی بەسەرۆکایەتی مەلا مستەفا بارزانی، بۆ بەرگری لە بەرەی مێرگەسوور – شێروان، بەرانبەر هێرشی لیوای عێراقی هێرشبەر بەناوی "دای".

هێزێکی تر بەسەرۆکایەتی موحەممەد سدیقی بارزانی بە یاریدەدەریەتی حاجی تەهای ئامێدی بۆ بەرەی باڵندە– ئامێدی، بەرانبەر رەتڵی بۆل.

شێخ ئەحمەد هێزێکی بەسەرپەرشتی خۆی هێشتەوە بەرانبەر ئەو فەوجەی لە بلەی نیمچە گەمارۆدراو بۆ ڕێگەگرتنی پێرس بەرانبەر ئەو هێزە یەدەگەی لە ئاکرێوە دەهات.

هیزی بارزان لە 1000 چەکدار تێنەدەپەڕی، چەکی جۆراوجۆریان پێ بوو، "ماوزەڕ، جامبێز، ئینگلیزی، هەندی رەشاشی لوەیس، کە بەدەستکەوت گرتبوویان لە شەڕی هێزەکانی حکومەت لە 1931/12/9. گومان هەبووە لەسەر کەمی تەقەمەنیو

---

[565] – حسن مصطفى: البارزان و حركات بارزان 1932- 147، بيروت، دار الطليعة، 1963، ص49

تاكە سەرچاوەی ئەوان دەستکەوتی شەڕەکانی رابردوو بووە، یەکەم شەڕ لە3/8/ لە دەروبەری گوندی "کورکێ"ی رۆژهەڵاتی میرگەسوور روویدا، یەکەکانی هێزی "دای" پێشڕەویان کرد بەرەو ئەو شەڕگەیەی بەرانبەریان، هێزێکی بارزانییەکان بەسەرۆکایەتی "ئەحمەد نادر" لە دوای شەڕێکی توند شکاندیانن، هێزی "دای" کشایەوە بۆ مێرگەسوورو لە دوای خۆی ژمارەیەك لاشەو تەقەمەنی لێ بەجێ ما، بۆ تۆڵەسەندنەوەی ئەو تێشکانەو بەرزکردنەوەی ورەی هێزەکانی چەکی ئاسمانی مەلەکی بەریتانی "F.A.R " لە رۆژی 4/19 بەشداری کردو زۆربەی گوندەکانی بارزانی بۆردومان کرد، بەتایبەت ناوەندی بارزان.

لە شەوی 3–4ی نیسان بارزانی هەموو هێزی شەڕگەکەی کۆکردەوەو هێرشێکی توند دەستی پێکرد بۆ سەر "رەتڵی دای" کە گەیشتبووە بیرسیاف، توانی لە هێزی شەڕگەکانی تری دابڕێ، دوای شەرێکی دەستەویەخە بەتەواوی دەستی بەسەر رەتڵەکە داگرت، ژمارەیەکی کەم نەبێت، کەس رزگاری نەبوو، ژمارەیەکی زۆر کە دەگەیشتە "253" کوژراوو ژمارەیەکی زۆر بریندار، دەستگیرا بەسەر زۆربەی چەك و کەرەستەکانی رەتڵەکە، بەو شەڕە مێژووییە دەوترا شەڕی "دۆڵا باڤی" یەکێکە لە شانازییەکانی بارزانییەکان، هەڵبەستو گۆرانی میللی بەسەردا وتراوە[566]. ژەنەراڵی بەریتانی روبنسون بۆ خۆی سەرپەشتی ئەو شەڕەی کردووە، لە دواوەی بەرەی جەنگ بوو، کاتێك رەتڵی "دای" هەڵاتن پێشەنگی هێزەکانی بارزان گەیشتنە بارەگای رۆبنسۆن، هەروەها لەو شەڕەدا رۆبنسۆن بریندار بوو، بەڵام ئەوکات بارزانییەکان بەوەیان نەزانیبوو، دەستیان بەسەر تەواوی کەرەستەکانی بارەگاکەی داگرت، رێگەیان بە برینداره‌کاندا بگەڕێنەوە مێرگەسوور بۆ بارەگای "دای"، هاوکاری ئەوانەییان کرد کە ناتوانن بڕۆن هەتا گەیشتنەوە بارەگای مێرگەسوور[567]. ئار، لۆ دلۆ هیوت فەرماندەی ئاسمانی هێزەکانی مەلەکی – لقی عێراق راپۆرتێکی تیروتەسەلی نووسیووە لەسەر ئەو شەڕانەو لەو خاڵانەی خستوویە ڕوو کۆکە لەگەڵ ئەوەی هێژا مەسعود بارزانی، بەڵام

---

[566] - البارزاني و الحركة التحررية الكردية، انتفاضة بارزان الاولى، كوردستان 1986،ص34-36

[567] - هەمان سەرچاوە، ل36-38

هەوڵی داوە هەر چۆنێك بێت لە قورسایی تێكشكانی هێزەكانی عێراقی كەم بكاتەوەو لەوێدا باسی برینداربوونی مێجەر روان رۆبنسۆن نەكراوە[568].

ئاكامی ئەو شەڕە وەكو هەورە تریشقە وابوو بۆ سەر ئینگلیز و كرێگرتەكانی، هەرچەند هەوڵیان دا هێزی "دای" بەهێزی تری بەهێز بگۆڕنەوە لەكەركووكو بەغداوە هێزیان نارد بەڵام بێئاكام بوو، نەیانتوانی لەو شەڕگەیەوە هیچ هێرشی تر بكەن، بەشەو رۆژ پەنایان بردە بەر بۆردومانی دڕندانە، دوایی چەند هیرشی تریان كرد، بەڵام بەپێچەوانەی پڕوپاگەندەی فەرماندە سەربازییەكانی عێراق هەموو لە بەرژەوەندی بارزانییەكان كۆتایی هات. بە ناچاری ئینگلیز قەناعەتی كرد سوپای عێراقی ئەو توانایەی نییە بارزانییەكان بشكێنێت، بۆیە هەوڵیدا سوود لە هەوڵەكانی شێخ بەهائەدینی بریفكانی وەربگرێ بۆ ناوبژیوانی لەگەڵ شێخ ئەحمەد بۆ ئەوەی بەئاشتی ملكەچی بۆ حكومەتی عێراقی رابگەیەنێ.

شێخ نورەدین هاتە لای شێخ ئەحمەد، هەواڵی دایە، كە حاكمی سیاسییو موتەسەڕیف رازین بێنە ناوچەكە بۆ گفتوگۆ بەمەرجێ لەگوندی "هوستان" كۆببنەوەو ئەویش بەتەنیا بەسێ پاسەوانەوە ئامادە بێت.

شێخ ئەحمەد وڵامی دانەوە، كە متمانەی بە ئینگلیز نییەو لەسەر ئەو مەرجە رازی نییە، یان ئەوەتە كۆبوونەوەكە دوور بێت لە شوێنی سوپا یان چەندی حەز بكات جەنگاوەران دێنێت بۆ ئەوەی دڵنیا بێت لە سەلامەتی خۆیو زوڵمی لێنەكەن، ئەگەر بەو دوو مەرجەش رازی نەبن ئەوە گفتوگۆ نابێت. شێخ دڵنیایی كردنەوە، كە بارزانییەكان ئامادەن درێژە بەجەنگو بەرگری بدەن، ئەگەر زۆری بۆ بهێنن عێراق بەجێ دیلێنو سەر بۆ ئینگلیز شۆڕناكەین، شێخ نورەدینیش كە نیشانەی تۆڵەو ئازاری پێوە دیاربوو، پێی وت: (ئەی سەماحەتی شێخ، هەستو سۆزمان لەگەڵ ئێوەیە، بەڵام تێناگەم چۆن دەتوانن بەرهەڵستی حكومەتی بەریتانیا بكەین، كە نیوەی گۆی زەوی لەبەردەست دایە، وێرانمان دەكەن، با ئەمری واقیع قبوڵ بكەینو چاوەڕوانی كاری خوا بین).

شێخ ئەحمەد وڵامی دایەوە:(سوپاسی سۆزی پاكیتان دەكەم، گومان نییە بۆ نییەت پاكیو راستگۆیی ئێوە، بەڵام هەتا ئەگەر رازیش بن بەگەڕانەوەمان بۆ بارزانو چەكیش

[568] - CO, 730/174/37 Extract from Personal Letter No, S/10371 April 6,1932.

دابنێین‌و بگەڕێینەوە بۆ سەر کاروباری خۆمان، ئینگلیز هەرگیز لێمان قبوڵ ناکات، دەیانەوێت واز لە ماف‌و بیروباوەڕی خۆمان بهێنین، ئەوانە دوژمن بەخاکمان‌و دوژمن بەئاییمانن. دەزانم بە هۆزێکی بچووکی وەکو بارزان بەرهەڵستی هێزی بەریتانیاو تورەیی ئەوان ناکرێ، بەڵام ژیان هەڵوێستی شەرەفمەندانەیە دەمانەوێت خواو ویژدانی خۆمان رزگار بکەین، ئەوەی لام گرنگە بۆ مێژوو تۆماری بکەم بەلایەنی کەمەوە بتوانین شەڕی بەریتانیاو بەکرێگیراوەکانی بکەین، کڕنووشیان بۆ نەبەین، ئینگلیز دەتوانێت گوندەکانمان بسووتێنێت‌و وێرانی بکات، دەرمان بکەن‌و بمانکوژن، بەڵام ناتوانێت بمان کڕن، تا ماوین دوژمنکاری دەکەین، ئەوە بڕیاری ئێمەیەو لێی پەشیمان نین، دەتوانی وەکو خۆی بۆ ئینگلیزی بگێڕیەوە)[569].

لەو قسانەوە جدی‌و مەبدەئی‌و خۆنەویستی شێخ ئەحمەد لە پێناو کوردایەتی دیارە، ئاکامی سروشتی رێبازی سۆفیگەری شۆرشگێڕو بەرهەمی پەروەردەی رێبازی سۆفیگەری بارزانییەکان بووە، لەو پێناوەدا بۆ ماوەی 11 ساڵ ئازارو ئەشکەنجەو هەژاری زۆریان چێشتو، لە دوورخستنەوە بۆ تورکیا و ناسریە و حیلە و کەرکووك.

لە6/22 شێخ ئەحمەد ناچار بوو بەخۆی و بە برایەکانی‌و وەلی بەگ‌و ژمارەیەك لە پیاوەکانی بچێتە ناو سنووری تورکیاوە، بەپێی رێککەوتنێکی پێشووتر نزیکەی 250 چەکدار لە ناوچە شاخاوییە سەختە سنوورییەکان مانەوەو ئەندازەیەك چەکیان شاردەوە، بەماوەیەکی کەم مەلا مستەفاو خەلیل خۆشەوی گەڕانەوە بۆ شەڕی پارتیزانی‌و زیانی زۆریان لە هێزەکانی حکومەت دا. ئینگلیزو حکومەتی عێراقی سکاڵایان لە حکومەتی تورکیا کرد، تورکیا هەتا شۆڕشگێڕانی لە سنوور دوورخستەوە.

شۆڕشگێڕان بۆ ئەدەنە دوورخرانەوە، دوایی دەسەڵاتدارانی تورکی بە رێگەی "کفر ـ وان" گواستیاننەوە بۆ ئەرزڕۆم، لەوێوە شێخ ئەحمەدو حاجی تەهای ئامیدیان گواستەوە بۆ ئەنقەرە. خێزانەکانیان گواستنەوە بۆ ئەزرۆم، لە ڕێگا خێزانەکانیان لە یەکتر جیاکردەوە، لە ناویاندا خێزانی شێخ ئەحمەدو موحەممەد سدیق‌و بابۆو مەلا مستەفاو براکانی‌و کوڕەکانی شەهید عەبدوسسەلامی براگەورەیان، لەگەڵ وەلی بەگ‌و خێزانی‌و دە لە خێزانەکانی تر لە ناویاندا خێزانی حاجی عەبدوڵڵای ئامێدیان گواستەوە،

---

[569] - مسعود البارزاني: انتفاضة بارزان الاولى،ص41-42

بەڵام ئەوانی تریان هەموو کۆکردەوەو پێچەوانەی ئەو بەڵێنەی دابوویان دایاننەوە دەست کاربەدەستانی عێراقی. حکومەتی عێراقی ئەوانەی وەرگرتەوەو بەبێ هیچ کێشەیەك رەوانەی گوندەکانی خۆیانی کردنەوە.

ئەو دوو راپۆرتەی نووسرابوو لەلایەن کۆمیسۆنی باڵای بەریتانی لە عێراق و فەرماندەی هێزی ئاسمانی بەریتانی ـ لقی عێراق ـ لەسەر شەڕەکانی بارزان بە ئەندازەیەکی باش جەخت دەکەنەوە سەر نووسینەکەی مەسعود بارزانی. کۆمیساری باڵا لە ڕاپۆرتەکەی ناوبراودا دەڵێت: (پێویستە هێزەکانی بەریتانی لە عێراق لەو شەڕانە رۆڵی ناسەرەکی بگێڕن، بەتەنیا بە بۆردومانی ئاسمانی بەشداریی لە چالاکییە سەربازییەکاندا بکەن دژی شێخ ئەحمەد، ئەگەر نا هێزەکانی عێراقی زیانی زۆریان لێدەکەوێتو مەعنەویاتیان دەڕوخێ، بەتایبەتی ئەفسەرەکانی سوپای عێراقی، چونکە زۆربەی ئەوانە جیلی کۆنی سەردەمی عوسمانینو باش دەزانن کاتی خانەنشین کردنیان نزیك بۆتەوەو لە جیاتی ئەوان ئەو ئەفسەرە تازانە دادەنرێن کە لەسەردەستی ئیدارەی بەریتانی مەشقیان پێکراوە، کارەسات روو دەدات ئەگەر هێزەکانی بەریتانی راستەوخۆ لە ڕووی رێنوماییو سەرپەرشتی ئەو هیزانەی بەرەکانی شەڕ و چالاکییە ئاسمانییەکان چڕ بکەنەوە)[570].

هەروەها هێزەکانی بەریتانی حکومەتەکانی ئێران و تورکیایان رازی کرد هێزی سەربازی بنێرن بۆ ناوچە هاوسنوورەکان هەتا شێخ ئەحمەد لە هەموو لایەکەوە هەست بەگەمارۆدراوی بکات، لەگەیشتنی هاوکاری لە دەرەوەی سنوور هیوا بڕا ببێتو ئومێدی بە پاشەکشە نەبێت بۆ کوردستانی تورکیا یان ئێران[571].

سەرەڕای پاڵپشتی بێ سنووری ئیدارەی بەریتانی بۆ حکومەتی عیراقی لە ناکۆکیەکانی بارازن، حکومەت بە تایبەتی عەسکەرییەکان لەو بڕوایەدابوون ئینگلیز بە

---

[570]- CO, 730/174/11 144637 Extract from Personal Letter No, S/10371 Dated April 28,1932, From Humphreys to Sir John Salmond Chief of Air Ministry. 16045, No, 995, (Operation Agaist Sheikh of Barzan) by Major Gen, Rowan. Robinson October 12,1932.

[571] – FO, 731/16o45 Despatch. Ministry of Foreign of Affairs, Baghdad to Iraqi Legation Ankara , CO, 730/6045 No, 955 (Operation Agaist Sheikh of Barzan) by Major Gen Rowan Robinson October 12, 1932.

ئەنقەسەت شەڕەکان درێژ دەکاتەوە بۆ ئەوەی خۆی بخافڵێنێت لەبەرانبەر بەرپرسیاریەتی مەسەلەی عێراق لەکۆمەڵەی گەلانو دەرچوونی ئینگلیز لەو وڵاتە، لەکاتێکدا چالاکیە سەربازییەکان شەش رۆژی خایاند، فەرماندە سەربازییەکان دەیانویست لێرەو لەویَ ئەو پروپاگەندانە بکەن: "ئەگەر پرسی بەریتانییەکان نەبوایە دەتوانرا بۆ ماوەی چەند هەفتەیەك کۆتایی بەشەڕەکانی بارزان بهێنرێت"، نیگەران بوون لە هەوڵی ئەفسەرەکانی ئینگلیز لە دانانی هەندیَ پرنسیپ بۆ فەرماندە سەربازییەکانی عێراقی لەمامەڵە لە گەڵ ئەو هۆزە کوردیانەی پەیوەندیان پێیانەوە هەبووە لەگەڵ ڕێگەنەدان بە بۆردوومانی کوێرانەو سزای بە کۆمەڵ دژی گوندنشینەکان[572].

ئەفسەکانی ئینگلیز دوودڵ بوون لەدەست واڵاکردنی فەرماندە سەربازیو ئیدارییەکانی عێراقی لەگرتنە بەری ڕێوشوێن دژی گوندنشینەکان بەبیَ جیاوازی، ئەوە دەبووە وورووژاندنی کوردانو هاوکاری بۆ شۆڕشگێڕان، بە تایەت هۆزە بێلایەنەکان، دەسەلاَتی سیاسیی بۆ بارزان لە بندەستی کابتن لایەن ئەفسەری سیاسیی بەریتانی لە هەولێر دابووە[573]. هەر کە چالاکییە سەبازییەکانی سەر بارزان درێژ بۆوە، سیاسییو پەرلەمانتارە عێراقیەکان لە بەغدا بەتایبەت بەرهەڵستکارە ناسیونالستە عەرەبەکان، ئەو دروشمەیان دەوتەوە، کە ئینگلیز بەم دواییە نەوتی تازەی دۆزیوەتەوەو عێراق بەجیَ ناهێڵێت، لە هەوڵدایە جوڵانەوەی بارزان بکاتە پاساوی مانەوە لە عێراق. هەتا هەندیَ لەوانە دەیانوت فڕۆکەکانی بەریتانی بەنهێنی چەكو خواردەمەنی فرێداوەتە خواریَ بۆ شەرمەزارکردنو بەدیارکەوتنی لاوازی هێزەکانی عێراقی[574].

[572]-United State Sate Department Confidential U.S Central Fiiles, Dispatch N0, 605 May 6,1932, Confidential U.S, Department post Records Ser No, 172, June 2, 1932, (Campaign Ageist Sheikh Ahmad and Public Opinion) U.S, Legation. Baghdad.

[573] --CO, 730/6045 No, 955 (Operation Agaist Sheikh of Barzan) by Major Gen Rowan Robinson October 12, 1932.

[574]- CO, 730/6045 No, 955 (Operation Ageist Sheikh of Barzan) by Major Gen Rowan Robinson October 12, 1932.

ئەگەر بمانەوێ جولاّنەوەی شێخ ئەحمەد هەڵبسەنگێنین لە پێش هەموو شتێك دەبێت ئاگادار بین کە راستە بارزانییەکان هێزێکی لێدانیان پێك هێنابوو، بەلاّم بەڵگەمان هەیە پێش ئێستا خستمانەڕوو، کە شێخ ئەحمەد درێژەپێدەری ئەرکەکانی شێخ عەبدوسسەلامی بارزان بووە، لە گۆڕینی بارزان بۆ ناوەندێکی پێشەنگی کوردایەتی، بەتەنها شەڕ نەبووە بۆ مانەوەو ناکۆکی هۆزایەتی لە دژی دەسەلاّتی ناوەندی، ئەگەر لایەنێکی ئەو رەهەندەش لەخۆ بگرێت.

ئەفسەرانی ئینگلیز لەکاتی نەخشەی لێدانی جولاّنەوەی شێخ ئەحمەد دەیانوت "لێدانی جولاّنەوەی شێخ ئەحمەد دەبێتە کۆتایی جولاّنەوەی کوردایەتی لە عێراق"[575]، بەلاّم رووداوەکانی دواتری سەدەی بیستەم ئەوەی بەدیارخست، کە لەناوچوونی جولاّنەوەی شێخ ئەحمەد جولاّنەوەی کوردایەتی بۆ ماوەی دە ساڵێك دواخست، بەلاّم دواتر گەشەی سەندو راست دەرنەچوو.

بەکورتی سیاسەتی بەریتانیو بەرژەوەندییە ئیمپریالیستیەکانی لە رۆژهەلاّتی ناوەڕاست گرنگترین هۆکاری کاریگەربوون لەسەر جولاّنەوەی کوردی ساڵانی 1930-1932، دەسەلاّتدارانی بەریتانی دەیانویست حوکمی زاتییەکی سنووردار وەکو ئەوەی لە رێککەوتنی کۆتایی کێشەی موسڵی ساڵی 1925 دا هاتووە جێبەجیّ بکەن.

پیادەکردنی ئەو سیاسەتەش رووبەڕووی کۆسپی گەورە دەبۆوە: بەرپرسانی بەریتانی لەسەر شریتی پاڵەوان هەنگاویان هاویشتووە لە هاوسەنگی راگرتنی نێوان خواستی نەتەوەخوازانی کورد بۆ سەربەخۆیی "لە ئاکامی تێگەیشتنی هەڵە بۆ بڕیاری کۆمەڵەی گەلان لەسەر کورد لە میانی کێشەی موسڵ"، لەنێوان نەتەوەخوازانی عەرەب ئەوانە بە چاوی گومانەوە دەیانڕوانییە ئامانجەکانی سیاسەتی بەریتانی لەکوردستان، کۆسپیان دەخستە بەردەم سادەترین مافی روشنبیری بۆ کورد کە بە بڕیاری کۆمەڵەی گەلان پێیان درابوو، لەلایەکی ترەوە دەسەلاّتدارانی تورکیو ئێرانی فشاریان دەخستە سەر دەسەلاّتدارانی بەریتانیو عێراقی هەتا لەوە زیاتر سازش بۆ کورد نەکەن.

575 - CO, 730/11 144637 April 4,1932, A.O.C (Situation.

## بەڵگەنامە

**نامە بۆ: هێژا ونستۆن چەرچڵ ـ وەزیری دەوڵەت بۆکاروباری داگیرگەکان، داوننگ سەتریت، لەندەن.**

.CO|370|157|7

زۆر نهێنی

ژمارە 3031– 20 ئەیلولی 1930

بۆ سەعادەتی وەزیر Plenipotentiary و کۆمیساری باڵای باڵیۆزخانەی عێراق لە ئەنقەرە–تورکیا.

دانەیەکتان لەو بیرخەرەوەیە بۆ دەنێرم، کە گفتوگۆی نێوان سەرۆکوەزیرانی "عێراق"و عیسمەت پاشا "سەرۆك وەزیرانی تورکیای جێگری مستەفا کەمال"و هێژا تۆفیق روشدی بۆ چەند بابەتێکی جێی بایەخی ئێوە ئەنجام دراوە.

واژۆ/ نوری سەعید

وەزیری عێراقی بۆ کاروباری دەرەوە/ بەغدا.

20/ئەیلولی 1930

## وەزارەتی کاروباری دەرەوە- عیێراق. زۆر نهێنی

بەغدا/ No .3032

20 ئەیلول 1930

دانەیەك بۆ ئاگاداریتان/ سەرۆکی دیوانی پاشایەتی

وەزارەتی ناوخۆ

راوێژکاری سیاسیی– نوێنەرایەتی باڵا

واژۆ. نوری سەعید

وەزیری کاروباری دەرەوە

## بیرخەرەوەیەك دەربارەی وتوێژەكانی ئەنقەرە لە نێوان نوری سەعید پاشاو سەرۆك وەزیرانی توركیو وەزیری كاروباری دەرەوە

لەگفتوگۆكانم لەگەڵ عیسمەت پاشاو دكتۆر تۆفیق روشدی جەختم لەسەر سێ تەوەرە كردەوە، كە دەتوانم بۆ ئەم خاڵانەی خوارەوە كورتیان بكەمەوە.

1: مەسەلەی ئەرمەن لەسەر سنووری عێراقی - توركیو پەیوەندی بە رێككەوتنی سێ قۆڵیەوە: وادیارە توركیا زۆر سوورە لەسەر ئەوەی دەرفەت نەدات بە خراپەكارانی ناوچەی ژێردەسەڵاتی شێخی بارزان لەكاری دوژمنكاری، سەرم سوڕما ئەوانە هێندە سوور بوون لەسەر ئەو بابەتە، چونكە باش دەزانم شێخی بارزان ماوەیەكی زۆرە پشتیوانیو چەك لە هەرێمەكانی سنووری توركیاوە وەردەگرێ، عیسمەت پاشا پرسیاری لێكردم كە ئایا بەڵگەم پێیە بۆ پشتیوانی ئەوان لە شێخی بارزان، یان هەر تەنیا قەناعەتێكە؟ وتم: بەڵگەم پێ نییە، بەڵام هەندێ هۆكار هەن ئەو باوەڕەیان لادرووست كردووین، وتم: هەندێ سەرۆكهۆزی كورد لە پەنا دەسەڵاتداریەتی توركی هاوكاری دەنێرن بۆ شێخ ئەحمەدی بارزان. پێشنیارم كرد كە حكومەتی عێراقی هیچ رێوشوێنێك دژی شێخی بارزان ناگرێتە بەر، هێزەكانی تورك لەسەر سنوور یاخیبوان دەگرنو دەیاندەنەوە دەست دەسەڵاتدارانی عێراقی، سوپاسم بۆ ئەم ئامادەییە، ئەگەر حكومەتی عێراقی رێوشوێنی چاوترساندن دژی شێخی بارزان بگرێتەبەر، ئەوە وەرزی بەهار گونجاوە نەك وەرزی پاییز، چونكە لەم وەرزەدا باران زۆر دەبارێو رێگاوبان ناخۆشەو شوێنە دوورەدەستەكان ئەوكات ناگەڕێنەوە بندەستی دەسەڵاتی ناوەندی. هەموو ئەو هۆكارانە رێگرن لەبەردەم حكومەت بۆ ئەنجامدانی چالاكی سەربازی پێویست، لەو كاتەی چالاكی سەربازی دەست پێبكرێ، بەهۆی ئەو هۆكارانەوە چالاكیەكان رابگیرێ، ئەوە بارەكە ئاڵۆز دەبێتو چالاكیە سەربازیەكان درێژ دەبێتەوەو سەركەوتن ئەستەم دەبێت. لە ئەیلولی 1930 هەڵسوڕاوی كاروباری توركی پەیوەندی پێوەكردم هەتا هەواڵم بداتێ كە چالاكییە سەربازییەكانی ئەم دواییە دژی هەڵگەڕاوە كوردەكانی ئارارات كۆتایی هاتو ئێستا هێرش بەرەو ناوچەی رۆژئاوای دەریاچەی وان دەستی پێكردووە، ئومێدم وایە بەزوویی كۆتایی بێت، دوایی هەڵسوڕاوی كاروباری توركی پێی وتم: بابەتی گرنگ ئامادەكاری هێزەكانی توركیایە لەسەر سنوور بۆ

دەستپێکردنی چالاکییە سەربازییەکان دژی شێخی بارزان، سوپاسم کرد بۆ ئەو کارەو دڵنیایم دایە ئێستا لەبەر ئەو هۆیانەی روونم کردەوە بیرۆکەی هێرشی لەو جۆرەمان نییە، بەڵام ئەگەر حکومەتی عێراقی بڕیاری ئەو چالاکییە سەربازییانە بدات مانگی مایس گونجاوترین کات دەبێت.

2: مەسەلەی نەوت: بۆ وەڵامی ئەو بیرخستنەوەی حکومەتی تورکی دابوویە هەریەك لە وەزارەتی دەرەوەی بەریتانیو حکومەتی عێراقی، لەسەر ئەو بابەتە سەرۆك وەزیرانی تورکی کۆمەڵێك پرسیاری لێکردم، منیش هەڵوێستی خۆمانم بۆ روونکردنەوە، پێم وتن من هەندێ مەرجی زیادەم لەسەر کۆمپانیای نەوتی بەریتانی داناوە، ئەوەی بەر لە چالاکی پاڵاوتن لە پێشەوە هەندێ پارە بدرێ، ناوچەی ئیمتیازاتی نەوت ئەمڕۆ زۆر لەوەی کۆن کەمترە، هەتا حکومەتی عێراقی خۆی دەتوانی بە سوودێکی کەمتر نەوت دەربێنێو بیپاڵێوێ بە بەراورد لەگەڵ ئەوەی عێراق بەهۆی کۆمپانیای بەریتانییەوە بەدەستی دەهێنێت. بەئاشکراو بەتەواوی بۆ حکومەتی تورکیم روونکردەوە، کە لە رووەوە بەرژەوەندی حکومەتی عێراق لە دەرهێنانی نەوت زۆر زیاترە لەوەی بەرژەوەندی تورکی، بۆیە حکومەتی عێراقی بۆ بەدیهێنانی ئەو مەبەستە بەهەرچی لە توانایدایە دەیەوێ بەزوویی بیگۆڕێ.

3: مەسەلەی رێککەوتنامەی ئابووری نێوان عێراقو تورکیاش هاتە گۆڕێ، بە سەرۆکی وەزیرانی تورکیم وت: ئەو پرۆژەیەی بەم دواییە رێکخرا پێش پێنج مانگ درایە حکومەتی تورکی بەڵام وادیارە بەرێوەبەرایەتیە پەیوەندیدارەکان لە ئەنقەرە نەیانتوانیوە وەڵامێکی کاریگەر بۆ ئێمە ئامادە بکەن. وەزیری تورکی سوور بوو بۆ زیادکردنی بەندێکی تر بۆ ناوەرۆکی رێککەوتنامەکە کە پەیوەستە بەمافی نیشتەجێبوون، منیش بەڵێنم پێدا هەر بگەڕێمەوە بەغدا لەو بابەتە دەکۆڵمەوە و وەڵامیشت دەدەمەوە. هەروەها دەمەوێ ئاماژە بدەم، کە کاتی گفتوگۆم لەگەڵ هەڵسوڕاوی کاروباری تورکی لە 18/ئەیلولی/ 1930 رەزامەندی تەواوی لەسەر رێککەوتنامەی تازەی قەزایی دەربڕی، کە حکومەتی عێراقی واژووی لەسەر کردبوو، منش پیرۆزبایم لێ کردن لەسەر ئەو دەستکەوتە.

**ئیمزا/ نوری سەعید**

# بەڵگەنامە

یاداشتنامەیەك لەسەر ژیانی شێخ مەحمود لەلایەن V.HOTL "ب– هوڵت"ی سکرتێری ڕۆژهەڵاتی کۆمیساری باڵای بەریتانی "وەرگێڕی عەرەبی" ئامادەکراوە، باش ئاگاداری مەسەلەی شێخ مەحمود بووە. ئەو ئەفسەرەیە، کە دیاری کرابوو بۆ گرتنەبەری ڕێوشوێنی خۆبەدەستەوەدانی شێخ مەحمود بەدەسەڵاتداران لە ناوچەی پێنجوین. ئەم یاداشتنامەیە ڕەنگدانەوەی هەڵسەنگاندنی تایبەتی "کابتن هوڵت"ە لەسەر کەسایەتی شێخ مەحمود.

دەتوانین ئاگاداری هەڵسەنگاندنێکی تر بین کە لەلایەن مێجەر E.B.STONE (میجەرسۆن= وەرگێڕ) لەسەر شێخ مەحمودو خوونەریتی سەیدەکانی بەرزنجە لە لاپەڕەکانی86 بۆ 192ی کتێبەکەی باس کراوە، لەوێ ئاماژەی تر هەیە لەسەر ئەو بابەتە بەناوی (رحلة منتكرة الى بلاد ما بين النهرين و كردستان) قەناعەتێکی ترمان دەداتێ لەسەر سروشتو پێکهاتەی خانەوادەی شێخ سەعیدی باوکی شێخ مەحمودو وێنەیەکی وردو درێژمان بۆ دەکێشێ لەسەر تاکڕەویو زاڵمیەتی شێخ سەعید، لەلاپەڕە 102 باس لەوە دەکات شێخ مەحمود لە توندوتیژیو تاوانکاری لە باوکی تێ پەڕاندووە.

بۆ ئەوەی لە نێوان میجەرسۆن "لەسەرەوە باسمان کرد"و ئەو هەڵسەنگاندنانەی خوارەوە بگەینە ڕاستییەکان، بەڵام لەگەڵ ئەوەش شێخ مەحمود ئەگەر خودبەسەری بوو بێت لە مامەڵەی لەگەڵ خەڵك، ئەوە بەشێوەیەکی گشتی خاوەنی ڕێزو ئەوەی دیارە خۆشەویستی خەڵکی لیوای سلێمانی بووەو خاوەنی لایەنگرو دەسەڵاتی بەرچاو بووە لە ناوچە شاخاوییە بەرفراوانەکان.

وەرگێڕی عەرەبی.

یەکەم پێکدادانی نێوان شێخ مەحمودو هێزەکانی بەریتانی لە نیسانی 1915 لە شوعەییەبووە، شێخ لەگەڵ ژمارەیەك لەلایەنگرانی هاتبوو بۆ شەڕ، جگە لەو سەرۆك هۆزە کوردانەی وەجاغ زادەبوون، ئەمانە هاتبوون بۆ پارێزگاری لە بیروباوەڕو سوڵتان دژی شاڵاوی کوفر. لە دوای نوێژکردن هێزەکانی کورد پێشڕەوییان کرد بەرەو دوژمن، لەو باوەڕەدا بوون هەتا ئێستاش سوارچاکی کۆن باوی ماوە. باوەڕیان وابوو دەتوانن

دوژمن بشکێنن‌و ناچاری پاشەکشەی بکەن بۆ دەریا، کە نیشتمانی ئەو کافرانەیە. تاکە وەڵامدانەوەی گاڵتە ئامێز لە ڕووبەڕووبوونەوەی سوارەی کوردەوە بەڕووی دوژمن دەرچوو.

لەسەرەتای ساڵی 1918 جارێکی تر ئینگلیزو شێخ مەحمود بەیەك گەیشتن، ئەم پەیوەندیەشی بەدواداهات لەکەرکوك لە بەهار و پایزی ئەو ساڵە بارودۆخی ئەو کاتە وای دەویست پەیوەندی لەگەڵ ببەستین، چونکە سەرۆکی سەیدەکانی بەرزنجەو نەوەی کاك ئەحمەدی شێخە. لەکاتی پێشڕەوییکردنی هێزەکانمان "هێزی ئینگلیز= وەرگێڕ" ئەو ناودارترین شێخی کوردان بوو لە ڕووی پیاوماقوڵی و پێگەوە لە ناوچەکانی خوارو هەتا زێی گەورە بە ئاراستەی موسڵ، وای لێهات لێك تێگەیشتنێکی سیاسیی لەگەڵ شێخ مەحمود بووە پێویستیەکی سیاسیی. سەرکردەی سەربازی خۆجێیەتی لە مایسی 1918 شێخ مەحمودی گرت، چونکە لێی کەوتبووە گومانەوە، کە پەیوەندی خیانەتکارانەی هەبێت لەگەڵ ئەفسەرە ئینگلیزەکان، بەڵام لەدوای ئەوەی بەڵێنیدا بە هەموو توانایەوە بەرهەڵستی ئینگلیز بکات، کەمتر لە چوار مانگ ئازاد کراو لەلایەن حاکمی تورکانەوە کرا بە حاکمی سلێمانی، لەو کاتە شێخ مەحمود دوو نوێنەری نارد بۆ لای حکومەتی خاوەن شکۆ تا داوای لێ بکات کە بەتەنیا کورد لە ئاکامی شەڕ "شەڕی یەکەمی جیهان=وەرگێڕی عەرەبی" لەناو گەلان نەگەیشتوونەتە سەربەخۆیی، لە وەڵامی ئەو دەستپێشخەرییەی شێخ مەحمود لەکانوونی یەکەم ئەفسەری سیاسییان نارد بۆ سلێمانی‌و ئیدارەیەکیان بۆ شێخ پێك هێنا، بەو ناوە لەزێی گەورە هەتا دیالە کرا بە حوکمدار بۆ دەسەڵاتداریەتی کوردستان، لەناو سەرکردەکانی جوڵانەوەی نیشتمانیدا شێخ مەحمود دەیویست لە نێوان ئارەزووی بەدەستهێنانی هێزی شایستە بەخۆی‌و بەدەستهێنانی ئاستێکی شایستە بەگەلەکەی پەیوەندیەکی لێك دانەبڕاو درووست بکات، هەروەکو ناودارانی تر پێی وابوو شۆرەتی خۆی‌و گەلەکەی دوو جەستەی لێك جیا نین. لەسەرەتاوە ئاشنا بووە بەخەونەکانی گەلی کورد لە ئازادی و یەکگرتووی و بڵاوبوونەوەی دەسەڵاتی بەسەر هەموو هۆزەکانی کورد، کاری بۆ ئەمە دەکرد، ئامانجەکانی ئەو زیاتر بووە لەو هۆکارانەی پەنای بۆ دەبردن، ئەمەش دەبووە هۆی تێکگیرانی چاوەڕوانکراو لەگەڵ ئەفسەرە سیاسییەکانی ئینگلیز، ئەوانەی زیاتر گرنگیان دەدا بەکاروباری ئیداری لەگەڕانەوەی هێمن‌و ئاسایش بۆ ناوچەکە، کە لە

ئاکامی جەنگەوە تێك چوو بوو، بەڵام ئەو گرنگی دەدا بە شکۆمەندی کورد. شێخ مەحمود دەرکی بە سروشتی ململانێی چاوەڕێ کراو کردبوو لە نێوان خۆیو ئینگلیز، بۆیە دەیویست ململانێیەکە لە بەرژەوەندی خۆی یەکلابکاتەوە، لە مایسی 1919 کودەتای سەربازی "دژی ئیداری ئینگلیز لە سلێمانی" ئەنجام دا.

شێخ مەحمود خێرا ئەم نەخشە ئینقلابیەی جێبەجێ کردو بەسەری دا زاڵ بوو، ئەفسەرە سیاسییەکانی ئینگلیزی لەوێ دەست بەسەر کرد، لە دوای مانگێك بەسەر کودەتا سەربازییەکەی هێزەکانی شێخ لە باشترین دەروازەی کوردستان، ڕێڕەوی بازیان لەگەڵ هێزەکانی ئینگلیز کەوتنە شەڕەوە، ئەو هێزانەی هاتبوون بۆ فریاکەوتنی هێزە دەست بەسەرەکانی لای شێخ مەحمود، لەو شەڕەدا هێزەکەی تێکشکاو شێخ بە بریندار لە شەڕگەکە بەجێ ما. دوایی بەدیل گیراوی درا بەدادگای سەربازیو بەتاوانی هەڵگەڕانەوە دادگا بڕیاری کوشتنی دا، بەڵام بۆی سوك کرا بەماوەی دە ساڵ زیندانیو دواتر بەهۆی فەرماندەی هێزەکانی بەریتانیاوە بۆی کرا بەدەست بەسەریو ڕەوانەی هیند کرا، لە حوزەیرانی 1922 گواستیانەوە کوێت، چاودێرییان لەسەر سووك کردو مووچەیەکی ئاسایی 200 ڕوپییەیان بۆ بڕیەوە. یەکێك لە نێردراوەکانی مستەفا کەمال "ئۆزدەمیر- وەرگێڕ" بەهۆی زیرەکیو سەرکەوتوویی خۆیو بەیارمەتی ئەو سەربازە تورکانەی ژمارەیان لە پەنجەکانی دەست تێنەدەپەڕی، هەموو پێوانەیەکی ئینگلیزو ئەو هۆزە کوردانەیان هەڵگێڕایەوە، کە کاتی خۆی لە ساڵی 1918 خۆشحاڵ بوون بەهاتنی ئینگلیز، هەتا لە ساڵی 1922 لە زۆربەی ناوچەکانی لیوای سلێمانیو هەولێر ناچاری پاشەکشەیان کردین.

لە دوای ئەوە ئینگلیزەکان هەمان کاریان بە شێخ مەحمود کرد کە تورکان بەر لەچوار ساڵ ئەنجامیاندا، ئەمەش دوای بەردانی لەکوێتەوە هێنایانەوە لە سلێمانی دایاننا بەحوکمدار، دوای ئەوەی ئینگلیز بەڵێنی تەاویان لێ وەرگرت، کە بەهەرچی لە توانای دا هەیە کاربکات بۆ بەرهەڵستی خزینی تورکانو هۆزە کوردەکانی لایەنگری.

شێخ مەحمود بەو بەڵێنانەی ئەم جارە دابووی بە ئینگلیز، سەرەڕای پەیوەندی نێوان شێخو فەرماندەی تورکی زیاتر لە جاران نەیتوانی شوێنپێی کاریگەری خۆی لە لیوای سلێمانی بکاتەوە. ئارەزووەکانی کەسایەتی شێخ مەحمودو خۆزگە نیشتمانییەکانی ئەم جارەش بووە هۆی نەهامەتی. بەپێچەوانەی ئەو بەڵێنانەی دابووی

هیچ هەنگاوی نەهاویشت لەگەڵ ئامۆژگارییەکانی ئینگلیز تێك بکاتەوە، داوای هەموو کوردستانی دەکردو دەیویست بە زەبری هێز دەسەڵاتی بگەیەنێتە هەموو ئەو ناوچە کوردییانەی، کە پێشتر کۆمیساری باڵای بەریتانیا نەیهێشتووە بکەوێتە ژێر دەستی ئەو، بۆیە ناچارکرا لە سلێمانی بکشێتەوەو بەشێوەیەکی کاتی سلێمانی لەلایەن هێزەکانمانەوە داگیر کرا، بەڵام مانەوەی هێزەکانمان لەناو شاری سلێمانی ئەستەم بوو، بۆیە کارگێڕیەکی خێڵەکی کوردیمان لە جیاتی کارگێڕییەکەی شێخ مەحمود دامەزراند، بەڵام ئەو هەوڵانەش سەرکەوتوو نەبوو، هێزەکانمان لە سلێمانی کشانەوەو شێخ مەحمود دووبارە گەڕایەوە شارو کەوتەوە تێکۆشان، بەبێ هیچ بەربەستێك زاڵ بۆوە بەسەر چارەنووسی کورد. هیچ کۆسپێك نەبوو لە بەردەم دەسەڵاتی شێخ مەحمودو هەوڵە بەردەوامەکانی لە زیادبوونی پێگەی لە ناوچەکان، کە بەئاشکرا ئاگادار کرایەوە لەو دەستێوەردانانە، سەرەڕای ویستی حکومەت ناچار بووین هەڵویستی لەدژ وەربگرین.

لە دوایی شێخ مەحمود ناچار کرا ڕێککەوتنامەیەك لەگەڵماندا واژۆ بکات، کە بەهیچ شێوەیەك دەست لە کاروبای ناوخۆی سیاسیی عێراق وەرنادات، بەسەریدا سەپێنرا خۆیو خێزانەکەی لە دەرەوەی سنووری عێراق بژین، لە بەرانبەر جێبەجێ کردنی تەواوی ئەو مەرجانە، حکومەتی عێراقی بەڵێنی گەڕاندنەوەی تەواوی سامانە زەوتکراوەکانی بدات، لەگەڵ ڕێپێدانی دانانی وەکیل بۆ ئەو زەویوزارانەی هەیەتی.

شێخ مەحمود بەو مەرجانە ڕازی بوو هەتا کاتی بوژانەوەی سەر لەنوێی جوڵانەوەی نەتەوایەتی کوردی لە سلێمانی، ماوەی هەڵبژاردنە گشتیەکانی ساڵی 1930، بەمە شێخ لە خۆبایی بوو، دووبارە وەکو سەرکردەی جوڵانەوەی نەتەوایەتی کورد بەدیار کەوت.

ئەو ڕووداوانەی لەسەرئەنجامی سەر لەنوێی جوڵانەوەی کوردی پەیدا بوو، لەو ڕاپۆرتەدا باس کراوە، شێخ مەحمود بە ئازایەتی و پاکیی شەڕی کرد، پێویستە ئەوە بخوێنینەوە، کە سەرەڕای کۆسپە زۆرەکانی بەردەم شێخ مەحمود لە کەمیی پیاو و تەقەمەنی و لاوازی ڕێکخستن، بەڵام ئەم بە ئازایەتی شەڕی کرد، وەکو زیانە سەربازییەکانی ئەو شەڕانە لە پێش چاوی کوردی باشوور کەمتر نەبوو لەو کاتەی بە دیلی لە دوای خۆبەدەستەوەدانی لە پێنجوین دەبینرا، کوردەکانی ئەو گوندانەی دۆڵو

شیوەکانی دەوروبەری کۆببوونەوەو دەستیان ماچ دەکرد، زۆربەیان لە کاتی بەڕێکردن فرمێسکیان لە چاوان دەهات، سەرەڕای هۆکاری گەورە لە سوکایەتی پێکردنی ئەوە بوو کە دەڵێن چەندین جار بەڵێنی شکاندووە، خودبەسەرو دڵڕەق و خۆپەرستو تەماعکار بووە، بەڵام لەهەموو حاڵەتەکاندا بەو ئەندازەیە یاخیو لەیاسا دەرچوو نەبووە، دەتوانرێ بە بەڵگەی بەهێزتر لەو بەڵگانە بەرگری لە شێخ مەحمود بکرێ، کە کەسایەتی پێ دەشکێنرێ. چونکە زۆربەی بەڵێن شکاندنەکەی بەزۆر بووەو بەشێوەیەکی گشتی هەڵەکانی هەڵقوڵاوی چاکەکانی بووە. هەروەکو دیکتاتۆریەتیەکەشی دەربڕی ویستی دیکتاتۆرانەی بووە، بەڵام کاریگەری خراپی لەسەر میرەکان کەم نەبووە، هەروەها بە دڵڕەق تاوانبار دەکرێت، بەڵام کێ شاهیدی لەسەر ئەوە دەدات؟ ئەوانەتان نەدیووە، کە چۆن لەناو گوندنشینەکان لەدوا ساتەکانی تێك شکانی دەهاتن دەستیان ماچ دەکرد، ئەوانەت نەدیوە "شایەتیدان لەسەر شێخ مەحمود =وەرگێڕ" هەتا لە ڕیزی ئەفسەرانی هێزی ئاسمانی، کە دژی دەجەنگان "دوانیان لەلای ئەو دیل بوون" ئەوانەش بەقسەی نەرمو خۆش دەوریان دابوو.

لە کەسمان شاراوە نییە شێخ مەحمود تەماعکارو شانازیکار بووە، بەڵام دەیویست بەو خۆزگەو شانازییانە ئاواتەکانی گەلەکەی بەدەست بهێنێ، زۆری تر وەکو شێخ مەحمود تەماعکار بوونو شانازییان بەخۆوە کردووە، بەڵام کەس قسەی لەسەر نییە، گریمان یاخیو لە یاسا دەرچوو بوو، هەروەها ئەگەر بەراوردی بکەین لەگەڵ گاریباڵدی و مستەفا کەمال، ئەوە بە هەموویان وتراوە، دەتوانین لەگەڵ حوکمدانێکی دادگەرانە بڵێین تاوانە گەورەکانی ئەم ماوەی سەدەیەك دوای ئەوان بووە.

لە ساڵانی 1942 تا 1945 ململانێیەکی سەربازی و سیاسیی لە نێوان جوڵانەوەی کورد بە سەرۆکایەتی مەلا مستەفای بارزانی و حیزبی هیوا لە لایەك و حکومەتی عێراقی بە پشتیوانی ئینگلیز لە لایەکی ترەوە، ئەم ململانێیەش بەشێك بووە لە ڕێڕەوی پرۆژەی پێکەوەلکاندنی کوردستان بە عێراق "وەکو دەوڵەتێکی ناسیۆنالیزمی عەرەبی". لە پاڵ هۆکارە بابەتی و زاتیەکان پێمانوایە ئینگلیز ڕۆڵی یەکلاکەرەوەی گێڕاوە لە کۆتاییهێنانی ئەو جوڵانەوەیە بە قازانجی حکومەتی ناوەند لە بەغدا.

ئەم لێکۆڵینەوەیە هەوڵێکە بۆ چاوخشاندنەوە بە هەندێ لایەنی پەیوەست بەو بزوتنەوەیە، بە وردتر لەو ئیشکالیەتانە دەدوێین، کە پەیوەستن بە سروشت و ئامانجی جوڵانەوەکە، هەندێ لە توێژەرەوان پێیان وایە بزوتنەوەیەکی هۆزایەتی و ناوچەیی بووە، ئەوانی تر بە نەتەوەیی و نیشتیمانی و کوردستانی ناو دەبەن، هەروەها لێرەدا کۆمەڵێك دیکۆمێنتی بەریتانی لەسەر ئەو ڕووداوە دەخەینەڕوو، بەڵام بەدڵنیاییەوە ئەو لێکۆڵینەوەمان ناتەواو دەبێت، چونکە نەمانتوانیوە سوود لەو بەڵگەنامانەی کۆشکی پاشایەتی بەغدا وەربگرین. لێرەدا پەیڕەوی شیکاری کرنۆلۆجی "گێڕانەوەی لەسەرخۆی ڕووداوەکان"مان کردووە.

## گەڕانەوەی مەلا مستەفا

لە ساڵی 1933و ساڵێك لە دوای گواستنەوەی بارزانییەکان بۆ ئەدرنەی نزیك سنووری تورکی–بولغاری، حکومەتی عێراقی بەقسەی ئینگلیز بەشێك لە ئاشووریە پەناهێندەکانی لەسەر سنووری عێراقی–تورکی نیشتەجێ کرد، حکومەتی تورکی لە مەبەستی ئینگلیز ترساو پێیوابوو دوورکەوتنەوەی بارزانییەکان بەدەرفەت دەزانێ بۆ بنیاتنانی دەوڵەتێکی نەتەوەیی بۆ ئاشووریەکان، ئەمەش ئەگەر ڕاست بوایە مەترسی دەبوو بۆ سەر ئاسایشی نەتەوەیی تورکی، چونکە لە بنەڕەتدا ئەو ئاشووریانە خەڵکی کوردستانی تورکیا بوون، لێرەدا حکومەتی تورکی باوەڕی بە حکومەتی عێراقی هێنا، کە لێبوردنێکی گشتی بۆ بارزانییەکان دەربکات و بگەڕێنەوە. شێخ ئەحمەد و مەلا مستەفا و نەوەد کەس لە لایەنگرانیان گەڕانەوە بۆ موسڵ و موتەسەڕیفی ئەوکاتەی موسڵ پێشوازیی لێکردن. سەرەڕای بڕیاری لێبوردن سەرکردایەتی بارزانییەکان وەکو

دیلی شەڕ و تاوانبار دوورخرانەوە بۆ ناسریە، لەویٚ بە زۆر نیشتەجیٚ کران، لە ژیانێکی کولەمەرگی و هەژاری دەژیان، دوایی هێنرانەوە بۆ سلێمانی، بۆ ماوەیەك لەویٚ هێشتیاننەوە. خانەوادە بارزانییەکان بۆ ماوەی یازدە ساڵ بەناڕەحەتی و غەریبی ژیانیان بردە سەر[576].

ساڵانی 1940ـ1942 بۆ ئەوان زۆر قورس بوو، چەند هۆکارێك هەبووە بۆ ئەم مامەڵە خراپەی بەرپرسان لە سلێمانی، کە مەلا مستەفای ناچار کرد هەڵبیٚ و بگەڕێتەوە بارزان:—

یەکەم: خراپی مامەڵەی شێخ مستەفا قەرەداغی لەگەڵ شێخ ئەحمەد و مەلا مستەفا، کە بە ئاماژەی بەرپرسانی عێراقی بە بەردەوامی بە چاوی سوك سەیری دەکردن و تەنگی پێهەڵدەچنین، لەسەر ئەو هەڵوێستەی مەسعود بارزانی دەڵیٚ:

لەوکاتە شێخ مستەفا قەرەداغی موتەسەریفی سلێمانی بووە، پلەوپایەی خۆش ویستووە و گوێڕایەڵی تەواوی بەریتانییەکان بووە، چونکە کورد بووە و خۆی بە ناتەواو زانیوە بەرانبەر بەرپرسان ویستویەتی زیاد لە ئەوانی تر دڵسۆزیی نیشان بدات بۆ حکومەت. ئەو سەرنجەمان داوە هەندیٚ لە ئەوانەی لەسەر حیسابی گەلەکەیان دەسەڵاتی گرنگیان وەرگرتووە وایان نیشان داوە لە پاشا، پاشاویستر دەبن.

پێش دەرچوونی بارزانی، قەرەداغی لە دژی بارزانییەکان رێوشوێنی توندی گرتبووەبەر، ئەو موچەیەی لیٚ بڕیبوون، کە حکومەت مانگانە دەیدا بە هەموو ئەوانەی لە دەرەوەی ناوچەی خۆیان بە زۆر نیشتەجیٚ کرابوون[577].

---

[576] -معروف جیاوك: مأساة بارزان المظلومة. بغداد. الطبعة العربیة، 1954، ص18-23.

[577]- ثورة بارزان. 1943-1945، ص17-18.

هێژا نوری شاویس لە بابەت مستەفا قەرەداغی دەنووسیٚ: لەو ماوەیەدا مستەفا قەرەداغی بە موتەسەریفی لیوای سلێمانی دامەزراو پێش ئەوە یاریدەدەری دووەمی بەڕێوەبەری گشتی وەزارەتی ناوخۆ بوو، بێگومان لەو ماوەیە یاریدەدەری یەکەم و دووەم بووە لە ژێر چاودێری (ئەدمۆنس)ی راوێژکاری بەریتانی بە کاروباری کوردستان لە وەزارەتی ناوخۆی عێراقی. واتە لە بندەستی ئەدمۆنس و بە راوێژی ئینگلیز مەشق درابوو، جگە لەوە پێشتر پەیوەندیی هەبووە بە ئینگلیز و خیانەتی لە گەلەکەی کردووە... (بڕوانە: مذکراتي، من منشورات حزب الشعب الدیمقراطي الکردستاني، 1985، ص27-28).

قەرەداغی بۆ ئەوەی بارزانییەکان ناچار بکات ملکەچی بن گەمارۆی کۆمەڵایەتی و ئابووری خستبوونە سەر، لەلایەك موچەی مانگانەی لێ بڕین و لە لایەکی تر چاودێریی خستبوونە سەر ناردنی هەموو هاوکارییەکی خەڵکی سلێمانی، لە کاتێکدا سلێمانی و عێراق بەگشتی بەهۆی بارودۆخی ناوخۆی عێراق و شەڕی دووەمی جیهانییەوە لە نەبوونی و برسیەتی و هەژاریدا دەژیان. بارزانییەکان ئەوکات لە هەموو کاروکاسبییەك دابڕابوون و بەمەش ئەرکی سەرشانیان زۆر قورس بوو.

شێخ ئەحمەد وێنای ئەو کاتەی سلێمانی بۆ مارف چیاوکی نەتەوەخوازی چالاك و نمایندەی کوردی لە پەرلەمان گێڕاوەتەوە:- (ئەوە راستە کاپتن لاین "ئەفسەری سیاسیی ئینگلیزی" دینارمان بۆ بخاتە ژێر فەرشەوە، بەڵام قەرەداغی ناهێڵێ خەڵك هاریکاریمان بکات؟). چیاوك پێی وتووە: (وتم "لاین" بە دووڕوویی مامەڵەی کردووە، نەك خۆشەویستی، مەلا مستەفاش بەهۆی بێ لوتفیی ئەوەوە هەڵاتووە). وا دیار بوو حکومەت و ئینگلیز دڵڕەق بوون لە بەرانبەر مەلا مستەفا و ویستویانە بەهەر رێگەیەك بێت چۆکی پێ دابدەن، بە بەردەوامی مەلا مستەفا تووشی سوکایەتی و تەنگ پێهەڵچنینی دارایی و دەروونی بۆتەوە، شێخ ئەحمەد لەلای چیاوك ئەو بارە نیگەرانییە دەروونییەمان بۆ دەگێڕێتەوە و دەڵێ: (گەنجە و سوکایەتی و رەقی قبوڵ ناکات، مردنی پێ باشترە لە ئابڕووچوون، هیچو پوچێك لە گەرماو گێچەڵی پێ کرد، کە هاتە دەرێ چووە لای موتەسەریف شکاتی لێ بکات، بەڵام بایەخیان بە سکاڵایەکەی نەدا، هەروەها هیچ پارەی نەبوو، پشتێنی ژنەکەی فرۆشت بۆ خەرجی، ئەقڵی لە سەریدا نەما و بە شەو لەگەڵ سێ لە مریدەکانی هەڵات)[578].

ئەو بارە قورسەی بارزانییەکان بەر لە ڕۆیشتنی مەلا مستەفا لە سلێمانی بە ڕوونی لەو راپۆرتەی ماجید مستەفا بەدیار دەکەوێ، کە لەو بارەیەوە پێشکەشی حکومەتی عێراقی کردووە و تێیدا هاتووە: (بە هۆی کەمی موچەی مانگانە و بەرزبوونەوەی خەرجیە پێویستەکان، سلێمانی بە بارێکی بژێوی خراپدا تێدەپەڕی هەتا حکومەتیش هەستی کردووە، کە دەبێت ژیانیان باش بکرێت، مەلا مستەفا و هاوڕێکانی لەوپەڕی هەژاریدا دەژیان، بەڵام حکومەت لە بەرانبەر چاککردنی بژێوییان بێدەنگ بوو، کۆمەڵێ

[578]- جیاوك: مأساة البارزان المظلومة، 1954، ص154

لێدوانی مەلا مستەفا لەبۆنەکانو هەروەها ئەو نامانەی نووسیویەتیو ئەو راپۆرتانەی ناردوونی هەموویان گوزارشت لە وێرانیی باری ئابووری و کومەڵایەتی بارزانییەکان دەکەنەوە، بۆیە چاوەڕوانکراو بووە، ئەگەر حکومەت بەفریای داواکانی مەلا مستەفا نەکەوێت لە ئاییندە هەوڵبدات هەڵبێ[579].

بە بۆچوونی ئێمە ئەو رقەی بەرانبەر بارزانییەکان دەگەڕێتەوە بۆ ئەو زیانەی مەلا مستەفا گەیاندیە هێزەکانی عێراقی لە شەڕی 1931–1932.

دوای گەڕانەوەی مەلا مستەفا لە مانگی تەممووزی 1943 بۆ ناوچەی بارزان بە ماوەیەکی کەم لاپەڕەیەکی تر لە بزووتنەوەی بەرگریی کوردایەتی دەستی پێکردەوە، بەگشتی بەرگریی لە شەڕی پارتیزانییەوە بۆ هێرش بردنە سەر بنکەی پۆلیس و لەشکری ناوچەکە، سەرئەنجام بە نوشستی هێزەکانی حکومەت دوایی هات، بە ناچاری نوری سەعید بە ناوی حکومەتی عێراقیەوە بڕیاری 25ی کانوونی دووەمی 1944 تایبەت بە جوڵانەوەی بارزانی دەرکرد. بارزانی چۆن لەو بارودۆخە قورسە توانی بەسەر هێزەکانی حکومەت سەرکەوێ؟ بۆچی حکومەت ناچاربوو بە دەرکردنی بڕیاری 25ی کانوونی دووەم؟، لێرەدا هەوڵ دەدەین وڵامی ئەم پرسیارانە بدەینەوە.

کارامەیی مەلا مستەفا لە سەرکردایەتی سەربازیی زۆر بەرز بووە، بارزانییەکان و کورد لە شەڕی هێزەکانی عێراقی بەڵێنی ژیان یان مردنیان دابوو. لە هۆکارە گرنگەکانی سەرکەوتن، هەروەکو لە توێژینەوەی تایبەت بە شێخ ئەحمەدی بارزانیش ئاماژەمان پێدا، گرنگترین بەرئەنجامی سەرکەوتنی ئەو جەنگانە قورسایی توانای فەرماندەی لاو مەلا مستەفا بارزانی بووە، کە بۆ خۆی سەرکردایەتی زۆربەی بەرەنگاربوونەوەکانی کردووە، لەگەڵ گەیشتەوە بە بارزان لە ساڵی 1943 تێگەیشت ماوەیەکی دەوێت هەتا هێزی سەربازیی ئامادە بکات بۆ شەڕی پارتیزانی.

بۆ ئەو مەبەستەش پێویست بوو خۆببوێرێ لە بەرەنگاربوونەوە لەگەڵ هێزەکانی حکومەت، چونکە پێویستی بە کات و جۆریك لە پێکهاتن و دۆستایەتی هۆزە کوردیەکان هەبووە لەگەڵ بێلایەن کردنی ئینگلیز لەو ململانێیەی نێوان ئەو و حکومەتی عێراقی، بۆیە لەگەڵ گەیشتنەوەی بە بارزان دەسەڵاتدارانی حکومەتی لە مێرگەسوور ئاگادار

[579]- F.O. 371\40038 NO. 570 Baghdad, British Embassy. 15 February, 1944.

کردەوە، کە بۆ ئەوە نەهاتووە لە حکومەت یاخی بێت، بەڵکو بەهۆی مامەڵەی خراپی شێخ مستەفای قەرەداغیەوە لە سلێمانی و بە هۆی بڕینی موچەی مانگانەی حکومەت و قەدەغەکردنی هاریکاری خەڵکی سلێمانی لەوان هەڵاتووە. بارزانی لە ماوەی کۆتایی تەمووز هەتا کۆتایی ئەیلول هەوڵیداوە خۆی لە ململانێی حکومەت دوور بگرێ. بارزانییە لاوەکان لە دەوری کۆ دەبوونەوە، هەتا بۆ ئەرکی جەنگاوەریەتی ئامادەیان بکات، بارزانی جەنگاوەرەکانی بەسەر دەستەی سەربازی 30 تا 40 جەنگاوەریی دابەش کرد.

لە دوای دوو مانگ مەلا مستەفا توانای هێزەکەی بۆ دەرکەوت لەسەر شەڕی پارتیزانی، داوای کرد حکومەت وەڵامی داواکاریی بارزانییەکان بداتەوە، بەڵام حکومەت نەك وڵامی داواکارییەکانی نەدایەوە، بەڵکو گەمارۆی خستە سەر شوێنی شۆڕشگێڕان. لە چەند نەخشەیەکی سەربازیی پتەو بارزانی خۆی سەرکردایەتی دەکرد، چەند چالاکییەکی دەستەویەخەی ئازایانەی لەگەڵ بنکەکانی پۆلیس و سوپا لە بارزان ئەنجامدا، سەرکەوتنە سەربازییە یەك بەدوای یەکەکانی لە مانگەکانی تشرینی یەکەم و دووەمدا بووە، مەسعود بارزانی شەڕی خیزۆك لە 12ی تشرینی یەکەمی 1943 بە"هاندەرترین و سەرکەوتووترین" شەڕ ناو بردووە، کە زیانی زۆری بە هێزەکانی عێراقی گەیاندووە، (120) کوژراو و (65) دیلی لێکەوتۆتەوە، ژمارەیەکی بەرچاو لە چەك و تەقەمەنییان دەست بەسەرداگرت، کە بارزانییەکان بۆ شەڕەکانی داهاتوو زۆر پێویستیان پێی هەبووە. شکانی هێزەکانی عێراقی لە شەڕی "مەزنە" لە 10ی تشرینی دووەم و گەمارۆدانی حامیەی مێرگەسوور، پاکسازی دەستەڕاستی رووباری "روکوچك"، هەتا حکومەتی عێراقی باوەڕی کرد، کە جەولەیەکی شەڕی سەربازی لەگەڵ بارزانی دۆڕاندووە[580].

لەگەڵ هەموو ئەو سەرکەوتنانە سیاسەتی بارزانی بانگەشە بووە بۆ گفتوگۆ لەگەڵ حکومەتی عێراقی و ئینگلیز، دەیوت: هێزەکانی عێراقی ناچاری کردووم چەك بەکاربهێنم، رێڕەوی ئەم سیاسەتەش لە بەڵگەنامەکانی بەریتانی و ئەمریکی سەرنج دەدەین:

---

[580]- البارزاني، مسعود: ثورة بارزان، 1943-1945، ل18-23

## له: مه‌لا مسته‌فا بارزانییه‌وه

بۆ: ئین، ج، ئای. سێر كه‌نهان كۆرنه‌والیس

مێژووی 1943/12/25

وێنه‌یه‌ك بۆ:

ب. ئی. س. ئین، سنی، یان كۆلۆنێل میسته‌ر ئه‌دمۆنس. س.ج.

رێگه‌م بده‌، كه‌ پێت بڵێم، فه‌رمانی ئێوه‌م به‌ نامه‌ی نووسراوتان له‌ مێژووی 21كانوونی یه‌كه‌می 1943 وه‌رگرت. من هه‌موو فه‌رمانێكی ئێوه‌ وه‌رده‌گرم، هه‌روه‌كو منداڵ فه‌رمان له‌ باوكی به‌ سۆزیه‌وه‌ وه‌رده‌گرێ، متمانه‌ی ته‌واوم به‌ دادگه‌ری حكومه‌تی خاوه‌ن شكۆی پاشایه‌تی هه‌یه‌ و ئێمه‌ هه‌موو خۆشه‌ویستیمان بۆ حكومه‌تی به‌ریتانی به‌رێزه‌. سه‌باره‌ت به‌ ئامۆژگاریه‌كانی ئه‌فسه‌رانی دادگه‌ری ئینگلیز گونجاوه‌ و ئێمه‌ به‌ به‌رده‌وامی وه‌ریده‌گرین و به‌ گوێی بكه‌ین، به‌ڵام مامه‌ڵه‌ی به‌رپرسانی عێراقی نادادگه‌رانه‌یه‌ و ده‌رگای هه‌موو ئومێدێكی لێداخستووین، بۆیه‌ ناچاربووین بۆ به‌رگری له‌ خۆمان ببزووین.

سه‌باره‌ت به‌ لێبوردنه‌كه‌ی حكومه‌تی عێراقی به‌داخه‌وه‌ قسه‌ی بێناوه‌ڕۆكن و هیچ راستگۆیی تیدا نییه‌، چونكه‌ نابێته‌ كرده‌وه‌، ئه‌وانه‌ ده‌یانه‌وێت ئێمه‌ بگرن، پێشتر زۆرمان گوێ لێ بوو ده‌یانوت: "بڕیاری لێبوردنمان داوه‌". له‌هه‌مان كات هۆزه‌كانیان له‌ دژمان هان ده‌دا و چه‌كیان به‌سه‌ردا دابه‌ش ده‌كردن هه‌تا به‌رانبه‌ر ئێمه‌ به‌ كاری بهێنن. هه‌ندێ كه‌س وه‌كو ئێمه‌ هه‌ست ده‌كه‌ن حكومه‌تی عێراقی نییه‌تی پاك نییه‌، به‌هه‌رحاڵ، ئێمه‌ به‌ سۆزه‌وه‌ به‌ شانازیه‌وه‌ له‌ به‌رده‌م فه‌رمانی ئێوه‌داین و فه‌رمانتان ده‌خه‌ینه‌ سه‌ر سه‌ر و سه‌ر چاو، سه‌ره‌ڕای هه‌موو ئه‌وانه‌ به‌پێی ئه‌وه‌ی گوێمان لێده‌بێت و به‌ چاو ده‌یبینین حكومه‌تی به‌ریتانی دادگه‌ره‌ و به‌ ڕێزه‌وه‌ به‌رگریی له‌ سته‌ملێكراوان ده‌كات و به‌ره‌و رووی زۆرداران ده‌وه‌ستێته‌وه‌، گوێ ده‌گرێ له‌ سكالای سته‌ملێكراوان، یارمه‌تیده‌ر و فریادڕه‌سی ئه‌وانه‌یه‌ رووی تێ ده‌كه‌ن.

منیش به‌و سیفه‌ته‌ی ره‌قترین جۆره‌كانی سته‌مم به‌ده‌ستی به‌شێك له‌م به‌رپرسه‌ عێراقیانه‌وه‌ بینیوه‌. هاوارتان ده‌كه‌مێ یارمه‌تیم بده‌ن، من متمانه‌م به‌ حكومه‌تی پاشایه‌تی به‌ریتانی هه‌یه‌ ده‌رگای به‌ رووی ئه‌وانه‌ داناخات، كه‌ هاواری بۆ ده‌به‌ن. له‌به‌ر

ئەوە منیش لە دەرگاتان دەدەم و بە هەموو راستگۆیی و دڵسۆزیەوە هاوارتان دەکەمێ، بە هاوارمانەوە بێن و بە چاوی سۆزەوە لەم بارە خراپەی ئێمە بڕوانن، کە بەدەستیەوە دەناڵێنین، رێزمان بگرن بە ناردنی مێجەر ئوستیگ (ئەفسەری کارگێڕی بەریتانی لە هەولێر. "نووسەر")، وەکو نمایندەی حکومەتی عێراقی بۆ لامان. من بەندەی گوێڕایەڵی ئێوەم با مێجەر ئۆستیگ بە پشتبەستن بە یاسای حکومەتی بەریتانیای گەورە دادوەر بێت، لە نێوان من و حکومەتی عێراقی، ئەگەر مێجەر ئۆستیگ دادوەر بێ، ئەگەر من تاوانبارم قبوڵمە، هەتا ئەگەر ئەو بڕیارە لەسێدارەدانیش بێت، ئەگەر مێجەر ئوستیگ حوکمی دا من زوڵم لێکراوم داوا لە خوا و لە حکومەتی خاوەن شکۆ دەکەم داوا لە حکومەتی عێراقی بکات بڕیاری لێبوردنم بۆ دەربکات، زیندانییەکانی لایەنگرم بەربدات. راگوێزراوان بگەڕێنێتەوە شوێنی خۆیان. ئەگەر ئەوانەیان کرد خەڵك گەڕایەوە ماڵی خۆیان بە ئاشتی دەژین و بە دڵسۆزییەوە خزمەتی حکومەت دەکەین، ئەوکات لەژێر فەرمانی ئێوەدا دەبین. من ئەوکات خۆم بەڵێن دەدەم هەتا لە ژیاندا مابم هیچ هەڵگەڕانەوە و یاخیبوونێك لەو ناوچەیە روو نەدات، دەتوانن بەرێزتان لە جیاتی من ئەو گرەنتەیە بدەن بە حکومەتی عێراق، من راستگۆم لە بەڵێنەکەم، چاوەڕوانی فەرمانی بەڕێزتانم هەرچەند قورسیش بێت بەجێی بهێنم، لە خوا دەپاڕێمەوە سەرکەوتن ببەخشێت بە هێزەکانی بەریتانی دژی دوژمنەکانی.

دڵسۆزتان

مستەفا بارزانی

لەو راپۆرتەی ماجید مستەفای وەزیری دەوڵەت بۆ کاروباری کورد لە حکومەتی نوری سەعید، لەو سەردانەی بۆ کوردستان لە کانوونی دووەمی 1943 بە کورتی ئەو هۆکارانەمان بۆ دەخاتەڕوو، کە بۆچی کورد لە ساڵی 1943 لە دەوری مەلا مستەفای بارزانی کۆبوونەوە وەکو:

1- ئەو بارودۆخە ئابووریە قورسەی بارزانییەکان تێیدا دەژیان.

2- خراپی لە رووی کارگێڕی و برسیەتی و وێرانی، کە باڵی بەسەر ناوچەکەدا کێشابوو.

3– دوورخستنەوەی شێخەکانی بارزان لە ناوچەکەی خۆیان نیگەرانی و تووڕەیی خەڵکی ورووژاندووە، بە پێچەوانەی زۆر لە شێخەکانی تری کوردستان، شێخەکانی بارزان خۆشەویستی مریدەکانی خۆیانن.

لە بڕگەیەکی تری راپۆرتەکە بۆچوونی بابەتیانە هەیە لەسەر بارودۆخی بارزانییەکان.

4– بێ توانایی دەسەڵاتدارانی ناوچەکە لە ڕووی سەربازیی و کارگێڕییەوە لە هەولێر و موسڵ لە بەرانبەر تێگەشتن لە ڕەهەندەکانی ئەو رووداوە وای کرد بێ ئاگایانە هیچ بایەخی پێنەدەن، هەروەها بەرلەوەی گەورە و دڵسۆز بێت هیچ رێوشوێنێکی یەدەك نەگرنەبەر بۆ دەستگرتن بەسەر جوڵانەوەی مستەفا بارزانی، دەسەڵاتدارە کارگێڕییەکان نووشستیان هێنابوو لە بەرانبەر دۆزینەوەی چارەسەر بۆ ئەو هۆکارانەی بارزانی بۆ بەهێزکردنی جوڵانەوەکەی سوودی لێ وەرگرتوون، بەتایبەت ناڕەزایی خەڵك لە حکومەت و نیگەرانی لە هەڵسوکەوت و هەڵوێستی بەرپرسان.

ئەمانە شوێنی بارزانیی لەناو خەڵك بەرز کردەوە و لە ناوچەکە پشتگیریی بۆ زیادکرد، بۆم دەرکەوتووە موتەسەریفی موسڵ بە درێژایی ماوەی موتەسەریفیەتی لیوا و ماوەی شاڵاوە سەربازیەکان هەتا بۆ جارێکیش سەردانی ناوچەی بارزانی نەکردووە، هەمان شتیش لەسەر موتەسەریفی هەولێر دەوترێت، ئاساییە بەرپرسانی تری کارگێڕی و پۆلیس لاسایی موتەسەڕیف بکەنەوە، ئەوەی نامۆ بووە لە لام، بۆم دەرکەوت ئەو ئەندازە گەنمەی وەکو یارمەتی بۆ خواردن و داچاندن وەریانگرتبوو هەتا بیدەن بە خەڵکی ناوچە شاخاویەکان، لە کۆگاکان دانرابوون و دابەش نەکرابوو، لە کاتێکدا دەتوانرا ئەمە وەکو پاڵپشتی حکومەت بەکاربهێنرێت بۆ راکێشانی دۆستایەتی ئەو هۆزانە و دوورخستنەوەیان لە شۆڕش، دوایی زانیم ئەو یارمەتیە حکومیانە لە گەنم و شەکر نەدرابوونە خەڵکی شیاو، تەنیا چەند کەسێکی کەم لە دەسەڵاتدار و دۆستانی بەرپرسان ئەو یارمەتیەیان پێگەیشتووە، من ئەم راستیانە بۆ سەرنج راکێشانی کەس نالێم، بەڵکو بۆ دڵنیایی لەسەر هەندێ لە بەرپرسانی دەوڵەت لە ئاستی قەزا و لیوا، لە بابەتی کارگێڕی دەوڵەت و چاودێری مامەڵەی بەرپرسانی پەیوەندیدار بە بابەتی بژێوی خەڵك. سەرەڕای ئەمانە هۆکاری تر هەیە لە بزواندنی پروپاگەندەی باشی مەلا مستەفا،

کە بووە هۆی زیادبوونی لایەنگرانی و درێژەدان بە شۆڕش، پۆلیسی خۆجێیی نەیانتوانیوە لەبەر چاوی خەڵکیی بوونی خۆیان بسەلمێنن[581].

گۆڕانکارییە هەرێمی و رووداوەکانی شەڕی دووەمی جیهانی لە کۆتایی ساڵی 1943 یارمەتیدەر نەبوون بۆ ئینگلیز و حکومەتی عێراقی، کە سوور بن لەسەر چارەسەری سەربازیی لە بارزان. بەریتانیا بیر لە بەرژەوەندییە ستراتیژیەکانی خۆی دەکاتەوە لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست، نیگەرانە لەوەی ئەڵمانیا شەڕی کورد لە عێراق بەدەرفەت بزانی و کۆسپ بخاتە بەردەم دەوڵەتانی هاوپەیمان لە ناردنی پشتیوانی بۆ رووسیا لە رێگەی ئێرانەوە. هەروەها بە نیگەرانییەوە دەڕواننە فراوانبوونی پێگەی رووسی لەناو کوردەکانی کوردستانی ئێران و لە بەرئەنجامەکانی دەترسێ لەسەر کوردستانی عێراق. بەریتانیا نیگەرانە شەڕی کورد لە عێراق کاریگەریی خراپی هەبێت بۆ سەر بارودۆخی کوردستانی تورکیا. لەوەش بێئاگا نییە جوڵانەوەی کوردەکان سەرقاڵی خەڵك بە شەڕی جیهانی بە دەرفەت بزانن بۆ هەڵگیرسانی شۆڕشێکی بەرفراوانی کوردان بە پاڵپشتی رووسیای کۆمۆنیستی.

دەتوانین سەرنج لەو نیگەرانییە بدەین لەو نامە ئامادەکارییە توندەی کۆرنەوالیسی راوێژکاری وەزارەتی ناوخۆی عێراق لە سییەکان و باڵیۆزی بەریتانی لە بەغدا لە ماوەی شۆڕشی دووەمی بارزان بۆ مەلا مستەفای ناردووە و داوای لێ کردووە ئەو شەڕە لە کوردستان پەرە نەسێنێت، چونکە زیان بە بەرژەوەندییە ستراتیژییە نێودەوڵەتییەکان دەگەیەنێت، کۆرنەوالیس بەڵێنی بە بارزانی دابوو هەموو هەوڵێکی دەخاتەگەڕ لەگەڵ حکومەتی عێراقی بۆ چارەسەرێکی ئاشتیانەی کێشەی بارزان[582].

دەتوانین لەسەر نیگەرانی بەریتانیا لە پەرەسەندنی بارودۆخی بارزان و مەسەلەی کوردیی دەستلەکارکێشانەوەی نوری سەعیدیش بە بەڵگە بهێنینەوە، کە زۆر لە ئینگلیز نزیك بووە، لە حوزەیرانی ساڵی 1933 نووسیویەتی: حکومەت پێویستە لە ناوچەکانی باکوور سەیری ئیدارەی کوردان بکات، بە تایبەتی کە زانیمان ئەو گرفتەی رووی داوە

[581] -F.O. 371\40038, Iraq Conferential, No. 570, February 15 Baghdad, British Embassy.

[582]- کۆچیرا، ص36-37.

لەسەر سنوورەکانی ئێرانی، سەرۆك هۆزەکان دەستیان بەسەر ناوچەکەدا گرتووە، حکومەتی ئێرانی دراوسێیەتی و هاوکارییان دەکات، ئاگادار کرامەوە، کە ئەنجومەنێکیان لە کوردەکان پێکهێناوە بۆ رێکخستنی ئیدارەی کاروبارەکان، سوپای تورکیا لە سەرسنوورەکانی عێراق و ئێران خۆی ئامادە کردووە بۆ چەسپاندنی ئاسایش و ئارامی. دەڵێن لەم رۆژانەی دوایی پەیوەندیی لە نێوان کوردەکان بە جیاوازیی چینایەتیانەوە بەردەوامە و ئەمە جێی چاوپێداخشاندنەوەیە، ئەو پەیوەندیانەش وڵاتانی پەیوەندیدار رێکی دەخەن[583].

لەوکاتە مەترسییەکانی بەریتانی لە سەرکەوتنەکانی بارزان زیادی کردووە، کە پارتی هیوا لە بەغدا بڵاوکراوەیەکیان دەرکردەوە و بانگەوازیان بۆ شۆڕشی بارزان کردووە، کە لەپێناو مافی رەوای کوردان هەڵگیرساوە، لە ناوەڕاستی کانوونی یەکەمی ساڵی 1943 کۆرنەوالیس چاوی بە سەرۆك وەزیرانی عێراقی کەوت و جەختی کردەوە، کە شۆڕشی بارزان سیمایەکی کوردستانی وەرگرتووە، نووشستی هێزەکانی عێراقی لە شەڕەکانی مانگی تشرینی یەکەم و دووەم ئەوەی سەلماند، کە پێویستە هێزەکانی عێراقی لە بارزان بکشێنەوە بۆ ئەو ناوچانەی، کە دەتوانن بەرگریی بکەن.

ئینگلیز هێزی پشتیوان و زیادەی سەربازی نارد بۆ دیانە و رەواندز، ئامانج لەمە پارێزگاری بووە، هەتا ئەفسەرانی پەیوەستی ئینگلیز لە ناوچەکە و پارێزگاری لە ئاشوورییەکان بکەن، لەپاڵ ئەمەدا بەرپرسانی عێراقی نیگەران بوون، بەوەی ئەگەر شەڕی کوردستان درێژە بکێشێت و حکومەتی عێراقی شەرمەزار بکات، لە بەرانبەر رای گشتی عێراقی بە لاوازی بەدیار بکەوێت. ئەرشەد عومەری وەزیری دەرەوە بە کۆرنەوالیسی وت: بارودۆخی کوردستان بۆتە مەترسی و هەڕەشە بۆ کۆدەتایەکی سەربازی دژ بە ئینگلیز[584]. کەیهان کۆرنەوالیس لە کاتی جوڵانەوەی بارزانی دووەم نامەیەکی پڕ هەڕەشەی بۆ مەلا مستەفا بارزانی نووسیووە و تێیدا هاتووە: چەندان جار لە هەموو ئەو نامانەی ناردوتانە بۆ بەرپرسان راستگۆیی و متمانەی خۆتان بە حکومەتی

---

[583] - مسعود البارزاني: ثورة بارزان 1943-1945 ، ص46-47.

[584] -کۆچێرا: ص225

Borhaneden Yassin, Vision or Reality? The Kurds in the Policy of the Great Powers, 1941-1947.p.130

بەریتانی دەربڕیوە، لە وەڵامی ئەمەدا ئامۆژگاریی کراویت، کە واز لەو کارانە بهێنی، کە زیان لە نیزام دەدەن، ئەو هاریکاریانەی حکومەتی عێراقی پێت دەڵێت قبوڵی بکە، بەڵام ئەو ئامۆژگاریانەت وەرنەگرتووە و لە جیاتی ئەوە بەردەوام چالاکییە نایاساییەکانتان فراوان کردووە.

2ـ کاتی ئەوە هاتووە ئاگادارتان بکەمەوە، ئەو بارودۆخە نیگەرانییە بۆ هەوڵە سەربازییەکانی حکومەتی بەریتانی، ئەگەر بەردەوم بن لەو چالاکیانە، ئەوە حکومەتی بەریتانی دەگاتە ئەو باوەڕەی، کە مەبەستتان دوژمنایەتییە، ئەمەش بۆ ئێوە ئاکامی خراپی دەبێت، پێمانوایە ئەوەی بە ئێوە وتراوە لە لێبوردن و بەڵێنەکانی تر لە لایەن حکومەتی عێراقیەوە لە ڕێگەی شێخ ئەحمەدەوە هەمووی شتی باشن[585].

مستەفا بارزانی بە ئەرێتی وەڵامی دایەوە و وتی: (من لەگەڵ چارەسەری ئاشتیدام، بە مەرجێ لێبوردن بۆ خۆم و چەکدارەکان و گیراوەکان و دوورخراوەکان لە خێزانە بارزانییەکان دەربچێت)، وەکو لە پێشتر ئاماژەمان پێدا بارزانی لە نامەکەیدا بیری خستبۆوە: (من هەموو فەرمانێکی ئێوە وەردەگرم، هەروەکو منداڵ فەرمان لە باوکی بەسۆزیەوە وەردەگرێ). لە 29ی کانوونی یەکەم، بە ڕێگەی نوری باویل ئاغا یەکەم وتوێژی ڕاستەوخۆی نێوان حکومەت و مستەفا بارزانی دەستی پێکرد، بارزانی قبوڵی دانوستانی کرد و داخی خوارد بۆ ئەو زیانانەی لە ئاکامی ئەو شەڕانە بە هەردوولا کەوتووە.

لەبەر ئەو هۆیانە حکومەتی عێراقی بە تایبەتی نوری سەعید باوەڕی کرد، کە چارەسەری مەسەلەی بارزان مەحاڵە، هەروەها بارزانییش لای خۆیەوە باوەڕی کرد، کە ئینگلیز هێزی کاریگەرە لە پشت بڕیاری عێراقی و دەروازەی تری نییە بێجگە لە قبوڵکردنی پێکهاتن لەگەڵ حکومەت. لە 15ی کانونی یەکەمی ساڵی 1943 نوری سەعید کابینەیەکی وەزاری تازەی پێکهێناو ئەمجارە پێچەوانەی نەریتی پێشووی بەغدا تەنیا دوو وەزارەتی بۆ کورد دانابوو، ئەوانیش ئەحمەد موختار بۆ داد و عومەر نەزمی بۆ ناوخۆ، ماجید مستەفاش وەزیری بێ وەزارت، کە ڕاسپێردرابوو بۆ مامەڵە لەگەڵ

[585] -FO, 371\35013 No. 1218. December 21. 21. 1943. Baghdad, FO, 371\40038 From Mustafa Barzani to Cornwallis.

مەسەلەی کورد، ماجید لە دوای دامەزراندنی لەو پۆستە تازەیە هەوڵیدا لە پارتی هیوا نزیك بێتەوە، کە ئەوان ئەوکات پشتیوانی جوڵانەوەی بارزانیان دەکرد، داوای لێکردن سێ لە ئەندامانیان بنێرن بۆ بارزان بۆ لێکۆڵینەوە لە داواکارییەکانی بارزانی، کارەکەیان ئەنجامدا و بارزانی یاداشتنامەیەکی لەسەر مافی کوردیی بۆ حکومەتی عێراقی نارد، کە ئەم خاڵانەی لەخۆ گرتبوو:

1– پێکهێنانی ویلایەتی کوردستان لە لیوا کوردییەکانی "کەرکووک، سلێمانی، هەولێر، قەزا کوردییەکانی موسڵ"، ئەو ویلایەتەش لە لایەن وەزیرێکی کوردییەوە بەڕێوە ببرێ.

2– دانانی بریکاری کوردیی بۆ هەموو وەزارەتەکانی عێراق.

3– زمانی کوردیی ببێتە زمانی کارگێڕی و فێرکردن لە کوردستان.

4– مەسەلەی بەرگری و کاروباری سەربازی و دارایی و پەیوەندییە دەرەکییەکان بەدەست دەسەڵاتی ناوەندییەوە بێت.

5– گەڕانەوەی دوورخراوان و بژاردنەوەی زیانلێکەوتووان و بەردانی زیندانییەکان و دەرکردنی بڕیاری لێبوردنی گشتی[586].

لە 7ی کانوونی دووەمی 1944 ماجید مستەفا گەیشتە بارزان بۆ دانوستان لەگەڵ بارزانی لەسەر داواکاریی کوردان، کە لە یاداشتنامەی بارزانی بەرجەستە ببوو، رێککەوتن لەسەر دانانی فەرمانبەری پاك لە ناوچە کوردییەکان، بنیاتنانی رێگەوبان و کردنەوەی قوتابخانە و گەڕاندنەوەی شێخ ئەحمەدی بارزان. ماجید مستەفا لە 18ی کانوونی کانوونی دووەمی 1944 لەسەر بارودۆخی بارزان راپۆرتێکی دایە حکومەتی عێراقی و باڵیۆزی بەریتانی ئەمە دەقی راپۆرتەکەیە:

1– سەرنجتان رادەکێشم بۆ برووسکەی ژمارە (74)ی 1944/1/27 شەرەفمەندم وەرگێڕدراوی راپۆرتی ماجید مستەفاتان بۆ بنێرم، کە بۆ حکومەت ئامادە کراوە لەسەر بارودۆخی بارزان، کە دانەیەکم لای خۆم هێشتۆتەوە.

2– ماجید مستەفا هەواڵی دامێ، کە حکومەت رازیی بووە لەسەر ئەو راسپاردانەی بۆ چاککردنی ئەوەی لە راپۆرتەکەدا هاتووە.

---

[586] – ئەردەڵان: بارزان و نهێنییەکانی، بەغدا، چاپخانەی مەعاریف، ل33

## بۆ ئەنجومەنی وەزیران
## (کێشەی بارزان)

پێشتر ئاکامی چالاکییەکانم بە ڕاپۆرتێکی زارەکیم دایە ئەنجومەنی وەزیران، بۆچوونی خۆم لەوبارەیەوە بە باشترین ڕێگەچارە زانیوە بۆ کێشەی بارزان، لە راپۆرتە زارەکییەکەمدا ئەوەم روون کردبۆوە، کە ئەم راپۆرتە تەواوی گرفتەکان و مەسەلەکانی پەیوەست بە بارزانی باش نەخستۆتەڕوو، دەبێت بچینە سەر ڕێگەچارەکان، هەروەها ئەم راپۆرتە تایبەت بووە بە کێشەی بارزان، ئەگەر داواکارن دەتوانم لە ئاییندە راپۆرتی ترتان لەسەر لایەنەکانی تری کێشەی باکوور بۆ بنێرم.

بە سوودوەرگرتن لەو زانیاریانەی لە بەڕێوەبەرایەتییە فەرمییەکان و کەسە پەیوەندیدارەکان دەستمان کەوتووە کێشەی بارزان بەم شێوە سەری هەڵداوە و پەرەی سەندووە:

1– دوای کۆتایی شۆڕشی یەکەمی بارزان، مەلا مستەفا بارزانی و سەرکردە بارزانییەکانی تر لە سلێمانی نیشتەجێ کران، لە بارێکی بژێوی خراپ ژیاون، تا ئەو ئەندازەیە حکومەت هەستی کردووە بەوەی پێویستە باری بژێوییان چاك بکرێت، بە هۆی کەمی موچەی مانگانە و گرانی و بەرزبوونەوەی خەرجی، مەلا مستەفا و هاوڕێکانی زۆر لە هەژارییدا ژیاون، حکومەت و ئەو خەڵکەی لە پەیوەندییدا بوون لەگەڵ بارزانییەکان گەیشتوونە ئەو باوەڕە، کە کێشەی دارایی و هەژاری تووشی کاری تاوانکارییان دەکات، لە چەندین لێدوانی مەلا مستەفا لە بۆنەکان و هەروەها لە چەند نامەیەك و راپۆرتێك، کە خەڵکی تر ناردبوویان، هەموویان جەختیان کردۆتە سەر وێرانی باری ئابووری و کۆمەڵایەتی بارزانییەکان. شتێکی چاوەڕێ کراوە ئەگەر حکومەت بە فریای داواکارییەکانی مەلا مستەفاوە نەچێت، بە دڵنیاییەوە هەوڵی هەڵاتن دەدات، بەڵام لە حکومەت ترساوە، لەو بڕوایەدا نەبووە تەواو سەرکەوتوو دەبێ لە هەوڵەکانی دژی حکومەت، بەرهەڵستی برایەکانیشی هۆکاری بنەڕەتی بووە، ئەو ماوەیە مستەفا بارزانی چالاکیی دژی حکومەت ئەنجام نەداوە، خراپی ئەو ئیدارەیەی باسمان کرد، زۆر کەسی هاندا لە ناویاندا مەلا مستەفا بارزانی، کە خۆیان بڕیار بدەن. دوای ئەوەی هەستی بە دڵنیایی کرد لە پیلانی هەڵاتن سەرکەوتوو دەبێت و هەستی بە بێئومێدی کرد حکومەتی عێراقی هیچ لەو بارە قورسەیان ناگۆڕێ مەلا مستەفا ناچار بوو هەڵبێ.

2- مستەفا بارزانی بە ماوەیەکی کەم دوای هەڵاتن توانی بگاتەوە ناوچەی بارزان، دوای ماوەیەك گەڕان لە ناوچەکە و خۆدوورگرتنی لە بەرەنگاربوونەوەی سەربازیی هەوڵیداوە پەیوەندیی بە بەرپرسانی دەوڵەتەوە بکات لە ناوچەکە، هەتا هەمان ئەو داواکارییانە بەدەست بهێنێت، کە لە سلێمانی هەوڵی بۆ دابوون. هەر لەو ماوەیەدا مستەفا بارزانی لە چەند بۆنەیەکدا هەڕەشەی کرد، کە ئەگەر حکومەت داواکارییەکانی قبوڵ نەکات لە لابردنی زوڵم و بە پیر داواکارییەکانییەوە نەیەت ناچار دەبێت هێزی سەربازیی چەکدار پێك بهێنێت، ئەمەش ئاکامی خراپی لێدەکەوێتەوە.

3- بێ توانایی دەسەڵاتی سەربازی و ئیداری لە هەولێر و موسڵ لە بەرانبەر تێگەیشتن لە ڕەهەندەکانی ئەو هەڵوێستە، بێ ئاگابوون لەو مەسەلەیە و بایەخیان پێ نەدا، هەروەها پێش ئەوەی گەورە بێت و ڕەهەندی جددیی وەربگرێ هیچ ڕێوشوێنێکی پێشتریان نەگرتەبەر بۆ دەستبەسەراگرتنی بزووتنەوەی مستەفا بارزانی، هەروەها بەرپرسە کارگێڕییەکان نوشستیان هێنابوو لە چارەسەری ئەو هۆکارانەی بارزانی سوودی لێوەرگرتبوو بۆ بەهێزکردنی بزووتنەوەکەی، بە تایبەت نارەزایی خەڵك لە حکومەت و نیگەرانییان لە مامەڵەی هەڵسوکەوت و هەڵوێستی بەرپرسان. ئەمانە شوێنی بارزانییان بەرز کردەوە و رای گشتی بۆ لای خۆی راکێشا. بۆم دەرکەوت موتەسەریفی لیوای موسڵ لە ماوەی خزمەتیداو لە کاتی چالاکییە سەربازییەکان بۆ یەك جاریش سەردانی ناوچەی بارزانی نەکردووە، هەمان شتیش لەسەر موتەسەریفی هەولێر دەڵێن. ئاساییە بەرپرسانی تری ئیداری و پۆلیس لاسایی موتەسەڕیف بکەنەوە. ئەوەی چاوەڕێم نەدەکرد و نامۆ بوو ئەو ئەندازە گەنمەی وەکو یارمەتی بۆ خواردن و داچاندن پێویست بوو بیدەن بە خەڵکیی لە کۆگاکانی ناوچە شاخاوییەکان دانرابوون و دابەش نەکرابوون، لە کاتێکدا دەتوانرا ئەمە وەکو پاڵپشتی حکومەت بەکاربهێنرێت بۆ راکێشانی دۆستایەتی ئەو هۆزانە و دوورخستنەوەیان لە شۆڕش. دوایی زانیم ئەو یارمەتییە حکومیانە لە گەنم و شەکر نەدرابوونە خەڵکی شیاو، تەنیا چەند کەسێکی کەم لە دەسەڵاتدار و دۆستانی بەرپرسان ئەو یارمەتیەیان پێگەیشتووە، من ئەم راستیانە بۆ سەرنج راکێشانی کەس ناڵێم، بەڵکو بۆ دڵنیایی لەسەر هەندێ لە بەرپرسانی دەوڵەت لە ئاستی قەزا و لیوا و لە بابەتی ئیدارەی دەوڵەت و چاودێریی مامەڵەی بەرپرسانی پەیوەندیدار بە بابەتی بژێوی خەڵك. سەرەڕای ئەمانە هۆکاری تر

هەبووە لە بزواندنی پروپاگەندەی باش بۆ مەلا مستەفا بۆ زیادبوونی لایەنگرانی و درێژەدان بە شۆڕش. لەپاڵ ئەوەدا پۆلیسی ئەو ناوچەیە نووشستیان هێنابوو لە بەرچاوی خەڵکی خۆیان بەدیار بخەن و بیسەلمێنن کە هەن.

4- لەو ماوەی جوڵانەوەی بارزان دەستی پێکردووە، حکومەتی ناوەندیی نەیتوانیوە ناوەندێکی سەرکردایەتی یەکگرتوو پێك بهێنێت بۆ بەرهەڵستی، بەڵکو بۆچوون و ڕێوشوێنەکان گەڕەلاوژە بوون بۆ سەرکوتکردنی بزووتنەوەی بارزان.

5- بەکورتی بارودۆخی باکوور بەتایبەت ناوچەی بارزان خراپ بووە، ئەمەش لە ئاکامی مامەڵەی خراپی بەرپرسانی حکومی و کاربەدەستانی دەوڵەت لە لیوا و بارەگاکانی فەرماندەیی. بۆیە لە بەرژەوەندیی حکومەتدایە ئەو هەڵانەی خۆی ڕاست بکاتەوە و بە ئاراستەیەکی چاکسازی ئاشتیانە بەرەو ناوچە کوردییەکان بچین، هەتا ناچار نەبین قوربانیی ماددیی و مەعنەوی گەورە بدەین لە بەرانبەر شۆڕشی دژ بە حکومەت. پێش ئەوەی ڕاسپاردەی خۆم بدەم لەسەر چارەسەری مەسەلەی بارزان پێمخۆشە کورتەیەك لەسەر بارودۆخی بارزان بدەمە حکومەت.

أ- گوندەکان کەسیان تیا نییە و هەندێکیان ڕوخاون.

ب- هیچ شوێنەوارێکی کشتوکاڵ لە ناوچەکەدا نییە.

ج- برسیەتی و دابڕان بە ڕادەیەکی مەترسیدا لە ناوچەکە بڵاوبۆتەوە.

د- هەموو هۆیەکانی پەیوەندیی و ڕێگاوبان لە ناوچەکە وێران بوون.

هەموو خانووە حکومییەکانی ناوچەکەش کاول بووە، تاکە خانووی وێران نەبووی ناوچەکە ئەوەیە کە هێزەکانی حکومەتی تێدایە.

هـ - هاوسۆزییەك هەیە بۆ سەرکردە دوورخراوەکان، ئەو هاوسۆزییەش هۆکاری بنەڕەتییە بۆ ئەوەی هۆزەکان لە دەوری سەرکردایەتی مەلا مستەفا بارزانی کۆببنەوە.

و- هاووڵاتیان لە زۆر بابەت سکاڵایان هەیە، زۆرمان ئاماژە بە هەڵەی بەرپرسانی حکومەتدا لەگەڵ چۆنییەتی چارەسەرکردن.

ز- بە مەلا مستەفا بارزانی گەیشتم و بینیم چۆن سەرۆك هۆزەکانی ناوچەکە پشتگیریی دەکەن، هەموویان سوورن بە هۆی خراپی ئیدارە چەك دانەنێن، هەروەها متمانەیان بە حکومەت نییە، بەرپرسان لیستی زەبەلاحیان لە بێبەڵێنی لە لا هەیە.

وتیان بە ناچاری ئەم ڕێگەیەمان هەڵبژاردووە، حکومەت ئێمەی ناچار کرد، دڵنیایی و دڵسۆزی و گوێڕایەڵی خۆیان بۆ حکومەت و پاشا نوێ کردەوە، ئامادەبوون بە هەموو راستگۆیی لە خزمەتی هەردووکیاندا بن، وتیان ئاییندە و ژیانمان بەلاگێڕی فەرمانەکانی حکومەت و دادگەرییەکەی بێت، بەڵێنم پێدان ئەگەر خۆیان بدەنە دەستەوە بە تەواوی بۆیان چاك دەبێن، بە زارەکی پێم وتن بچن لە حامیەی مێرگەسوور خۆ بدەنە دەستەوە، دوایی داوام لە بارزانییەکان کرد ئەم مەرجانە جێبەجێ بکەن:

یەکەم: وازهێنان لە بەرەنگاری سەربازی و لابردنی گەمارۆ لەسەر هەموو حامیە و بازگە سەربازییەکان.

دووەم: هاوکاری کردنی خێرای دەسەلاتە کارگێڕییەکانی ناوچەکە لەپێناو چاککردنی ڕێگەوبان و گەڕاندنەوەی هێڵی تەلەفۆنی بۆ ناوچەکە.

سێیەم: دەبێت گوندییەکان و خێزان و ئاژەڵەکانیان بگەڕێنەوە و بەکاری ئاسایی خۆیانەوە خەریك بن.

چوارەم: دەبێت پەیوەندییەکی باش لەگەڵ ئەفسەرانی سوپا و بەرپرسەکانی حکومەت لە ناوچەکە دابمەزرێنن.

پێنجەم: چەندی لە توانایاندایە دەبێت خەڵکی ناوچەکە هاوکاری دەسەلاتدارانی حکومەت بن بۆ گەڕاندنەوەی باڵەخانەی بازگە سەربازییەکان.

شەشەم: دەبێت مەلا مستەفا بارزانی لە ناوچەکانی چالاکییە سەربازییەکان دوور بکەوێتەوە و بە تەواوی لە سەربەخۆیی بە کاری رۆژانەی ژیانی خۆیەوە خەریك بێت، لەو مافانە بەهرەمەند دەبێت، کە کەسێکی ئاسایی هەیەتی، بەپەلە بۆ خۆی بچێتە بەغدا بۆ دەبڕینی گوێڕایەڵی بۆ وەسی شازادەمان، هەر ئێستاش دەتوانم رەزامەندیی وەسی وەربگرن بۆ ڕێوشوێنی تایبەت بەو مەبەستە.

سێ ئەفسەری سەر بە هۆزە کوردییەکانی ئەو ناوچەیەم ناردووە چاودێریی ڕووداوەکانم بۆ بکەن، ڕاپۆرتم بۆ بنووسن هەتا وەزارەت بڕیارێك لەو بارەیەوە دەردەکات. بەپێی ئەو زانیارییانەی هەتا ئێستا بەدەستم گەیشتووە هیچ مەرجێکی ڕێککەوتنەکەیان نەشکاندووە و بە پێچەوانەی ئەوەی لەسەری ڕێککەوتین هیچ هەنگاویان نەگرتۆتەبەر. لەوانەیە لە ئاییندە هەندێك گرفتمان بێتە پێش، بەلام دڵنیام

بەسەر هەموو گرفتەکان تێپەڕ دەبین، ئەگەر ئەو بایەخ و چاودێرییەی بە تێبینی خستمە ڕوو لەگەڵ ئەو ڕاسپاردانەی لەبەر دەستدان بیگرینە بەر، دڵنیام ئۆقرەیی و ئاسایش باڵ بەسەر ناوچەکەدا دەکێشێت.

**ڕاسپاردە بۆ چاککردنی ئەو بارودۆخە**

هەندێ پێشنیار هەیە بۆ ڕێوشوێنی چاوترساندن و غەرامەکردنی هەندێ لە سەرانی بەرپرس بۆ گەڕانەوەی ئارامی و زاڵبوونەوەی حکومەت بە زەبری هێز، تا وێنەی حکومەت لەبەر چاوی خەڵك چاك بێت. ڕێوشوێنی لەو جۆرە بە گونجاو نازانم، ئەوەی بۆم دەرکەوتووە لەسەر باری ئەو ناوچەیە وام لێدەکات لە بنەڕەتەوە لە دژی گرتنەبەری هەموو ڕێوشوێنێکی لەو جۆرە بم. دەبێت لەو بارەیەوە ئاگاداری مەسەلەی تر بین، ناوچەکە سروشتێکی سەختی شاخاوییە، هێزی پێویست لەبەر دەستدا نییە بۆ ئەرکی سەربازیی، زۆربەی یاخیبوان و گردبوونیان لە ناوچەکە و سەرکردایەتی یەکگرتوویان، هەڵچوونی بەهێز و ئامادەیی بۆ بەرگریی بەتایبەت لەم چەند ڕۆژانەی دوایی، کە یاخیبوان گوندەکانی خۆیان بەجێهێشتووە بۆ شەڕ، میریی ناتوانێت بە زەبری هێز ئامانجەکانی دەست بخات. هەندێ وا پێشنیار دەکەن چالاکییە سەربازییەکان بۆ بەهاری دوابخرێن، هەتا گونجاو بێت بۆ چالاکیی سەربازیی، باوەڕم وایە کارەکان ئاڵۆزتر دەکات نەك ئاسان، چونکە دەرفەتی باشتر بۆ هۆزە هەڵگەڕاوەکان دەڕەخسێت خۆراك و جێگایان دەست بکەوێ. سەرەڕای ئەمانە دواخستنی چالاکییە سەربازییەکان دەرفەت دەداتە یاخیبووان هەتا ژمارەیان زیاد بێت و بازنەی یاخیبوونیان فراوان بکەن، زۆر گرفتی تر لەوبارییەوە درووست دەبێت، بۆیە پێشنیار دەکەم ئەم ڕێوشوێنانە بگرنە بەر:

أ- سەرەڕای باری ئێستای یاخیبوون ئازادکردنی هەموو دوورخراوە بارزانییەکان، لەبەر دوو هۆکاری لەو جۆرە لە بەرژەوەندیی حکومەت دەبێت:

یەکەم: مقۆمقۆ دەخاتە ریزی جوڵانەوەی یاخیبوان و کاری خراپی دەبێت لەسەر سەرکردایەتی ئەوان، چونکە لە بنەڕەتەوە تەبایی لە نێوان ئەو سێ برایە مەلا مستەفا و شێخ ئەحمەد و سدیق بابۆدا نییە. سەرەڕای ئەوە مەلا مستەفا هەمیشە دەڵێت: بە پاڵپشتی هەڵوێستی براکەم ئەمە دەکەم، بەڵام بە بەردەوامی ناکۆکی لە بۆچوونیاندا هەیە و هەر یەك لەو برایانە دەیەوێت بە تەنیا دەسەڵاتی خۆی بسەپێنێت.

دووەم: ئەگەر سەرکردە دوورخراوەکان بگەڕێنەوە، بزوتنەوەی یاخیبوون بێ مەبەست دەمێنێتەوە.

پەلەکردن بۆ گەڕانەوەی دامەزراوە مەدەنییەکانی حکومەت بۆ ئەو ناوچانەی لەژێر کاریگەریی بزووتنەوەی هەڵگەڕانەوەدان، لەگەڵ دامەزراندنی بەرپرسانی لێوەشاوە، بەوە دەتوانین پەیوەندیی بەو سەرۆك هۆزانەوە بکەین، کە لەژێر گوێڕایەڵی شێخی بارزاندا نین، بێگومان بەمە پێگەی شێخەکانی بارزان کەم دەکەینەوە.

ب- دانانی ئەندازەیەك پارەی پێویست لەگەڵ شێوازێك بۆ گەڕاندنەوەی پەیوەندیی پچڕاوی ناوچەکە بە چاککردنەوەی رێگا وێرانبووەکان و دانانی هێڵی تەلەفۆن و کردنەوەی رێگە بۆ بەستنەوەی بلە بە ئامیدی و ئاکرێ، دانانی بازگەی سەربازیی بە درێژایی رێگا هەتا حکومەت زاڵ بێت و ناوچەکە بە شارە گەورەکانەوە ببەسترێتەوە. حکومەت لە بنیاتنانی رێگەوبان و ئاوەدانکردنەوە پشت بە کرێکاری ناوچەکە ببەستێت هەتا خەڵکی ئەوێ وا هەست بکەن بەرژەوەندیی ماددییان لەوەدایە دەسەڵاتی حکومەت لە ناوچەکەیاندا هەبێت.

ج- دەبێت بە خۆڕایی یان بە هەرزان کەرەستەی خواردەمەنی دیاریکراو بگاتە ناوچەکە و ئەوەی بۆی دانراوە زیاد بکرێت، هەتا دانیشتوانی ناوچەکە هەست بکەن بوونی حکومەت پێویستە.

د- ئەگەر ئەو رێوشوێنانە گیرایە بەر، بەرپرسان بە شێوەیەکی باش جوڵانەوە لە پیادەکردنی دادگەری و راستەوخۆ دانەبڕان لە دانیشتوانی ناوچەکە، ئەوکات کارگێڕیەتی ناوچەکە دەتوانێت دەست بگرێ بەسەر ناوچەکە و بەدواداچوون لەگەڵ تاوانباران بکات و چەك لە گوندییەکان داماڵێت، ئینجا دەتوانرێت ئەو کەسانەی باری ئارامی و ئاشتی ناوچەکە تێك دەدەن بۆ ماوەیەك یان بە هەمیشەیی دوور بخرێنەوە.

داوام لە مەلا مستەفا کرد سەردانی بەغدا بکات بۆ ئەوەی خۆی بداتە دەست "وەسی" عێراق و پێشتر رەزامەندی فەرمیم وەرگرتووە قبوڵی پێشوازیی مستەفا بارزانی بکات، هەتا گومانی خەڵکی ناوچەکە بسڕێتەوە لەوەی حکومەت پابەندیی بەڵێنەکانی نابێت، دوای ماوەیەکی کەم دەرفەتی مەلا مستەفا بدرێت بگەڕێتەوە بۆ باکوور.

من دڵنیام ئەگەر ئەو پێشنیارانە بەئەنجام بگەن، بە ماوەیەکی کەم بە هەموو ئامانجەکانمان دەگەین، بە دڵنیایی حکومەت بەم کارانە دەتوانێت گیانی یاخیبوون لەناوبەرێت، لە لایەکی ترەوە ئاسانکارییە بۆ ئیدارەیەکی دادگەر و رێکوپێك لە ناوچەکە. بەجێهێنانی ئەو راسپاردانە دەبێتە گەمارۆدانی شۆڕش لە ناوچەکە و گرەنتییە بۆ پاڵپشتی ناوچەکانی تر.

**ماجید مستەفا**

**وەزیری بیٚ پۆست، 18ی کانونی دووەمی 1944**

لە 25ی کانوونی دووەمی 1944 "بەبێ نوری سەعید کە ئەوکات لە دەرەوە بوو" بڕیارێك سەبارەت بە مەسەلەی کورد دەرچوو، کە ئەو خاڵانەی لە خۆ گرتبوو:

1- دانانی خەڵکی باش و پاك بۆ دەزگا کارگێڕییەکانی قەزای زێبار و رەواندز و ئامێدی.

2- بە گوێرەی پێویست بنکەی پۆلیس لە ناوچە سنوورییەکان دابنرێ.

3- درووستکردنی رێگەی گشتی بۆ ناوچەکانی بارزان.

4- مەلا مستەفا دوور بخرێتەوە لە پیران، لە ناوچەی پشدەر نیشتەجێ بکرێت.

5- شێخە دوورخراوەکانی بارزان بگەڕێنەوە ناوچەی بارزان، رازی بن لەسەر هاتنی مەلا مستەفا بۆ بەغدا، کە حکومەتی عێراقی بۆ ئەو مەبەستە داوای لێ دەکات.

6- چەك و کەرەستەکانی تری حکومەت کە لە بندەستی بارزانییەکانە وەربگیرێتەوە.

7- رەزامەندیی لەسەر دەرکردنی بڕیاری لێبووردنی گشتی بۆ پارتیزانە بارزانییەکان، بێجگە لەو هێزە چەکدارانەی پەیوەندییان پێوەکردوون.

حکومەتی عێراقی رازیی بوو لەسەر پێشنیاری ماجید بەوەی پشت بە هەندێ ئەفسەری کورد لە سوپای عێراقی ببەستن وەکو ئەفسەری پەیوەندیی لەگەڵ هۆزە کوردییەکان[587].

[587]سعاد روؤف شير محمد: نوري سعيد و دورة في السياسة العراقية حتي العام 1945، بغداد، ص190-191.

مەسعود بارزانی بە سەرسوڕمانەوە لە بابەت بڕیاری حکومەتی عێراقی دەڵێ: (نازانم ماجید مستەفا بە ئەمانەتەوە ئەو بڕیارانەی داوە بە بارزانی و هیوا یان نا؟ چونکە ناگونجێ لەگەڵ ئەو خاڵانەی مەلا مستەفا بارزانی دابوویە ماجید[588].

ئەو پرسیارەی مەسعود بارزانی گومانێکی راشکاوانەیە لەسەر راستگۆیی ماجید مستەفای وەزیر، کە وەکو پەیوەستییەك وابووە لە نێوان بارزانی و حکومەت. لەڕاستییدا ئەو راپۆرتەی ماجید مستەفا لەسەر بارودۆخی کوردستان بەرزی کردۆتەوە "پێشتر بڵاومان کردەوە" بۆتە بنەڕەتێك بۆ بڕیاری حکومی 25ی کانوونی دووەمی 1944، هەندێ باسی تێدایە لە سەرچاوە کوردییەکان لە بابەت وتوێژەکانی حکومەت و بارزانی باسی ناکرێ. مەسعود لە باوکی دەگێڕێتەوە، کە جیاوازیی زۆر هەبووە لەسەر ئەو وتوێژە و ئەوەی لە راپۆرتی ماجید مستەفادا هاتووە لەسەر ئەو چاوپێکەوتنە. ماجید هیچ لەو داواکاریانەی کوردانی باس نەکردووە، کە بارزانی و هیوا خستویانەتە ڕوو، هەروەها راپۆرتەکە بەندی وای تێدایە بارزانی لەسەری رازیی نەبووە، وەکو دوورخستنەوەی بۆ دەرەوەی بارزان. ناگونجێ بارزانی لەو کاتەی لە بەرەکانی شەڕ سەرکەوتوو بووە ئەو مەرجە نزمانە قبوڵ بکات.

دکتۆر بورهانەدین یاسین لە دیبلۆماسییەکانی ئینگلیز لە بەغدا دەگێڕێتەوە، کە لە نیسانی ساڵی 1944 ئەدمۆنس رەشنووسی چارەسەری مەسەلەی بارزانی داڕشتووە، کە گرنگترین مەرجەکانی وازهێنانی بارزانی بووە لە ناوچەی بارزان لەگەڵ خۆبەدەستەوەدانی بێ مەرجی بارزانی بە حکومەتی عێراقی، گەڕاندنەوەی هەموو چەك و تەقەمەنی بۆ حکومەت، لە بەرانبەردا حکومەت هەموو سامانە دەستبەسەراگیراوەکان بداتەوە بە بارزانییەکان و یاسای لێبوردنی گشتی دەربکات بۆ هەموو پیاوانی بارزانی بێجگە لەو سەرباز و پۆلیس و پلەدارانەی پەیوەندییان بە شۆڕشی بارزانەوە کردووە. بارزانی بە توندی ئەو مەرجانەی رەت کردەوە، هەتا وتی: (مردنم پێ باشترە لەو مەرجانە)[589].

---

[588]- پورە بارزان 1943-1945، ص43.

[589]- Vision or Reality? P.126.

ئەو بەندانە لە راپۆرتەکەی ماجید مستەفا و ئەو بەیانەی لە 25ی کانوونی دووەم ئامادەی کردبوو، کە بارزانی قبوڵی نەکرد لەبەر ئەو هۆیانەیە پرسیارەکەی هێژا مەسعود بارزانی پێشنیاری کردووە لەسەر ئەندازەی راستگۆیی و دڵنیایی ماجید مستەفا پرسیارێکی رەوایە.

لە سەرچاوە کوردییەکان جۆرێك لە کۆدەنگی هەیە لەسەر نادڵسۆزی ماجید مستەفا بەرانبەر ئامانجەکانی نەتەوەی کورد بە گشتی و مامەڵەی لەگەڵ بارزان بە تایبەتی، تا مستەفا بارزانی بۆ خۆی ماجید مستەفای ئاگادار کردۆتەوە لەو گەمەیەی بە مافی کوردانی کردووە لەپێناو خواستی بەرژەوەندییەکانی خۆی. ماجید مستەفا لە بارزانی دەپرسێ بۆ بەکرێگرتە کوردەکان دەڵێ: "جاش پۆلیس". بارزانی دەڵێ: چونکە ئەوانە رێگایان بە خۆیان داوە لە خزمەتی دوژمنانی کورددا بن. هەروەها بارزانی دەڵێ: ئەگەر ماجید مستەفا دڵسۆزی مافەکانی کورد نەبێت ناوی لێدەنێین "جاش وەزیر"[590].

مارف جیاوك "سیاسی و نوێنەری چالاکی سییەکان و چلەکانی کورد" لە شێخ مەحمودەوە دەگێڕێتەوە، کە لە باسی ماجید مستەفا وتوویەتی سیاسییەکی ساختەچییە و بە باپیری دەچێت، کە لەبەر دووزمانیی و دووڕوویی لە سلێمانی زمانیان بڕی، هەروەها جیاوك دەڵی: ماجید لەناو کورد بە بەکرێگیراوی ئینگلیز ناسرابوو، پێش ئەوەی سەردانی کوردستان بکات خۆی لە پارتی هیوا نزیك کردەوە، تا خۆی لە گومانی خیانەت دوور بخاتەوە[591].

بابەتی پڕ لە بگرە و بەردە بوونە ئەندامی ماجید مستەفایە لە حیزبی هیوا، ساڵح حەیدەری "ئەندامی پارتی هیوا" لە یاداشتەکانیدا ماجید مستەفا بە ئەندامی هیوا دادەنێت[592]، دکتۆرە پاکیزە رەفیق حیلمی لەو گفتوگەیە ئامادە بووە، کە لەگەڵ "رەفیق حیلمی" وەکو یەکێك لە دامەزرێنەرانی هیوا و سەرۆکی ئەو پارتە باسی ماجید مستەفا کراوە لە کاتی بزووتنەوەی دووەمی بارزان.

[590] - مسعود البارزاني: ثورة بارزان، 1943-1945، ل39.

[591] -مأساة بارزان، ل128.

[592] - وليد حمدي: 243.

لەوکاتەی ئینگلیز پێی وابوو پاڵپشتی هیوا لە بزووتنەوەی بارزان لە جوڵانەوەیەکی خێڵەکیەوە دەگۆڕێ بۆ بزووتنەوەی نەتەوایەتی، هەروەها لە ماجید مستەفا و ڕەفیق حیلمی لێك نزیك دەکردەوە بە ئومێدی دەستبەسەراگرتنی پەیوەستی نێوان هیوا و بارزانی، لە بەرانبەردا ماجید مستەفا لە بەیەکگەیاندنی ئەو مەسەلەیە لای حکومەت ویستویەتی ڕەفیق حیلمی بکرێتە وەزیر، گوایە ئەمەی دوایی وەڵامی دابێتەوە بەوەی (درۆم زۆر لێ دیت و لێ بیستی، ئەوە یەکیانە، ماجید زیانی زۆری بە یەکیەتی هیوا گەیاندووە...)[593].

ئەردەڵان لەو راستیەمان دڵنیا دەکاتەوە و دەڵێ: (ماجید مستەفا فێڵزان، زمان لوس، پیشەی درۆ و هەڵخەڵەتاندن بوو، بە جۆرەها فڕوفێڵ هەوڵیداوە خۆی بخزێنێتە ناو هیوا، بەوەی کە دڵسۆزی کوردە)[594]. نوری شاویس، کە یەکێکە لە دامەزرێنەر و ئەندامانی هیوا، لە گفتوگۆیەکی لەگەڵ کریس کۆچیرا، ماجید مستەفای بە"بەکرێگیراوی ئینگلیزی داناوە"[595].

بەڵام لەگەڵ بێمتمانەیی هیوا بە ماجید رێگر نەبوون لە ئەفسەرە کوردەکانی ئەندامی هیوا تا وەکو ئەفسەری پەیوەندیی کار بکەن، کە حکومەتی عێراق لەسەر پێشنیاری ماجید مستەفا دایمەزراندبوون. ئەوەی شایانی باسە ئەو رژێمی پەیوەندیەی ماجید مستەفا پێشنیاری کردبوو لاسایی کردنەوەی رژێمی کارگێڕیی بەریتانی لە عێراق کە پشتی دەبەست بە دانانی ئەفسەری ئینگلیز لە ئەرکە کارگێڕییەکان لە عێراق. ئەو ئەفسەرانە لە ڕۆژانی ئینتیداب ئەرکی قائیمقام و بەڕێوەبەری شارۆچکەیان رادەپەڕاند، ماجید مستەفا لەو هەوڵانەی بۆ بەکارهێنانی ئەفسەری پەیوەندیی دەیوەست بیکاتە هۆکاری دابڕینی هۆزەکان لە مستەفا بارزانی. لەوکاتەدا هیوا پێی وابووە ئەفسەرەکانی ئەندامی ئەوان لەناو خێڵەکان هەستی نەتەوەیی خێڵەکان بەرز دەکەنەوە[596].

---

[593]-پاکیزە رەفیق حیلمی: یادی لەدایکبوونی مامۆستای کوردایەتی رەفیق حیلمی، رابوون، ژمارە، 26، 1999 ص34.

[594] -بارزانی و نهێنیەکانی، 32.

[595] -کۆچیرا: 226.

[596] اردلان: ل34.

سەرچاوە بەریتانییەکان وێنەکی جیامان لەسەر ماجید مستەفا دەدەنێ، مەکدواڵ دەڵێ: گرفتی ماجید مستەفا وەکو گرفتی هەموو ناوبژیوانێك وابووە، هەوڵی داوە هەردوولا رازیی بکات هەتا متمانەی هەردوولا دەست بخات، کەچی دیارە ماجید مستەفا متمانەی هەردوولای لەدەست داوە، لایەنە کوردیەکان بە بەکرێگیراوی حکومەت و ئینگلیزییان زانیوە و زۆربەی وەزیرە عەرەبەکانی حکومەتی نوری سەعیدیش بە ئەندامی هیوایان دانابوو، کە پایە حکومییەکەی بەکار دەهێنێت بۆ هاندانی دەماگیریی نەتەوەیی[597].

ئەگەر کات و دەسەڵاتی پێویستی لە بەردەستدا بوایە، کۆرنەوالیس دەڵێ: ماجید مستەفا دیبلۆماسییەکی لێهاتوو بوو، ئاشتی راستەقینەی لە کوردستان مسۆگەر دەکرد. کۆلۆنێل مید یاریدەری راوێژکاری سیاسیی لە موسڵ گفتوگۆی نێوان ماجید مستەفا و نوری سەعیدمان بۆ دەگێڕێتەوە، کە لە کاتی سەردانی هاوبەشی هەردووکیان لە نیسانی 1944 بۆ کوردستان:

نوری سەعید: ئایا دەتوانی لێرە بمێنیتەوە و هەوڵ بدەی چەك لە کۆمەڵەکەی مەلا مستەفا بارزانی دابماڵی؟

ماجید: من چۆن دەتوانم ئەوە بکەم، لەو کاتەی حکومەت هیچ ئارەزووی نییە بەرەوپیری سکاڵاکانی کورد بچێت.

نوری: ئەمە بە هیچ شێوەیەك پەیوەندیی بەو بابەتەوە نییە، بەهەرحاڵ ئێرە جێی ئەوە نییە.

ماجید: لەگەڵ ئێوە جیاوازم، ئەگەر دەتانەوێ هەستێکی درووست بەرانبەر حکومەت لە ناوچەکە درووست بکەین زۆر پێویستە چەند رێوشوێنی دەستپێشخەریی بگرنە بەر.

نوری: دووبارەی دەکەمەوە ناتوانم هیچ رێوشوێنێکی لەو جۆرە بگرمە بەر، من لە موسڵم، بەڵام بڕوام وایە ئێستاش دەتوانی بۆ باشکردنی بارودۆخەکەی ئێرە قسە لەگەڵ مەلا مستەفا بکەیت.

---

[597]- A modern History of Kurdish (London: I.B. Taurus Publishers,1997,p291.

ماجید: چۆن بڕوات وایە شتی وا دەتوانم، کە پێشتر پێم وتبووی 30ـ تا 40 ئەفسەری کورد بە تاوانی کوردبوون لە ناوچەکە دوور خراونەتەوە.

نوری: ئەوەی ئێمە قسەی لەسەر دەکەین هیچ پەیوەندیی بەو بابەتانەوە نییە.

ماجید: ئێوە هەڵەن بەتایبەت لەو خاڵە، چونکە کاری گواستنەوەی ئەفسەرە کوردەکان شوێنەواری زۆر خراپی هەبووە، ئەو هەستەی لای کورد درووست کردووە، کە حکومەت جیاوازیی رەگەزی و مامەڵەی خراپ دەکات.

نوری: من لێرە ئامادە نیم دەست بخەمە ئەو کارەوە، ناڕەزایی سوپا بوروژێنم بۆ رەزامەندیی مەلا مستەفا.

ماجید: کەس داوا لە تۆ ناکات، ئەگەر ئامادەی ئەمە نابی ئەوە مامەڵەی تۆ و هاوشێوەکانت تێڕوانینی خراپ لای کورد درووست دەکەن، ئەگەر دەتەوێ هاوکارت بم بۆ چارەسەری ئەو کێشەیە، پێم بڵێ تا ئێستا چیت داوە بە کورد.

هەتا ئێستا پرۆژەیەکی ئاودێری بایی (15) دیناری عێراقیشت بۆ کورد بنیات ناوە؟

نوری: کەس لەو بارەیەوە هیچی بۆ پێشنیار نەکردووم؟

ماجید: من ئەوەم مەبەست نییە، بە تەنیا دەمەوێ ئەوە بڵێم هەتا ئێستا حکومەت هیچی بۆ کورد نەکردووە، هەتا کورد هەست بکەن بایەخیان پێدەدەرێ و هەڵوێستی حکومەت دۆستانەیە. ژمارەیەکی زۆر کەمی کوردان دەرفەتی خوێندنی باڵایان بۆ رەخساوە. ئەوە وا نییە؟ هەتا ئەوانەش زۆر بە ناڕەحەتی دەخوێنن، خویندکاری کورد وەکو نێردراو (بعثة) رەوانە ناکرێن.

لێرە سەرۆك وەزیران وتی: لەو بڕوایەدا نیم درێژەدان بەم قسانە ئاکامی هەبێت، ئێمە لەسەر هیچ بنەڕەتێك قسە ناکەین، هەروەها حکومەت ناتەواویی زۆرە، حکومەت هەڵەی زۆری کردووە و هیچ گومانم نییە لە ئایندە بەدیار دەکەوێ.

ماجید رازی بوو لە موسڵ بمێنێتەوە هەتا پلانێکی کارکردن لەو بارەیەوە بگرێتەبەر[598].

---

[598] FO, 371\40038 23-23 -وێنەیەك بۆ نوسینگەی راوێژکاری سیاسیی ناوچە، لە موسڵ، 15\311 16\مایس 1944 کۆلۆنێل.

ڕەهەندەکانی ئەو گفتوگۆیە روونە، ماجید مستەفا نە بەکرێگیراوی ئینگلیز و نە هی حکومەتی عێراقی، بەڵکو دەیەوێت لە میانی دەزگای حکومەتی عێراقی و پەیوەستی کوردستان بە عێراق و دابینکردنی پرۆژەی پەرەپێدان و کۆمەڵێك رێوشوێنی کارگێڕی و ئابووری بکات لەگەڵ پارێزگاریی لە ناسنامەی نەتەوایەتی کورد. لە هەمان کات هەستی بە عێراقی بوون درووست بکات، ماجید مستەفا وەکو هاوەڵەکانی سەعید قەزاز و موحەممەد ئەمین زەکی بەگ و سیاسییەکانی تری کوردی سەردەمی پاشایەتی، کە جەمال نەبەز بەوانە دەڵێت: (وردە بۆرژوای کورد)، ئەوانە لەو باوەڕەدابوون بە هاریکاری ئینگلیز و مانەوە لەناو دامەزراوەکانی دەوڵەتی عێراقی پاڵپشتی لێکراوی ئینگلیز دەتوانن مافە نەتەوایەتییەکان دەستەبەر بکەن، دەتوانن لەناو دەوڵەتی نەتەوایەتی عێراقی چارەسەری مەسەلەی کورد بکەن[599].

ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ لای رووداوەکانی پێشتر، ئەوە لە دوای دەرچوونی بڕیاری 25ی کانوونی دووەمی ساڵی 1944 لەگەڵ ئەوەدا کە کورد ناڕازیی بووە لە گرتنەبەری کۆمەڵێك رێوشوێن و بەڵێندان بە کورد بۆ هێورکردنەوەی قەیرانەکە، حکومەتی عێراقی لیژنەی پەیوەندیی پێك هێنا لەو ئەفسەرە کوردانەی ئەندامی هیوا بەو شێوەی خوارەوە:

| ناوی ئەفسەر | ناوچەکەی |
|---|---|
| لیوا بەهائەدین نوری | سلێمانی |
| عەقید ئەمین رەواندزی | رەواندز |
| نەقیب سەید عەزیز سەید عەبدوڵڵا | میرگەسوور |
| نەقیب میر حاج | ئاکرێ |
| نەقیب مستەفا خۆشناو | بارزان |
| رائید عیزەت عەبدولعەزیز | بلە |

لەو ماوەیەدا حکومەت هاوکاریی ناوچە کوردییەکان و بە تایبەت بارزانی کرد، وەکو پێویستییەکانی خۆراك و جلوبەرگ و چاکسازیی کارگێڕی لەگەڵ لابردنی ئەو

[599] – جەمال نەبەز، ژێ کاف و ئایدۆلۆژیای ورد بۆرژوای رۆشنبیری ناسیونالست لە کوردستان.

کارمەندانەی بە بەرتیلخۆری و گەندەڵی ناسرابوون. نوری سەعید بە یاوەری ماجید مستەفا سەردانی کوردستانی کردووە، لە چەندان کۆبوونەوە لەگەڵ پیاوماقوڵ و سەرۆك و شێخەکانی کورد بەڵێنی پێدان هەموو خواستە نەتەوایەتییەکانی کورد دابین بکات لە چوارچێوەی عێراق، دڵنیای کردنەوە تازە هەستی بەرانبەر کورد دەبزوێ، چونکە دایکی کوردە.

ماوەی ئەو کرانەوەیە کورت بوو، هەر زوو هەوڵەکانی نوری سەعید رووبەڕووی چەند کۆسپێك بۆوە، هەتا لە ماوەی مایسی 1944 بۆ مایسی 1945 باری نەشەڕ و نە ئاشتی باڵی بەسەر پەیوەندییەکانی هەردوولادا کێشابوو، هەریەك ئەوی تری تاوانبار دەکرد لەسەر مەبەست خراپی و تەنبەڵی کردن لە ئاشتی. کۆمەڵێك هۆکاری تر رۆڵی هەبوو لە ئاراستەی هەردوولا بەرەو شەڕ، کە دەتوانین کورتیان بکەینەوە لە: ئەو تەمومژەی لە جێبەجێکردنی بڕیاری 25ی کانوون هەبووە، لەگەڵ بێمتمانەیی نێوان کورد و حکومەتی ناوەند و یەك نەبوونی ریزی کورد. زۆربەی وەزیرەکان و فەرماندەکانی سوپا بەرهەڵستی هەموو مافێکی نەتەوایەتی کوردیی بوون، بەریتانیاش دەترسا جوڵانەوەی بارزانی ببێتە ئامرازێك بە دەستی رووسیاوە، بۆیە دەیویست کۆتایی پێ بێت.

بەرهەڵستی ناوخۆیی حکومەت و ناسیۆنالستی نەتەوەیی لە بەغدا دژ بە بڕیاری 25ی کانوونی دووەمی 1944 چەندان تێکگیران و ناکۆکی درووست کرد، لە کاتێکدا بڕیاری ناوبراو تەنیا حکومەت لە لای خۆیەوە دەریکرد نەك بە گفتوگۆ لەگەڵ سەرکردایەتی کوردیی، بەڵام جوەیدە دەڵێ: زۆربەی وەزیرەکانی نوری سەعید بەرهەڵستی ئەو بڕیارە بوون، ناویان نابوو سازش بۆ مەلا مستەفا بارزانی. لە سەرەتای نیسانی 1944 نوری سەعید بە سەردان چووبووە فەلەستین، تۆفیق سویدی جێگری و بەرهەڵستکار لەگەڵ نوری لە بابەت مامەڵەی ئەو سیاسەتەی بەرانبەر بە کورد لە 25ی کانوونی یەکەم ئەو بڕیارەی دەرکردووە لەسەر چارەسەرکردنی کێشەی کورد[600].

وەکو بۆمان بەدیار دەکەوێت مەبەستی پاکی بڕیاری 25ی کانوون دەرنەچووە و نوری سەعید بۆ بەڕێکردنی رووداوەکان بڕیاری داوە و رەزامەندیش نەبووە لەسەر

[600] -Kurdish Nationalism Movement, p.682.

پێشنیارەکانی ماجید مستەفا، کە بە شێوەی گشتی زیاتر بەلای کوردەوە قبوڵ بووە. لەڕاستیدا نوری سەعیدیش سوور نەبووە لە هەوڵەکانی بۆ چارەسەری کێشەی کورد بە رێگەی ئاشتیانە. بەریتانیاش فشاری بۆ ئەمە کردووە تا باری کوردستان بەر لە کۆتایی هاتنی شەڕ بە دژی بەرژەوەندیی هاوپەیمانەکان نەوروژێ. نوری سەعیدیش ئەگەر رازی بوایە لەسەر مافی نەتەوایەتی کورد ترسی سوپای هەبووە، تا ئەو کاتەش تارمایی کودەتای 1941ی بەسەرەوە بووە، کە نوری سەعید و ئینگلیزی خستە ژێر باری خەرجییەوە. ئەمەش بە ڕوونی لەو گفتوگۆیەی لە بەڵگەنامەی سەرەوە باسمان کرد لە نێوان ماجید مستەفا و نوری سەعید بەدیار دەکەوێ:

ماجید: ئێوە هەڵەن بە تایبەت لەو خاڵە، چونکە کاری گواستنەوەی ئەفسەرە کوردەکان شوێنەواری زۆر خراپی هەیە و ئەو هەستەی لای کورد درووست کردووە، کە حکومەت جیاوازیی رەگەزی و مامەڵەی خراپ دەکات.

نوری: من لێرە ئامادە نیم دەست بخەمە ئەو کارەوە و ناڕەزایی سوپا بوروژێنم بۆ رەزامەندیی مەلا مستەفا.

نوری سەعید بۆ ئەوەی باوەڕ بکات بە بەرهەڵستکاریەتی سوپا لە بایەخی بڕیاری 25ی کانوونی دووەمی کەم کردەوە، لە هۆیەکانی راگەیاندن دەیوت جوڵانەوەی بارزان تەنیا روخسارێکی خێڵەکییە و بارزانی بۆ "مەبەستە تایبەتییەکانی خۆی" یاخی بووە. هەروەها حکومەت لەناو سوپا پڕوپاگەندەی دەکرد کە مەلا مستەفا لە کردەوەکانی پەشیمان بۆتەوە و خۆی داوەتە دەست حامیەی سەربازیی مێرگەسوور، ئەفسەران و بەرهەڵستکارانی حکومەت سوور بوون، کە ئەگەر یاخیبوونی بارزانی قبوڵ بکرێ و رێزی لێبگیرێ شیعەکانیش هان دەدات داوای هەمان ئیمتیاز بکەن و هۆزەکانیش لەسەر هەڵگەڕانەوە لە دەسەڵاتی ناوەند هان دەدات[601].

بەرپرسانی بەریتانی چاك ئاگادار بوون، کە حکومەتی عێراقی ئامادە نییە بەندەکانی بڕیاری 25ی کانوونی دووەم جێبەجێ بکات، کە بە ڕوونی لەم بەڵگەنامەیەدا بەدیاردە کەوێ، کە کەمترین داواکاری مافی کوردی تێدا هاتبوو:

---

[601] -**حسن مصطفى: ص58-59، شیر محمد: ص192-193.**

Longing, Iraq, 1900-1950 pp.335-326.

## لە بەغداوە بۆ وەزارەتی دەرەوە
## سێر کۆرنەوالیس

ژمارە 3170 نیسانی 1944

دووبارە لە م. ئای. لەسینگ

ئەنقەرە، موسڵ

برووسکەم بە ژمارە (168).

سەرەڕای بەبیرخستنەوەی دووبارەم، حکومەتی عێراق هیچ ڕێوشوێنێکی نەگرتۆتەبەر بۆ بارودۆخی ناوچە کوردییەکان. لەو کاتەوە بارودۆخ مەیوە، کە ماجید مستەفا توانی لە مانگی شوبات مەلا مستەفا رازیی بکات سەفەری بەغدا بکاو خۆی بداتە دەست "وەسی". لەوکاتەوە مەلا مستەفا لە بەغدایە بێ ئەوەی هیچ فەرمانێکی پێ بدرێت، ئاماژەکان بەلای مەترسیەوەن لەسەر بارودۆخی ناوچەکە. هۆکاری مەیینی هەڵوێستی حکومەت دەگەڕێنەوە بۆ ناجێگیریی حکومەت و رەخنەی راشکاوانە بەرانبەر بەڕێوەبەرایەتییە چالاکەکانی لە بەغدا دژی ئەو رێوشوێنە سەرەتاییانەی ماجید مستەفا خستبویە ڕوو بۆ چارەسەری کێشەی کورد، "وەسی"یش دوودڵ بووە و سوور نییە لەسەر گرتنەبەری رێوشوێنی پێویست بۆ رازیکردنی کورد، لەوانەش بوو ئەوانی تر بڕوایان پێهێنابێت، کە ماجید مستەفا کار بۆ ئامانجی هێزە جوداخوازەکانی کورد دەکات.

سەردانی مستەفا بارزانی بۆ بەغدا هاوکات بووە لەگەڵ ئەو تورەییەی ناسیۆنالستانی عەرەب بەرانبەر حکومەتی نوری سەعید. رۆژنامە عێراقییەکان و هەتا هەندێ لە بەرپرسە بەریتانییەکانیش لە بەغدا نیگەران بوون لەو پێشوازییە گەرمەی لە بارزانی کرا. ناسیونالستەکان دەیانووت: ئەو مامەڵەی لەگەڵ مەلا مستەفا کرا لە بەغدا هەموو لایەکی حاڵیکرد، مەلا مستەفا نەهاتووە خۆی بداتە دەستەوە، بەڵکو وەکو فەرماندەیەکی سەرکەوتووە هاتووە. نەتەوەخوازان لە بەغدا بێتاقەت بوون بە بینینی مەلا مستەفای بارزانی و هاوەڵەکانیان، کە بە بەرگی کوردییەوە لە شەقامەکانی بەغدا دەسوڕانەوە، هەتا بەڕێوەبەرایەتییە فەرمییەکانی بەریتانی و باڵیۆزخانەی بەریتانی داوایان لە بارزانی کرد، کە بەغدا بەجێ بهێڵێ[602].

---

[602] - Jwaideh, p.682. جیاوك: ص165

ئەو بیانوەی هەندێ لە دەوڵەتانی ناسیونالست دەیهێننەوە بۆ پاساوی نەبوونی ماف نەتەوایەتی بە کورد بیانوویەکی بێمانایە، چونکە مەسەلەی کورد لە عێراق زۆر جیاوازە لە مەسەلەی مەزهەبی "شیعە" و مەسەلەی تورکمان، لەگەل ئەوەشدا هەندێ خاڵی هاوبەشیان هەیە. ئەم بیانووە بۆ درێژەدانە بە دیکتاتۆریەت و قبوڵ نەکردنی فرەیی. بە دڵنیاییەوە ئەو دەوڵەتانەی سوورن لەسەر سروشتی تاکڕەوی و دان بە واقیعی ئەو پێکهاتانەدا نانێن و پێیانوایە ئاکام لەناو دەچێ.

بڕیاری $25$ی کانوونی دووەم بە ڕێگەیەکی لێڵ و ناواقیعیی لەدایك بوو، ئەمەش وایکرد جێبەجێکردنی ئاسان نەبێت. بۆ نمونە ئەو بڕیارە مەلا مستەفا بارزانی پابەند کردووە هەموو ئەو چەك و تەقەمەنیانەی لە کاتی شەڕ گرتبوونی بیانگەڕێنێتەوە، بەڵام ئەم بڕگەیە لێك نەدراوەتەوە چۆن جێبەجێ بکرێ و هەتا دوامۆڵەتی بۆ دیاریی نەکراوە. بارزانی رایگەیاند هەموو چەکەکانی گەڕاندۆتەوە تەنیا بەشێکی کەمی نەبێت لە ناوچە ئەستەمەکان بەدەست چەند کەسانێکەوەیە و بە ئاسانی کۆ ناکرێنەوە، بەڵام حکومەت دەیوت بارزانی تەنیا بەشێکی کەمی لەو چەکانە گەڕاندۆتەوە.

ئەو بڕگەیەش کە پەیوەندیی بە لێبووردنی بەشداریکارانی جوڵانەوەی بارزانییەوە هەبووە بابەتێکی تری جێی مشتومڕ بووە. بەبێ بیانوو بڕیاری حکومەت لە بابەت لێبوردنی گشتییەوە بۆ ئەوانەی پێیاندەوت: "چەتە"کانی بارزانی دواکەوت، بڕیارەکە ئەو چەکدارە کوردانەی نەدەگرتەوە، کە لە هێزەکانی پۆلیس بوون و سوپا پەیوەندییان بە شۆڕشەوە کردبوو. داڕشتنی ئەو بڕیارە بەو شێوەیە هەروەکو هێژایان جیاوك و جویەیدە دەڵێن: حەکیمانە نەبووە، چونکە زۆر قورس بووە بۆ بارزانی هەوڵ بدات هاوڕێکانی بداتە دەست حکومەت. لە ڕووی ئاکار و نەریتی هۆزایەتی ناو بارزانیان نابێت کەسێك داوای ئەمان بکات تەسلیم بکرێتەوە، کە هەر حکومەت خۆی بە بڕیار ڕێگەی بە ئەفسەرەکانی کورد دابوو بۆ ئاسانکاری هێمن کرنەوەی بارودۆخی ناوچە خێڵەکییەکان لە لیژنەی پەیوەستی کار بکەن.

لەگەڵ ئەوەدا لە $21$ی مایس ئەو بڕیارەی هەڵوەشاندەوە و داوایان لێ کردوون بەخێرایی بگەڕێنەوە یەکە سەربازییەکانی خۆیان، ئەو ئەفەسەرانە گیران و سزا دران و دادگایی کران بەتاوانی برەودان بە ناسیۆنالیستی کوردی و پەیوەندیکردن بە نوێنەری دەوڵەتانی بێگانە و سنووربەزاندنی دەسەڵاتی خۆیان. ئەو هەنگاوانەی حکومەت لە

بەرانبەر ئەفسەرە کوردەکان هەستی بارزانی بە تایبەت و کورد بەگشتی ورووژاند دژی حکومەت، کاریگەریی هەبوو لەسەر بەدگومانی لە بەرانبەر راستگۆیی حکومەت لە مامەڵەی لەگەڵ کورد. بڕیاری 25ی کانوونی دووەم ئەرکی ئەفسەرانی پەیوەستی بە ڕوونی دیاریی نەکردبوو هەتا ئەوانە کێش نەبنە ناو بزووتنەوەی کوردایەتی[603].

ئینگلیزەکان لە کۆتاییدا لە پشت حکومەتی عێراقیەوە بوون، لە ساڵی 1945 بۆ یەکلاییکردنەوەی هەڵوێست لە هەمبەر بارزان بە ڕێگەی سەربازیی. راستە کاتی خۆی لە ساڵی 1943وە ئینگلیزەکان لە پشت ئاشتبوونەوە بوون لەگەڵ مەلا مستەفا بارزانی، بەڵام وەکو ئاماژەمان پێدا بەرژەوەندیی ستراتیژیی ئەوکاتەی بەریتانی بوو، کە سەرقاڵی شەڕی یەکەمی جیهانی بوو، بەڵام ئەو ڕۆژە دوایی هات.

شەڕ لە کۆتایی ساڵی 1944 لە بەرژەوەندیی هاوپەیمانەکان بوو، تێڕوانینی حکومەتی بەریتانی لە بەرانبەر کێشەی کورد گۆڕابوو بۆ هاوشێوەی تێڕوانینی پێشتری ئینگلیزی ساڵانی بیستەکان و سییەکان، کە کوردیان بە هۆکاری نائۆقرەیی دەزانی بۆ دەوڵەتە ناسیۆنالستەکانی ژێردەستەی بەریتانیا لە عێراق و ئێران و تورکیا. هەروەها زۆر نیگەران بوون لە پەرەسەندنی پێگەی رووسی لەناو بزوتنەوەی کوردیی. گفتوگۆکانی نێوان میر حاج و مستەفا خۆشناو مامەند مەسیح لەگەڵ ئەفسەرانی رووس لە کوردستان بە فەرمانی بارزانی باڵیۆزخانەی بەریتانی و ئەفسەرە سیاسییەکانی ئینگلیزی لە کوردستانی عێراق تووڕە کرد. هەروەها ئینگلیزەکان بە نیگەرانییەوە دەیانڕوانییە کۆبوونەوەی سەرکردەکانی کورد لە ئێران و تورکیا و عێراق بۆ یەکخستنی هەڵوێستەکانیان، حکومەتی بەریتانی و ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا پێیانوابووە ئەو کۆبوونەوانە بەشێکە لە نەخشەی رووسی بۆ گەیشتنی پیلانی سۆڤیەتی بۆ عێراق و هەڕەشەیە بۆ سەر کانە نەوتەکانی سەر بە کۆمپانیای ستراتیژیی ئێرانی - بەریتانی، لەگەڵ بەکارهێنانی کورد بۆ نائارامی خستنە ناو عێراق و تورکیا و ئێران و سوود وەرگرتن لەو گەڕەلاوژەیە بۆ سەپاندنی رژێمی کۆمۆنیستی سەر بە رووسیا لەهەریەک لە تورکیا و ئێران و عێراق[604]. مەکدواڵ لەو بارەیەوە دەڵێ: (مستەفا خۆشناو لە

---

[603] - Jwaideh, p. 694-696. جیاوك، ص181-186.

[604] Sate Department. Foreign Relation, 1946. The Near East and Africa, Washington, 1969. Memorandum by the State- War- Navy C00rdinating

کوردستان زۆر بە سادەیی بە یەکێك لە ئەفسەرەکانی ئینگلیزی وتبوو:...ئامانجمان لەو گفتوگۆیانە لەگەڵ کوردی ئێران کۆکردنەوەی هەموو کوردستانی گەورەیە لە رژێمێکی سیاسی لەژێر سەرپەرشتی بەریتانی، چونکە یەك گەل و یەك خێزان و یەك نیشتیمانین، دان نانێین بەو سنوورە دەستکردەی، کە شا کێشاویەتی)[605].

بە گەیشتنی هێژا ستون هیوت باڵیۆزی تازەی بەریتانی بۆ بەغدا سیاسەتی پشتیوانی بێ مەرجی حکومەتی بەریتانی بۆ حکومەتی عێراقی دەستی پێکرد بۆ سەرکوتکردنی بزووتنەوەی کوردی. لە ناوەڕاستی 1945 باڵیۆزی تازە هێڵە گشتییەکانی سیاسەتی بەریتانی لە عێراق خستەڕوو، لەژێر رۆشنایی سیاسەتی تازە نابێت پەیوەندیی بکرێت بە کەسایەتی و سەرکردە کوردەکانەوە، دەبێ کورد هان بدرێت بەبێ مەرج ملکەچی حکومەتی عێراقی بن[606]. لەبەر ئەو هۆیانە بوو ئینگلیز حکومەتی نوری سەعیدی رووخاندو لە جێی ئەوە لە 3ی حوزەیرانی 1945 حکومەتی حەمدی پاچەچی درووست کرد، حکومەتی تازە مافی کوردانی لە بڕیاری 25ی کانوونی ساڵی 1945ی هەڵوەشاندەوە لەگەڵ هەموو ئەو بەڵێنانەی درابوون بۆ پەرەپێدانی ناوچە کوردییەکان. هەریەك لە مستەفا عومەری وەزیری ناوخۆ و تەحسین عەلی وەزیری بەرگری دژی هەموو رێوشوێنێك وەستانەوە، کە لە بەرژەوەندیی کوردان بێت[607].

بە هۆی نەبوونی پارتێکی جەماوەریی هاوهەڵوێست و پشتیوان بۆ شۆڕشی بارزان و نەبوونی یەکڕیزیی نێوان سەرکردە کوردەکان حکومەتی هێنایە سەر چارەسەری سەربازیی. پارتی هیوا بوو پشتیوانی شۆڕشی دەکرد ئەویش تەنیا نوخبەیەکی شارنشین بوون و لە بڵاوکردنەوەی رۆژنامە و بەیاننامە و ناردنی زانیاری بەو لاوە هیچی تریان لە دەست نەدەهات. پارتی هیوا لە ناوخۆیاندا یەکدەنگ نەبوون لە پشتگیریی شۆڕشی بارزان. هیوا ببوونە دوو باڵ، باڵی راستڕەو بە سەرۆکایەتی رەفیق حیلمی، کە

---

Committee to Major general John Holding Washington, 12 October 1946. FO, 371\52667 Persia, Confidential March 15, 1946. No, 65. Sur Bullard to Mr. Bevin- .

[605] - A modern History of Kurds, p.282.

[606] -کۆچیرا: 334

[607] – Jwaideh, p689.

سەرۆکەکەیان پێیوابوو جوڵانەوەی بارزان خێڵەکییە و خزمەتی بەرژەوەندیی نەتەوایەتی ناکات. هەورەها ئەم خەتەیان پەیوەندیی بە ئینگلیزەوە هەبووە و ئامادە نەبووە ئینگلیز لە خۆی تووڕە بکات[608].

بەهۆی لێکترازانەوە هیوا توانای خۆی لەدەست داو تەنیا وەکو راگەیاندن مابووونەوە، بەڵام زۆربەی ئەفسەرانی ئەندام لە هیوا چوونە پاڵ جوڵانەوەی بارزان، ئەفسەرە کوردەکان لە چوارچێوەی لیژنەی ئازادی کاریان دەکرد بە سەرۆکایەتی مستەفا بارزانی، کە لە 21ی کانوونی دووەمی 1945 پێکهێنرا بۆ ئیدارەی شۆڕش، بە شێوەی سەرەکی شۆڕش بە سەرکردایەتی و پێشمەرگەوە لەسەر شانی بارزانییەکان بووە، ئەفسەرە کوردەکانیش رۆڵی فەرماندەی سەربازیی شۆڕشیان بینیوە.

ئەو قسەیەی کە دەڵێین بارزانییەکان رۆڵی سەرەکییان هەبووە لە سەرکردایەتی شۆڕش و هێزی لێدان لە جوڵانەوەی دووەمی بارزان، ئەمە شتێکە و ئەوەی کە شۆڕش نەبووە و جوڵانەوەیەکی خێڵەکی بووە، خەمی کوردستانیان وەکو نیشتیمان لەئەستۆ نەگرتووە شتێکی ترە. مەکدواڵ دەڵێ: هیچ بەڵگەیەکی بەرجەستە نییە لەسەر ئامانج و دەستپێکی نەتەوایەتی جوڵانەوەی دووەمی بارزان[609]. دکتۆر بورهانەدین یاسین رای

---

[608] - پاکیزە رەفیق حیلمی: ل 53، پشتگیریی هیوا بۆ بارزان حیزبی کردە دوو باڵ: باڵی یەکەم ئەو ئەندامە بوون لەژێر کاریگەری چەپو دۆستایەتی بۆ یەکیەتی سۆڤیەت هەتا لە رەفیق حیلمی و ماجید مستەفای رزگاریان بێت و حیزب نەکەوێتە بندەستی ئینگلیز، ئەم باڵەیان زاڵ بووە. لە پاییزی 1945 هیوا لێکترازاو 350 ئەندام جیا بوونەوە و چوونە ناو پارتی شۆڕشی مارکسی. بەڵام باڵی راسترەو بە سەرۆکایەتی رەفیق حیلمی (فەرماندەی باڵا) دڵنیا بوون ئینگلیز دەسەڵاتی باڵایە لە عێراق و پێویستە کورد دۆستایەتی بکات لەپێناو بەدەستهێنانی خواستە نەتەوایەتیەکانی، روسیاش دەوڵەتێکی گەورەیە، بەڵام لە بارودۆخی کوردستانەوە دوورە. ئەم باڵەیان قورسایەتیان لەناو کوردا نەمابوو، چونکە ئینگلیز قورسایی لەناو کورد نەمابوو بەهۆی پشتگیریی لە ئەندازە بەدەری بۆ حکومەتی عێراقی دژی کورد. لە راستیدا هیوا بە راسپاردەی ئینگلیز لە بەرئەنجامی پێویستەکانی شەڕی جیهانی دروست ببوو، ئێستا شەڕ کۆتایی هاتووە و ئینگلیز پێویستی بە پشتگیریی کورد نەماوە، دڵنیایە بە پشتگیریی ئەوان حکومەتی عێراقی دەتوانێ بە شێوەی سەربازیی چارەسەری کێشەی کورد بکات. (بڕوانە: نەجاتی عەبدوڵڵا: حیزبی هیوا 1939-1945)، دوو رەوت یەك کۆتایی، رابوون، ژمارە (26)، 1999، ص62.

[609] -McDowell, p.293-294

مەکدواڵی پشتڕاست کردۆتەوە. هەریەك لەو دوو بەڕێزانە پشتیان بەستووە بە بەڵگەنامەکانی بەریتانی، کە بریتی بووە لە نامەکانی نێوان بارزانی و ئەفسەرە سیاسییەکانی ئینگلیز لە عێراق[610].

بارزانی لە پاییزی 1943 حکومەتی عێراقی بە نوێنەریەتی موحەممەد سەعید تکریتی کەوتە جەولەیەکی دانووستانەوە. تکریتی فەرماندەی هێزەکانی عێراقی بووە لە کوردستان. کورتەی ئامانجەکانی بارزانی بریتی بووە لە:

لێبووردنی گشتی بۆ خۆی و لایەنگرە بارزانییەکانی.

گەڕانەوەی بارزانییە دوورخراوەکانی حیلە بۆ شوێنی خۆیان.

لێبوردنی گشتی بۆ ئەو پۆلیسە بارزانیانەی پەیوەندییان بە شۆڕشەوە کردووە.

زەوی‌و زاری دەستبەسەراگیراوی خۆی بۆ بگەڕێتەوە.

ناوەڕۆکی ئەم ئامانجانە پەیوەندییان بە ماف نەتەوایەتیەوە نییە[611]. بەڵام بە خوێندنەوەیەکی خێرا بۆ رووداوەکانی شۆڕش دەبینین لەلایەك بارزانی هەتا جیٚ پێی خۆی کردۆتەوە مەبەستی راستەقینەی خۆی شاردۆتەوە، لەلایەکی ترەوە حکومەتی عێراقی و باڵیۆزخانەی بەریتانی بڕیاری شاڵاوی راگەیاندنیان داوە دژی بارزانی و ئەو شاڵاوەش بە ئاراستەی شێواندنی رووی راستەقینەی شۆڕشی بارزان بووە هەتا لە جەماوەری کوردی دابڕن، بەوەی جوڵانەوەیەکی خێڵەکییە. پێشتر ئاماژەمان پێدا حکومەتی عێراقی لە سەرەتای راگەیاندنی شۆڕشەوە بە ڕووداوی ناوچەیی ناوی بردووە، ئەوەی پاڵنەری بارزانی بوو بۆ شۆڕش بە "هۆکاری شەخسی رووت و بیٚ دەرامەتی و هەژاری" ناوی بردووە[612].

مەسعود بارزانی لەو بارەیەوە دەڵیٚ: (بە هەموو رێگەیەك ئەفسەرانی بەریتانی هەوڵیان داوە بارزان و ئەفسەرە نیشتیمانپەروەرەکان لێك دابڕن، هەموو توانایان

[610]- Vision or Reality? P.124.

[611] -FO, 371\140041 Review of events in Iraq During 1943. January 24, 1944. From British Embassy in Baghdad to Foreign Office: DSDF, 890G\1674, NA. From the American Legation in Baghdad to the Department of State November 13, 1943. cited in Yassen, p.125.

[612] - شیر محمد: ص192.

خستبووە گەڕ بۆ دابڕینی بارزان لە ڕۆشنبیرانو بێبەشکردنی لە پیاوی کارامە و تواناکان، تا لە ناوەڕۆکی نەتەوایەتی دابیبڕن و نیشانی بدەن، کە جوڵانەوەیەکی یاخیگەرییە، ئەو جوڵانەوەی لە ساڵی 1943وە ڕەنگی داکوتابوو خۆی بەهێز کردبوو، بیخەنە ئەو بازنەی کە هۆزێکی سەرەڕۆ ئەنجامی داوە)[613].

لە ناوەڕاستی کانوونی یەکەمی 1943 سیر کەیهان کۆرنەوالیس لە بەرانبەر نوری سەعید نیگەرانیی خۆی دەبڕی، بەوەی شۆڕشی بارزان وای لێهاتووە "بۆتە شۆرش لە پێناو مافی نەتەوایەتی کوردی"[614]. ئەمە بۆ بارزانی شاراوە نەبووە و لە بەیاننامەی لیژنەی ئازادی کە لە 15ی شوباتی 1945 دەرچووە هاتووە: (من دەزانم حکومەتی عێراقی هەوڵی لێکدابڕینی مەسەلەی بارزان و جوڵانەوەی کورد دەدات، بەڵام ئێمە دژی ئەوە دەوەستین و ئامانجمان رزگارکردنی کوردستانە)، تا دوژمنانی بارزانیش وەکو زەعیم حەسەن مستەفا دانی بەوە داناوە، کە دوای پەیوەندییکردنی ئەفسەرانی کورد لە ئەندامانی هیوا، جوڵانەوەی بارزان گۆڕا بۆ جوڵانەوەیەکی نەتەوەیی[615]. هێژا وادی جووەیدە بۆچوونێکی ترمان دەداتێ و دەڵێ: ئەگەر لە سەرەتاوە گومان هەبووبێت لە نیازی نیشتیمانییەتی شۆڕشی بارزان، دوای سەرکەوتنی مەلا مستەفا گومانمان نامێنێت باوەڕ بکەین، کە خاوەنی پەیامی بەدیهێنانی خواستی نەتەوایەتی کوردیی بووە[616].

لەڕاستیدا مەلا مستەفا تاکە سەرکردەی کورد نەبووە ئینگلیز بە خێڵەکی ناوی ببات، ئەوان ویستویانە متمانە بەتایبەت لە سەرکردە کوردەکان وەرگرنەوە، بڵێین ئەوانە خێڵەکی و شێتن و بەرگی نیشتیمانییان بۆ مەبەستی خۆیان بەکارهێناوە، هەر بەو شێوەش مامەڵەیان لەگەڵ سمکۆ و شێخ مەحمود و شێخ ئەحمەد کردووە، ناگونجێت پیاوێکی وەکو مەلا مستەفا بارزانی بە خێڵەکی بمێنێتەوە لەکاتێکدا پیاوێکی زۆر هەستیار و چاودێرێکی وردی ڕووداوەکان بووە، سەرەڕای ئەو بارودۆخە قورسەی تا ساڵی 1943 بەسەریدا هات، زیاد لەوە زیرەك و تێڕوانینی وردی هەبووە، چۆن دەبێت هەستی کوردایەتی نەبێت لەکاتێکدا ئەو لە خانەوادەی شێخ عەبدوسسەلامی بارزانییە،

---

[613] - ثورة بارزان، ص65-66.

[614]- کۆچیرا: ل225.

[615] - البارزانیون، ص65.

[616] Kurdish Nationalism Movement,, p.694

که له پێناوی کوردایەتی کوژرا، به چاوی خۆی شۆڕشی ئاراراتی بینیووە، خۆی و برایەکانی ئازاری بێبەشی و ئاوارەییان دیووە، هەر لە منداڵییەوە خانەوادەکەی خەریکی کوردایەتی بوون، چۆن ئەو ماوە زۆرەی لە سلێمانی بووە نەکەوتۆتە ژێر کاریگەریی کوردایەتی، کە سلێمانی لە ئاوڕەحمان پاشای بابانەوە لانکەی کوردایەتی بووە، هاوزەمانی ئەو دڵنیامان دەکەنەوە، کە ئەو ماوەی لە سلێمانی بووە لێکۆڵینەوەی کەلتوری شێخ مەحمودی کردووە و لەژێر کاریگەریی خانەوادەکەی ئەودا بووە، شێخ لەتیفی کوڕی شێخ مەحمود لە نزیکەکانی مەلا مستەفا بووە، بەشداریی کۆبوونەوەکانی رێکخسنی برایەتی بووە، پەیوەندیی پتەوی بە پارتی هیواوە هەبووە، شێخ لەتیف لە کاتی هەڵاتنی بۆ بارزان هاریکاری بووە[617].

ئەگەر پشتگیریی خێرای هیوا بۆ شۆڕشی بارزان بەهێند وەربگرین، ئەوە بەڵگەیە لەسەر نەخشەی پێشتری نێوان بارزانی و هیوا پێش ئەوەی بارزانی لە سلێمانی هەڵبێت.

لە سەرەتای هەڵگیرسانی شۆرشی بارزان و لە هەموو دانووسان و نامەگۆڕینەوەکان لەگەڵ بەرپرسانی عێراقی بارزانی جەختی کردۆتەوە لەسەر ئەوەی کار دەکات بۆ بەرژەوەندیی نیشتیمانی. لە چاوپێکەوتنی ماجید مستەفا لەگەڵ مەلا مستەفای بارزانی لە 7ی کانوونی دووەمی 1943 لە مێرگەسوور بارزانی داواکاریی شۆرشی کوردی خستۆتە بەردەم حکومەت، کە پێکهێنانی ویلایەتی کوردستانی تێدابوو لەژێر دەسەڵاتی بەرپرسێکی کوردیی بە پلەی وەزیر لەگەڵ هاوبەشیی بەهێزی کوردان لە هەموو وەزارەتەکانی عێراق[618]. ئەو داواکارییانەی بەر لە 60 ساڵ بارزانی دایە حکومەتی عێراقی داواکاریی ئەمڕۆی پارتە کوردییەکانە لەسەر فیدراڵیەت.

لە 15ی شوباتی 1945 لیژنەی ئازادیی بە سەرۆکایەتی مستەفا بارزانی پێکهات، یەکێك لە ئامانجەکانی (لیژنەی ئازادی) ئازادکردنی هەموو کوردستان بووە بە رێگەی ئاشتیانە[619]. ئەگەر بارزانی پیاوێکی خێڵەکی بوایە بۆچی پارتێکی سیاسیی تازەی وەکو ئازادیی بۆ ئیدارەی شۆرش پێکدەهێنا؟ بۆچی یەکێك لە ئامانجەکانی شۆڕش

[617] -کۆچێرا: ل218، بڕوانە: Kurdish Nationalist Movement. pt, 2. p.671-674

[618] -- Kurdish Nationalism Movement, p.678.

[619] - اردلان: ل42.

ببووه رزگارکردنی کوردستان؟ مارف جیاوك ئەوکات موتەسەریف بووە لە سلێمانی و خۆشەویستی خانەوادەی بارزانی بووە، ئاگادار بووە کە ئەو خانەوادەیە بەهۆی کوردایەتییەوە تووشی ناخۆشی بوون، دەبینین جیاوك لە پەیوەندییەکی تەلەفۆنیدا لەگەڵ بارزانی دەڵێ: (من لە موتەسەڕیفیە بووم و زەنگی تەلەفۆن لێدرا، مایکرۆفۆنەکەم هەڵگرت دەنگێکم هاتە گوێ بە دەنگی مەلا مستەفا دەچوو، گوتم: پێموایە مەلا مستەفا بێت؟ وتی: چۆن دەمناسی...؟ وتم: ناتوانم ئەوەی هەیە بە تەلەفۆن بیرت بخەوە (نامەی جیاوك بۆ شێخ ئەحمەد.. "دانەر").، چونکە دەبێت سەرنج بدەیت و پێش ئەوەی هیچ روو بدات کارەکان رێك بخەیت، ئەوەی من دەبیستم و لە ئێوەم گوێ لێدەبێت لە ئاسمانی ئێوە لیلّی و ئاکامی توندی لێدەکەوێتەوە، تکایە بیهێننە پێش چاوی خۆتان لە ساڵی 1932 چیتان لێ بەسەرهات، نووسەر" لەگەڵ دواڕۆژەکانی ژیانی ئاوارەییتان لە سلێمانی لە کوشتن و برسیەتی و سوکایەتیپێکردن، دوای ئەوە بۆ هەمان چارەنووس رێگەتان گرتەبەر[620].

لە نیسانی 1944 بۆ نیسانی 1945 لە هەموو نامەگۆڕینەوە و دانووسانەکانی جەختی لەسەر ئەوە کردۆتەوە، کە تەنیا گرفتی بارزانییەکان نییە، بەڵکو کێشە مافی کوردانە بەگشتی. لە کانوونی یەکەمی 1944 لە نامەیەکیدا بارزانی داوای لە حکومەت کردووە لیوایەکی تازە بۆ قەزا کوردییەکانی سەر بە موسڵ بە ناوی دهۆك دابمەزرێنێت و جێگری هەموو وەزیرەکان لە بەغدا کورد بن، بە ئەندازەی 144000 پاوەنی ئیستەرلینی بە قەرز بدرێتە نوسینگەی بارزانی هەتا خەرجی بکات بۆ قەرزی کشتوکاڵی و چارەسەرکردنی برسیەتی کوردستان[621].

لە مایس و ئابی ساڵی 1945 بەر لە هەڵگیرسانی شەڕ مەلا مستەفای بارزانی لە هەموو چاوپێکەوتنەکانیدا لەگەڵ موتەسەریفی هەولێر و ئەفسەرانی ئینگلیز لە کوردستان بە ناوی راوێژکاری سیاسییەوە لە هەموو ئەوانە بە بارزانییان وتووە، کە حکومەت ئامادەی دابینکردنی ئاسایش و بوژانەوەی ئابوورییە بۆ خۆی و هۆزەکەی بەرانبەر وازهێنان لە مافی کورد. بارزانی لە هەموو ئەوانە دڵنیای کردوونەتەوە، کە کێشەی ئەو تایبەت بە خۆی یان بە هۆزەکەی نییە، بەڵکو کێشەی ئەو مافی کوردانە. لە

---

[620] - مأساة البارزان المظلومة... ص 179

[621] - McDowell, p.292

نامه و وتارەکانی باس لە بەڵگەنامەی ئەتڵەنتی کردووە، کە تایبەتە بە مافی گەلان و بەریتانیا لایەنێکی سەرەکی ئەو بەڵگەنامەیە. شێوازەکانی بارزانی لە ئیدارەی ململانێش خێڵەکی نەبووە، ئەوەتا بارزانی بە لقی بەغدای پارتی هیوا دەڵێ: بە ناوی دیموکراتی باڵیۆزی دەوڵەتانی ڕۆژئاوا بۆ مافی کوردیی بدوێنن[622]. دەبینین ئەو شێوازەی مستەفا بارزانی گرتبوویە بەر لە ئیدارەی ناکۆکییەکان خێڵایەتی نەبووە.

بارزانی ورد لە ئایندەی گۆڕانکاری و ڕووداوەکان گەیشتبوو، چاکی دەزانی حکومەت سوور نییە لەسەر بەجێهێنانی بەڵێنەکانی و بەریتانیا لە هێرشی حکومەت بۆ بارزان پشتیوانی حکومەت دەکات، بۆیە پەیوەندیی کرد بە نوێنەری ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و ڕووسیای سۆڤیەتی، تا لەسەر کورد هەڵوێستیان بزانێت. ئەوەی شایانی باسە بە ماوەیەکی کەم لە هەڵگیرسانی شەڕ دەسەڵاتدارە سەربازییەکانی ڕووسیای لە کوردستانی ئێران بە وردتر ژەنەراڵ سیماندۆڤی بینی. ئەمە بۆ مسۆگەر کردنی داڵدەیەکی ئەمین بۆ ئەو کاتەی هێزەکانی بە ناچاریی پاشەکشە دەبن.

بۆ باڵیۆزی حکومەتی ئەمریکی لە بەغدا دەنووسێت و بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ پەیوەندییکردنی بە ڕووس دەردەبڕێ، دەڵێ: (حکومەتی بەریتانی و عێراقی مەبەستیانە بە راشکاوی هێرشی دوژمکارانەمان بکەنە سەر بە بیانووی هاندانی دەرەکی دژی عێراق، ئێمە ئەوە رەت دەکەینەوە، هیچ دەستێکی دەرەکی بە نهێنی لەپشت جوڵانەوەکەمانەوە هەبێت)[623].

سەعید قەزازی موتەسەریفی هەولێر سەرکۆنەی مەلا مستەفای کردووە بەوەی پەیوەندیی بە نوێنەری ڕووسیەوە کردووە و ئەمەشی بە ناشایستە داوەتە قەڵەم، بارزانی لە وەڵامی ئەمەدا وتویەتی: هەموو بەڵێن و پەیمانێکتان شکاند و دەرگاکانتان لێ داخستم، چارم نییە و لەپێناو کێشەی ڕەوای کورد لە هەموو دەرگایەك دەدەم. ئێمە لە هەڕەشەی گەورەکانی تۆ ناترسین، چ جای هەڕەشەکانی تۆی خزمەتکار و زەلیلی ئەوان[624].

---

[622] - اردلان، بارزانی‌و نهێنیەکانی، ل63-65، 92.

[623] - مسعود البارزاني: ثورة بارزان ، ص67.

[624] - هەمان سەرچاوە، ل67.

لەگەڵ دامەزراندنی کابینەی پاچەچی حکومەت بە ئاشکرا لە پێناو رازیکردنی ئینگلیز و هەڵۆکانی سوپای عێراقی خۆی بۆ شەڕی کوردستان ئامادە کرد، لەکاتێکدا هەڵۆکان لە فەرماندەکانی سوپا لەو بڕوایەدا بوون دەرفەتی پێویستیان نەدراوەتێ یاخیبوانی بارزان چاوترسێن بکەن، حکومەتیان تاوانبار دەکرد بەوەی کە سستی نواندووە لەگەڵ تاوانبارانی بارزان. پێیانوابوو "وەسی"و وەزیر هەڵە بوون، بەوەی پێشوازییان لە پیاوێکی یاخی وەکو بارزانی کردووە و رێگەیان بە "ئەفسەرە توندڕەوەکانی کورد" داوە، ئەو ئەفسەرانەی پەیوەندییان بە مەلا مستەفا کردووە، ئەو پێشوازییە رەوایەتی بەخشینە بە یاخیبوون دژی حکومەت[625]. سکاڵای ئەوانە و سیاسییە ناسیۆنالستەکانی عەرەب لە بەغدا بەرهەڵستی حکومەت بوون لە بەرانبەر بانگکردنی ئەفسەرەکانی کورد و ئاگربەستی خێراو ئاشکرا لە کوردستان، چونکە بارزانی سوودی لێوەرگرتووە بۆ بەهێزکردنی پێگەی خۆی لەناو هۆزەکان. حەسەن مستەفا دەنووسێ: بارزانی 10 مانگی "کۆتایی ساڵی 1944 بۆ سەرەتای ئابی 1945" بەدەرفەت زانی بۆ سەردانی هۆزەکانی بارزان لە دهۆکەوە بۆ ئاکرێ و دەشتی هەریر و شەقلاوە. ئەو سەدان جەنگاوەرەی لەگەڵ خۆی دەبرد بۆ سەرنجراکێشانی هۆزەکان یان ترساندنیان تا بچنە پاڵ جوڵانەوەکەی و پروپاگەندە بکەن دژی حکومەت. لەو گەشتانەی پشتگیریی مەحمود ئاغای زێباری و 600 لە جەنگاوەرەکانی مسۆگەر کرد، لەگەڵ پشتگیریی مەحمود خەلیفە بە 400 جەنگاوەر و دینۆی سەید تەها بە 100 جەنگاوەر، لەگەڵ پشتگیریی چەندان سەرۆك هۆزی زاخۆ و ئامێدی[626]. لە ژمارەی رۆژی 6ی حوزەیرانی 1945 رۆژنامەی تایمزی بەریتانی "نزیك لە حکومەتی بەریتانی" لەسەر پروپاگەندەکانی عێراق دژی بارزانی هاتووە: (مەلا مستەفا وەکو حاکمی ئەو هەرێمە هەڵسوکەوت دەکات، دەست وەردەداتە کاروباری هۆزەکان و ئیدارە و خۆراك و قەدەغەکردنی بەڵێندەران لە بنیاتنانی شەقام و قوتابخانە و نەخۆشخانە، کۆمەڵێك چەکداری راگرتووە بۆ ترساندنی ناحەزەکانی)، دیارە ئەمە رای فەرمی حکومەت بووە لە شاڵاوی راگەیاندن بۆ شێواندنی راستییەکان ئەگینا بارزانی سوور بوو لەسەر داواکاریی بۆ دامەزراندنی شەقام و قوتابخانە و نەخۆشخانە بۆ ناوچەکە.

---

[625] - **حسن مصطفی: ص**61-62.

[626] - **هەمان سەرچاوە،** 68-72.

بارزانی بۆ دەستگرتن بەسەر قەیرانەکە فەرمانی بە ئەفسەرە کوردەکانی ئەندامانی ئازادیدا خۆیان بدەنە دەست ئەفسەرە راوێژکارە سیاسییەکانی ئینگلیز تا بە ئاسانی بیانگەڕیننەوە یەکە سەربازییەکانی خۆیان، بەڵام بە پێچەوانەی هەموو بەڵێنەکانیان میر حاج و مستەفا خۆشناو و موحەممەد قدوسیان گرت و دواتر دوریان خستنەوە بۆ فەرمانگە مەدەنییەکان. ئەو ئەفسەرانە بە دۆستایەتی بۆ بزوتنەوەی کوردایەتی ناسرابوون و دووبارە مەترسییان هەبوو بگیرێنەوە، بۆیە هەموویان هەڵاتن بۆ ناوچەی بارزان[627]. لە20ی حوزەیرانی 1945 بارزانی لە یاداشتنامەیەکی بۆ باڵیۆزی بەریتانی لە بەغدا لەسەر هەموو ئەو پێشێلکاریانەی رێککەوتنامە واژۆکراوەکانی نێوان خۆی و حکومەتی نوری سەعید بەم شێوە دەنووسێ: (پێچەوانەی هەموو بەڵێنەکان حکومەتی پاچەچی کاری دوژمنکاریی دژی کورد ئەنجام داوە، حکومەت چەندان هەراسانکاری کردووە، لەوانە بنکەکانی سەربازی و پۆلیسی لە بارزان زیاد کردووە، بە بیانووی مەشقکردن بۆ جەنگە شاخاوییەکان لە هەوڵی داگیرکردنی بەرزاییە ستراتیژییەکانی هاوسنووری بارزانە، فەرمانی دەرکردووە بۆ گرتنی هەموو ئەو بارزانیانەی دەچنەوە بۆ فەرمانگە حکومییەکان. حکومەت لە هەوڵدایە بێ بیانوو گوندەکانی بارزان بۆردوومان بکات و نەهێڵی مەلا مستەفا سەردانی هۆزە کوردییەکان بکات[628].

ئەفسەرەکانی بەریتانی وستویانە بارزانی رازیی بێت، کە حکومەت نەخشەی نییە بۆ داگیرکردنی ناوچە کوردییەکان بەڵکو تەنیا هەوڵیداوە هەندێ مەشقی سەربازی لە شاخەکان بکات. بارزانی بە توندیی وەڵامی داونەوە: (بۆ ئەو جۆرە مەشقانە جارێکی تر گرژیی بە حکومەتی عێراقەوە دەبینم)[629]. ئەو هۆکارانە رێگەیان خۆش کرد بۆ پێکدادانی سەربازیی لە نێوان هێزەکانی حکومەت و مەلا مستەفای بارزانی. لەکاتێکدا هەردوولا لە کۆتایی ساڵی 1944وە خۆیان بۆ ئەو شەڕە چاوەڕوانکراوە ئامادە کردبوو.

---

[627] بارزان و نهێنیەکانی، ل39-41.

[628] - هەمان سەرچاوە. ل90-91.

Kurdish Nationalism Movement, p.698.

[629]- مسعود البارزانی: پورە بارزان، 58-59.

له 8ی ئاب حکومەتی پاچەچی بڕیاری ڕاگەیاندنی شەڕی دەرکرد لەسەر بنەڕەتی ئەم خاڵانەی خوارەوە:

1- پەرەسەندنی بارودۆخی زێبار و دەوروبەری گەیشتۆتە ئاستی وێرانی و مەترسی.

2- بارزانی و دارودەستەی کاری تاوانکاری و مەترسی بۆ سەر ئاسایش ئەنجام داوە.

3- بۆ گەڕانەوەی ئاسایش و نەهێشتنی کاری تاوانکاری بڕیارماندا بە شاڵاوی سەربازیی ناوچەکە داگیر بکەین و تاوانباران بگرین و دادگایی دادگەرانەیان بکەین.

هەروەك جیاوك ڕوونی کردۆتەوە و جۆری ئەو تاوانەی بارزانییەکانی دیاریی نەکردووە، بۆ جێبەجێکردنی ئەو بڕیارە سەعید قەزاز لە بەیاننامەیەکدا داوای لە هۆزەکان کردووە هاوکاریی بارزانییەکان نەکەن و هەڕەشەی لێکردبوون لە ئاکامی بەشداریکردن. لە 19ی ئابی 1945 ئەحکامی عورفی لە ڕەواندز و ئامێدی و دهۆك و ئاکرێ ڕاگەیاندرا، لە 1ی کانونی یەکەمی 1945 ئەنجومەنی عورفی عێراقی بە غیابی حوکمی بۆ 35 کەس لە ئەفسەر کوردەکان و شێخەکانی بارزان دەرکرد[630]. یەکەم پڕیشکی هەڵگیرسانەوەی شەڕی نێوان هەردوولا لەناو مەخفەری پۆلیسی مێرگەسوور بە کوشتنی ئۆلو بێگی خاڵی مەلا مستەفا بارزانی دەستی پێکرد.

بۆ درێژەی ڕووداوەکانی شەڕ خوێنەر دەتوانێ بگەڕێتەوە بۆ هەردوو کتێبی مەسعود بارزانی و مارف چیاوك، لێرەدا درێژەی پێنادەین، بەڵام وەکو لەو بەڵگەنامانەی خوارەوە بەدیار دەکەوێ هێزەکانی بارزانی توانییان زیانی گەورە بە سوپای عێراقی بگەیەنن، حکومەت بە تەنیا بە دوو ڕێگە توانی خۆی لە تێکشکانی چاوەڕوانکراو دەرباز بکات: یەکەمیان، بەهۆی پشبەستن بە هۆزە بەکرێگیراوە کرێگرتەکانی ناوچەکە[631]. دووەمیان: دەستێوەردانی ئینگلیز بە هەموو قورساییەکی خۆیەوە، بەتایبەت هێزی

---

[630]- جیاوك، مأساة البارزان المظلومة، 184-186

[631] -مەسعود بارزانی دەنوسێ: دوای ماوەیەکی کەم ژمارەیەکی کەم لە سەرۆك هۆزەکان لە بەڵێنەکانی خۆیان ڕاستگۆ بوون، زۆربەیان هاوشانی حکومەت چەکی خیانەتیان کردە شان و بوونە کرێگرتە). بڕوانە: ثورة بارزان، ص77.

ئاسمانی پاشایەتی و ئەفسەرە پسپۆڕەکانی، کە نەخشەکێش و جێبەجێکاری زۆربەی چالاکییە سەربازییەکان بوون.

## FO, 628\91
## بابەت: چالاکییە سەربازییەکان لە باکوور، سوپای عێراقی، زۆر نهێنی.
1577 –31 –45

**وەزارەتی بەرگریی**

**نێردراوی سەربازی. وێنەیەك بۆ عەقید. 20ی سیڤەری MC\DSO\CB**

**وێنەیەکتان لە کۆنووسی 1945/9/23 کۆبوونەوەی حکومەت بۆ دەنێرین لە کۆشکی پاشایەتی، هەروەها لەگەڵ کتێبی ژمارە 130|G132.**

**4522–30–1077 بە مێژووی 1945/9/22.**

**عەقید. سەرۆکی نێردراوی سەربازی بەریتانی HHC\JJW**

**کۆنووسی کۆبوونەوەی کۆشکی پاشایەتی لە بەغدا لە 23ی ئەیلولی 1945**

1ـ وەسی "عەبدولئیلا" پرسیاری لە سەرۆك وەزیران کرد لە بابەت بارودۆخی باکوور، کە جیاوازیی چییە لە نێوان تێڕوانینی حکومەتی عێراق و سەرۆکی نێردراوی سەربازی بەریتانی لە عێراق؟ ئەم پرسیارە ئاڕاستەی سەرۆك وەزیران و وەزیری بەرگریی و ناوخۆ کرابوو، وەڵامی بدەنەوە.

2ـ لە سەرەتای مانگی ئابەوە وەزیری ناوخۆ روونکردنەوەی دابوو لەسەر ئەو بارودۆخە، لە زیادکردنی بەرچاوی هێزەکانی سەربازیی و ئاراستەی پەیوەندیی پێوەکردنی هۆزەکان بە مستەفا بارزانی، وەزیری ناوخۆ مەترسی دابوو، ئەگەر چالاکییە سەربازییەکان دوابکەوێ بۆ 1946 /1/1 یاخیبوون بەرفراوانتر بڵاو دەبنەوە، بۆیە پێویستە خێرا چالاکییە سەربازییەکان دەست پێبکرێت، بەڵام وەزیری ناوخۆ دەڵێ: قەناعەتی دواخستنی نێردراوی سەربازیی بەریتانی لە بابەت چالاکییە سەربازییەکانەوە تێگەیشتووە، هەروەها وەزیری ناوخۆ دەڵێ: راکێشانی هۆزەکانی کورد بۆ حکومەت زۆر گرنگە، بەو پاڵپشتیە دەتوانین لیوای حکومەت لە دینارتە لە لەناوچوون رزگار بین،

ئەگەر چالاکییە سەربازییەکانمان دوابکەوێ ناتوانین پشتیوانیی ئەو هۆزانە دەست بخەین.

3- وەزیری ناوخۆ دەڵێ: یەکەم جار ناکۆك بووم لەگەڵ بۆچوونەکانی پشکنەری گشتی "بەریتانی" لە کۆتایی مانگی تەمووز گوێم لە عەمید رید گرت وەکو وەزیری ناوخۆ، کە گەیشتمە ئەو باوەڕە هەر ئێستا چالاکی سەربازیی دەست پێبکرێ. چەند جار وەزیری بەرگریی جەختی کردەوە، کە زانیارییەکانی میستەر رید بڕوای پێهێنام پێویستە چالاکی سەربازیی دەست پێبکرێ. هەروەها وەزیری بەرگریی رایگەیاند، کە لەگەڵ نەخشەی پشکنەری گشتی ناکۆکم لە ئامێدیەوە هێرش بکرێ، چونکە ئەو ناوچەیە مەترسیدارە و هۆزەکانی ئەوێ ناحەزمانن، دوای ئەوە وەسی داوای پرسیاری لە پشکنەری گشتی کرد، ئەو یاداشتنامەیەی لەو بارەیەوە هەیە بیخوێنێتەوە.

4- یەکەم کەس وەزیری ناوخۆ وەڵامی بیرخەرەوەکەی دایەوە، وتی: پێویستە بە خێرایی لە دینارتەوە بۆ سەر "بیراکبرا" هێرش بکرێ، سەرەڕای ئەوە چەندەی دەگونجێت هێرش بکرێتە سەر شاخی "پێرس"، لەهەمان کات لە مێرگەسوورەوە هێرش بکرێتە سەر "مەزنە"، وەزیر روونی کردەوە، کە گرتنەبەری رێوشوێن بۆ گرەنتی پشتگیریی هۆزەکانی ناوچەکە تەواو بووە. وەزیر لەو روونکردنەوەیەدا دەیوت باش تێدەگەین لەو حاڵەتەی هێرش دەکرێتە سەر "بیراکبرا"و بلە لە هێزی مرۆیی ناتەواویمان هەیە بۆ مسۆگەرکردنی سەلامەتی هێڵی پەیوەندیی سوپا، بەڵام وتی: بۆ پاسەوانی هێڵی پەیوەندیی هەوڵ دەدەین خەڵکی زیاتر لەناو هۆزەکانی دۆستی حکومەت هێزی پۆلیس چەکدار بکرێ، هەروەها لەو باوەڕەدام پشتگیریی ئەو هۆزانە ناتەواویەکانمان بۆ پڕ بکاتەوە. وەزیر ئاماژەی بەوەدا، ئەگەر ئێستا هێرش نەکرێت، ئەوە هەڵوێستی هۆزە دۆستەکان دەگۆڕێ لە بێلایەنییەوە بۆ نەیاریی، مەلا مستەفا لە زستان دەتوانێت هێزەکانی رێك بخاتەوە، بۆیە مانەوەی ئەو هێزانە لە بیراکبرا زۆر پێویستە، وەزیر لە لێدوانەکانیدا دەیوت پشکنەری گشتی لەو باوەڕەدایە سوپا لە 1946/1/1 ئامادەی هێرش بردنە، بۆچی ئێستا هێرش ناکرێ؟ وەسی وڵامیدایەوە، کە راپۆرتی پشکنەری گشتی روونی کردۆتەوە، کە هێزەکان لە مانگی تشرینی یەکەم ئامادەی هێرشن بە مەرجێ رێوشوێنی پێویست لە ئامادەکاری و مەشق هەبێت.

5ـ وەزیری بەرگریی پشتگیریی وەزیری ناوخۆی کرد لە بانگەشەی پێویست بۆ هێرش بردن، بەڵام هێرشکردن بە ڕێگەی خەلان ـ ڕێزانی پێ باشتر بوو، لەو شوێنەی وەزیری ناوخۆ پێشنیاری کردبوو، وەزیری بەرگریی لەسەر قسەکانی بەردەوام بوو، باسی ئەو چالاکییە سەربازییەی کرد، کە مانگی ئەیلولی ڕابردوو کردبوویانە سەر ئاکرێ، هەموو ئەوەی رووی دابوو لە خەمساردیی ئەو پرۆسەیە خستیە ئەستۆی فەرماندەی سەربازیی، دوایی بیانووی هەموو ئەو فەرمانانەی هەبووە بە دامەزراندنی ئەفسەری شارەزا لە شەڕ، بەڵام مەرج نییە باش بن، پێش ئەوەی وەزیر ڕەفیق عارف دابمەزرێنێ بەرهەڵستیی توند هەبووە بۆ ئەو دامەزراندنەی، دەستەی ئەرکانی گشتی (C.G.S) لەو بڕوایەدا بوو ڕەفیق عارف پیاوێکی زیاتر تیۆرییە و ئەزموونی نییە.

6ـ دەستەی ئەرکانی گشتی بە توندیی ڕەخنەی لە نەخشەی پشکنەری گشتی گرت، کە دەڵێ: ئامانج لە هێرشکردن لێدانی بارزانییەکانە نەك بارزان، هێرش بە ڕێگەی مێرگەسوورەوە گونجاوترە لە ڕێگەی خەلان، کە بە دارستانی چڕ دەورە دراوە، دەستەی ئەرکانی گشتی زۆر بە توندیی بانگەشەی وەزیری ناوخۆی ڕەت کردەوە بە پاڵپشتی و چەکدارکردنی خێڵەکانی بارزان لیوایەکی سوپایان لە دینارتە رزگار کرد لە لەناوچوون، دەستەی ئەرکان بانگەشەی ئەوەی بوو، کە ئەوان ئەو لیوایەیان لە دینارتە رزگار کردووە، بە دەرکردنی بڕیار بە گواستنەوەی لیوای یەکەم لە ئاکرێ بۆ "هوشتکە" لەپێناو پشتیوانی لەو لیوایەی دینارتە، بەڵام دەستەی ئەرکان ئەوەی بەدیار نەخست، کە هێزە خێڵەکیەکانی لایەنگری حکومەت ڕێوشوێنی پشتگیری و گواستنەوەی برینداره‌کانی ئەنجام دابوو، دوایی سەرۆکی وەزیران بە سەرسوڕمانەوە، بەڵام بە دەنگی هێدی بۆ ئەو بابەتە لەسەر شارەزایی خۆی لە جووڵانەوەکانی بارزانی یەکەم قسەی کرد.

7ـ دوای ئەوە "وەسی" بڕیاریدا وەزیری ناوخۆ و وەزیری بەرگری و دەستەی ئەرکانی گشتی و پشکنەری گشتی بچنە باکوور، بۆ ئامادەکردنی ڕاپۆرتێك لەسەر باری مەیدانی. حکومەت بڕیاریدا نابێت هیچ ڕێوشوێنێك بخرێتە پێش گەیشتنی ئەوان بە شوێنی دیاریکراو و ئامادەکردنی ڕاپۆرتی ناوبراو. وەزیر گفتوگۆیەکەی کۆتایی پێهێنا بە خستنەڕووی ناوی لیستی پێویستییەکان، کە لە ((U.C.I.G.Sی سەر بە وەزارەتی

جەنگی وەردەگرێ، ئەمە هەمووانی تووشی دڵخۆشییەکی گەورە کرد "لە ناویاندا وەزیری دارایی"، کۆبوونەوەکە بە دڵخۆشی هەمووان کۆتایی هات.

8- لەو کاتەی پێیان چاك بوو بڕۆن وەزیری بەرگریی بیرخەرەوەیەکی لەسەر ((Ansonsدا بە وەسی کۆشك "عەبدولئیلا".

9- چەندان جار وەسی جەختی کردۆتەوە، کە حکومەتی ئازاد ئاگاداری پەرەسەندنی بارودۆخەکە بووە، بەڵام باڵادەست بووە بەسەر ڕێڕەوی گفتوگۆکان، هەروەکو لە زۆربەی سەرنجەکانی بەدیار دەکەوێ، کە پێش کۆبوونەوەکانی بە چەند ڕۆژێك لە بارودۆخەکەی باکوور یاداشتنامەی پشکنەری باڵای خوێندۆتەوە و لێی تێگەیشتووە.

## یاداشتنامەیەك لەسەر بارودۆخی باری ئێستای سەربازیی کوردستان

لە 6ی ئاب چالاکییە سەربازییەکان لەلایەن لیواوە لە باپشتیانەوە دەستی کردووە بە هێرش بردن بەرەو سیدەکان. دوای زیانی (90) تا (100) پێکراو، لیوا تەنیا (5) میل چووە پێشەوە و ناچاری پاشەکشە بووە بۆ باپشتیان.

لە 4ی ئەیلول چالاکییە سەربازییەکانی لیوا لە ئاکرێ بەرەو مێرگەسوور، دوو لیوا لە باپشتیانەوە بە ئاڕاستەی مێرگەسوور دەستی پێکردووە.

پێموایە حکومەت ویستویەتی پێش 20ی ئەیلول دەست بگرێ بەسەر دۆڵی بارزان، لەو بەرواره ئەو هێزە بە دووری (7) میل بەرەو ئاکرێ پێشڕەوی کرد، هێزی باپشتیانیش بە (8) میل چووە پێشەوە. پێکراوی هەردوو هێز گەیشتۆتە (100) کەس و لەدەستدانی (3) چەکی ڕەشاش، لێرەوە هەردوو هێز هیچ سەرکەوتنی تریان بەدەست نەهێنا بێجگە لە دەستبەسەراگرتنی پردی "زەنتە" ئەویش لە 7ی ئەیلول.

لەبەر ئەم هۆکارانەی خوارەوە هێرشەکان تووشی شکست بوو:

چالاکییە سەربازییەکان بە پەلە ئەنجامدراون و هەموو لیواکان نزیکەی (500) سەربازی خۆیان لەدەستداوە، ئەمەش بووە هۆی ناردنی سەنگەری لاواز، کە یاخیبوانیش بە ئاسانی دەستیان بەسەردا گرت.

بەکارهێنانی زۆری ئەو سەربازە بێ مەشقە تازانەی لە عەممارەوە هێنابوویان بۆ ئەو هێرشە، تەنانەت سەربازێکیان بێجگە لە (n.205) نەیدەزانی چەك بەکار بهێنێت.

نەخشەی سەربازیی هەڵە، هێرشی بەرەیی بۆ سەر ئاکرێ و چیای پێرس چاوەڕوانی نوشستی لێدەکرا، هەروەها هێرش لە ڕێگەی مێرگەسوورەوە هێزێکی زۆر پێویست بوو بۆ سیدەکان، کە خەسارەیەکی گەورەی دەوێ، چونکە لە بنەڕەتەوە ئەو نەخشە سەربازییە هەڵە بووە.

دانانی ئەفسەری مەشق پێنەکراو.

زەعیم ئسماعیل سەفوەت فەرماندەی هێزەکانی ڕەواندز، مەشقی بە هێزەکانی نەکردبوو، وەکو تێیگەیشتووم بەبێ نەخشەی پێشوەخت هێرشی بردبوو، هێزەکانی دەرفەتی ئاگاداریو لێووردبوونەوەی نەبووە، ڕێگەیان پێنەدرابوو زانیاریی پێشوەخت وەربگرن، دواتر بە شەو هێرشیان بردبوو بەبێ ئاگادارکردنەوەی ڕەبیە نزیکەکانی حکومەت.

عەقید ئەحمەد حەمدی شارەزای مەشق نەبووەو ساڵی پێشتر تووشی داڕوخانی دەروونی ببوو، کەچی سەرکردایەتی لیوای پێنجەمی کردووە.

موقەدەم عاسی حەموود، فەرماندەی هێزی پیادە بوو، شارەزای مەشق نەبووەو پێشتر لە فەسیلی لیوای پاسەوانی بووە لە بەغدا.

سەرۆکی یەکەم حەسەن مستەفا ئەفسەری نایابی تۆپخانە، لەو ڕۆژەی چالاکییە سەربازییەکان دەستی پێکردووە، کردبوویانە فەرماندەی فەسیلەیەك لە پیادە و هیچ کارامەیی لێی نەبووە.

موقەدەم عەبدوڕڕەزاق عەبدولوەهاب. پێشتر کارامەیی نەبووەو کرابووە فەرماندەی فەسیلی چوارەمی تۆپخانەی شاخاوییەکان.

موقەدەم خەیروڵڵا حوسێن. کرابووە فەرماندەی فەسیلی پیادەو پیشتر لە مانۆڕە سەربازییەکانی بە ناوی دۆستانە ئەنجام درابوو نوشستی هێنا بوو، خەیروڵڵا حوسێن بایەخی بە بەرژەوەندیی پیاوەکانی نەدەدا.

شۆڕشگێڕان چالاکییان نەنواند، بۆیە کارەسات ڕووی نەدا، ئەگینا هیچ حیکمەت نییە ئێستا پشت بە ئەوانە ببەسترێت.

## ڕاسپاردە

ئەگەر ئەم خاڵانە بەهێند وەرگیرێ لە بەهاری داهاتوو چالاکییە سەربازییەکان کۆتایی دێت:

تیپێکی سەربازیی و فەسیەلەیەکی پاشکۆ لە زستان ڕێوشوێنی بەرگریی لە هێڵی باپشتیان بگرنەبەر، لەگەڵ چاودێریکردنی پردی مەزنە ـ ئاکرێ، دوو لیوایەکەی تر بە نۆرە بۆ ماوەی 6 هەفتە بحەسێنەوە، هەر لیوایەك بە نۆرە مەشق بکەنو وەزیر نەخشەی تەواوی مەشقیان بداتێ.

فەرمانی ئەوانەی ماوەی خزمەتیان لە سوپا کۆتایی هاتووە جێبەجێ بکرێ، سوپا بە دانانی لیژنەیەکی بەسەربازگرتن بەهێز بکرێ."پێشنیارم وایە نورەدین مەحمود و یەك لە ئەندامانی نێردراوی سەربازیی ئەندامی ئەو لیژنەیە بن". ئەرکی ئەو لیژنەی ئامادە کردنی سەرژمێریی گشتی بێت بۆ هەموو فەسیلو یەکەکانی ڕاستەوخۆی سەر بە وەزارەتی بەرگریی، لەگەڵ ناردنی هێزی زیادە بۆ مەشق هەتا ببێتە هێزێکی جەنگاوەر.

شاڵاوێکی تازە بۆ سەربازگرتن ئەنجام بدرێ.

موچەی خۆبەخشەکان زیاد بکرێ.

بە بۆچوونی من دانانی یاریدەدەر بۆ عەقیدی چالاك زۆر پێویستە بۆ ئەو ئەرکە تازەیە.

*ـ دوور خستنەوەی ئەو ئەفسەرانەی مەشقیان نەکردووە لە شوێنی شەڕ بەتایبەتی زەعیم ئیسماعیل سەفوەت.

پێشنیار دەکەم ڕەفیق عارف بکەنە فەرماندەی فیرقەی دووەم. فەرماندەیی لیوای پێنجەم بدەنە موقەدەم غازی داغستانی. بەرپرسیاریەتی لیوای یەك بدەنە موقەدەم مەحمود سیرت. لە دوای لێکۆڵینەوە بەدیار کەوت، کە عەقید یاسین مەحمود لە بەجێهێنانی ئەرکە سەربازییەکەی لە دینارتە نوشستی هێناوە لەو پایەی لابرێت. بۆیە لەسەر ئەو بابەتە بۆچوونی خۆم دەردەبڕم، پێکهێنانی فەسیلێکی پاڵپشت لە ناوچە شاخاوییەکانی نێوان شەقلاوەو پیرمامو خەلیفان هەتا مەشق بکەنو لە (10٪) هێزی یەدەك بن بۆ ئەوەی لە کاتی شەڕ جێگەی پێکراوەکان بگرنەوە.

دەبێت هێزەکانی لیوای پێنجەم پەیوەندیی بکەن بە هێزەکانی تری فیرقەی ناوچەکە لە خەلیفان و باپشتیان.

دەبێت لە سەرەتای وەرزی بەهار بە درێژایی رێگای خەلیفان هێرش بکرێتو خالان، رێزان بکرێنە مەیدانی شەڕ، هەموو هێزەکانی فیرقەی دوو بەشداری شەڕ بکەن. لەویَ رێگەیەکی شاخاوی هەیە دەتوانریَ بەکاربێت بۆ هێنانی پێویستی بۆ بلە، وەکو من تێدەگەم حکومەت مەبەستی نییە رێگەی ئامێدی ـ بلە بکاتەوە، بۆیە چاکترە بەکار بهێنرێت.

لە زستان هەڵوێستی هێزەکانی حکومەت بەرگریی دەبێت، بەڵام پێش هێرشی بۆ سەر ئوردو شوێنەکانی دوژمن چەند هێرشێکی سنووورداری تاکتیکی دەکات.

پێمخۆشە جەخت بکەمەوە سەر بۆچوونی خۆم، هەر هەوڵێك بدرێت بۆ پێشخستنی کاتی دەسپێکردنی چالاکیە سەربازیەکان بۆ زستان یان پاییز ئەو بەشێکی زۆری ئەو هێزە لەدەست دەدەینو زیانی گەورەمان لێدەکەویَ، ئەمەش بەهۆی سستی ئاستی مەشقو ئامادەکاری.

پێویستە هەر ئەم هەفتەیە ئەو هێڵە گشتیانەی ئەو هێرشە دیاریی بکرێت، هەتا پێویستییەکان ئامادە بکرێن، لە بەتانیو خێمەو..هتد. بۆ دەستەبەری پێویستییەکانی نیشتەجێبوونی زستانەی هێزەکان. دەبێت ئەم هەنگاوانە پێش زستان بنرێن.

ئەگەر ئەو شارانەی بۆ بازگانی پشتی پێدەبەستن وەکو ئاکریَ، ئامێدی، زاخۆ گەمارۆ بدرێنو گوندەکانی ناوچەکە بۆردوومان بکرێت، ئێستا حاڵی دوژمن باش نییە، ئەگەر کار بەو راسپاردانە بکرێت ئەوە دوژمن لە زستان لاواز دەبێت.

**JMLR\OUFI**
**1945\9\22**

## وانەو پەند

بارزانی وەکو سەرکردەیەکی سەربازیو سیاسی رۆڵی سەرەکی بینی لە ئامادەکردنی شۆڕشی دووەمی بارزان. سەرکەوتنە سەربازیەکانی لە گەشتی یەکەم "تشرینی یەکەمو دووەمی 1945"و گەشتی دووەم "مایسو ئابی 1945" بەڵگەیە لەسەر بلیمەتی سەربازیی مستەفا بارزانیو باڵادەستی جەنگاوەرەکانی لە بەرانبەر هێزەکانی سوپای عێراق. سوپای عێراقی بەبێ هێزەکانی بەریتانی نەیدەتوانی سەرکەوتنی تەواو مسۆگەر بکات، بەتایبەت بێ پشتیوانیی یەکەی ئاسمانی هێزەکانی پاشایەتی. سەرکەوتنی کۆتایی وەکو شەڕەکانی شۆڕشی 1930ـ1931 دەگەڕێتەوە بۆ باڵیۆزخانەی بەریتانیو نێردراوی سەربازی پاشکۆی ئەوان لە بەغدا.

ناوچەی بارزان هەروەکو سلێمانیو دەوروبەری سالانی شۆڕشی شێخ مەحمود 1918–1932 بەهەمان رێگە دەستی بەسەرداگیرا. ئەو پڕوپاگەندانەی حکومەتەکانی عێراقی لەگۆڕنا، کە ئینگلیز لە پشت بزووتنەوەکانی کوردەوەن. لەراستیدا ئەگەر پشتگیرییە بەهێزە بەردەوامەی ئینگلیز نەبوایە بۆ حکومەتی عێراقی، ئەوە کوردستانی عێراق بەم سنووری سیاسیەی ئێستایەوە نەدەبووە بەشێکی عێراق. هەروەها کپبوونی هیوا لە جۆشدانی جەماوەری کوردیی لە دەرەوەی بارزان بەڵگەیە لەسەر لاوازی بیرۆکەی نەتەوایەتیو دەستەوەستانی نوخبەی مەدەنی *.

شۆڕشی دووەمی بارزان لەگەڵ بەرژەوەندییەکانی بەریتانی لە عێراق و بەرژەوەندیی ئاغاکانی زێبار و هەرکی و سورچی و شێخەکانی لۆلان نەدەگونجا، ئەمەش هۆکاری بنەڕەتی بوو لە نووشستی ئەو شۆڕشە. لەسەر سەرکردەکانی کورد پێویست دەکات، ئەگەر لە بەرانبەر هێزێکی هەرێمی یان نێودەوڵەتی وەستانەوە دۆستایەتی یەکێك لە هێزە گەورەکان مسۆگەر بکەن، هەروەها لە ناوەوە ماڵی کوردیی رێك بخەن، تا لە دەرەوە نەکرێتە کارتێك بۆ لێکترازان، ئەمانەش لە گرنگترین بنەماکانی سەرکەوتنە لە جەنگە چارەنووسسازەکان.

---

* - لێرەدا سەردەمی سەرکردایەتیکردنی بزاڤی رزگاریخوازی کورد لەلایەن ئەو سەرکردانەوە کۆتایی هات، کە نوسەر بە "سەرکردە تەقلیدییەکان" ناویان دێنێ، نووسەر لایەنگری ئەوانە لەسەر حیسابی نوخبەی خوێندەواری نەتەوەخوازی ئەوکات، کە لە پارتو رێکخراوە کوردیەکان خۆی دبینێتەوە، کەچی سەردەمی ئەو سەرکردە تەقلیدیانە کۆتایی هاتو سەرکەوتن یاوەریان نەبوو.. "وەرگێڕ".

میژووی کورد لە سەدەی بیستەم چەندین گۆڕانکاریی گرنگی لە خۆگرتووە، گرنگترینیان گۆڕانکارییەکانی ساڵانی 1945و 1946ی لەدایکبوونی کۆماری کوردستانە لە مهاباد، چەندین لێکۆڵینەوە لەسەر ئەزمونی مێژووی مهاباد کراوە، بەڵام ناوبەناو ئەو رووداوە زیاتر هەڵدەگرێ لەسەری بوەستین، بەتایبەتیش لەژێر رۆشنایی ئەو بەڵگەنامە فەرمیانەی لە رووسیا و ئێران و بەریتانیا و ئەمریکا دەردەکەون، هەندێکیان مەحمودی مەلا عیزەت لە کتێبی "کۆماری مهاباد: نامەو دیکۆمێنت ـ بەشی سێیەم" خستوونییە ڕوو، ئەم توێژینەوە سوودی لەو بەڵگەنامانە وەرگرتووەو دەیەوێ رووداوەکان بە تێڕوانینی رەخنەگرانەی تازەوە هەڵبسەنگێنێ، بەڵام بۆ لێکۆڵینەوەیەکی بابەتیی لەو جۆرە پێویستە لە ئایندەدا سوود لەو بەڵگەنامە پەیوەندیدارانەش وەربگیرێ، کە زۆربەیان لە باکۆ و تاران نەخراونەتە بەردەستی توێژەرەوان، ئەمەش وای کردووە ئێستاش لێڵیو ئیشکالیاتی یەکلایی نەکراوە مابێت، بەتایبەتی لە بابەت سەرهەڵدانو رووخانی کۆماری کوردستان.

پێموایە کۆمەڵێك هۆکاری ناوخۆیی و هەرێمی و نێودەوڵەتی هەبوون لە بەدیهێنانی خەونی سەد ساڵەی کورد بۆ دامەزراندنی قەوارەی نەتەوایەتی، لە بەرامبەردا کۆمەڵە هۆکارێکی ناوخۆییو هەرێمیو نێودەوڵەتی هەبوون بۆ لەباریەك بردنی ئەو ئەزمونە ساوایە، وا دیار بووە کورد بە دامەزراندنی کۆماری مهاباد "بە مەبەست یان بێ مەبەست" ویستویەتی زاڵ ببێ بەسەر ئەو رژێمە فەرمیە هەرێمیانەی دەرهاویشتەی رووداوەکانی شەڕی یەکەمی جیهانیو رێککەوتنامەی سایکس بیکۆ و لۆزانی بیستەکانی سەدەی بیستەمن، ئەمەش لەلایەن هێزە هەرێمیو نێودەوڵەتییەکانەوە قبوڵنەکراو بووە.

لە وتارێکی تر لە بابەت بارودۆخی کورد لە بیستەکانی سەدەی بیستەم لە کوردستانی رۆژهەڵاتو بە وردتر لەسەر "بزوتنەوەی سمکۆ" چووینە سەر هەندێ لایەنی کێشەی کورد لە ئێران، کۆشتنی سمکۆ لە ساڵی 1930 بەدەستی هێزەکانی رەزا شا دەستپێکی گەورەی سیاسیی بووە بۆ شەڕی لەناوبردنو قڕکردنی کورد، بۆیە دەبێت لێرەش پێش ئەوەی بچینە سەر باسەکەمان بە کورتی تیشك بخەینە سەر بارودۆخی سیاسی لە دوای کوشتنی سمکۆ لە کوردستان.

## ڕەزا شا و کورد

لە زۆر لایەنەوە ڕەزا شا لەژێر کاریگەریی مستەفا کەمالی تورکی دابووە، بەتایبەت لە بنیاتنانی دەوڵەتێکی سیکۆلاریزمی لەسەر شێوازی ڕۆژئاوا، ڕەزا شا ئەو سیاسەتەی بە ناوی: "ئێرانی" ناو دەبرد، کە تواندنەوەی هەموو نەتەوەکانی تری نافارسی تێدا بەرجەستە دەبوو، بۆ ئەو مەبەستە ئێرانی لە دەوڵەتێکی لامەرکەزیو دابەشکراو لەسەر بنەمای ئەیالەت گۆڕی بۆ دەوڵەتێکی ناوەندی سەپێنراو.

ڕەزا شا دەستی کرد بە دژایەتیکردنی دەستووری بنەڕەتی ئێرانی ساڵی 1907، بەتایبەت ئەوەی پەیوەندیی هەبووە بە دابەشکردنی ئێران بۆ ئەیالەتو پاراستنی مافی نەتەوە نافارسەکان، بەتایبەتیتر لە بابەت مافی فەرهەنگیو قسەکردن بە زمانی دایك[632]، ئەوەی ناونابوو چاکسازی، کە لە دواکەوتوییو ئازار بەو لاوە هیچی تری لێ شین نەبوو، وەکو چاکسازییەکانی کوڕەکەی (موحەممەد ڕەزا شا) دلڕەقیو بەڕۆژئاواییکردنی رووکەشانە بووە، نەچووە ناو کرۆکی کێشە کۆمەڵایەتیو ئابوریەکانەوە، بۆ بەدەستهێنانی ئەو سیاسەتە لە کوردستان بە هەوڵی فەرماندە تەقلیدیەکان (سەرۆك خێڵو پیاوانی ئاینی) کەوتنە پیلانی دووبەرەکینانەوەی خێڵەکی لەناو کورد.. هەندێ لەوانەی بە نازناوی شانازیو دیاری مەعنەویو ماددیی کەم بایەخ، وەکو ئەنگوستیلەیەکی زێڕ یان ئەنگوستیلەیەکی ئەڵماس سەرنجی ڕاکێشرابوون، بەڵام ئەو پیاوە ئاینیانەی ملکەچی نەبوون بۆ ویلایەتە دوورەکانی شیرازو خوراسانو تارانی دوور خستنەوە[633]، لەدوای کوشتنی سمکۆ، ڕەزا شا هێرشی بەرفراوانی بۆ داماڵینی چەك

---

632-Atabaki Touraj. Azerbauyjan: Ethnicity and Autonomy in Twentieth Century Iran (London:British Academy Press. 1933) pp. 13-15

633 - کوردستان (ڕۆژنامەی حکومەتی کوردستان) لە ژمارەی ڕۆژی 1946/11/1 نووسیویەتی: یاسای ساڵی 1911 لەلایەن شای قاجاریەوە لە دوای فشاری گەورەی زانایانو جەماوەرەوە بە ناوی بزوتنەوەی مەشروتیە "بزوتنەوە لەپێناو دەستوور" دەرچووە. میستەر بۆلارد باڵیۆزی بەریتانی لە تاران لە باسی ئەو پرۆژەدا دەڵێ: پڕە لە دژیەك و نەگونجاویی نێوان بەندەکانی. بۆ نمونە دەستوور دەسەڵاتی داوە بە کارگێڕی خۆیەتی ویلایەتەکان، بەڵام روونی نەکردۆتەوە چۆن؟. بەپێی دەستوور دەسەڵاتی ئەنجومەنی کارگێڕی لیواکان زیاتر سروشتی راوێژکاری هەیە، حاکم لە ویلایەت دەسەڵاتی یەکلایی دەکرێتەوە. بڕوانە: FO, 371/52667 Persia No, 65 March 3. 1946.

دەست پێکرد، لە سەرەتاوە نرخێکی کەمی دانابوو بۆ ئەوانەی چەك دەگەڕێننەوە بۆ حکومەت، دواتر دەسەڵاتیدا بە جەندرمەی ئێرانی بە کوشتنو دوورخستنەوەی هەموو ئەوانەی گومانیان لێدەکرێ چەکیان هەبێت[634].

سەرەڕای نەبوونی پرۆژەی پەرەپێدانی کشتوکاڵیو ژێرخانی پیشەسازیی ناوخۆ، سەرچاوەی سامانی ئاژەڵیو کشتوکاڵی بە دواکەوتوویی مابۆوە، بە تایبەتیش توتن، بریکارەکانی حکومەت گەنمو تووتنیان بە زۆر لە جوتیارانی کورد دەکڕیەوەو بە نرخێکی زۆر گرانتر لە بازاری ئێرانیو لە دەرەوە دەیانفرۆشتەوە، بەمەش کوردستان رووبەڕووی سیاسەتی دواکەوتوویيو برسیەتی ببۆوە[635].

کاربەدەستانی ئازەری، کە پێیاندەوتن: "عەجەم" بۆ سیاسەتی برسیکردنو تۆقاندن بەسەر کوردەوە سەپێنرابوون، ناکۆکی مێژوویی لە نێوان کورد و عەجەم ریشەی مێژوویی هەبووە، ئەمەش بۆ هۆکاری خێڵایەتیو ئابووری دەگەڕایەوە، وەکو ناکۆکی لەسەر خاوەندارییەتی زەوی، چونکە ئەوان شاریو کورد گوندنشین بوون، سەرەڕای ناکۆکی مەزهەبی، کە عەجەم شیعە مەزهەبو کورد سوونني مەزهەب بوون. "هەژار"ی شاعیر لەو بارەیەوە دەڵێ: (مەئموورە عەجەمەکانو پۆلیسو جەندرمە گەندەڵو ترسێنەرو زاڵم بوون، بەرتیلیان لە کورد وەردەگرت یان بە چەند بیانوویەك ئازاریان دەدان، وەکو لەبەرکردنی بەرگی کوردیو نەفرۆشتنی توتن بە حکومەت، یان

---

ئەوەی پێی دەوترا چاکسازییەکانی رەزا شا هیچ ئاکامی نەبووە، بێجگە لە زیادکردنی دواکەوتووییو نیگەرانی، چونکە ئەم چاکسازییانە وەکو چاکسازییەکانی کوڕەکەی "موحەممەد رەزا شا" خودبەسەرىو بەغەربیکردنو رواڵەتی بووە. کێشە کۆمەلایەتی و ئابوورییەکانی زیاتر قوڵکردۆتەوە. لە زەمانی شەڕی یەکەمی جیهانی "کوردێل"ی یاریدەدەری وەزیری دەرەوەی ئەمریکی نووسیویەتی: (ئێران هەتا بڵێی وڵاتێکی دواکەوتووەو 99٪ وەکو کۆیلە مامەڵەیان لەگەڵدا دەکرێ. بڕوانە:

C. Hull. The Memories of Cordel Hull. The Near Looms Big (New York. The Mcmillan ,co) Vol. 2, pp.507: 1946, F.O. 371/25667, Persia No. 65., March 3.

[634] – Department of State of Oficer of Strategic services oss, No,2707 March 5, 1945. Tribal policy in Iran s Domestic and Foreign policy. Washington 1945.

[635] – یغما، ژمارە، 80 بەرگی 2 ساڵی 1952.

پارچەیەك قوماشیان لە بازرگانەکان دەسەند، یان لەبەر ئەوەی خزمەتی دیوەخانەکانیان نەکردووە سزا دەدران، ئەو کاتەی کارمەندێك یان پۆلیسێکی ئازەری لە کوردستان بمردایە قوڕ بەسەر کوردان دەبوو، هەتا ئەگەر بە مردنی ئاسایی خۆشی بمردایە، سزای بەکۆمەڵ دەدران، کار گەیشتە ئەوەی چەکیان لە ماڵەکەت دادەنا هەتا دوایی سزات بدەن‌و هەندێ پارەت لێ بستێنن[636].

دکتۆر عەبدوڕڕەحمان قاسملۆ لەو بارەیەوە دەڵێ: (ژەندرمە، کە ئەوکات پێیان دەوتن (ئەمن = ئاسایش) جەماوەری کوردستانی بێزار کردبوو، گەنجەکانی کورد بە زۆر راپێچی خزمەتی سەربازیی دەکران‌و بەرتیل بە شێوەیەکی گشتی بڵاو ببۆوە)[637].

لە کوردستان شا بۆ ئەنجومەنی ئێرانی "پەرلەمان" پشتی بە ئەفسەرەکانی سوپا دەبەست، ئەمەش لەسەر بنەڕەتی دۆستایەتی بۆ ئێران، بەڵام ئەو کەسانە "ئەندامانی ئەنجومەن" لەلای کورد هیچ نرخێکیان نەبووە، هەروەها رەزا شا دەستی دابووە سیاسەتی بەزۆر نیشتەجێ کردنی هۆزە کوردییە کۆچەرییەکانی سنوورەکانی عێراق‌و تورکیا، ئەمەش زیانێکی زۆری بە کۆمەڵگای کوردیی گەیاند، چونکە یەکێك لە پێگەکانی ژیانی کوردەواریی وێران کردو هۆزەکانی کورد زیانی گەورەیان لێکەوت[638].

کورد بەتەنیا لە مافی سیاسیی و کۆمەڵایەتی‌و ئابووری بێبەش نەبوو، بەڵکو لە ناسنامەی نەتەوەییش بێبەش کرابوو، لەو ماوەیەدا حکومەتی ئێرانی بانگەشەی ئەوەی بوو، کە کورد ئێرانییەکی رەسەنە‌و کوردستانیش بەشێکە لە ئێران، هەتا هەتایە لە خاکی ئێران جیانابێتەوە، زمانی ئەدەب‌و کەلەپوری تایبەت بە خۆی نییە‌و زمانی کوردیی شێوە زارێکی زمانی فارسییە[639]. لە ساڵانی 1921ـ1941 بەرنامەی پێشوەخت‌و درێژخایەنی دانابوو بۆ دەستبەسەراگرتنی نەریت‌و مێژوو و فەرهەنگی

---

[636]- هەژار: چێشتی مجێور، پاریس 1997، ل54-55.

[637]- د. عبدالرحمن قاسملو: اربعون عاما من الکفاح من اجل الحریة. ترجمة: دکتور عزالدین مصطفی رسول، جزء الاول، ص26.

[638] - Department of State of Oficer of Strategic services. Research and Analysis Branch, No, 2707 “Tribal Problem in Iran s Domestic and Foreign Politics” Washington March 15, 1945

[639]- Amir Hassan pour (The Nationlist Movements in Azerbailan and Kurdistan. 1941-1946. p.54

کوردیی، بۆ نموونە لە ساڵی 1934 شا مەرسومێکی دەرکردبوو بۆ هەڵوەشاندنەوەی زمانە ئێرانییە نافارسییەکان، لەسەر دیواری فەرمانگەکانی دەوڵەتو خوێندنگاکان دەیانووسی: (فارسی سخن بگویید– بە فارسی قسە بکە). لەسەر راسپاردەی حکومەتی ئێرانی رەشید یاسەمینی توێژینەوەیەکی نووسی بە ناوی "کوردو پەیوەستە رەگەزیو مێژوویەکانی"، لەوێدا رایگەیاندبوو، کە لە بنەڕەتدا کورد فارس بووە[640].

ئەو سیاسەتە دلڕەقانەیەش بە گوزارشتی ئێستا پێی دەڵێن "جینۆساید" یان پاکتاوی رەگەزی، هەوڵدان بۆ لەناوبردنی فەرهەنگو ناسنامەی گەلان، کە بەپێی بەڵگەنامەی جنێفی نێودەوڵەتی جۆرێکە لە جینۆساید، رەزا شا زیانی زۆری بە کۆمەڵگای کوردیی گەیاند، لە سەرەتای دامەزراندنی کۆماری کوردستان رێژەی نەخوێندەواری لەناو پیاواندا لە (95٪)و لەناو ژناندا لە (98٪) بووە، شا بە مەبەست ویستویەتی کورد بەرەو نەزانین بەرێو بە دواکەوتوویی بمێننەوە، لەوکاتەی قازی موحەممەد پشتیوانی لە هەوڵی نوێنەری کوردستان کردووە لە ئەنجومەن بۆ چاکسازیی سیاسیی و رووناکبیری لە کوردستان، یەکێك لە لایەنگرانی شا کەوتبووە بەربەرەکانیو سوێندی خواردبوو، کە ئەو قوتابخانە ناوەندیەی کە بڕیار درابوو لە مهاباد بکرێتەوە داخاتو نەیەڵێ ئەو هەوڵە سەربگرێ، ئەوەی شایانی باسە تاکە ناوەندی بووە لە هەموو کوردستان[641]، ناوەندییەکی یەك پۆلی لە هەموو شارەکانی مهاباد و سنە و بۆکان و سەقز و بانە خوێندکاری لێ کۆببۆوەو هەموو مامۆستایەکانیشی ئازەری بوون[642].

سەرەڕای ئەو زۆردارییە گەورەیەی رژێمی پەهلەوی، کورد دەستەوەستان دانەنیشت، چەند راپەڕینێکی دەست پێکرد، لەوانە لە ساڵانی 1918ـ 1929 کوردەکانی موکریان بە سەرۆکایەتی مەلا خەلیل بۆ بەرگریی لە ستەملێکراوانی کوردو بەرگریی لە دروشمە ئیسلامییەکان راپەڕین[643]، ئەو بزاڤە لە ڕووی سروشتو ئامانجەوە هاوشێوەی بزوتنەوەی شێخ سەعیدی پیران و جوڵانەوە کوردییەکانی تری سەدەی

---

[640]– قاسملو: سەرچاوەی پێشوو، ص25

[641] – سەید موحەممەد سەمەدی: ژێ کاف چی بوو؟ چی دەویست؟ چی لێ بەسەرهات؟ مهاباد 1981. ل18.

[642] – بلوریان: ئاڵەکۆك، بەسەرهاتەکانی ژیانم، ستۆکهۆڵم، ل61.

[643] – عومەر عارف،: یاداشتهاي از کردستان، خاطرات رؤوف ضیاء الدین. سنندج 1367، ل113

نۆزده بووه*، تێکۆشەرە کوردەکان دروشمی "بژی شەریعەت" یان "لا اله الا الله"و "مردن بۆ ڕەزا شا و بێدینەکانی تاران"یان بەرز کردبۆوە، بەڵام هەروەکو ڕاپەڕینەکانی پێشتری بە سەرۆکایەتی سمکۆ و جەعفەر سوڵتان و مەحمود خانی کانی سانان‌و مەحمود خانی دزڵی دڕندانە لەلایەن ڕەزا شاو ئیدارەی ئینگلیز لە عێراق‌و ئێران سەرکوت کرا، وەکو چۆن مستەفا کەمال لە دوای سەرکوتکردنی شۆڕشی شێخ سەعیدی پیران هێرشی بردە سەر مەڵبەندە ئیسلامییەکان بەتایبەت قوتابخانە زانستییەکان‌و مەڵبەندەکانی ڕێبازی نەقشبەندیی لە ناوچەکە، لە دوای ئەو ڕاپەڕینە حکومەت کۆمەڵێك ڕێوشوێنی دژی ئیسلام‌و هێما ئیسلامییە کوردییەکان گرتە بەر.

بە درێژایی سییەکانی سەدەی بیستەم، لەگەڵ ئەو فشارە سیاسی‌و مەعنەوییە توندەش جوڵانەوەی زانستی‌و قوتابخانە شەرعیەکان بەردەوام بوون لە ڕێبەریکردنی بزوتنەوەی زانستی‌و ڕووناکبیری لە کوردستان، لەو ڕێگەیەوە منداڵی کورد فێری خوێندنی کوردی‌و مێژووی کوردیی بوون.

هێمنی شاعیر دەڵێ: (لە زۆربەی گوندەکان ئەو قوتابخانە زانستیانە ببوونە مەڵبەندی کوردایەتی)[644]، زۆربەی نووسەرو سەرکردەکانی "کۆمەڵەی ژیانەوەی کورد"و خاوەنی "نیشتیمان" وەکو حەسەن قزڵجی و هێمن و هەژار و قازی موحەممەد لەگەڵ زۆربەی کادیرو فەرماندەو فەرمانبەرەکانی کۆماری کوردستان لە دەرچووانی ئەو قوتابخانانە بوون، بەڵام بەداخەوە ئەو ڕێچکەیە لە کوردستانی ئێران نەیتوانی تا سەر بەردەوام بێت، بەتایبەتی دوای ڕووخانی کۆمار ڕێبەرانی ڕێبازی نەقشبەندیی بوونە دۆستی حکومەتی ناوەندیی، هەروەکو هەژار لە کتێبی "چێشتی مجێور" ڕەخنە لەو بارە دەگرێ، کە چۆن ئاستی ئەو قوتابخانانە دابەزین‌و بوونە ناوەندی ئەفسانەو داهێنراوی پووچ[645].

---

* - نووسەر لەگەڵ دووبارەکردنەوەی ئەو گوزراشتە هەموو جارێ دەنووسێ: ڕاپەڕینەکانی سەدەی نۆزدە، بێجگە لە ڕاپەڕینی شێخ عوبێدوڵڵای نەهری ئێمە هیچ جوڵانەوەیەکی ترمان لە سەدەی نۆزدەدا لەو شێوەیە نەبوو شێخانی تەریقەت ڕێبەرایەتیان کردبێت. "وەرگێڕ".

644 - هێمن: تاریك‌و ڕوون، ل9-11.

- Foreign Office (FO) 371\1887 Persia. Teleg No. 339. Beritish Legation Tehran 12-1929.

645 - هەمان سەرچاوە، ل11.

## وێستگەکانی گەیشتن بە کۆماری کوردستان

کۆماری مهاباد بە چەند وێستگەیەکدا تێپەڕی لەوانە:

یەکەم: گرتنی ئێران لەلایەن هاوپەیمانانەوە، بەتایبەت لەلایەن رووس و ئینگلیزەوەو کەوتنی ئیدارەی شا لە کوردستان.

دووەم: رووداوەکانی ورمێی ساڵی 1942.

سێیەم: دامەزراندنی کۆمەڵەی ژیانەوەی کورد "ژێکاف" لە ساڵی 1942.

چوارەم: دامەزراندنی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران لە ساڵی 1945.

## بارودۆخی ئێران‌و دەستێوەردانی هەرێمی و نێودەوڵەتی

رەزا خان لە ساڵی 1921 وەك ئەفسەرێکی سوپای ئێرانی‌و بێ بنەڕەت‌و رەچەڵەك، توانی دوا شای قاجاری لەناو بەرێ‌و دەست بگرێ بەسەر سوپا، دوایی ببێ بە رەزا شا، لێرەوە سەردەمی پەهلەوی لە ئێران دەستی پێکردووە، دیارە کە لە بیستەکان ئینگلیز رێنومایی کردووە، بە پێچەوانەی موحەممەد رەزا شای کوڕ (1941–1979) پیاوێکی بەهێز بووە، هەوڵیداوە لە سیاسەتی دەرەوەو ناوەوە لاسایی مستەفا کەمال بکاتەوە، لە ئاستی ناوخۆ بە ناوی هاوچەرخیەتی دەستی کردووە بە رۆژئاواییکردنی کۆمەڵگای ئێرانی، لەو بوارەشدا ویستویەتی پیشەسازی‌و هۆیەکانی گواستنەوە پێشخا.

ئەڵمانیا لە سییەکانی سەدەی بیست وەکو هێزێکی جیهانی هاتە سەر شانۆی نێودەوڵەتی، شا ویستویەتی ئەو هێزە جیهانییە نوێیە بەکار بهێنێ بۆ کەمکردنەوەی پێگەی رووسی و بەریتانی لە ئێران، چونکە ئەڵمانیا بەلای بەرژەوەندیی داگیرکارییەوە نەبووە، ویستویەتی لە رێگەی پێویستی ئێران بە پیشەسازی سوپاو گەشەپێدانی هۆیەکانی هاتوچۆ پێگەی خۆی لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست بەکاربێنێ، رەزا شا سوور بوو لەسەر گۆڕینی دەوڵەتی ئێرانی فرەنەتەوە بۆ دەوڵەتێکی نەتەوەیی‌و بە فارسیکردنی گەلانی نافارس، لێرەوە ئەڵمانیا هەستی دەمارگیریەتی ئاریەتی رەزا شای بزواندووە.

لەگەڵ هەڵگیرسانی شەڕی دووەمی جیهانی رەزا شا لە سیاسەتی دەرەوە لاسایی تورکیای کردۆتەوە، لە ئەیلولی 1939 لە بەیانێکدا بێلایەنی ئێرانی لە شەڕ راگەیاندو لە ساڵی 1940 قوتابخانە ئەمریکی‌و بەریتانییەکانی لە ئێران داخستووە، هەروەها

رایگەیاند، کە سیاسەتی فراوانخوازیی ئەڵمانیای لە ئەورووپا لاپەسندە بەتایبەت بۆ بەدەستهێنانی ئەوەی پێی دەڵێن: (ڕێڕەوی پۆڵۆنی). هیتلەر بە سیاسەتی روون‌و ئاشکرا قورسایی خستەسەر رۆژهەڵاتی ناوەڕاست‌و هەوڵیداوە دەست بەسەر کەنداوی فارسدا بگرێ، بەتایبەتی دوای ئەوەی رووسیا چووە پاڵ هاوپەیمانەکان، ئەڵمانیا چەندین سیخوڕی بە نهێنی ناردبووە ناوچەکە، ئەوانە خەریکی خۆڕێکخستنی کودەتای سەربازیی بوون لە عێراق‌و ویستوویانە دەسەڵاتی تەواو بەسەر رەزا شادا بکەن، لە ساڵی 1941 کودەتای رەشید عالی گەیلانی دۆستی هیتلەر لە عێراق روویدا، ئەڵمان هەوڵیدا دەست بخاتە ناو هۆزە کوردییەکانی ئێرانەوە.

ئێران ڕێڕەوێکی گرنگی تێپەڕبوونی هاوکارییە ستراتیژییەکانی هاوپەیمانان بووە بۆ رووسیا، بۆ بەرژەوەندییەکانی کۆمپانیای نەوتی بەریتانی - ئێرانی‌و بەرژەوەندیی ئینگلیز لە عێراق، بەپێی بەرژەوەندییە ئیمپریالستیە تەقلیدیە کۆنەکە "رووس لە باکوورو ئینگلیز لە باشوور"، هەردوولا رێککەوتن لەسەر دابەشکردنی خاکی ئێران، راستەوخۆ لە ساڵی 1941 ئێرانیان داگیر کردو رەزا شایان لە پایەی خۆی لابرد، موحەممەد رەزا شای کوڕی، کە ئەوکات تەمەنی بیست‌و یەك ساڵان بووە لە شوێنی ئەویان دانا، بە واژۆکردنی رێککەوتنامەیەکی سێقۆڵی "ئێران، رووسیا، بەریتانیا" ئێران داگیر کرا، هاوپەیمانەکان لە 29ی کانوونی دووەمی 1942 ویستیان بەرگێکی فەرمی بەبەر داگیرکرنەکەیاندا بکەن، لە مادەی یەکەمی رێککەوتنامەکەدا هاتووە: ئەو وڵاتانەی رێککەوتنامەکەیان واژۆ کردووە، سوورن لەسەر پاراستنی یەکیەتی خاکی ئێران لە بەرانبەر سەلامەتی گەیشتنی یارمەتییە جەنگییەکان بە رووسیا، مادەی (14) جەختی کردۆتە سەر دەستێوەرنەدانی هێزەکانی هاوپەیمان لە کاروباری ناوخۆی ئێران.

لە ساڵی 1943 هەریەك لە چەرچڵی سەرۆك وەزیرانی بەریتانی‌و رۆزفێلت سەرۆکی ئەمریکاو ستالین سەرۆکی سۆڤیەت لە تاران گەیشتنە رێککەوتنێك، کە دواتر بە"لێدوانی تاران" ناسرا، بەو پێیە پێویست بووە هێزەکانی داگیرکەری سەر بە هاوپەیمانەکان "رووس‌و بەریتانیا" لە دوای پێنج مانگ لە کۆتایی هاتنی شەڕ لە ئێران بکشێنەوە.

## کوردستان لە ماوەی شەڕی دووەمی جیهانی

گرنگترین ئەنجامی شەڕو کەوتنی رەزا شا دووبارە سەرهەڵدانەوەی کێشەی کوردیی بووە بۆ سەر شانۆی رووداوە خۆجێیو نێودەوڵەتییەکان. ئینگلیز لە کاتی شەڕ لە ئیلام و کرماشانەوە هەتا سنە، هێزەکانی سۆڤیەتیش لە ئازەربیجان لە خوی و سەڵماس و ورمێ، تا مياندواو دەستيان بەسەرا گرتبوو، ناوچەی مهاباد بەهەر چوارلادا بە دووریی 20ـ40کم. وەکو ناوچەیەکی دابڕاو وابووە لە نێوان ئەو دوو ناوچەیەی باسمان کرد، بە جۆرێ هێزی داگیرکەری هیچ لایەکیان نەیگرتبۆوە، لەپاڵ ناوچەی مهاباد شارەکانی بۆکانو نەغەدەش مابوونەوە. کورد دەستی گرتبوو بەسەر ناوچەی مهابادو دەرووبەری، لەگەڵ دەروبەری خویو سەڵماسو ورمێو سەقزو بانە، بەڵام ناوەندی شارەکانی سەردەشتو سەقزو بانەو سنە تا کۆتایی دەسەڵاتی کۆماری کوردستان لەژێر دەسەڵاتی حکومەتی ناوەندیی تاراندا مانەوە.

گرنگترین بەرئەنجامی کەوتنی رەزا شا دووبارە سەرهەڵدانەوەی پێگەی سەرکردە تەقلیدییە کوردییەکان بووە، ئەمەش بەڵگە بووە لەسەر پەراوێزبوونو نووشستی سیاسەتی بە رۆژئاواییکردن لە ئێران و بەتایبەتی لە کوردستان[646].

رۆڵی هۆزایەتی وەکو کۆڵەکەی بنەڕەتی پێشتر گەشەی کردبوو، هەندێ لە هۆزە کوردییەکان لەناو نەخشەی سیاسی ڕۆڵی بەرچاویان گێرا، لەوانە هۆزی "شوکاك"، کە (40) هەزار چەکداری هەبووە، هەروەها هۆزی جەلالی لە سنووری باکووری شوێنی شوکاك نیشتەجێ بوون، (20) هەزار چەکداریان هەبووە، سەرۆکەکانی شوکاك لە سمکۆوە هەتا عومەر خان لەناو کورد رۆڵی سیاسیی بەرچاویان گێڕاوە.

---

[646]- Borhanedin Yasin or Reality: The Kurd in the politics of Great Powers (Lund Univ. Press. 1995) p.63-65

سەرەڕای بەزۆر بە ڕۆژئاوایکردنی کۆمەڵگای موسڵمان لەسەر ئەو شێوەی مستەفا کەمال لە تورکیا پەیڕەوی دەکرد، ئەو گۆڕانکاریانە رووکەشو کورت هەڵهاتبوو لە دەستەبژێك لە تاران، لە هەندێ لە شارە سەرەکییەکان مایەوە. لە چلەکانی سەدەی رابردوو کوردیل های وەزیری دەرەوەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، بە ئێران دەڵێ: لە بنەڕەتەوە کۆمەڵگایەکی خێڵەکیەو نەگۆڕاوە بۆ کۆمەڵگای پێشکەوتوو، زۆر دواکەوتوون، لە1%ی دانیشتوان لە 99%ی داهاتی وڵاتیان بەدەستەوەیەو گەل وەکو کۆیلە مامەڵەی لەگەڵدا دەکرێ. بڕوانە:

Hull, The Memories of Corde 11 Hull (New York: The Mcmillan Co) vo. 1

هۆزی هەرکی کە لە خوارووی شوکاك نیشتەجێ بوون لە ڕۆژئاواو باشووری رۆژئاوای ورمێ لە ناوچەی تەرگەوەڕو مەرگەوەڕ فاکتەری گرنگ بوون لە سیاسەتی کوردیی، بەتایبەتیش بە هەوڵی سەرۆکەکانیان زێرۆ بەگو رەشید بەگ لەگەڵ بچوکی هۆزەکەشیان لە کوردستانی ئێران رۆڵی باشیان گێڕاوە، ئەگەر بە ئاراستەی باشوور بڕۆین لە نێوان ورمێو شنۆیە لە ڕۆژئاواو لە سێگۆشەی سنووری تورکیاو ئێرانو عێراق هۆزەکانی بەگزادەو زازای لێ نیشتەجێن، لە باشووری ئەو ناوچەیەو بە ئاراستەی سنووری عێراقی - ئێرانی، هەوارگەی هۆزی "قەرەباغ"ی تورکی لە نەغەدە و دەوروبەری نیشتەجێن. لە سنووری باشووری نەغەدەو مهاباد بە ئاڕاستەی سنووری عێراقی هۆزی مامەشو مەنگور هەبوون، ئەو دوو هۆزەی هەتا ساڵی 1800 بەشێك بوون لە میرنشینی بڵباسی کوردیی. دیبوکری لە باشووری مهاباد نیشتەجێ بوون. قەرەنی ئاغای مامەشو ئەمیر ئەسعەدی دیبوکری رۆڵی زۆر خراپیان گێڕاوە بەوەی، کە دۆستی دەسەڵاتی ناوەندیی بوونو دژایەتی بەرژەوەندیی نەتەوایەتی کوردیان کردووە، هەروەها لە ناوچەی باشوورو بە ئاڕاستەی رۆژهەڵات لە بانە و هەورامان لە مەریوان هۆزی بەگزادە هەبووە[647].

دامەزراوەکانی دەوڵەتی پەهلەوی لە کوردستان لەگەڵ کەوتنی رەزا شاو هاتنی هێزەکانی هاوپەیمانان لێك هەڵوەشایەوە، سەربازانی ئێرانی لە بەرانبەر مانەوەی ژیانی خۆیان کۆگای چەكو تەقەمەنییان دەدایە هۆزە کوردییەکان. هێمنی شاعیر لە بیرەوەریەکانیدا دەڵێ[648]: ئەوانە لە بەرانبەر نانی وشك وەکو بەفری ناو ئاو توانەوە. لە دوای هەرەسی ئیدارەی پەهلەوی لە ساڵی 1941 سەرۆك هۆزەکان فەرمانڕەوایەتی کوردستانیان کردووە، وەکو ئەمیر گوڵ لە کرماشان و ئاغای ئاسەف لە سنە، موزەفەر ئەردەڵان لە سەقزو قازی موحەممەد لە مهاباد، قەرەنی ئاغای مامەش لە ناوچەی مامەش، عەبدوڵڵای مەنگور لە ناوچەی مەنگورایەتی[649]. میر ئەسعەدی دیبوکری لە

[647] -William Eagleton ; The Kurdish Republic of Mahabad 1946. (London. Oxford Press. 1963) pp.17-19. M. Izady. The Kurds. (Washingyon, Taylor and Frzncis Inernationanl Publisher, 1992) pp.80-86:

[648] - هەژار: چێشتی مجێور، ل59.

[649] - یاسین سەردەشتی: دوو تەلەگرافی کاربەدەستی ئێرانیو خۆفرۆشێکی کورد، ساغکردنەوەی رووداوی چەککردنی شارەوانی مهاباد، رامان، ژ12، مایسی 200،ل113.

تاران كرابووه فەرمانداری مهابادو دەوروبەری، میر ئەسعەد لەگەڵ فەرمانداری ئێرانی بە ناوی (سریع العلم) (300) پیاوی لەگەڵ خۆی هێنابوو بۆ سەپاندنی ئیدارەی حكومەتی تاران بەسەر خەڵكی مهاباد[650]. قازی موحەممەد لەلایەن پیاوماقوڵانی شاری مهابادەوە كرایە سەرپەرشتیاری كردەیی كاروبارەكانی شار، پێشتر قازی موحەممەد وەكو بەڕێوەبەری پەروەردەو فێركردن خزمەتی كردبوو، دواتر ببووە قازیی شار، كارگێڕییەكی بۆ یارمەتیدانی خۆی لە خەڵكی شار پێك هێنابوو[651]، لەلایەكی ترەوە حەمە رەشید خان سەرۆكی بەگزادە، كە بۆ كوردستانی عێراق دوور خرابۆوە هەڵاتو گەڕایەوە بانە، خۆی وەكو حاكمی شار سەپاندبوو، دەسەڵاتی ناوەندیش بە فەرمیی دانی نابوو بە دەسەڵاتی حەمە ڕەشید.

ململانێی گەرم لە ساڵانی 1941ـ1945 هەبووە لە نێوان سەركردە كوردەكان، ئەوانەی بە پشتیوانی ڕووس ویستوویانە كارگێڕیەكی خۆجێیەتی بسەپێنن لەگەڵ ئەوانەی حكومەت پشتیوانی لێدەكردن بۆ گەڕانەوەی دەسەڵاتی حكومەتی ناوەندیی بۆ ناوچە كوردییەكان، لەگەڵ قۆستنەوەی ئەو پشتیوانییەی حكومەتی بەریتانی پێشكەشی دەكرد، بەتایبەتی ئیدارەی بەریتانی لە عێراقو بەرپرسانی ئینگلیز لە ئێرانو حكومەتی ئەمریكی. ئەوەشی بۆ دووبەرەكیو تێك بەردانی هۆزە كوردییەكان بەكار دەهێنا.

لە ساڵانی 1941ـ1943 ڕووس سیاسەتێكی ڕۆشنی نەبووە لە بەرانبەر كوردو رۆڵێكی یەكلاكەرەوەشی گێڕاوە لە ململانێی نێوان كوردو حكومەتی ئێران، هەموو خەمی حكومەتی ئێرانی لەو قۆناغەدا گرەنتی بەكارنەهێنانی چەك بووە لەلایەن هۆزە كوردییەكانەوە، كە لەبەردەستیاندا بووە لە دژی هاوپەیمانەكان، هەروەها مسۆگەركردنی پاراستنی هێڵی هاتوچۆ، كە لە ڕێگەی خاكی ئێرانەوە بەناو ناوچە كوردییەكاندا تێدەپەڕێ بۆ گەیاندنی هاوكاریی هاوپەیمانەكان بە ڕووس[652].

---

[650] -هەژار: سەرچاوەی پێشوو، ل69.

[651] -Hassan Arfa. The Kurd A Historical and Political Study (London University Press, 1966) p.72.

[652]- FO, 195\25667 Persia Confidential. No. 65 Tehran 3rd March 1946 R. Bullard to Mr. Bevin.

ڕووسەکانیش بە هاوکاریی لەگەڵ ئینگلیز سوور بوون لەسەر پاراستنی ئاسایش‌و ئارامی لە ئێران، بۆیە فەرمان درابووە ئەفسەرە ڕووسەکان لە باکووری ئێران، کە پەیوەندیی بەهێز لە ڕێگەی سەرۆك هۆزەکانەوە لەگەڵ کورد دابمەزرێنن[653].

سەرەڕای ئەمە هێزەکانی ڕووس لە کوردستان بەهێز بوون، بۆیە باشترین ڕێگەچارەش بۆ پاراستنی ئاسایش بەهێزکردنی پەیوەندیی بووە لەگەڵ عومەر خانی شوکاك و زێرۆ بەگی هەرکی‌و قازی موحەممەد، ئەمەش وەکو هەنگاوێك بۆ ڕاکێشان‌و دڵڕاگرتنی کوردو دوورخستنەوەی ئاژاوە، بە هۆی ئەو سیاسەتەشەوە بووە، کە سەردارانی (30) سەرۆك هۆزی کوردی لە ساڵی 1942 بانگهێشت کردە باکۆی پایتەختی ئازەربایجانی ڕووسی، لەو سەردانەدا دیاریی گرانبەهایان دا بە میوانە کوردەکان‌و بەرنامەی خۆش ڕابواردنیان بۆ ئامادە کردبوون، دەیانویست کورد هۆشیار بکەنەوە بە پەرەسەندنی پیشەسازی‌و کشتوکاڵ‌و سەربازی لە ئازەربایجانی سۆڤیەتی‌و بیخەنە ژێر کاریگەریی ڕژێمی سۆڤیەتی[654]، ئێرانییەکان لەو باوەڕەدا بوون، کە ئەو سەردانە لە هەوڵەکانی رووسیا بووە بۆ هاندانی کورد لەسەر هەڵگەڕانەوە لە حکومەت‌و ئاشنا کردنیان بە ڕژێمی کۆمۆنیستی رووسی، لەو کاتەی حکومەتی بەریتانی ناڕەزایی هەبووە لەسەر ئەو سەردانە، سۆڤیەت وەڵامی دایەوە، کە ئەمە مانایەکی سیاسی نییە‌و بەڵکو لە چوارچێوەی سیستمی قسەی خۆش‌و پتەو کردنی پەیوەندیی ڕۆشنبیریدا بووە لەگەڵ کورد، ئەوەش بۆ بەرژەوەندیی کێشەی دەوڵەتانی هاوپەیمانان[655].

لە 12ی ئەیلوولی ساڵی 1942 ئەفسەرە ڕووسەکان لە کوردستان لە "شنۆ" کۆنگرەیەکیان بۆ کوردان بەست، بە ناونیشانی "هاریکاری‌و دۆستایەتی لەگەڵ کورد" ڕووسەکان دەیانزانی کورد لەناو خۆیاندا یەکدەنگ نین‌و دوژمنکاریی باڵی بەسەردا کێشاون، بۆ نموونە نێوانی قەرەنی ئاغای مامەش‌و میر ئەسعەدی دیبوکری، نێوانی

[653] -W.N. Howell (The Soviet Union the Kurds: A study of National Minority Problems in Soviet). (unpublished PH. D.Dissertation University of Virginia. 1965. pp.281-283

[654] - FO, 195\25667 Persia No, 65. 3rd March 1946 R. Bullard to Mr. Bevin

[655]- FO, 371\1388, British Legation in Tehran 14 January 1942. cited in Yasn Bullard. P.239

خانەوادەی قازی موحەممەد لە مهابادو سەرۆکەکانی دیبۆکری خۆش نییە[656]، بەڵام لەگەڵ ئەوەدا زۆر سوور بوون لەسەر نزیك بوونەوە لە سەرۆکە کوردەکان‌و دروستکردنی ئەو باوەڕە، کە دەسەڵاتی ناوەندیی لاوازەو ناتوانێ خۆی بەسەر کورداندا بسەپێنێ.

حکومەتی ئێرانی لە ماوەی ساڵانی 1941ـ1945 بە بەردەوامی رووسیای تاوانبار کردووە بە بزواندنی هەستی نەتەوایەتی کوردان‌و هاندانیان بۆ سەربەخۆیی و رێگریی لە بەرامبەر حکومەتی تاران لە ناردنی هێزی سەربازیی بۆ گەڕاندنەوەی دەسەڵاتی حکومەت بۆ ناوچە کوردییەکان، بەڵام رووسیا لەلای خۆیەوە نکوڵی لەو پڕوپاگەندانە کردووەو وتویەتی: بە شێوەیەکی گشتیی سیاسەتی ئەوان بە تایبەتی لە کوردستان لەسەر بنەمای دەستوەرنەدان لە کاروباری ئێران دامەزراوە، هەندێ جاریش رێگەنەدانی هێزەکانی حکومەتی ئێرانی بۆ ئەوەی نەگەنە ناوچە کوردییەکان، ئەوە لەپێناو دابینکردنی ئارامی‌و دوورخستنەوەی هەڵگیرسانی شەر بووە لە نێوان ماڵی کوردو دەسەڵاتی ناوەندیی[657]، بەڵام بە ئاماژە بۆ رووداوەکان‌و بەڵگەنامە بلۆککراوە تازەکان بە تەنیا ئەوە ناگەیەنن رووسیا پێش ساڵی 1945 نەیویستبێت، بەڵکو هەوڵی بەردەوامی رووسیا بووە سنوور دابنێ بۆ هەر چالاکییەکی کوردان، کە ئامانجی دروستکردنی قەوارە بێت بۆ کورد یان پەشێوی بخاتە بارودۆخی ئێران، ئەمەش لە مامەڵەی ڕووسەکانەوە تێبینی کراوە لەگەڵ هۆزە کوردییەکانی سەر سنووری تورکی ـ ئێرانی‌و رووداوەکانی ورمێی ساڵی 1942و پەیوەندییەکانی ئەو ماوەیەی ڕووس لەگەڵ کۆمەڵەی ژێکاف.

## رووداوی راپەرینی ورمێی ساڵی 1942

لە بەهاری ساڵی 1942 لە ورمێ راپەڕینی کورد روویداو کۆمەڵێ رووناکیی خستە سەر ئامانج‌و مەبەستی هەریەك لە لایەنە پەیوەندیدارەکان: کورد، ئێران، ڕووس،

---

[656] -کریس کۆچیرا: مێژووی کورد لە سەدەی نۆزدەو بیست دا، و/ موحەممەد ریانی، تاران1369، ل258-260.

[657]- یاسین سەردەشتی: سەرچاوەی پێشوو، ل84-85.

ئەمریکا، ئینگلیز. لە نیسانی 1942 حکومەتی ئێرانی هێزێکی حکومی پێکهێنا بۆ ئەوەی دەسەڵاتی تەواو بەسەر شاری ورمێ دابمەزرێنێ، کە ئەو هێزە بە شێوەیەکی سەرەکی پێکهاتبوو لە ئازەرییەکان، لەکاتێکدا کەوتنی رەزا شا بۆ خۆی پاڵی بە کوردەوە نا لەناو شارو دەرەوەی ورمێ جەخت بکەنە سەر ناسنامەی نەتەوەیی و هەڵگرتنی چەك بۆ گەڕاندنەوەی هەندێ لەو زەویانەی لە کاتی رەزا شا دەستی بەسەردا گرتبوو ئازەریەکانیش لە ناوچەکە زەوتیان کردبوو، کەوتنە شکاندنی کەسایەتی هەندێ لە کوردان لەناو ورمێ. یەکێك لە پیاوماقوڵانی شاریان کوشت، هۆزە کوردییەکانی دەرەوەی شار راپەرینو هاتنە فریای براکانیان لەناو شاری ورمێ، (10) هەزار چەکداری کورد گەمارۆی شاریداو دەستیان بەسەردا گرت، ئیدارەکەی ئازەریو هێزەکانی حکومەت هەڵاتنو شار کەوتە دەستی کوردان، ئەفسەرە ڕووسەکانی ناچار بوون خێرا بگەنە ورمێو نوێنەری حکومەتی تاران لەگەڵ خۆیان بهێنن بۆ گفتوگۆ لەگەڵ کورد، کوردیش ئەم داواکاریانەی خستەڕوو:

لابردنی سەربازگە حکومییەکانی نێوان مهابادو خوی.

چەکدارە کوردییەکان رێگەیان پێ بدرێ هەر کاتێك مەبەستیان بوو بچنە شارەوە.

کورد لە ئیدارەی دەوڵەت لە ورمێ نوێنەری هەبێت.

کورد هەموو مافێکی رۆشنبیریی نەتەوایەتی هەبێت.

منداڵانی کورد لە ورمێ و دەوروبەری بە زمانی کوردیی بخوێنن.

کورد زەوییە دەستبەسەرگیراوەکانیان وەربگرنەوە.

ئەو (21) کوردەی حکومەت لە ورمێ گرتبوونی ئازاد بکرێن.

لە دوای وتوێژەکانی نێوان ڕووسو ئێرانییەکانو کورد هەندێ لە مافەکانی کورد قبوڵ کرا. لە حوزەیرانی ئەو ساڵە رێگە بە حکومەت درا ئیدارەو هێزەکانی بگەڕێنێتەوە ورمێ[658]. لەو بارەیەوە د. عەبدورەحمانی قاسملو دەڵێ: (راپەرینەکە زیاتر سیمایەکی بێ سەرەو بەرەی وەرگرت، بەڵام ئاکامی سیاسی لێکەوتەوە، چەکدارە کوردەکان

---

[658]- نەوشیراوان مستەفا ئەمین: حکومەتی کوردستان، رێبەندانی 1324-1325، نەوشیروان مستەفا ئەمین: کورد لە گەمەی سۆڤیەتدا، هۆڵەندا 1993، ل53-54، کۆچیرا: سەرچاوەی پێشوو، 156-157.

کەوتنە بەربەرەکانی یەکترو بەربوونە تاڵانو زەوت کردن بەبێ بەدەستهێنانی هیچ مافێك شاریان بەجێ هێشت)[659].

ڕووداوەکەی ورمێ سەرنجی هەردوو حکومەتی بەریتانیو ئەمریکی ڕاکێشا، لە کاتێکدا وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە ساڵی 1942 بە پاساوی ناردنی یارمەتی گەورەی مرۆیی بۆ ئێران هاتبووە ئێران بۆ تەواو کردنی هەوڵەکانی بەریتانیا هەتا سەرلەنوێ حکومەتی ئێرانی لەسەر پێی خۆی بوەستێ. ئەمریکییەکان سەرقاڵی ڕێکخستنەوەی هێزەکانی ژەندرمە بوون، هەروەها وەکو ڕاوێژکاری دارایی کاریان دەکرد، لەگەڵ حکومەتی بەریتانی هاریکار بوون بۆ ئەوەی نەهێڵن ڕووس ئەو دەرفەتە بقۆزێتەوەو هەیمەنە بکاتە سەر ئێران[660].

لە ماوەی ڕووداوەکانی ورمێ حکومەتی ئێرانی داوای لە هێزەکانی ڕووسی کرد ڕێگەیان بدات هێزی زیاتر بنێرن بۆ پشتیوانی هێزی گەمارۆدراوی حکومەت لە ورمێ، بەڵام ڕووس ئەوەی پەسند نەکرد. ئێران وایدەڕبری، کە ئەم ڕەتکردنەوەیە دەست تێوەردانێکی بێ شەرمانەیە لە کاروباری ناوخۆو لادانە لە ڕێککەوتنامەی مۆرکراوی نێوان ئێرانو ڕووسیاو بەریتانیا. یاداشتنامەیەکی بۆ حکومەتەکانی بەریتانیا و تورکیا و ئەمریکا نووسی، لەوێدا هاتووە: بە مەبەستی دامەزراندنی دەوڵەتی کوردیو هەڕەشە لە ئاسایشی هەرێمی ڕووسەکان کورد هان دەدەن لە حکومەتی ناوەندیی یاخی بن[661].
بەڵام ڕووس بە پێچەوانەی حکومەتی ئێرانی باش دەیزانی ناردنی (1500) سەربازو جەندرمەی ئێرانی بە ورەی ڕووخاوەوە ناتوانن بەرانبەر (10) هەزار چەکداری کوردی، مەسەلەیەکی مەترسیدارە، بۆیە هەوڵیدا لە ڕێگەی وتوێژەوە مەسەلەکە یەکلایی بکاتەوە[662]. لە 6ی مایس حکومەتی ئەمریکی لەسەر سکاڵای سەرۆك وەزیرانی ئێرانی عەلی سوهەیلی، کوردێل هالی وەزیری دەرەوە برووسکەیەکی بە پەلەی دایە باڵیۆزی

---

[659] - قاسملو: سەرچاوەی پێشوو، ل39-40.

[660] - Bullard, pp.24-25

[661] FO. 195\2477. No, 29 and 2nd Jun, 1943. British Consulate General Tabriz.

[662]- FO, 371\527702. (Kurdish Problem) Research Department 2nd April 1946

خۆی لە مۆسکۆو نیگەرانی توندی حکومەتی ئەمریکی دەربڕی بوو لەسەر ڕێگەنەدانی ڕووس بە حکومەتی ئێرانی لە ناردنی هێز بۆ ورمێ و داوای ڕوونکردنەوەی لە حکومەتی ڕووس کردبوو، چونکە پێی وابووە:

1- دەوڵەتانی میحوەر "ئەڵمانیا" سوود لە ڕووداوەکانی کوردستان وەردەگرن.

2- حکومەتی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ناڕازیبوونی خۆی دەربڕی بوو لە هەوڵەکانی ڕووسی بۆ پشتیوانی لە تێکۆشانی سەرۆکە کوردەکان بۆ جیابوونەوە لە ئێران، کە دەبنە هەڕەشە بۆ ئارامی ناوچەکە، بەتایبەتیش بۆ سەر تورکیا، لەکاتێکدا ڕەشید گەیلانی دۆستی هیتلەر بەم دواییە لە عێراق دەسەڵاتی وەرگرتووە، لە پەیوەندیدایە لەگەڵ کەسایەتیە کوردییەکان.

3- گلەیی لە ئیدارەی ڕووسی لە ئازەربایجانی ئێران کرابوو، کە شۆرشگێرانی کورد خێزانی پەیامنێری ڕۆژنامەیەکی ئەمریکییان لە ناوچەکە کوشتووە[663].

ئینگلیز لە نزیکەوە چاودێریی ڕووداوەکانیان دەکردو لەلای خۆیەوە داوای لە ڕووس کرد هەڵوێستێکی زیاتر یەکلاکەرەوە وەربگرێ لەگەڵ کوردو چەکەکانیان لێوەربگرێ و زوو بەبێ کۆسپ نانەوە ڕێگە بە حکومەتی ناوەندیی بدات هێزەکانی بنێرێ بۆ ناوچەکە[664]. حکومەتی تورکیاش ناڕەزایی خۆی دەربڕی لە بەرانبەر ڕووداوی ورمێ و ڕایگەیاند، کە ڕووس کوردەکانی چەکدار کردووەو بە مەبەستی وروژاندنی کوردی تورکیایە، هانیان دەدات لە ناوچە سنووریەکانەوە هێرش بکەنە سەر خاکی تورکیا[665].

لەڕاستیدا ڕووس هاندەری کوردان نەبووە لە داواکردنی مافی خۆیان، پشتیوانییان لەو هەڵوێستەی حکومەت کردووە بە کشانەوەی کورد و گفتوگۆ هەتا کارەکان ڕێڕەوی خۆیان وەربگرن، کە لەڕاستیدا ئەمە پیلان بووە لەسەر مافی کورد و لە بەرژەوەندیی دەسەڵاتی ناوەندیدا بووە، لە ورمێ ڕووسەکان هەڕەشەیان لە سەرۆکە کوردەکان

---

[663] -O.S.S. Confidentiat files, Teleg No 23. 6 May 1942. Washington

[664]- دکتۆر عەزیز شەمزینی: جوڵانەوەی ڕزگاریی نیشتیمانی کوردستان، و/فەرید ئەسەسەرد، چاپخانەی ئیبراهیم عەزۆ، ل164-165.

[665]- FO, 371\31390 Teleg, 1687 4 May 1942. Persia. From His Majestys Embassy.. Ankara to London.

کردبوو بەوەی کە لە شار نەکشێنەوە ڕووس ناچار دەبێ بە هێز ململانێیەکە ببڕێنێتەوە، سەرۆکە کوردەکان لە هەڵوێستی ڕووسی تێگەیشتن و لە شار کشانەوە لە بەرامبەر ڕێگەپێدان بە هەندێ مافی نابنەڕەتی وەکو مافی هەڵگرتنی چەك لەناو ورمێ[666].

هەروەها ڕووس وەڵامی داواکاریی حکومەتی ئێرانی دایەوەو داوای لێکرد لیوایەك لە هێزەکانی لە ورمێ کۆبکاتەوە، بەڵام ئێرانییەکان وتبوویان، کە ئەو هێزە زیادەیەمان لە تەورێز نییە.

ژەنەراڵ درەخشانی فەرماندەی هێزەکانی ئێرانی لە ئازەربایجان لە لێدوانێکیدا وتبووی: هیچ هیزێکی زیادەی نییەو مەبەستیشی نییە هێز بنێرێ بۆ "ورمێ"، کوردەکان دەیانتوانی هەر هێزێك بچێتە ئەوێ تێکی بشکێنن[667]، بەڵام حکومەتی ئێرانی ڕێگەی ئەمەی نەدا، چونکە بە درەنگەوە ڕووسەکان رازیی بوونو مەرجیان دانا هێز لە تەورێزەوە بنێرن و یەك لیوایان بە کەم گرتبوو بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی کورد. ڕووس دەیویست کورد ئەو هێزە لێك هەڵبوەشێنن، هەتا حکومەتی ئێرانی قەناعەت پێ بهێنن بێتە سەر رای ڕووس بەوەی هێز نەنێرێ بۆ ورمێ[668]، بەڵام من بە لای قسەی دکتۆر بورهانەدین یاسینم، کە دەڵێ: ئێرانییەکان باش لەوە ئاگادار بوون، کە هێزی تەواویان نییە بینێرن بۆ ورمێ و دەیانویست ئەمریکا و ئینگلیزییەکان دەست لەو ململانێیە وەربدەن بە مەبەستی کۆتاییهێنان بە دەسەڵاتی ڕووس لە ئازەربایجان، بۆیە ڕووداوەکانیان گەورە کردو هەراو هۆریایان نایەوە[669].

بە کورتی ئەگەر دیبلۆماسیەتو فشاری ڕووسی نەبوایە کورد ورمێی بەجێ نەدەهێشتو دواتر گوندە دەوڵەمەندەکانی ورمێ بەشێك دەبوو لە کۆماری کوردستان، هەروەکو ئەو ناوچەیە بۆ ماوەیەکی کەم مەڵبەندی حکومەتی سمکۆ بووە.

---

[666] -FO, 195\25667 Persia No 65 3rd March 1946 Sir R. Bullard to Mr. Bevin.

[667] -هەمان سەرچاوە.

[668] - هەمان سەرچاوە.

[669] - یاسین سەردەشتی: سەرچاوەی پێشوو، ل88-89.

## كۆمەڵەی "ژێكاف" و ڕووس و هیوا

پەیوەندیی ڕووس بە"ژێكاف"ەوە بەڕوونی چەند لایەنێكی سیاسەتی ڕووسی بەدیار خستووە بەرانبەر كورد. لە 16ی ئابی 1942 یازدە كەسایەتی لە پیاوماقوولانی كورد لە مهاباد ڕێككەوتن لەسەر دامەزراندنی كۆمەڵەیەك بە ناوی كۆمەڵەی ژیانەوەی كورد "ژێكاف". حوسەینی فەهروەر "زێرنگەر"، عەبدوڕڕەحمانی زەبیحی، مەلا قادری مودەریسی، داودی، نانەوا زادە لە دامەزرێنەرانی ئەو كۆمەڵەیە بوون، لە ڕووی پێكهاتەو ئامانجەوە تەواوكەری كۆمەڵەی "خۆیبوون" بووە. كۆمەڵەیەكی نەتەوایەتی بۆ دروستكردنی قەوارەیەكی كوردیی تێكۆشاوە، كە كوردی هەر چوار بەشە جیایەكەی كوردستان لەخۆ بگرێ. لە سەرەتاوە "ژێكاف" بایەخی تایبەتی هەبووە، چونكە تاكە كۆمەڵەی كوردیی بووە، كە دامەزرێنەرەكانی لە سەركردایەتی تەقلیدی كوردی "ئاغاو شێخەكان" نەبوونو زۆربەیان لە ڕۆشنبیرانو بازرگانو زانایان بوون، كە پێیان دەوترا "بۆرژوازی بچووك".

بە هۆی سروشتی نهێنی "ژێكاف"و نەبوونی بیرەوەریو نووسینی پێویستی پەیوەست بە دامەزراندنی ئەو كۆمەڵەیە لەلایەن "پێڕی یەكەم"ەوە ئامانجو پەیوەندییەكانی ڕۆشن نییە، بێجگە لە هەندێ چاوپێكەوتن نەبێت لەگەڵ مەلا قادری مودەریسیو بیرەوەرییەكانی هێمنو هەژار، بۆ نموونە ڕووس یان كۆمەڵەی هیوا دەستیان هەبووە لە دروستكردنی "ژێكاف"؟ هەڵوێستی ئینگلیز لە"ژێكاف" چی بووە؟ سرووشتی ئایدۆلۆژیەتی "ژێكاف" چی بووە؟ ئایا بە ئارەزووی خۆی گۆڕا بۆ حیزبی دیموكراتی كوردستانی ئێران یان هۆكاری خۆجێیو نێودەوڵەتی لە ڕووی سیاسییەوە دەستی بەسەردا گرتبوو؟ هەوڵ دەدەین وەڵامی ئەو پرسیارانە بدەینەوە.

هەریەك لە هەژارو هێمن لەسەر سەرەتاكانی دامەزراندنی "ژێكاف"ەوە دوو ئەندامی بنەڕەتیو شاعیری "ژێكاف" بوون دەڵێن: رووناكبیرانی كورد لە كوردستانی ئێرانو بەتایبەتیش لە مەهاباد زۆر سودیان لە ئەدەبیاتی بزوتنەوەی نەتەوایەتی كورد لە كوردستانی عێراق بینی، كە بە نهێنیو لە ڕێگەی قاچاغەوە دەگەیشتە كوردستانی ئێران بە تایبەتی گۆڤاری گەلاوێژو بڵاوكراوەكانی هیوا[670] و خۆیبوونو زاری كرمانجی، كە حوزنی موكریانی دەری كردووە.

---

[670] -هێمن: سەرچاوەی پێشوو، ل19. هەژار: سەرچاوەی پێشوو، ل53-55.

له دوای ساڵی 1941 کوردستانی ئێران کەوتە دەرەوەی دەسەڵاتی حکومەتی ئێرانیو بارودۆخێکی ئازادی بڵاو ببۆوە. رووناکبیرانی کورد لە مهاباد بە ئازادیی قسەیان لە ئەدەبیاتی بزوتنەوەی نەتەوایەتی کوردیی دەکرد. ئەو ماوەیەش چەند رووناکبیرێکی کوردی کوردستانی عێراق لەمهاباد بوون، وەکو دڵشاد رەسوڵی، پەیوەندی نێوان ئەو رووناکبیرانەو هیوا زەمینەی سەرهەڵدانی "ژێکاف" یان خۆش کرد. "میرحاج"ی ئەندامی هیوا ئامادەی چەند گفتوگۆیەك بووە. رۆژێکیان بە هەژار دەڵێ: (لەو کاتەی رێکخستنێکمان نەبوو "زەبیحی" ئێمەی بردە ماڵی خۆیو وتی: خۆمان رێك دەخەین یەکەم جار "حیزبی ئازادیخوازی کوردستان" پێکهات، دوای ئەو رێکخستنە لە ئەنجامدانی هەر چالاکییەکی گرنگ بێجگە لە بەیانێکی بەخێرهاتن کردنی ڕووس نوشستی هێنا.

دوای ئەوە عەزیز کرمانجو عەبدوڕڕەحمانی زەبیحی رۆڵی گرنگیان گێڕا لە پێکهێنانی "ژێکاف"[671]. بۆیە ناتوانین لە هەوڵو رۆڵی زەبیحی بێ ئاگا بین، کە دواتر بوو بە سکرتێری "ژێکاف"و بۆ ماوەیەك بەرپرسی پەیوەندییەکان بووەو ڕاسپێردرا بە شێوەیەکی دەوریی پەیوەندیی بکات بە بەرپرسانی ڕووسو ئینگلیز. سەرەڕای ئەو ڕۆڵەی هەیبووە، زەبیحی لە ڕێکخستنو بواری روناکبیری بەتوانا بووە، سەرنووسەری گۆڤاری "نیشتیمان" بووە، کە بەناوی "ژێکاف"ەوە دەرچووە. شوێنەواری مارکسیو دەمارگیری چەپی تێکەڵاو بەبیری نەتەوایەتی زۆر بە ڕوونی بەر نووسینەکانی زەبیحییەوە دیار بووە، لە نیشتیمان بە ناوی "بیژەن" دەینووسی[672].

لەڕاستیدا کە قسە لەسەر "ژێکاف" دەکەین دەبێت جیاوازیی نێوان هەردوو قۆناغی ئەو کۆمەڵەیە بکەین. قۆناغی یەکەم خۆئامادەکردن لە نێوان ساڵانی 1942و 1943 زەبیحی دەسەڵاتی هەبووە بەسەر "ژێکاف"، دکتۆر عەزیز شەمزینی دەڵێ: لەو قۆناغە زۆر لە هەڵوێستەکانی سیاسەتی حیزبی تودەی ئێرانی پیادە کردووە[673]. داوای چاککردنی کشتوکاڵ و خەبات دژی شێخو دەرەبەگەکانی کردووە. بە تێڕوانینی

---

[671] - هەژار: سەرچاوەی پێشوو، ل73.

[672]- کەریمی حیسامی: گزینگ، ژ 13.

[673] - شەمزینی: سەرچاوەی پێشوو، هێمن: سەرچاوەی پێشوو، ل20.

"ژێکاف" ئەوانە هۆی دواکەوتنی کوردن. لەو قۆناغە ئاغاو شێخەکان دەیانتوانی ببنە ئەندامی "ژێکاف"، بەڵام بۆیان نەبوو بگەنە سەرکردایەتی ئەو کۆمەڵەیە[674].

"ژێکاف" هەوڵی دەدا بیرو هۆشیاری نەتەوایەتی لە ناو جوتیاران بڵاو بکاتەوە، ئەمەش بە مەبەستی گەڵاڵەبوونی بیری نەتەوایەتی کوردیو دەرچوون لە پەیوەستی هۆزایەتی. نووسینەکانی "نیشتمان" ئاماژەی بەردەوام هەبووە، لەسەر کاریگەریی دەستکەوتەکانی شۆرشی بەلشەفی لە ڕووسیا بە سەرکردایەتی لینینو ستالین. ژێکاف جەختی دەکردە سەر بایەخی پیشەسازیی لە کوردستان و قۆرغکردنی بازرگانی ناوخۆو دەرەوە لەلایەن دەوڵەت. "ژێکاف" لە ڕێگەی نووسینی یاداشتنامەو داواکاریی بۆ حکومەتی تاران بۆ بەدەستهێنانی ئیمتیازی نەوتی ئێرانی چەندین جار پشتیوانی لە ڕووسیای سۆڤیەتی کردووە[675].

لە ڕاپۆرتێکیدا باڵیۆزی رووسی لە ئێران لە ساڵی 1945 چەندین وێکچوون دێنێتەوە لە نێوان "ژێکاف"و بەرنامەی پارتی کۆمۆنیستی عێراقی ـ لقی کوردستان، کە بۆچوونەکانی خۆیان لە ڕۆژنامەی "یەکێتی تێکۆشین"دا بڵاو دەکردەوە. دەڵێ: (ئەو بەیاننامەیەی لە بەرنامەی پارتی کۆمۆنیستی عێراقی ـ لقی کوردستان گەیشتووە بە بەرپرسانی ڕووسی لە چەند لایەکەوە چوونییەکیو لێکەوەنزیکی تەواوی هەیە لەگەڵ هی "ژێکاف")[676].

قۆناغی دووەمی ژیانی "ژێکاف" لە نیوەی دووەمی ساڵی 1945 دەستی پێکردووە، کە قازی موحەممەد لە دوای ئەندامیەتی لە حیزب تەواو دەسەڵاتی بەسەردا هەبووە. لێرەوە "ژێکاف" گۆڕا بۆ بەرەیەکی فراوان[677]، کە سێ رەوت لە ڕیزەکانی جێی بێتەوە، رەوتی ئیسلامیی نەتەوایەتی، کە قازی موحەممەدو زانا ئاینییەکان سەرکردایەتییان کردووە. رەوتی دووەم ئەو بورجوازییە بچوکانە بووە، کە لەژێر کاریگەریی بیری نەتەوایەتی رۆژئاوادا بوون، رەوتی سێیەمیش سەرۆک هۆزەکانی کورد بوون.

---

[674] – ئەفراسیاو هەورامی: هەندێك بەڵگەو بۆچوون لەسەر کۆمەڵەی ژێکاف، بەشی دووەم، وەرگێڕانی لە ڕووسییەوە: رابوون، سوید، ژمارە 23، 1988.

[675] –ئەفراسیاو هەورامی: سەرچاوەی پێشوو، بەشی دووەم، رابوون، ژ22، 1988.

[676] – ئەفراسیاو هەورامی: سەرچاوەی پێشوو، بەشی سێیەم، ژ 24، 1998.

[677] – Arafa, p.77

سەرۆك هۆزەكان "رەوتی سێیەم" لەبەر چەند هۆكارێك ببوونە "ژێكاف"، لەوانە ئارەزووی زۆربەیان لەوەی دوانەكەون لە كاروانی بانگەوازەكانی سەربەخۆیی و رزگاربوون لە دەسەڵاتی ناوەندیی‌و دەستخستنی دەستكەوتی تایبەتی‌و خێڵەكی، یان هەیانبووە لە"ژێكاف" ترساوە زاڵ بێت بەسەر زۆربەی گوندەكان‌و مەڵبەندی شارەكان[678]. هەروەها ژمارەیەكی زۆر لە سەرۆك هۆزەكان لەبەر ئەوە بوونە "ژێكاف" چونكە پێیانوابوو ڕووسەكان لە پشتیەوەن، كار گەیشتە ئەوەی نەدەبوونە "ژێكاف" هەتا راوێژیان بە دەسەڵاتدارانی سۆڤیەتی نەكردایە لە ئازەربایجان[679]. رەوتی دووەم بریتی بوون لە ڕۆشنبیرانی كوردو كاسبكارو بازرگانی بچوك‌و خوێندكاران، ئەوانە گروپی یەكەمی "ژێكاف" بوون، هەستی نەتەوایەتی‌و ئارەزووی قۆستنەوەی بارودۆخی شەری دووەمی جیهانی‌و بەرئەنجامەكانی بۆ بەدیهێنانی ئاواتی سەربەخۆیی كوردستانی گەورە، ئەمەش بە پشتیوانییەتی ڕووس‌و بەریتانیا. ئەم رەوتە درێژەپێدەری خەتی خۆیبوون‌و هاوتەریبی خەتی هیوای ناو جوڵانەوەی نەتەوایەتی كوردیی بووە[680]. دروشمەكانی ئەم رەوتە هەڵقوڵاوی راگەیاندنی هاوپەیمانەكان بووە لە كاتی شەڕی دووەم لە پشتگیری بۆ دیموكراتی‌و راپەڕین بەڕووی فاشیەت، پێیانوابووە بەڵگەنامەی ئەتڵەنتی "میثاق الاطلنطي"و كۆنگرەی "سان فرانسیسكۆ" بۆ ئاشتی ساڵی 1945 مافی كورد زامن دەكات[681]. بەڵام رەوتی یەكەم قازی موحەممەد سەركردایەتی كردووە، رەوتێكی چاكسازیی بوو لە بازنەی ئیسلام‌و درێژەپێدەری ئەو بزوتنەوە كوردایەتییە ئیسلامییە بووە، كە سەركردایەتی زۆربەی جوڵانەوەكانی سەدەی نۆزدەهەم‌و نیوەی یەكەمی سەدەی بیستەمی كردووە، ئەو رەوتە پشتئەستور بووە بەو كەلەپوورە مێژوویە دەوڵەمەندە لەسەر هێما ئیسلامییەكان[682].

---

678 - ئەفراسیاو: بەشی دووەم، ل73.

679- عەباس وەلی: دەسەڵاتی سیاسی‌و حاكمیەت لە كۆماری كوردستان، گزینك، ژ13. ئەفراسیاو: بەشی دووەم. رابوون. ژ22,198.

680-ئەفراسیاو، بەشی دووەم،. رۆژنامەی كوردستان، ژ23 مایسی 1946.

681- ئەفراسیاو: سەرچاوەی پێشوو، نەبەز: سەرچاوەی پێشوو، ل33.

682 -ئەفراسیاو: سەرچاوەی پێشوو، ل76.

کۆمەڵە بە ئەندامیەتی قازی موحەممەد لە تشرینی یەکەمی 1944 هێزو گورێکی تری پەیدا کرد، پێش ئەوە "ژێکاف" لە ڕێکخستنی دەستەبژێری کورتهەڵهاتوو، ئەندامانی بەگشتی چینی بۆرژوای شار بوون[683]. گۆڕا بۆ بزوتنەوەیەکی جەماوەری، زانایانو سەرۆك هۆزەکانو جوتیارانو کرێکارانو خوێندکارانو شێخەکانی ڕێبازی تەریقەتی سۆفیگەرییش چوونە پاڵ "ژێکاف"، بزووتنەوەیەکی کوردستانی هەر لە ماکۆ و خۆی لە باکوورەو هەتا پاوە و بانە و سەردەشت و مهابادی گرتەوە. راپۆرتی ئیدارەی سۆڤیەتی لە ئێران لە ساڵی 1945 دەڵێ: لە (70٪) پیاو و گەنجانی کورد لە موکریان ئەندامی "ژێکاف"ن[684]. ئەندامیەتی قازی موحەممەدی خاوەن کەسایەتی کارازمایی لە"ژێکاف" گۆڕانکاریی بنەڕەتی لەو کۆمەڵەیەدا درووست کرد.

بۆ ئەوەی لە بایەخی ئەو گۆڕانە ریشەییە تێبگەین، پێویستە لێرەوە ئاماژە بە ڕابردووی قازی موحەممەد بکەین لەگەڵ مەسەلەی ئەندامیەتی لە کۆمەڵەی "ژێکاف"و شێوازی ئیدارەو ئەو ئاکامانەی لەگەڵ بوونە ئەندامی بۆ ئەو کۆمەڵەیەی زیاد کرد.

## قازی موحەممەد و "ژێکاف"

قازی موحەممەد لە ساڵی 1904 لە خانەوادەیەکی ناوداری ئایینیو شارەزا لە زانستە شەرعیەکانو کوردایەتی لەدایك بووە، کوڕی قازی عەلی کوڕی قازی قاسمە. باوکیو مامەکانی ڕۆڵی سەرکردایەتییان هەبووە لە بزووتنەوەی موحەممەدی ئیسلامیو پشتگیریی لە خەباتی شێخ مەحمود دژی ئینگلیز[685].

قازی فەتاحی مامی قازی موحەممەد لە ڕۆژانی شۆڕشی دەستوری "مەشروتی" لە کوردستاندا پیاوێکی خاوەن شکۆ بووەو وتویەتی: (مادام من زیندووم سوێند دەخۆم نابێ سەربازانی ڕووس پێ بخەنە خاکی مهاباد، کفنی ئامادە کردو بانگی خەڵکی کوردستانی کردو تێکۆشانی راگەیاند، شەڕی کرد هەتا لەو ڕێگەیە گیانی بەخت کرد،

---

683 -هەمان سەرچاوە، ل76.

684- نجفقولی بسیان: من مهاباد الدامیة الی ضفاف اراس، (لەسەر ئەنتەرنێت چاپ کراوە) ، کۆچێرا: سەرچاوەی پێشوو، ل276.

685- ڕۆژنامەی کوردستان، ژمارە، 1946.

قازی موحەممەد لە "حوجرە" زانستی شەرعی فێر ببوو، شارەزایی باشی هەبوو بە زانستەکانی ئوسولی فیقەو زانستی کەلامو نەحوو سەرف. زۆر لەژێر کاریگەریی شێخەکەیدا بوو بە ناوی مەلا عەلی، کە لە بنەڕەتەوە خەڵکی سلێمانی بووە، سەرەڕای ئەوە گیانی کوردایەتیشی لێ فێر بووە[686].

کریس کۆچیرا لە باسی رۆژانی قازی موحەممەدو کۆماری کوردستان دەڵێ: ئەو لە تەمەنی چلو شەش ساڵیدا بووە*، سەرەڕای زمانی کوردیی زمانی فارسیو عەرەبیو تورکی دەزانیو هەندێ لە ڕووسیو فەرەنسیش تێدەگەیشت. وێژەو بوێژانی خۆش دەویستو عاشقی ئەدەبی کوردیی و ئێرانی بووە، بەتایبەتی حافیزی شیرازیو سەعدی، هەمیشە بەڵگەی بە فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ)و شیعرەکانی سەعدیو حافزی هێناوەتەوە، هەروەها "کۆچیرا" باسی قازیی دەکات بەوەی کە رووخۆشو دڵنەرمو ریشدار بووە، چاوی وەکو ئەستێرە دەدرەوشایەوە. کەسایەتی خواناس، جگەرەی نەدەکێشاو ئارەقی نەدەخواردەوە[687].

لە چەندین رێگەوە قازی موحەممەد جەختی لەسەر ناسنامەو پابەندیی خۆی بە ئیسلام کردۆتەوە. کریس کوچیرا چەند قسەیەکی ئەوی هێناوەتەوە، کە دەڵێ: (ئێمە لەکاتێکدا داوای حوکمی زاتی دەکەین ئەوە مانای ئەوە نییە دانمان ناوە بە بنەماکانی رۆژئاوا یان سیستمی سۆڤیەتی، بەڵکو بەپێچەوانەوە لایەنی بەربەریەتی ئەو شارستانییەتە رەت دەکەمەوە، بەڵام خۆشگوزەرانی کوردەواریمان دەوێ)[688].

قازی موحەممەد دەیزانی ئیسلام زەخیرەیەکی شۆڕشگێڕی هەیە، توانیویەتی لە خزمەتی کوردایەتیدا بەکاری بهێنێت، داوای لە زانایانی ئیسلام کردووە بێنە ناو رێکخستنەکانی "ژێکاف"، هەتا وای لێهات هەموو زانایانی کوردستان لە گوندەکانی

---

[686] - کۆچێرا: سەرچاوەی پێشوو، ل277-278.

* - کەواتە نابێ لە ساڵی 1904 لەدایك بووبێ، یان بەو پێیە دەبێت ئەو کات تەمەنی "42" ساڵ بووبێت، نەك 46 ساڵ. "وەرگێڕ".

[687]- کۆچێرا: سەرچاوەی پێشوو، ل80 نەسرەدین بەرزنجی، کە ئینگلیز لە عێراقەوە ناردبووی بۆ مهاباد دەڵێ: قازی موحەممەد دەروێش بووەو سەر بە تەریقەتی نەقشبەندیی بووە. بڕوانە: Secret British ; Empassy Baghdad 30 September 1946.

[688] - عەلائەدین سوجادی: شۆڕشەکانی کوردو کۆماری عێراق، بەغدا، 1959، ل277.

خۆیان بوونە بەرپرسی ئەو کۆمەڵەیە[689]. پێیوابووە دەبێت پابەند بێت بە شوراو لەسەر بنەڕەتی شەرعی ئیسلامی حوکم بکات، داوای لە گەورەکانی کورد کرد لەسەر شێوەی ئیسلامەتی پەیمانی پێبدەن[690]. ئەمەش هەندێ لە توێژەرەوە کوردەکانی نیگەران کردبوو، کە ئەوان دەیانویست ئیسلام لە ژیانی کۆمەڵگای کوردیی جیا بکەنەوە، بە بیانووی جیاکردنەوەی ئایین لە سیاسەت[691]. گۆڤاری "نیشتمان" لە ژمارە (8) تەمووزی 1943 نووسیبووی "ژێکاف" پشتی بە سێ بنەمای بنەڕەتی بەستووە: ئیسلام، کوردایەتی، هاوچەرخایەتی. "ژێکاف" کادیرەکانی هان داوە پابەند بە ئیسلامو خواپەرستی بن. غەنی بلوریان بۆمان دەگێڕێتەوە، کە قازی موحەممەد ئەندامانی تیپی شانۆیی "دایکی نیشمانی"ی هان دابوو لەو کاتانەی بە ناوچە کوردییەکانی ژێر دەسەڵاتی کۆماری کوردستان دەسوڕێنەوە پابەندبن بە ئەدەبی ئیسلامیو نوێژی بەیانی[692]. پێشتر ئاماژەمان پێدا قازی موحەممەد هەر لە ڕووخانی ئیدارەی رەزا شاوە هەتا ساڵی 1941 سەرۆکی شاری مهاباد بووەو بۆ پاراستنی ئاسایشی شار نزیکەی (50) پیاوی چەکداری هەبووە. فەرماندار "حاکمی مهاباد" لەو ماوەیە (1941–1945) لە چەندین بۆنەدا ئەوەی بە حکومەتی ناوەندیی و ئەفسەرە ڕووسەکان وتووە: مادام کە قازی موحەممەد حاکمی مهابادە ئەم هیچ دەسەڵاتێکی کارای نییە[693].

خەڵکی مهاباد لە 12ی شوباتی 1945 هێرشیان بردە سەر فەرمانداری، کە هێمای دەسەڵاتی ناوەند بووە لە مهاباد، لەو ڕووداوە پێنج پۆلیسی ئازەری کوژراو دوانیش بریندار بوون، لەگەڵ کوژرانی یەك لە ڕاپەڕیوەکان، شارەوانیو بەڵگەنامەکانی سووتان[694]. هۆکارەکانی ئەم ڕاپەرینەش چەند لایەنێکی لێڵی هەیە، لە تەگبیری

---

689 -کەریمی: هەمان سەرچاوە. 27-28.

690- هەمان سەرچاوە.

691- نەوشیروان: سەرچاوەی پێشوو. ل130-131.

692- ئاڵەکۆك: ل41.

693- ئەفراسیاو: سەرچاوەی پێشوو، بەشی سێیەم، ل77-78

694- یاسین سەردەشتی: ل7-12، دکتور مصطفى الموتي، ایران در عسر بهلوی، جلد، جهارەم. بیرەوەری ڕۆژنامەنووسی ئێرانی لەمەڕ کۆماری کوردستان 1946. وەرگێڕانی ئەنوەری سوڵتانی، وتاری یەکەم،

"ژێکاف" بووە یان لەخۆوە بووە؟ ئایا حوسێن فەهروەرو عەزیزخان بۆ بەدەستهێنانی ئامانجو بەرژەوەندیی کەسایەتی "وەك ئێرانییەکان بانگەشەی بۆ دەکەن"، ئەمەیان کردووە؟ ئایا ڕووس ڕۆڵی لەم ڕووداوە هەبووە یان نا؟.

ئەوەی شایانی باسە ئەم ڕاپەڕینە لە کاتێکدا هەڵگیرسا، کە قازی موحەممەدو کۆمەڵێك لە گەورەکانی مهابادو سەرۆك هۆزەکان لە سەردانی تاران بوون بۆ وتووێژ لەگەڵ حکومەتی ناوەندیی لەسەر مافی کورد. گێڕانەوەی حکومەتیش ئەمەیە:

فەهیمی ئەندامی پەرلەمان "ئەنجومەن"ی ئێرانی سەردانی ناوچە کوردییەکانی کردبوو، کورد داوایان لێ کردبوو بە مەبەستی ئاشتی لە کوردستان زیاتر خۆراکی بنەڕەتی بۆ ناوچەکە بنێرن. لە دوای گەڕانەوەی فەهیمی بۆ تاران حکومەت هەندێ شەکرو چاو خواردەمەنی ناردبووە شاری مهاباد. لەوێ حوسێن زێڕنگەری بەڕێوەبەری دابەشکردنی خۆراك هەندێ لە خواردەمەنیان بە بەرتیل دابوو بە ئاغا چالاکەکانی دەوروبەری مهاباد، بۆ ئەو مەبەستەش ناسنامەی ساختەی درووست کردبوو، هەتا فێڵ لە حکومەت بکات.

دەسەڵاتداری پەیوەندیدار لە تەورێز "ئەوکات مهاباد سەر بە پارێزگای ژمارە (4) بوو، کە ناوەندەکەی تەورێز بوو" بەوەیان زانیو فەرمانیان دەرکرد لێکۆلینەوە لەو بارەیەوە بکرێ. کاتێك حوسێنی زێڕنگەر بەو کێشەیە دەزانێ (4000) تمەنی دا بە عەزیز کرمانج، تا خەڵکی مهاباد هان بدات هێرش بەرنە سەر بەڕێوەبەرایەتی شارەوانیو بەڵگەنامەکان بسوتێنن، ئەو تۆڕە بزربوو، کە دەیخزاندە دادگا، عەزیزخانو هەشت لە چەکدارەکانی هێرشیان بردە سەر شارەوانیو بەڵگەنامەکانیان سوتاندو زیانیان بە هێزەکانی حکومەت گەیاند. حکومەت ناچار بوو داوا بکات قازی موحەممەدو سەرۆك هۆزەکانی کورد بە خێرایی بگەڕێنەوە مهابادو ئەوانە بگرن، کە دەستیان لەو ڕووداوەدا هەبووە. بە پشتبەستن بە بەڵگەی فەرمی حکومەت، کە یاسین سەردەشتی لە گۆڤاری (رامان. ژ. 112) بڵاوی کردبۆوە، قەرەنی ئاغای مامەشو هەندێ لە سەرۆکە کوردەکان هێزیکی چەکداریان پێکهێناو هێرشیان کردە سەر مهابادو دەستیان بەسەردا

حیکایەتی پڕخەمی منو ایرانی من ئیسماعیل پوور والی "بامشاد"، ل14-17، (سوپاسی ئەنوەر سوڵتانی دەکەم بەر لەوەی بڵاوی بکاتەوە ڕێگای پێدام سوود لەو دەستنووسە وەربگرم).

گرت، ئەو بەرپرسو ژەندرمەو پۆلیسە ئێرانیانەی دەستبەسەر بوون لە لای ڕاپەڕیوەکان ئازاد بکەن[695].

لە دوای ئەو ڕووداوە ئێرانییەکان لەلای ڕووسەکان لەسەر باری ئاسایشی مهاباد سکاڵایان کرد، هەردوولا ڕێك کەوتن، کە دیبوکری "ئەمیر ئەسعەد" بە (300) هێزی خێڵەکییەوە ببێتە حاکمی مهاباد. مامەڵەی ئەندامانی ئەو هێزە ئاماژەیەکی سپی قبووڵنەکراو بووە لەلای خەڵکی مهاباد، پیاوماقوڵانی شار قازی موحەممەدیان هەڵبژارد نوێنەرایەتییان بکاتو بەرژەوەندییان ڕەچاو بکات. هەوڵ بدات بۆ دەرکردنی ئەو هێزە نامۆیە لە شار[696]. میر ئەسعەد هەوڵیدا یانەی لاوانی کوردیی دۆستی "ژێکاف" دابخات، ئەمەش بە فەرمانی حکومەتی تاران هەتا خەڵکی شار بکات بە گژ میر ئەسعەد بکات. خەڵکی شاریش بە سەرۆکایەتی قازی موحەممەد ڕاپەڕینو باری ئاسایش تێکچوو، ئەمە عەبدوڵڵا ئۆفی ئەفسەری ڕووسی پەیوەندیدار بە کاروباری مهاباد والێکرد میر ئەسعەدو هێزەکەی ناچار بکات شار بەجێبهێڵن[697]. لە دوای ئەوە قازی موحەممەد بە پشتیوانی ڕووس هێزێکی خێڵەکی 50 کەسی پێکهێنا بۆ پاراستنی ئاسایشو رژێمو ڕووبەڕووبوونەوەی حکومەتی ناوەندیی یان هێزە خێڵەکییەکانی دۆستی حکومەت[698]. لەکاتێکدا قازی موحەممەد لە ئەنجومەنی چواردەهەمی ئێرانی پاڵێوراو بووە بۆ نوێنەرایەتی، بەمەش قازی موحەممەد دەسەڵاتی بەسەر مهاباددا دەبوو.

ڕاپەڕینی دوازدەی شوبات ئاکامی چاوەڕوانکراوی ستەمی ئیدارەی ئازەری - ئێرانی بووە لە ماوەی بیست ساڵی رابردوو لە مهاباد، بەڵام دریژەی ئەو ڕاپەڕینە لە گۆڤاری نیشتیمانو ئەدەبیاتی "ژێکاف" باس نەکراوە. ئەمەش گومانە بۆ ئەوەی کە ئایا ژێکاف ئاگادار بووە یان تووش کراوە، چونکە ڕووسەکان نکۆڵیان لەوە کردووە

---

[695] - یاسین سەردەشتی: ل77 قونسوڵی رووسی لە رەزائیە لەو بڕوایەدا بووە قەرەنیاغای مامەش بە ڕێنومایی هۆشمەندی ئەنساری ئەفسەری ئێرانی دژە کورد لە دژی کورد کاری کردووە. (ئەفراسیاو: بەشی سێیەم. ل43.

FO, 371/45446. Teleg No, 18, 1945. British Consulate – General.

[696] - بلوریان: سەرچاوەی پێشوو، ل30-31.

[697] -ئەفراسیاو: بەشی دووەم. بلوریان: سەرچاوەی پێشوو، ل26-27. هەژار: سەرچاوەی پێشوو، ل69.

[698] -ئەفراسیاو: سەرچاوەی پێشوو، بەشی دووەم، ل77.

تێکەڵاوی ئەو ڕووداوە بووبن. قونسوڵی ڕووسی لە ورمێ قسەی هەردوو حوسێن زێڕەنگەرو عەزیز کرمانج ڕەت دەکاتەوە، کە ڕووس هاریکاریی ئەوانی کردبێ[699]. بۆیە دەگونجێ حوسێن زێرەنگەر هەر خۆی ئەم کارەی ئەنجام دابێت، بەهۆی ئەو باوەڕەی، کە پێویستە لەبەر نییەتخراپیو بێ سەرەو بەرەی ئیدارەی ئازەری – ئێرانی وەدەرنێ. پێش ئەو ڕووداوە حوسێن زێڕنگەرو عەزیز کرمانج چووبوونە مزگەوتی هەباس ئاغاو عەزیز کرمانج وتاری دابوو، وتبوی: ئەمریکییەکانو ئینگلیز دەیانەوێ لە ڕێگەی هاریکاریی موحەممەد ڕەزا شا دیکتاتۆریەتی ڕژێمی پەهلەوی بگەڕێننەوە بۆ سەر گەلی ئێرانی: (ئایا ڕێگەی عەجەم دەدەن دووبارە بگەڕێتەوەو بەڕێوەبەرایەتیو شارەوانیو دەزگای سەرکوت کردن لە کوردستان دابنێن؟ ئایا ئێوەی کورد ڕۆژانی ڕەزا شاتان لەبیر کرد، هەتا موحەممەد ڕەزا شا دووبارەی بکاتەوە؟). دوای ئەمە جەماوەر لە مزگەوتەوە چوون بەرەو شارەوانیو سوتاندیان[700].

دەشگونجێ ئەوە دەستپێشخەرییەکی حوسێن زێڕەنگەر بووبێ لەپێناو بێبەشکردنی ئیدارەی حکومەتی ئێرانی لە مەسەلەی بەرتیل، لە کاتێکدا کە حوسێن زێرنگەر ناسراوە بەوەی کاری تاکڕەویی ئەنجام داوە. "ژێکاف"یش ئەندامیەتی ئەوی هەڵپەساردبوو. هەروەها بە هۆی بەدئاکاریو بێ سەرەو بەرەیی لە پایەی بەڕێوەبەری پۆلیسی مهاباد دەرکرابوو[701]. عەزیز کرمانجیش پیاوێکی بەرژەوەندیخواز بووە. "ژێکاف" دڵی لێ پیس کرد، دەرکەوت ئەگەر چی لە ساڵی 1939 ڕۆڵی هەبووە لە دامەزراندنی پارتی ئازادیخوازانی کورد، بەڵام پەیوەندیی نهێنی هەبووە بە دەسەڵاتی ناوەندیی، بۆیە "ژێکاف" لە ئەندامیەتی دەریکرد[702].

ڕۆزفێلت ئیگلتۆن دەربارەی پەیوەندیی کردنی قازی موحەممەد بە"ژێکاف"ەوە دەنووسێ: مەسەلەی پەیوەندیکردنی قازی موحەممەد هەتا ماوەیەکیش جێگەی مشتومڕ بووە، هەندێ کەسایەتی مەعنەویو میللی قازی موحەممەد لە کوردستان ئەمەیان بەپێویست زانیوە، بەڵام هەندێکی تریان دوودڵ بوون لەوەی ڕەزامەندی

[699] سەردەشتی: سەرچاوەی پێشوو، 7-12.

[700] -FO, 371/45446. Teleg No, 18, 1945. British Consulate - General.

[701] -بلوریان: ئاڵەکۆك، ل46.

[702] - هەژار: چێشتی مجێور، ل57، سوجادی: سەرچاوەی پێشوو، ل275-276.

دەربڕن، چونکە لە باڵی قازی موحەممەد دەترسان کەسایەتی خۆی فەرز بکات بەسەر "ژێکاف". لە کاتێکدا "ژێکاف" پێشتر دڵنیا بوو، کە شێخو ئاغاکان "قازی موحەممەد بۆ خۆی خاوەن زەوییەکی گەورە بوو" هۆکاری دواکەوتنی کوردن، پێشتر ڕێگە بە سەرکردە کلاسیکییەکان نەدەدرا ببن بە ئەندامو شوێنو دەسەڵاتیشیان نەدەدرایێ. عەزیز شەمزینی دەڵێ: "ژێکاف" چەند جار داواکاری قازی موحەممەدی ڕەت کردەوە ببێتە ئەندام[703]. ئەم قسەیە بێ بەڵگەیەو دوایی بە درێژی ڕوونی دەکەینەوە.

دکتۆر ئەمیری حەسەن پوور بڕوای بە ئەندام بونی قازی موحەممەدو هۆکاری هەرەس هێنانی "ژێکاف" بووە. پێیوایە لێرەوە "ژێکاف" لە هێڵە بنەڕەتییەکانی خۆی لای داوە. دەڵێ: بەمە "ژێکاف" هەنگاوێك بەرەو دواوە گەڕایەوە[704].

جەلال تاڵەبانیش ئەو بۆچوونەی هەیەو دەڵێ: بەئەندام وەرگرتنی قازی موحەممەد لە"ژێکاف"و گۆڕانی بۆ پارتی دیموکراتی کوردستانی ئێران، هەڵەیەکی مێژوویی بووە لە سروشتی گەشەی "ژێکاف"، هەمان ئەو هەڵەیەی کرد، کە پارتی ڕزگاریو شۆڕشو هیوا لە ساڵی 1946 تێیکەوتن بە قبوڵکردنی مەلا مستەفا بارزانیو کاکە زیادو شێخ لەتیف، ڕابردووی ئایینیو دەرەبەگایەتی ئەوانە لە سەرکردایەتی پارتی نوێ "پارتی دیموکراتی کوردستانی عێراق" ڕزگاریو هێزە نەتەوەخوازە کوردییە شۆڕشگێڕەکانی تری لە گەشەی سروشتی خۆی بێبەش کرد[705].

هەر لەبارەیەوە دکتۆر عبدولستار تاهیر شەریف دەڵێ: سەپاندنی قازی موحەممەدو باڵی خێڵەکی بەسەر "ژێکاف"، سەرەتای ژیانی "سەرکردایەتی تاکڕەو" بووە، ئەمەش بە هۆی بەهێزیی کەسایەتیو گەورەیی ئەو لەناو جەماوەر، بۆیە لە زیادەڕۆیی دەسەڵاتی ئەو بەسەر کۆمەڵەدا دەترسان.. ئەمەش بە کردەیی ڕوویدا[706].

---

[703] - شەمزینی: سەرچاوەی پێشوو، ل165.

[704] -کەریمی: ل27-28.

[705] - سەرچاوەی پێشوو، ل325-327.

[706] - الدكتور عبدالستار طاهر شريف: الجمعيات و المنظمات و الاحزاب الكردية في نصف قرن 1908-1958.

جەمال نەبەز: کۆمەڵەی ژێکافو ئیدۆلۆژیای هوردە بۆرژوای ڕۆشنبیری ناسیۆنالست لە کوردستاندا، سوید، چاپەمەنی ئازاد 1985، ل20.

کۆسپی بەردەم گەشەی سروشتی، کە هەریەك لە جەلال تاڵەبانیو دکتۆر ئەمیری حەسەن پوور بۆ رزگاریو "ژێکاف" ئاماژەی پێدەکەن مەسەلەیەکی لێڵو نادیارە، هیچ بەڵگەیەك لە ئاسۆی 1946دا دیار نییە لەسەر کۆمەڵەی رزگاریی کۆمۆنیستی، کە بتوانێ گەشە بکاتو لە کوردستانی عێراق بڵاوبێتەوە. لەکاتێکدا زۆربەی خەڵك شیوعیەتی بە کافرو بێ باوەڕ زانیوەو پێیانوتووە: "بەلشەفیك". هەندێ لە شیوعییە کوردەکانی ناو کۆمەڵەی شۆڕشی مارکسی وەکو ساڵح حەیدەریو نافیع یونس نەچوونە ناو پارتی دیموکراتی کوردستانو شەقامی کوردیی خۆیان ون کردو لەناو حیزبی شیوعی عێراقیش وازیان هێنا[707]. دەتوانین بڵێین مەلا مستەفا بارزانیو پارتی دیموکراتی کوردستان بە قبوڵکردنی شیوعییەکان "لەناو ریزەکانی پارتی = وەرگێر" شەرعیەتیان بە شیوعییە کوردەکانو بیری مارکسیەت دا لەناو خوێندەوارانی کورد بڵاوبێتەوە. لەۆکاتێکدا مستەفا بارزانی رقی لە شیوعییەت دەبۆوە. مارکسیە کوردەکان لە کۆنگرەی ساڵی 1953 دووریی مەلا مستەفایان بەدەرفەت زانیو بە سەرۆکایەتی ئیبراهیم ئەحمەد دووبارە گەڕانەوە بۆ دەسەڵاتو پارتی دیموکراتی کوردستانیان گۆڕی بۆ پارتێکی مارکسی. لە زۆربەی بابەتە هەنووکەییەکانی ئەو کاتەدا کەوتبوونە هاریکاریو یەك هەڵوێستی لەگەڵ پارتی شیوعی عێراقی[*]. بۆیە پارتی لە ساڵانی 1946ـ1959 بەبێ بارزانی ببووە پارتێکی بچوكو نەیتوانی هەتا گەڕانەوەی بارزانی ببێتە پارتێکی جەماوەری.

سەبارەت بە"ژێکاف"و بارودۆخی بابەتیو زاتی سەخت وای لێ کردن رازیی بین لەسەر ئەندامیەتی قازی موحەممەد. بەڵام ئەوەی پەیوەندیی هەیە بە باری زاتیەوە شێوازی ئیدارەکەی زەبیحیو حوسێن زێڕنگەر لە "ژێکاف" بەهەمان داینەمۆی پێشوو "ژێکاف" لەسەر بنەڕەتی هەمان ئەو دەستەبژێرە دامەزرایەوە، کە لە ساڵی 1939 بە ناوی پارتی رزگاریخوازی کوردستانەوە دامەزرابوو، کە بە لاوازیو بێ کاریگەریی

---

[707] - جەمال نەبەز: سەرچاوەی پێشوو، ل20.

[*] - پێمانیە نووسەر بە وردی ئاگاداری مێژووی سەرەتای دامەزراندنی (پارتی دیموکراتی کورد) و رەوتە ناکۆکەکانی ئەوکاتەی بێت، چونکە، چونکە هەمزە عەبدوڵڵا یەکەم سکرتێری پارتی بووە، کە دیارە یەکەم چەپی کارای ناو پارتی بووە، ئیبراهیم ئەحمەد دواتر هات. "وەرگێڕ".

مابۆوه، لەو كاتەی هێزەكانی هاوپەیمانان له ساڵی 1941 گەیشتن، بەیاننامەیەكیان دەركرد بۆ بەخێرهێنانیان، هەر لەوكاتە له ساڵی 1942 حیزبەكە گۆڕا بۆ "ژێكاف"، هەتا ساڵی 1944 بە گشتی لە نوخبەی "رۆشنبیرانو بازرگانی بچوكو هەندێ فەرمانبەری بچوك" كورت هەڵهاتبوو، "ژێكاف" بێدەسەڵات بوو بەرانبەر گۆڕانكاریی رووداوەكان، دوای كەوتنی رەزا شا لە كۆمەڵەیەكی نهێنی گۆڕا بۆ پارتێكی ئاشكرا، زەبیحی له بانگەوازكارانی نهێنی بووە، لاسایی رێكخستنی شیوعییەكانی دەكردەوە[708].

هەژار دەڵێ: لە ساڵی 1944 "ژێكاف" گەیشتە ئەو باوەڕەی زەبیحیو حوسێن زێڕەنگەر لەو خانەوادانەن كە ریشەی كۆمەڵایەتییان نزمەو خۆیان بردۆتە پێش بۆ سەركردایەتی، لە ڕووی كۆمەڵایەتییەوە شایستە نەبوون بۆ راكێشانی جەماوەرو شێخەكانی كورد، بۆیە واقیع قازی موحەممەدی هێنایە پێشەوە، قازی موحەممەد له ماوەی رابردوو بایەخی گەورەی هەبووە بۆ "ژێكاف". فراوانبوونی كۆمەڵەی "ژێكاف" باوەڕی بە قازی موحەممەد هێنا، تاسەر فەرامۆش نەكرێت و بە ئەندام وەرگیرا، بە ماوەیەكی كەم بووە زمانحاڵی فەرمیو بزوێنەری بنەڕەتی بۆ "ژێكاف"[709]. ناوەندە فەرمییەكانی ئێران لەو باوەڕەدا بوون قازی موحەممەد بە هەوڵی رووسەكان بۆتە ئەندامی "ژێكاف"، هەتا بەهێزی بكەنو بیكەنە كارتی فشاری دەستی خۆیان لە دژی ئێران[710].

لەڕاستیدا قازی موحەممەد پێویستی بە"ژێكاف" نەبووە، وەكو ئاماژەمان پێدا، لە ساڵی 1944 دەستی بەسەر مهاباددا گرتو ماڵەكەی وەكو بارەگای سیاسیی لێهاتبوو، دیبلۆماسانی ئینگلیزو رووسو سەرۆك هۆزە كوردییەكانو نوێنەری دەسەڵاتی ناوەند لە ساڵانی 1941ـ1945 هاتوچۆیان كردووە. لە پێش ئەوە لە ساڵی 1942 بە ناوی (30) سەرۆك هۆزی كوردیی سەردانی باكۆی كردووە، لە تشرینی یەكەمی هەمان ساڵ چاوی بە ئەفسەری ئینگلیز كەوتو پێی وتبوو، ئارەزووی بینینی ئەفسەرە بەریتانییەكان دەكات لە بەغدا، هەتا هەڵوێستو داواكاریی كوردیان بۆ باس بكات[711].

---

[708] - چاوپێكەوتن لەگەڵ لەگەڵ د.گولمرادی سەبارەت بە كۆماری كوردستان. گۆڤاری "گزنگ" ژمارە 130، ل8-9، كۆچیرا: ل260.

[709]- هەژار: سەرچاوەی پێشوو، ل69.

[710] Arafa, p.77.

[711] -كۆچیرا: سەرچاوەی پێشوو، ل260

له سەرەتای ساڵی 1944 لەوکاتەی تاران دەیویست دەست بەسەر کوردستاندا بگرێ قازی موحەممەد بە سەرۆکایەتی وەفدێکی کوردیی چووە تاران ـ بەر لەوەی بێتە ناو "ژێکاف" لەلای شاو ژەنەراڵەکانی ئێران داوای ماف گەلی کوردی کردووە. ویستوویەتی سەرنجو دۆستایەتی شا بۆ لای خۆی رابکێشێتو پێی وتووە: کورد شانازیی بە ئێرانییەتی خۆیەوە دەکات، بەڵام بە هۆی فەرامۆش کردنو دواکەوتوویی تەندرووستیو ئابووریو پەروەردەیی ناوچەکە نیگەرانە. قازی موحەممەد ئەم بارودۆخە نائارامیەی ناوچە کوردییەکانی بە شێوەیەکی گشتی گەڕاندبۆوە بۆ مامەڵەی ئەفسەرانی ئەفشاری بە پشتیوانی بەکرێگیراوە ئازەریو کوردەکان، کە لەپشت کارەساتی قەسابخانەی مەریوانو بانەو سوتاندنی دەیان گوندەوە بوون. ژەنەراڵ "رازمارا"ی سەرۆکی ئەرکانی هێزە چەکدارەکان هەوڵیدا قازی موحەممەد لە پایەی سەرۆکایەتی هۆزەکانی تر دابڕێ، بەڵام هەوڵەکانی بێ ئاکام بوو[712].

ئەم ئاماژانە بەڵگەی ئەوەن قازی موحەممەد بەر لەوەی ببێتە ئەندامی "ژێکاف" سەرۆکی نیشتیمانیو باوەڕپێکراوی هەموو لایەك بووە، بە بوونە ئەندامی لە"ژێکاف" شێوازێکی هاوچەرخی بەدەست هێنا لە خستنەگەڕی بەرفراوانی کورد بۆ بەدیهێنانی ئامانجە نەتەوایەتیەکانی. بە دووری نازانین ئەگەر وتمان "ژێکاف" چۆتە پاڵ قازی موحەممەدو ئارەزوومەندانە ملکەچی فەرمانەکانی ئەو بوون، بە هاتنی قازی موحەممەد رۆڵی سەرکردەو دامەزرێنەر بزر بوو، ئەو لەوانە نەبووە، کە بە ناوبردنی جەستەیی یان دوورخستنەوە یان گۆشەگیرکردنی هاوڕێکانی لە سەرکردە دامەزرێنەرەکانی مەبەست بووبێت، بەڵکو شێوازی دیموکراتیو وردبینی لە کارەکانیداو بەتوانایی بێ ئەندازەی خۆی لە قەناعەتپێهێنان، گوێمان لە دەنگی ناڕەزایی نەبووە لە سەرکردایەتی قازی موحەممەد پێش شەهیدبوونی یان دوای شەهیدبوونی، لەسەر شێوازی سەرکردایەتی کردن، بەڵام بەم دواییە گوێمان لە چەند دەنگێکی ناڕەزایی بووە لەسەر ئەو مەسەلەیەی لەلایەن سەید عەزیزی شەمزینی، کە خانەوادەکەیان لە ناکۆکیی زەقدا بوون لەگەڵ خانەوادەی قازی موحەممەد لەسەر دەسەڵات لە کوردستانی ئێران، هەروەها لەلایەن کەریمی کوڕەخوشکی عەبدوڕڕەحمانی زەبیحی، کە پێیوایە لە کاتی

---

[712] - ئەفراسیاو: سەرچاوەی پێشوو، بەشی یەکەم، کۆچیرا: ل262.

گیرانی لەلایەن حکومەتی ئێرانییەوە، قازی موحەممەد هەوڵی پێویستی نەداوە بۆ بەردانی زەبیحی، لەڕاستیدا ناتوانین لە ڕۆڵی قازی موحەممەد تێبگەین لە"ژێکاف"و "حدك"و کۆماری کوردستان بەبێ گەڕانەوە بۆ ئەو تێڕوانینە گشتیەی هەیە بۆ سەرۆکایەتی لە چوارچێوەی جوڵانەوەی نەتەوایەتی کورد، بە شێوەیەکی گشتی لە هەردوو سەدەی (19و 20). پەیوەندیی قازی موحەممەدو "ژێکاف" دیاردەیەکە پێشینەی مێژوویی هەیەو یەکەم دیاردە نییە لە مێژووی بزاڤی کورد، لە ساڵی 1923 دەستەبژێری کوردایەتی لە ئەفسەرانی کورد "پارتی سەربەخۆیی"یان دامەزراند لە کوردستانی تورکیا، بەڵام ئازادیی نوشستی هێنا لەوەی جەماوەری کورد بە لای خۆیدا رابکێشێت، بۆیە ناچار بوو سەرنجی شێخ سەعیدی پیرانی بۆ لای خۆی راکێشا، لە دوای پەیوەندیی شێخ سەعید بە ئازادی هەمان دیاردە روویدا، کە لە دوای پەیوەندیی قازی موحەممەد بە"ژێکاف"ەوە روویدا، رۆڵی مەلا مستەفاو حیزبی رزگاریو پاشماوەی پارتی هیوا لەسەر هەمان رێڕەون، سەرکردایەتی نوخبەی وردە بۆرژوای کورد لە نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەم بۆ گەیشتن بە زیادبوونی پێگەی جەماوەریی خۆیان پەنایان بردۆتە بەر هێما ئایینییەکان، وەکو کەناڵێك بۆ گەیشتن بە ویژدانی جەماوەری موسڵمانی کورد.

## ژێکاف و ئامانجەکانی و پەیوەندیی لەگەڵ پارتی هیوا

ئەگەر بە وردی دیراسەی "ژێکاف" بکەین، دەبینین هەندێ خاسیەتی هەیە لەوانی تری جیا دەکاتەوە. "ژێکاف" وەکو حیزبەکانی تر گۆشکرابوو بە بنەماکانی شۆڕشی فەڕەنسیو بنەماکانی سەرۆك ولسنو بەڵێنەکانی ئەتڵەنتی بۆ مافی گەلان، هەروەها لە ژێر کاریگەریی بزووتنەوەی نەتەوایەتی کوردستانی عێراقدا بووە، بەتایبەتی بیری گۆڤاری گەلاوێژو بڵاوکراوەکانی هیواو خۆیبوونو بیری پارتە مارکسیەکانی کوردستانی عێراقو پارتی تودە.

"هاشموف"ی قونسوڵی ڕووسی لە ورمێ لە نزیکەوە دیراسەو چاودێریی "ژێکاف"ی کردبوو، دەڵێ: (خۆی لە توندوتیژی دەپارێزیو میراتگری پارتی خۆیبوونە، بۆ بەدیهێنانی ئامانجی نەتەوایەتی لە ڕێگەی گۆڕانی کۆمەڵایەتیو چاککردنی کشتوکاڵ

جەخت دەكاتە سەر رزگاركردنی كوردستانی گەورە)[713]. لەڕاستیدا "ژێكاف" بزوتنەوەیەكی سیاسی چاكسازیی بووە، لە چاوپێكەوتنێكی تایبەتی لەگەڵ مامۆستا حەمدی دەڵێ: مەلا قادری مودەڕسی یەكێك بووە لە دامەزرێنەرانی "ژێكاف" وتویەتی: بە بۆچوونی "ژێكاف" چەك بێسوودەو زیان بە جوڵانەوەی كوردیی دەگەیەنێت، چونكە گەلی كورد لە ڕووی فیكریو كۆمەڵایەتیەوە ئامادە نییە بۆ سەربەخۆییو خەباتی چەكداری، هەروەها مودەڕیسی دەڵێ: (بڕوامان وابوو خەباتی چەكداری دەست پێنەكەین، تا رێكخستنەكانی حیزبمان لە هەموو پارچەكانی كوردستان بڵاو دەبنەوە، ئەوكات لەیەك كاتدا لە هەموو كوردستان خەباتی چەكداریی رابگەیەنین)[714]، بەڵام بە لای جەمال نەبەزەوە دواخستنی خەباتی چەكداریی لەلایەن "ژێكاف" لەسەر ئەو بڕوایە هەڵچنراوە، كە پێیوابووە ئینگلیز لە دوای شەڕی دووەمی جیهانی هاوكارییان دەكات بۆ بنیاتنانی دەوڵەت[715]. پێكهاتەی سەركردایەتی "ژێكاف" لە قۆناغی یەكەم جیاوازییەكی ترە لەگەڵ پارتە كوردییەكانی تر، سەركردایەتی كلاسیكی "ئاغاو شێخەكان" پێیانوابووە پێشەنگی زۆربەی جوڵانەوەكانی كوردایەتین، بەڵام "ژێكاف" لە نەوەی وردە بۆرژوای بچووك "فەرمانبەرو بازرگانی بچووك" بوون.

لە قۆناغی یەكەم زۆربەی ئەندامانو جەماوەری "ژێكاف" لە هەمان چین بوون، ئاغاو شێخەكانیان بە كۆسپی بنەڕەتی بەردەم پێشكەوتنی گەلی كورد داناوە، لە یەكەم ژمارەی گۆڤاری "نیشتیمان"دا زەبیحی بانگی ئاغاكانی كوردی كردووە، كە بیر لە ئاییندە بكەنەوە و بە قسەی دوژمنان فریو نەخۆن، لە شەشەم ژمارەی هەمان گۆڤار زەبیحی بەراوردی كردوون، وەكو سەرۆك هۆزەكانی قوڕەیش، ئەوانەی دژایەتی ئیسلامیان كردبوو، ئاغا كوردەكانیش لەلای خۆیانەوە دوژمنایەتی زۆری "ژێكاف"یان دەكرد، قەرەنیاغای مامەش دوژمنی سەرسەختی "ژێكاف"، ویستبووی زەبیحی بكوژێ، بەڵام رووسەكان نەیانهێشتووەو رزگاریان كرد[716]، هەژار لەوبارەیەوە دەڵێ:

---

[713]- ئەفراسیاو: بەشی دووەم، ل76.

[714] -سەمەدی: سەرچاوەی پێشوو.ل13-14.

[715] - نەبەز: سەرچاوەی پێشوو، ل35.

[716] - هەژار: سەرچاوەی پێشوو، ل69.

گوێم له عەلی خانی زاده بووه، كه یەكێك بوو له ئاغاكانی ئێران نامەیەكی زارەكی بۆ بابەكر سەلیم ئاغای پشدەری ناردووەو ئاگاداری كردۆتەوه، كه پشتگیریی "ژێكاف" نەكات، چونكه پارتێكی ئەفەندیانەیەو دژی ئاغاكان خەبات دەكەن[717]. له راستیدا دەسەڵاتی ناوەندیی رۆڵی بەرچاوی گێڕاوه له وروژاندنی ئاغاكان له دژی "ژێكاف". فەهیمی ئەندامی پەرلەمان له گەشتەكەیدا بۆ كوردستان له ساڵی 1944 به كۆمەڵێك له ئاغاكان دەڵێ: (له دەستووری سۆڤیەتیدا هاتووه "ئێمه دەوڵەتی كرێكاران‌و جوتیارانین"، ئەدی شوێنی ئێوه له كوێیه؟)[718].

هێمن دەڵێ: "ژێكاف" سەرەڕای ئەوەی پارتێكی سیاسیی بووه، حیزبێكی ئەخلاقی‌و كۆمەڵایەتیش بووه، یەكێك له مەرجەكانی ئەندامیەتی سوێندخواردن بووه بەوەی نابێت خیانەت له كوردو "ژێكاف" بكات، ئامانج لەو سوێندخواردنه ئەوه بووه، هەتا ببێته شوورەیەك له بەرانبەر بێ ئاكاری‌و دزی‌و دركاندنی نهێنییەكانی "ژێكاف"و خیانەت له گەلی كورد، لەپێناو سامان یان پلەو پایه[719]. هەژار دەڵێ: (به درێژایی ژیانم كۆمەڵێكی سیاسیم نەدیووه وەكو "ژێكاف" خۆشەویستی‌و برایەتی‌و خۆنەویستی باڵی بەسەرادا كێشابن)[720].

هەموو توێژەرەوەكان له قۆناغی یەكەمی ژیانی "ژێكاف" بەزۆری باسی لایەنی ئەخلاقی دەكەن، بەداخەوه بزوتنەوەی كوردایەتی هاوچەرخ ئەو لایەنەی فەرامۆش كردووه، ئەمەش قەیرانی ئەخلاقی درووست كردووه. بەرئەنجامی ئەو قەیرانەش لەسەر گەلی كورد زۆر كەوتووه، دزی‌و زوڵم و دووبەرەكی و نووشستی هەموو بزوتنەوه سیاسییەكان ئاماژه و كاریگەریی قەیرانی ئەخلاقییه. به لێكۆڵینەوەی ورد له بزووتنەوەی كوردایەتی له سەدەی نۆزدەوه بۆ شۆڕشی ئەیلول‌و راپەڕین‌و ئەزموونی حكومەتی هەریم بەڵگەیه بۆ ئەو ئاماژەیه.

---

[717] - هەمان سەرچاوه، ل70.

[718] - ئەفراسیاو: بەشی یەكەم، ل55.

[719] - هێمن: سەرچاوەی پێشوو، ل20.

[720] - هەژار: سەرچاوەی پێشوو، ل60.

دکتۆر گوڵمرادی لە بابەت ئامانجو بەرنامەی "ژێکاف"ەوە دەڵێ: (ژێکاف یەکەم ڕێکخراو بووە خاوەن بەرنامەو تێڕوانینی روون بێت)[721]. د.قاسملو رایەکی تری هەیە و دەڵێ: (ژێکاف هەندێ ئامانجی بۆ خۆی دانابوو، بەڵام بەرنامەی روونی نەبوو، شێوازی ڕێکخستنەکەی بەڵگە بووە لەسەر ئەوەی کۆمەڵەیەکی نەتەوەیی داخراو بوون)[722]. دکتۆر شەفیق قەزازیش لەو بارەیەوە دەڵێ: (حیزبێکی بێ بیروباوەڕ، لایەنی هەستی نەتەوایەتی رووت بە سەریاندا زاڵ بووە، کۆبوونەوەیەکی نەتەوەیی بوون زیاتر لەوەی بە مانای حیزبی، حیزبی بن)[723]. لە یەکەم ساتەوە سەرەڕای تێکگیرانی ئەم بۆچوونانە دیارە، بەڵام ئەمانە گوزارشت لە جیایی ئامانجی "ژێکاف" دەکەن. مامۆستا گوڵمرادی هەڵە نەبووە لەوەی ناجێگیریی ئامانجی "ژێکاف" باسی کردووە لە نێوان سەربەخۆییو حوکمی زاتی، ئەگەر "ژێکاف" داوای حوکمی زاتی کردبێت، دەبێت ئاگادار بین بەوەی لە دوایی خۆی دەبوارد لە داواکاریی سەربەخۆیی بۆ هەموو کوردستان.

دکتۆر قاسملوش پێکاویەتی، کە دەڵێ: ("ژێکاف" بەرنامەی روونی نەبووەو لەسەر ئامانجی گشتی قسەیان کردووە). ئەگەر گۆڤاری نیشتیمان بخوێنیتەوە لە بابەت هەندێ بیروبۆچوونی ئەو پارتە تێدەگەی، کە "ژێکاف" پەیڕەوێکی ناوخۆو ئامانجی دیاریکراوی نەبووە، بەڵام قسەی قەزاز، کە دەڵێ: زیاتر گردبوونەوەیەکی نەتەوەیی بووە، ئەمە بە تەواویی لەسەر قۆناغی دووەمی "ژێکاف" جێبەجێ دەبێت، بەڵام لە یەکەم قۆناغ هەندێ بنەڕەتی پارتایەتی لە ئامانجو رژێمی کارگێڕی و پرنسیپی روونی بەرچاوی هەبووە.

هەندێ لە توێژەرەوان بڕوایان وایە "ژێکاف" بەشێك بووە لە پارتی هیوای کوردستانی عێراق، کە لە ساڵی 1939 بە سەرۆکایەتی ڕەفیق حیلمی دامەزرا، هیوا بەوە ناسرا بوو، کە دۆستایەتی لەگەڵ ئینگلیز هەبووەو ڕێگەی سیاسیی و دیبلوماسی گرتبووە بەر بۆ بەدیهێنانی خواستی کوردستانی سەربەخۆ بە یارمەتی بەریتانیا[724].

---

[721] -گولمرادی: سەرچاوەی پێشوو، ل9-10.

[722] -قاسملو: سەرچاوەی پێشوو، ل26.

[723]- Shafiq Qazaz, (The Kurdish Question) unplished ph. D Dissertation. P.81

[724] -هەژار: 64-65، نەبەز: ل46، عەبدوڵڵا مەردۆخ: کۆمەڵەی "ژێکاف"و حیزبی هیوا، گزینگ، ژمارە 13، ل55-65.

"ژێکاف" داوای کردووە هیوا نوێنەری خۆی بنێرێ بۆ مهاباد بۆ بەگەڕخستنی کورد لە کوردستانی رۆژهەلات. یەکێك لە ئەندامانی هیوا بە ناوی (میرحاج) وەکو میوان لە کۆنگرەی دامەزراندنی "ژێکاف" لە ساڵی 1943 ئامادە بوو، بۆیە ناتوانین میرحاج وەکو ئەندامانی دامەزرێنەری "ژێکاف" تێبگەین، هەروەها گۆڤاری نیشتیمان لە لاپەڕەی یەکەمدا نووسیویەتی: (بژی سەرۆك)، دەڵێن مەبەستیان رەفیق حیلمی بووە، ئەمە بووە بڕوای سوجادیو کۆچیرای گۆڕیبوو، کە "ژێکاف" بکەنە بەشێك لە پارتی هیوا[725].

بەڵگەنامە رووسیو بەریتانییەکان جەخت دەکەنەوە لەسەر ئەوەی "ژێکاف" لە رووی کارگێڕیو رێکخستنەوە بەشێك بووە لە هیوا، لەگەڵ ئەوەشدا ئامانجی وێکچوویان هەبووە. بە پشتبەستن بە سەرچاوە فەرمییەکانی حکومەتی ئێرانی "ژێکاف" دیاردەیەکی ناوخۆییەو بە دەرەوە پەیوەست نەبووە[726]. لەڕاستیدا دەتوانین ئەوە تێبینی بکەین "ژێکاف" لە پەیوەندییە گشتیەکانیدا سەربەخۆ بووە لە بەرانبەر هیوا. بە شێوەیەکی تر ساردیو گەرمی پەیوەندییەکانیان لەسەر ئیدارەی ئینگلیز لە هەریەك لە عێراق و ئێران دامەزرابوو. بە ڕوونی دڵنیام "ژێکاف" بەشێك نەبووە لە هیوا، لەوکاتەی لە کوردستانی عێراق ئازادیی رێکخستنو بزاوتن درابوو بە هیوا، لە ئێران ورياییان دابوو بە کورد لە چەندین بۆنەدا پەیوەندیی بە سەرکردەکانی "ژێکاف"ەوە نەکەنو لەگەڵیاندا قسە نەکەن[727].

بە نەمانی هیوا بەهۆی دووبەرەکیەوە "ژێکاف" توانی لقی خۆی لە کوردستانی عێراق بکاتەوە بە سەرۆکایەتی ئیبراهیم ئەحمەد، لە لقە هەرە چالاکەکانی "ژێکاف" بووە، هەتا دوای گۆڕانی "ژێکاف" بۆ حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران، ئەو لقە مابوونەوەو ئیبراهیم ئەحمەد سوور بووە لەسەر هەڵنەوەشاندنەوەی "ژێکاف". ئەو کاتەش حیزبی دیموکراتی کوردستانی عێراق درووست بوو، ئیبراهیم ئەحمەد و هاوڕێکانی نەچوونە ناویەوە، تا رەزامەندیی مهابادیان وەرنەگرت و نەکەوتنە ژێر فشاری

---

[725] -نەبەز: ل33.

[726] -Arfa: p.72.

[727] - ئەفراسیاو: سەرچاوەی پێشوو، بەشی یەکەم، ل51.

کۆمەڵەکەی خۆیان لە سلێمانی[728]. مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد لە چاوپێکەوتنێکیدا لە ساڵی 1998 دەیوت: پەیوەندیی نێوان ژێکاف لە مهابادو لقی سلێمانی زۆر لاواز بووە، ئێمە وەکو رێکخستنی سەربەخۆ کارمان کردووە، لقی سلێمانی زۆر چالاك بووە لە هاریکاری ناوەندیی لە ئەدەبیاتی کوردیو لە بەخشین[729].

ژێکاف هەوڵیدا چالاکییەکانی بۆ کوردستانی گەورە فراوان بکات، داوای لە کوردی کوردستانی تورکیاو عێراقو سوریا کرد سەردانی مهاباد بکەن. قەدری پاشاو قازی وەهاب لەو کوردە چالاکانە بوون سەردانی مهابادیان کرد، هەروەها موحەممەد ئەمین شەریفیان ناردە کوردستانی عێراق بۆ هاریکاریی لەگەڵ هیوا. هەردوولا رێککەوتن لەسەر کۆبوونەوەیەکی کوردیی بۆ هەر چوار پارچەی کوردستان لە گوندی (دلانبێر)* لە ناوچەی سێگۆشەی سنووری عێراقو تورکیاو ئێران. قاسم قادریو هەژار بە نوێنەرایەتی "ژێکاف"و قازی وەهاب بە نوێنەرایەتی کوردی تورکیا، هەروەها شێخ عوبێدوڵڵای زینۆیی بۆ ئەو کۆبوونەوەیە نوێنەری کوردی عێراق بوون. لەو کۆبوونەوەیە لیژنەیەك پێکهێنرا بۆ چالاکی بزوتنەوەی کوردایەتی لە کوردستانی گەورە. نوێنەری "ژێکاف" گەڕایەوەو بەیاننامەی لەسەر کۆبوونەوەکە بڵاو کردەوە، بەڵام سەرکردایەتی هیوا پەیوەست بوون بە ئینگلیزەوەو نەیاندەویست بەیاننامەکە بڵاو بکەنەوە، تا ئینگلیز لێیان نیگەران نەبێتو نەزانێ کوردی عێراق هاریکارییان لەگەڵ "ژێکاف"ی پاڵپشتدراوی رووسیادا هەیە[730]. رەفیق حیلمی دەستەوستانیی دەربڕی لە هەوڵەکانی "ژێکاف" بۆ کۆکرنەوەی کورد لەژێر یەك سەرکردایەتی. ئەمە ئاماژەیە لەسەر ئەوەی بەرژەوەندیی دەرەکی باڵەکانی بزووتنەوەی کوردیو پەیوەندییە دەرەکییەکانی رێگر بووە لە بەردەم دانانی یەك سەرکردایەتی. ئەو قەیرانە لە نیوەی دووەمی سەدەی بیستەم زیاتر بەردەوام بوو، بەڵام ئەو کۆبوونەوەیە هەریەك لە تورکیا و ئێران و ئینگلیزی وروژاند.

---

[728] -ئیبراهیم ئەحمەد: بیرەوەریەکانم لە دامەزراندنی "ژێکاف"، گزینگ، ژمارە، 13، ل50-51.

[729]- کەریمی: سەرچاوەی پێشوو، ل46.

* - ئەو گوندە ئێستا دیار نییە کەوتۆتە کوێیە؟

[730] - مەحمودی مەلا عیزەت: کۆماری میللی مەهاباد، لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی سیاسی، سوید، 1986،ل67-68.

به كورتی بانگەشەی ژێكاف وەكو پارتێكی هەموو كورد "پان كوردیزم"و دروشمەكانی هەروا مانەوەو لەوبارەیەوە نوشستی هێنا، هەروەكو نوشستی پێشتری خۆیبون. "ژێكاف" لە كوردستانی ئێران، وەكو ڕێكخستنێكی سنوردار مایەوە، خۆیبونیش كاتی خۆی لە سنووری كوردەكانی توركیا مایەوە، گەرچی هەندێكیان بۆ سوریا كۆچیان كرد.

## ژێكاف و سۆڤیەت

بەر لەوەی ئەفراسیاب هەورامی كۆمەڵێك بەڵگەنامە لە گۆڤاری "رابوون"و "گزنگ" بڵاو بكاتەوە، باسی پەیوەندییەكانی نێوان رووس‌و ئینگلیزو "ژێكاف" جێگەی مشتومڕ بووە، ئەو بەڵگەنامەو بیرەوەریانەی هەژارو غەنی بلوریان ئەو گفتوگۆیەمان دەوڵەمەندتر دەكەن، بە خوێندنەوەی ئەو سەرچاوانەی باسمان كردن دەردەكەوێ "ژێكاف" ئینگلیزو رووس دروستیان نەكردووە، بەڵكو هەردوو دەوڵەت لە هەوڵی ئەوەدا بوون، یەكەم جار چۆن بیگرنە خۆ، بۆ جاری دووەم دەستی بەسەردا بگرن، چونكە مهاباد ناوچەیەكی دوورەدەستی نێوان دەسەڵاتی ڕووسییە لە باكوورو ئینگلیزە لە باشوور، ئەوە شتێكی ئاساییە هەردوو دەوڵەت لە هەوڵی ئەودا بن، لە ڕێگەی كەسایەتییە سیاسی‌و سەرۆك هۆزە ناسراوەكان‌و "ژێكاف"ەوە دەسەڵاتی سیاسی خۆیان بگەیەننە ئەو ناوچەیە.

جەعفەر باقرۆڤی سەرۆك كۆماری ئازەربایجانی سۆڤیەتی، ئەندازیاری سیاسەتی ڕووسی بووە لە كوردستان، كە بە زمانی ئازەری قسەیان كردووە بۆ هاوئاهەنگی لەگەڵ كورد، پێشتر ئاماژەماندا كە هەڵوێستی رووسی لە ساڵانی 1941 ـ 1943 لەگەڵ كورد، هاوشێوەی هەڵوێستی بەریتانی بووە، لەمەڕ جەختكردنە سەر پاراستنی ئارامی‌و ئاسایش لە كوردستان‌و ڕێگەنەدان بە كورد بارودۆخەكە بتەقێنێتەوە یان لاوازیی دەسەڵاتی ناوەند بە دەرفەت بزانرێ بۆ راگەیاندنی دەوڵەتی كوردیی.

ئەوانەی بایەخ بە هەڵوێستی ڕووس دەدەن لە بەرانبەر كورد، لە ساڵی 1944 تێبینی گۆڕانێكی بەرچاویان كردووە، لە سیاسەتی رووسی، هەریەك لە نەوشیروان مستەفاو د.بورهانەدین یاسین باوەڕیان وایە ئەم گۆڕانە دەگەڕێتەوە بۆ حكومەتی

ئێرانی، کە ئیمتیازی نەوتی ڕووسی لە باکووری ئێران ڕەت کردەوە[731]، لەکاتێکدا حکومەتی ئێرانی لە هەمان ساڵ چەندین ئیمتیازی پشکنینی نەوتی دابوو بە کۆمپانیاکانی بەریتانیو ئەمریکی.

بۆیە دەبنین رووس نیگەران بوون لە هەڵوێستی حکومەتی ئێرانی، رادیۆی باکۆ کەوتە بڵاوکردنەوەی بەرنامەی راشکاوانە لەمەڕ داواکاریی لەسەر پێویستی یەکگرتنی هەردوو ئازەربایجانی ڕووسیو ئێرانی، هەروەها ستالین بە پێچەوانەی نەریتی چەند ساڵەی ڕووسی، لە ساڵی 1944 برووسکەی بە بۆنەی جەژنی سەری ساڵی "نەورۆز"ەوە بۆ شا نارد، لە دوای راگەیاندنی هەڵوێستی فەرمی حکومەتی ئێرانی لە تشرینی یەکەمی ساڵی 1944 لەمەڕ ڕەتکردنەوەی ئیمتیازی نەوت بۆ رووس، ئەوانیش لە شوێنی خۆیانەوە کەوتنە گرتنەبەری رێوشوێنی فشار لەسەر ئازەربایجان بۆ سەر حکومەتی ناوەند، وەکو داماڵینی چەك لە پاشماوەی هێزەکانی ئێرانی "پۆلیسو سوپا" لە ئازەربایجانو پێدانی گڵۆپی سەوز بە ئەندامانی حیزبی تودە "پارتی کۆمۆنیستی ئێرانی"، بە گرتنەبەری هەڵوێستی زیاتر دوژمنکارانە بەرانبەر حکومەتی ناوەندیی، بە پێکهێنانی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێرانیو هاندانیان هەتا لە چوارچێوەی ئێران داوای حوکمی زاتی بکەن، دواتر راگەیاندنی کۆماری ئازەربایجانی میللی دیموکراتی لە تەورێز[732].

دەتوانین لە چوارچێوەی سیاسەتی ڕووسی لە ئێران لە ساڵانی 1944 ـ1945 لە هەڵوێستی رووس تێبگەین، بەرانبەر "ژێکاف". هەژار لە بابەت هەڵوێستی کورد و "ژێکاف" بەرانبەر ڕووس دەڵێ:

ڕووس "ژێکاف"ی درووست نەکرد بوو، لە راستیدا ڕووس بە بەردەوامی قبوڵی مامەڵەیان لەگەڵ ئێمەدا نەکردووە، لەو کاتەی لەگەڵ هێزەکانمان تێکگیران بۆ بەدەستهێنانی سیاسەتی ڕووسی، لەوێ دەیانویست بەسەرماندا زاڵ بن، ئێمە وا سەیری رووسمان کردبوو، کە بۆ ئازاد کردنی ئێمە هاتوون لە بەرانبەر زوڵمی رەزا شا، باوەڕمان

---

[731] –Howell, pp.281-282, Yasin, 114.

[732] – FO, 371/52667. Persia. Confidential Teleg. No, 65 March 3rd. 1946, R,Bullard to Mr. Bevin.

وابوو هاوکاریمان دەکەن بۆ دامەزراندنی دەوڵەتی کوردیی، گوێبیستی سەرکردەی وەکو لینین‌و ستالین بووین، لەگەڵ ئەوەشدا شتێکمان لە بابەت رابردوو و بیروباروەڕو هەڵسوکەوتی رۆژانەی ئەوانەوە نەدەزانی، "من‌و هێمن" شەوو رۆژ پێماندا هەڵدەگوتن)[733].

ئەو راپۆرتەی قونسوڵی سۆڤیەتی لە ورمێ لە 9ی ئەیلولی 1944 لە ئاکامی چاوپێکەوتنەکەی بە سەرکردەکانی "ژێکاف" ئامادەی کردبوو، بەتایبەتی لەگەڵ قاسم ئیلیخانی زادە، زەبیحی، عەلی ریحان پشتگیرییە لە بۆچوونی هەژار. ئیلیخانی زادە بە قونسوڵی ڕووسیی دەڵێ: (ئێمەی کوردی سۆڤیەت ئەمە وەکو ئومێد دەبینین)، بەڵام قونسوڵ وەڵامی دەداتەوە: (ڕووس هەتا ئێستا لە شەڕدان‌و کاتی ئەویان نییە دیراسەی مەسەلەی کورد بکەن)[734].

لە ڕاپۆرتێکی تری "هاشمۆف" لە چاوپێکەوتنی لەگەڵ سەرکردەکانی "ژێکاف". دەڵێ: (لە هەموو چاوپێکەوتنی سەرۆکە کوردەکان پێمان وتوون مەسەلەی رزگارکردن‌و سەربەخۆیی کوردستان مەسەلەیەکی ناواقیعیەو کاتی بەسەر چووە، داوامان لێکردوون پەیوەست بن بە پارتە دیموکراتییەکانی ئێرانەوە)[735].

لە ساڵی 1944 هاشمۆف هەڵوێستی لەمەڕ "ژێکاف"ەوە دەربڕیوەو دەڵێ: (سەرۆکە کوردەکان و "ژێکاف" ئیستا دەیانەوێ بە هەموو ڕێگەیەك هاوکاریی ئێمە بکەن، بەڵام ئەوانە ئامانجی پیسیان هەیە، دەیانەوێ سوود لە پشتیوانی ئێمە وەربگرن بە شێوەیەکی کاتی بۆ بەدیهێنانی ئامانجی ئەم قۆناغەیان، بەڵام هەرگیز ئەمەکدار نین، بەکرێگیراوی ئینگلیزن، سەربەخۆیی لەلای ئەوان یانی پاراستن‌و قۆرغکردنی ئەو سامانەی بە ڕێگەی دەستبەسەراگرتن کۆیان کردۆتەوە، ئینگلیز کورد هان دەدات داوای سەربەخۆیی لە سۆڤیەت بکەن‌و لە ئەوان پشتیوانی وەربگرن، ئینگلیز دەیەوێ ڕووس لە مەسەلەیەکی ترسناك وەربدات)[736].

---

[733]- هەژار: سەرچاوەی پێشوو، ل66.

[734]-ئەفراسیاو: سەرچاوەی پێشوو. بەشی یەکەم، ل53.

[735] -ئەفراسیاو: سەرچاوەی پێشوو، بەشی دووەم، ل72.

[736] -هەمان سەرچاوە، ل56.

گومانی هاشمۆف لەسەر پەیوەندیی نهێنی نێوان "ژێکاف"و ئینگلیز هیچ بنەڕەتێکی نەبووە، بێجگە لە هەندێ تاوانبارکردنی لێرەو لەوێی حکومەتی ئێرانیو ڕۆژنامەی ئێرانی نەبێت، لە ساڵی 1944 ڕۆژنامەی کەیهانی ئێرانی بڵاوی کردەوە، کە کورد چەك لە عێراق وەردەگرێ، بۆ هەڵگیرسانی جوڵانەوەیەکی چەکداریی لە ئێران دژی بەرژەوەندییەکانی ڕووس، ئەو کارەش بە پاڵپشتی ئینگیلز دەکات. هەروەها ڕۆژنامەکە رایگەیاند کە ئینگلیز هێژا تایەری کوڕی سمکۆی بە هێزێکی سەربازی گەورەوە ناردۆتە ناوچە سنوورییەکانی کوردستان، حکومەتی سەید "زیائەدین"یش لە تاران لەگەڵ کوردەکانی دۆستی ئینگلیز هاریکاریی هەیە بۆ لاواز کردنی پارتی تودە[737].

سەرەڕای وریاییو بێمتمانەیی و گومان بە کورد سەرۆکەکانی"ژێکاف" بە چاوی هاوپەیمانییەتیەوە دەیانڕوانییە رووس، "ژێکاف"، "زەبیحی"یان بە ڕێکخەری پەیوەندییەکان دانابوو لەگەڵ رووس، بە بەردەوامی سەردانی قونسوڵیەتی ڕووس لە ورمێ و تەورێزی کردووەو داوای لێکردون لە مەسەلە سیاسییە هەنوکەیەکانی سەر گۆڕەپانی ئێرانی ئامۆژگاریی بکەن، ئەم بەڵگەیە بایەخێکی گەورەی هەیە لەسەر ئەو مەسەلەیە، لە زۆر بۆنەدا زەبیحی داوای پشتیوانی دارایی و مەعنەوی لە ڕووس کردبوو، لە یەکێك لەو چاوپێکەوتنانە زەبیحی بە قونسوڵیەتی وتبوو، کە ئینگلیز نایەڵن گۆڤاری "نیشتیمان" لە ناوچە کوردییەکانی ژێر دەسەڵاتی ئەواندا بڵاو بێتەوە، ڕۆژنامە هاوهەڵوێستی خۆیان بە زمانی کوردیی بۆ راکێشانی کورد بڵاو دەکەنەوە، داوای لە ڕووس کردبوو، یارمەتی بدەن بەوەی "تۆبۆگراف" پێبدەن، بەڵام قونسوڵ لەمە داوای لێبوردنی لێ کردبوو، زەبیحی گەڕابۆوەو وتبووی ئێمە ئامادەین بەرانبەر ئەوە ئەندازەیەکتان پارەو زێر بدەینێ[738]. لە بۆنەیەکی تردا سەرکردەکانی "ژێکاف" لە قونسوڵیان پرسی بوو، ئایا ڕێگەیان پێدەدا "ژێکاف"ڕێکخستنەکانی خۆی بگوازێتەوە بۆ کوردستانی تورکیا و کوردستانی عێراق، دیارە هەڵوێستی قونسوڵیە لەبارەیەوە لێڵ بووە[739].

---

[737] - هەمان سەرچاوە، ل53.

[738] - هەمان سەرچاوە.

[739] - هەمان سەرچاوە.

دوای پەیوەندیی قازی موحەممەد بە"ژێکاف" لە ساڵی 1944 گۆڕانکاریی خراپ لە پەیوەندیی نێوان ئێران‌و رووس دەبینین. هەڵوێستی ڕووس بەرانبەر "ژێکاف" گۆڕاوە، هەر لەو ماوەیەدا تێبینی دەکرێ، چۆن کارتی کوردیی لەلایەن سۆڤیەتەوە بەکار هێنراوە بۆ لاوازکردنی دەسەڵاتی ناوەندیی بۆ پاڵپشتی لە مەسەلەی داواکردنی ئیمتیازی نەوت‌و هەڵوێستی تودەو مەسەلەی ئازەربایجان لە چوارچێوەی سیاسەتی ئێرانی.

پێشتر ئاماژەمان پێدا رووس چەندین جار نەیهێشتووە هێزەکانی ئێرانی بچنە مهابادو دەروبەری، چۆن (زەبیحی)یان لە مردن رزگار کرد؟ ئەمە بەڵگەیە، کە ئەوان ویستویانە کارتی کوردیی وەکو هۆکارێکی فشار بۆ سەر دەسەڵاتی ناوەند بەکار بهێنن‌و لە بندەستی خۆیان بیهێڵنەوە، لە مایسی ساڵی 1945 هەندێ لە سەرۆك هۆزەکان راوێژیان بە ڕووس کرد، کە بچنە ناو "ژێکاف" یا نا؟ وەڵامی رووسەکان لەوبارەیەوە باش بووە. هەر بۆیە زبێر بەگی هەرکی دۆستی ڕووس‌و فەوزی بەگ‌و حەسەن یەتلۆو عومەر خانی شکاك پەیوەندییان بە"ژێکاف"ەوە کرد، بەو هیوایەی ئیمتیازات و رەوامەندیی سۆڤیەت بەدەست بهێنن[740]، بە ڕێگەی دابەشکردنی چەك‌و دیاریی رەمزییەوە ڕووس هەوڵیداوە سەرۆك هۆزەکان بە لای خۆیدا رابکێشێت، هەتا لەژێر فەرمانی ئەودابن[741].

"ژێکاف" پشتیوانی سیاسەتی سۆڤیەتی بووە لە ئێران، لە راپۆرتێکی "حەسەن ئۆف"ی قونسوڵی سۆڤیەتی لە تەورێز لە رۆژی 1944/2/26دا کۆمەڵێك رێوشوێنی باس کردووە، کە "ژێکاف" لەو ماوەیەدا لە بەرژەوەندیی رووس پێشکەشی کردووە، یەکێك لە ئەندامە باڵادەستەکانی "ژێکاف" بە ناوی موحەممەدی نانەوازادە بۆ کۆبونەوەیەکی (300) کەسی لە مهاباد وتاری دەداو داوای لە حکومەتی ئێرانی دەکرد، ئیمتیازی نەوت بدا بە ڕووس، ئەو ئیمتیازەشی بە خزمەتی بەرژەوەندیی گەلانی ئێران لێك دەدایەوە، هەر لەو ساڵەدا "ژێکاف" داواکارییەکی بە واژۆی (123) کەسایەتی کوردیی ئامادە کردبوو، داوای لە حکومەتەکەی ساعیدی سەرۆك وەزیرانی ئێرانی

---

740 - FO. 271/4559 No. 26 Millitary Attaches Report, July 8,1945.

741- هەژار: سەرچاوەی پێشوو، ل70. ئەفراسیاو: سەرچاوەی پێشوو، بەشی دووەم، ل75.

ئەوکات کردووە، رازی بێت ئیمتیازی نەوت بداتە ڕووس[742]. سەرەڕای ئەوەی کورد پێشتر داوای کردبوو پاشکۆیەتی فەرهەنگی رووسی لە مهاباد بکرێتەوە، بەڵام رووس قبوڵی نەکردبوو، لە مایسی ساڵی 1945 نوێنەرێکیان نارده مهاباد بۆ کۆکردنەوەی پاشکۆیاتیەکە. "ژێکاف" زۆر دڵخۆش بوو بەو بڕیارە، بەڵام داکۆکی کردبوو بە ناوی "پەیوەستی سۆڤیەتی ـ کوردی"یەوە بێت لە مهاباد، بەڵام رووس سوور بوو بە ناوی "پاشکۆی سۆڤیەتی ئێرانی"یەوە بێت. کورد زۆر بە توندی وشەی ئێرانی رەت کردەوە، بەڵام رووس رازی بوو وشەی "ئێرانی" لابەرێ، بەڵام وشەی "کوردی" نەخستە شوێنی[743]. ئەو گفتوگۆیەی نێوان رووس‌و سەرکردەکانی "ژێکاف" بەڵگەیە لە سەردانەنانی ڕووس "هەتا نییەتی داننەنان" بە مافی کورد وەکو گەلێکی سەربەخۆ، لەو چاوپێکەوتنەی قازی موحەممەد بە وەفدی رووسی وتبوو: دەمەوێ نوێنەرێکی گەورەی سۆڤیەتی لە مهاباد بێت بە ئاسانی لە هەموو کاروبارێك راوێژی پێ بکەم‌و سوود لە ئەزموونی سۆڤیەتی وەربگرم).[744]

لە ڕاپۆرتێکی نوسینگەی ویلگنسکی وەزیر لە هۆبەی کاروباری گەلانی دۆستی سۆڤیەت لە وەزارەتی دەرەوەی ڕووسیا ویلگنسکی جەخت دەکاتەوە سەر "ژێکاف"، بەوەی هاوکارە لەگەڵ پارتە دیموکراتیەکان "دۆستانی ڕووسیا"، هەتا لەگەڵ ئەو پارتانە هاوکاریی بکەین بۆ داواکاریی دەستلەکارکێشانەوەی وەزارەتەکەی ساعدی "دۆستی ئینگلیز" بن، "ژێکاف" پارتێکی چەپە و لە دژی دەرەبەگ تێدەکۆشێت‌و داواکاریی چاکسازیی کشتوکاڵی دەکات[745].

وادەردەکەوێ بە پێچەوانەی بۆچوونی هاشیمۆف سەرکردایەتی "ژێکاف" لە هەڵوێستی دۆستایەتی لەگەڵ ڕووسدا راستگۆن. شانۆگەری "دایکی نیشتیمان"، کە رەمزی کوردستانە، ئەو منداڵەش بەرگی سوورە بەرگی هێزەکانی رووسیە، ئەوەش ئاماژەیە بەوەی رووس رزگارکەری کوردانن[746].

---

[742]-ئەفراسیاو: سەرچاوەی پێشووو، بەشی دووەم، ل55.

[743] -ئەفراسیاو: سەرچاوەی پێشوو، بەشی یەکەم ، ل70.

[744]- ئەفراسیاو: سەرچاوەی پێشوو، بەشی دووەم، ل41.

[745] -ئەفراسیاو: سەرچاوەی پێشوو، بەشی دووەم، ل76.

[746]- ئەفراسیاو: سەرچاوەی پێشوو، بەشی دووەم، ل40.

منیش لەگەڵ هێژا "ئەفراسیاب هەورامی" هاوبۆچونم، کە دەڵێ: (بە درێژایی سەدەی بیستەم هەڵوێستی رووس دۆستانە نەبووە لەگەڵ کورد، لە سەرەتای بیستەکان نامەی شێخ مەحمودیان قبوڵ نەبووە، دوودڵ نەبوون لە پاڵپشتی مستەفا کەمال بۆ سەرکوتکردنی بزوتنەوەی شێخ سەعیدی پیران‌و پاڵپشتی شا دژی سمکۆو هەڵوەشاندنەوەی کۆماری سووری کوردستان. وادیارە ئەو خۆپیشاندانەی "ژێکاف" لەپێناو ئیمتیازی نەوتی ڕووسی لە ئێران‌و راوێژی بەردەوامی نێوان "ژێکاف"و بەرپرسانی ڕووس بەرزکردنەوەی وێنەی لینین‌و ستالین لە چەندین بۆنەدا بەس نییە، رووس بڕوا بکات بە نییەتپاکی "ژێکاف" بەرانبەر ئەوان‌و سەربەخۆیی "ژێکاف"، بەڵام ئەو کارانە بەس بووە بۆ وروژاندنی توڕەیی دەسەڵاتدارانی ئێرانی‌و ئینگلیزی‌و ئەمریکی بەرانبەر "ژێکاف"[747].

## ژێکاف و ئینگلیز

پەیوەندیی نێوان "ژێکاف"و ئینگلیز زۆر خراپ بووە، بەریتانیا لە ماوەی شەڕی دووەمی جیهانی ترساوە لە پەیوەندیی لەگەڵ کورد، نەیویستووە مەترسی ئێران‌و تورکیاو عێراق بۆ خۆی بوروژێنێ[748]. لەکاتێکدا بەریتانیا لە بیستەکان و سییەکان پاڵپشتی ئەو دەوڵەتانەی کردووە بۆ سەرکوتکردنی جوڵانەوەی نەتەوایەتی کورد، لە ژێر چاودێریی ئەودا پەیمانی سەعد ئابادی دژ بە ئاسایشی نەتەوایەتی کوردیی مۆر کرا. ئەو دەوڵەتانە لەو بڕوایەدا بوون ئینگلیز لەپشت هەموو بزوتنەوەیەکی نەتەوایەتی کوردیەوەیە، بەڵام هەموو بەرژەوەندییە ستراتیژیەکانی بەریتانیا لەو ماوەیەدا پاراستنی کانەکانی نەوتی سەر بە کۆمپانیای نەوتی ئەنگلۆ- بەریتانی بووە، لەگەڵ چاودێریی هێڵی بەیەکگەیشتنی رووس‌و ئێران بۆ گەیاندنی یارمەتییەکانی بەریتانیا بۆ رووس دژی هیتلەر، لە کۆتایی شەڕی یەکەمی جیهانیش پشتیوانی بەریتانیا بۆ حکومەتی ناوەندیی لە تاران دژی هەوڵەکانی ڕووسیا بووە لە بەرانبەر لە ئامێزگرتنی ئێران لە ڕێگەی پارتی

---

[747]- ئەفراسیاو: سەرچاوەی پێشوو، بەشی یەکەم، 49.

[748] - FOm 370/52702 (Kurdish Problem) Research Despartment, state Department. April 2nd 1946.

تودەو پارتە چەپەکانی تر، ئەمە لە گرنگترین ئامانجە ستراتیجیەکانی بەریتانیا بووە، لەوەشدا ئینگلیز ئاگادار بووە، کە کۆمۆنیستەکانی ڕووس بەرژەوەندیی ئیمپریالیستیان لە ئاوەگەرمەکاندایەو پێشتر لە ساڵی 1940 پەیماننامەی نهێنییان بۆ بەدیهێنانی ئەو ئامانجە هەبووە لەگەڵ هیتلەر[749].

ئینگلیز لە بیست ساڵەی دەسەڵاتی ڕەزا شا پشتیوانی هەوڵەکانی حکومەتی ئێرانی بووە، لە دەستبەسەراگرتنی بزووتنەوەی کوردو پشتگیریی سیاسەتی سەرکوتکردنی هۆزە کوردەکان، لە ماوەی شەڕی یەکەمی جیهانیو دوای ڕووخانی ڕەزا شا، هیچ لەم سیاسەتەی نەگۆڕیبوو، لە 15ی کانوونی دووەمی 1942 ئایدن وەزیری دەرەوەی بەریتانیا یاداشتنامەیەکیدا بە مۆلتۆف وەزیری دەرەوەی سۆڤیەت، کە گوزارشتی لە نیگەرانی حکومەتی بەریتانی دەکرد بەرانبەر سوود وەرگرتنی کورد لە پشتیوانی سوپای سوور بۆ وروژاندنی گرفت لە سنووری ئێرانی ـ تورکی[750].

حکومەتی بەریتانی لەو باوەڕەدا بووە ڕووس "ژێکاف"ی درووست کردووە، لە خولگەی نەخشەی سیاسەتی رووسیش دەخولێتەوە، بۆیە ئیدارەی بەریتانی لە عێراق بایەخی تایبەتی بە کاروباری ناوچە کوردییەکانی ئێران داوە، ئەفسەرە هەواڵگرییەکانی بەریتانی وەکو کۆلۆنێل لیونی لە کەرکووکو کۆکس چەندان جار سەردانی ناوچە کوردییەکانی ئێرانیان کردبوو بۆ ئەوەی ئاگاداربن لە هەڵوێستو پشتیوانی لە هەوڵەکانی حکومەتی ئێرانی لە دەستبەسەراگرتنی بزوتنەوەی نەتەوایەتیو سەرۆک هۆزە شۆڕشگێڕەکانی دژ بە دەسەڵاتی ناوەند، وەکو حەمە ڕەشیدخانو مەحمودخانی کانی سانانو جەعفەر سوڵتانی دزڵی[751].

یورکات قونسوڵی ئینگلیز لە تەورێز ئەوەی بیر سەرۆک هۆزەکانی کورد خستبۆوە، کە پشتیوانی رووس بۆ ئەوان هیچی لێ شین نابێت، هەروەکو هاوکاریی حکومەتی فەرەنسی بۆ بزووتنەوەی ئیسکتلەندی نەتەوایەتی هیچی لێ شین نەبووە[752].. ڕۆزفێڵت

---

[749] -Eagleton.p.14.

[750]– ئەفراسیاوە. بەشی دووەم.

[751] – شەمزینی: سەرچاوەی پێشوو، ل165.

[752] – کۆچیرا: سەرچاوەی پێشوو، ل260.

پاشکۆی سەربازیی لە تاران وتبووی کە عەبدوڵڵا ئوف لە ڕێگەی مەشروباتەوە پەیوەندیی بە زەبیحییەوە کردووەو بەلای خۆیدا رای کێشاوەو کردوویەتیە بە کرێگیراو[753]. پشتیوانی ئینگلیز بۆ حکومەتی ئێرانی لە شەڕەکانی بانە و سەقزی سالانی 1942–1944 بەدیار کەوتووە، دوای کەوتنی رەزا شا، حەمە رەشید لە ساڵی 1941 بارودۆخی شەڕی قۆستەوەو لە مەنفاوە هەلاتو کەوتە بەرەنگاری حکومەتی ئێرانی بێ ورە. بە هاوکاریی‌و پشتیوانی هۆزەکانی بەگزادەی بانە بەسەر سوپای ئێرانی سەرکەوت، کە ژەنەرال ئیبراهیم فەرەح‌و هۆشمەند ئەفشاری خوێنڕێژ سەرکردایەتیان دەکرد، حەمە رەشیدخان هێزەکانی ئێرانی تێکشکاندو حکومەتی ئێرانی ناچار کرد دان بنێ بە دەسەلاتی ئەو لە بانە. ساڵی 1944یش هێرشی کردە سەر مەریوان، بەلام هێزەکانی ئێرانی ئەم جارە بە پشتیوانی هەندێ لە هۆزە کوردەکان هێزی حەمە رەشیدخانیان تێك شکاندو بۆ جاری دووەم ناچاریان کرد بەرەو عێراق هەڵبێت[754].

نامەکانی نێوان ئیدارەی بەریتانی لە عێراق‌و بەرپرسانی ئینگلیز لە ئێران ئاماژەیە بەوەی لە کاتی شەڕەکان حکومەتی بەریتانی زانیاریی بایەخداری داوە بە حکومەتی ئێرانی. بابەکراغای پشدەری خاوەن پێگەی ناوچە سنوورییەکانی عێراق‌و ئێران یەکێك بووە لە کۆڵەکە خۆجێیەکانی پشتیوانی لە سیاسەتی ئینگلیز لە کوردستان[755]. "ژێکاف" لە قۆناغی یەکەم بە سەرۆکایەتی زەبیحی‌و لە قۆناغی دووەم بە سەرۆکایەتی قازی موحەممەد لە هەوڵی ئەوەدا بوون هەڵوێستی هاوسەنگ لەگەڵ ئینگلیز وەربگرن. زەبیحی هاموشۆی قونسوڵیەتی رووسی دەکرد لەگەڵ ئەوەدا سەردانی قونسوڵیەتی ئینگلیزیشی دەکرد لە ورمێ. لە چەندین بۆنەدا قازی موحەممەد بۆ بەدەستهێنانی ئامانجی نەتەوایەتی کورد سەرکردەکانی "ژێکاف"ی ناردووە بۆ قونسوڵیەتی ئینگلیز[756]. کۆچیرا لە قازی موحەممەدەوە دەگێڕێتەوە کە وتویەتی: بەبێ پشتیوانی

---

[753]-A.Roosevele, Jr. (The Kurdish Republiv of Mahabad) p.125

[754]-O.S.S. Department of State (The Tribal Problems in Iran s domestic and Forign Policy 49-48ل ،....مستەفا هەڵەموتی

[755] – عەبدوڵلا رەسوڵ پشدەری: یاداشتەکانم، بەشی یەکەم، بەغدا، 1992، ل41.

[756] – بلوریان: سەرچاوەی پێشوو، ل52.

حکومەتی بەریتانی بەرژەوەندیی نەتەوایەتی کورد لە عێراق بەدی نایەت[757]. گۆڤاری نیشتیمان لە ژمارە 4/3ی ساڵی 1943 نووسیویەتی: حکومەتی بەریتانی رزگارکەری گەلانی چەوساوەیە، گۆڤاری "دەنگی گێتی تازە"ش هاواری بردۆتە بەر بەریتانیا کە رادیۆیەك بۆ کورد دابمەزرێنێت*، بەڵام بەو خۆدەرخستنە نەیتوانی بێلایەنیو سەربەخۆیی خۆی بۆ ئینگلیز بسەلمێنێتو هەر بە دروستکراوی رووسییان زانیوە. لەڕاستیدا "ژێکاف" بە شێوەیەکی گشتی بەلای رووسدا مەیلدار بووە، ئەو سیاسەتەش چۆتە رێڕەوی گشتی سیاسەتی رووسی، بە تەنیا مەسەلەیەك نەبێت، ئەویش سووربوونی "ژێکاف"ە لەسەر بەدیهێنانی سەربەخۆیی کوردستانی گەورە، کە کارێکەو لەگەڵ بەرژەوەندییەکانی رووس تێك گیراوەو نەیویستووە ئێران پارچەپارچە ببێت.

سۆڤیەت بۆ راکێشانی سەرنجی زۆرینەی "تورك، عەرەب، فارس" لە وڵاتی خۆیاندا هەوڵیداوە لە ئێران پشتی بە پارتی تودە ببەستێو ویستویەتی کارتی ئازەریو کورد وەکو فشار بۆ سەر دەسەڵاتی ناوەند بەکاربهێنێت. چاوی بڕیبوە گرێدانی ئازەربایجان بە کوردستانیشەوە بە ئازەربایجانی سۆڤیەتی، بۆیە نیگەران بووە لەهەر مامەڵەیەکی "ژێکاف" لەگەڵ ئینگلیز[758].

هەیە پێیوایە "ژێکاف"و سکرتێری یەکەمی زەبیحی پەیوەندیی نهێنییان لەگەڵ ئینگلیزدا هەبووە، ئەگەر ئەوە وابێ، کە هاشیمۆفو حکومەتی ئێرانی پڕوپاگەندەیان بۆ کردووە، بۆچی ئامێرێکی چاپیان نەدایە بۆ دەرکردنی گۆڤاری "نیشتیمان"ی زمانحاڵی "ژێکاف"، کە زۆر پێویستیان پێی هەبووە؟ ئەم داواکاریەی چەند جار لە ڕووس دووبارە کردۆتەوە، بۆچی ئیدارەی بەریتانی قبوڵی نەکردووە گۆڤاری نیشتیمان لە ناوچە کوردییەکانی ژێر دەسەڵاتی حکومەتی بەریتانی بڵاو بێتەوە؟ لەکۆتاییدا بۆچی

---

[757] - کۆچێرا: سەرچاوەی پێشوو، ل28.

* - گۆڤاری دەنگی گێتی لە کۆتایی ساڵانی شەڕی یەکەمی جیهانی لەلایەن تۆفیق وەهبیو حوسێن حوزنیەوە لە رێنومایيو پشتیوانی ئینگلیز لە عێراق دەردەچوو هیچ پەیوەندیی بە سیاسەتی"ژێکاف" نەبووە. "وەرگێڕ".

[758]- FO.371/52702.No.British Emboassy Moscow to state Department. 4th June 1946.

ئینگلیز قبوڵی نەکردووە داوا لە حکومەتی ئێرانی بکات بۆ بەردانی زەبیحی؟ ئەم پرسیارانە هی مامۆستا ئەفراسیاب هەورامیەو بە شیاوی دەبینم[759].

## گۆڕانی "ژێکاف" بۆ حزبی دیموکراتی کوردستان

هەتا ئێستاش مەسەلەی گۆڕینی "ژێکاف" بۆ حیزبی دیموکراتی کوردستان جێگەی مشتو مڕە، کتێبەکەی عەلی کەریمی کە بەم دواییە بڵاو کرایەوە "ژیانو بەسەرهاتی عەبدوڕڕەحمانی زەبیحی"، زیاتر ئەو مەسەلەیەی وروژاند، ئەوەی کەریمی ئاماژەی پێکردووە هەوڵێکی ئینقیلابی بووە، لەوکاتە ئەنجام دراوە هەرسێ سەرکردەکەی "ژێکاف" زەبیحیو دڵشادی رەسوڵیو قاسمی قادری لەوێ نەبوون، بەڕای ئەو قازی لە دوای وەرگرتنی پۆستی سەرۆکایەتی ئەندامە سەرەکیەکانی "ژێکاف"ی دوور خستۆتەوە، لەجێی ئەو کەسانی نەشیاوی داناوە، ئەو هەنگاوەشی بە هاندانو پشتیوانی رووس بووە، چونکە رووس لە بانگەشەی سەربەخۆیی کوردستانی گەورە رازیی نەبوون. هەروەها کەریمی دەڵێ: بڕیاری گۆڕینی ناوی "ژێکاف" بۆ "حیزبی دیموکراتی کوردستان" لە تاریکی دراوە*. ئەگەرنا چۆن حیزب هەڵدەوەشێتەوە بەبێ سکرتێرو ئەندامە سەرەکیەکانی[760].

---

[759] -ئەفراسیاو، سەرچاوەی پێشوو، بەشی یەکەم، ل51-52.

* - مەرج نیە لەگەڵ تەواوی رای ئەوانە بم بە هی نووسەریشەوە، لێرەدا دوو سەرنج لەسەر ئەو بۆچوونە دەردەبڕم:

یەکەم: لە پرنسیپی حزبایەتی وایە، ناوی حیزب لە ڕێگەی کۆنگرە یان کۆنفراسەوە دەگۆڕێ، کەچی هیچ سەرچاوەیەك باسی کۆنگرەو کۆنفراسو تەنانەت کۆبوونەوەیەکی سەرکردایەتی "ژێکاف"یش ناکات لەسەر گۆڕینی ناوو دەستلەکارکێشانەوەی سەرۆکی پێشووی "ژێکاف"و دانانی سەرۆکی تازە بۆ "حدك".

دووەم: سەرکردە تەقلیدیەکانی پێش قازی موحەممەد، لە بزاڤی رزگاریخوازی کورد، کە دیارە قازیش هەر لە ریزی ئەوانە بووە، هەموویان لەوەدا یەك دەگرنەوە، کە لەگەڵ نوخبەی سیاسی کورد دۆست نەبوون، بە پێچەوانەوە نوخبەی سیاسیش لە دوای مردنی نەبێت لەگەڵ سەرکردە کاریزما تەقلیدیەکان تەبا نەبوون، ئەمەش بە زیان بۆ سەر بزاڤی سیاسی کوردستان دوایی هاتووە، ئاساییە پەیوەندیی قازیو نوخبەی سیاسی ئەوکاتەش لەسەر هەمان رێڕەو بووبێتو لە ئاکامی ئەو ناکۆکیە زیان بە بزاڤی رزگاریخوازی کورد گەیشتبێ، پێموایە هۆکاری هەموو پەردەپۆشکردنی ناکۆکیەکانی نێوان ئەندامانی پێشووی

ئەفراسیاب هەورامیش بەشداری لە بۆچوونی کەریمی کردووە و دەڵێ: (هیچ گومانی تێدا نییە هەڵوەشاندنەوەی "ژێکاف" بە پیلانی سۆڤیەت بووە، چونکە سەربەخۆیی کوردستان لەگەڵ بەرژەوەندییەکانی سۆڤیەت ڕێکنەدەکەوت، حیزبی تودەش لەو مەسەلەیەدا ڕۆڵی هەبووە، بە ناوزڕاندنی "ژێکاف" لای سۆڤیەتییەکان)[761].

لەکاتێکدا سەید عەزیزی شەمزینی پێشتر ئاماژەی بەمە کردبوو، نووسیبووی: کە قازی موحەممەد زەبیحیو دڵشادو قاسمی لە بەرپرسیاریەتی دوور خستبۆوە، کەسی نادڵسۆزی خستبووە شوێنیان. لەوکاتەی زەبیحیو هاوەڵانی لە مهاباد گیران خەڵکی مهاباد هەوڵیاندا کاربەدەستە عەجەمەکان بگرن، بەڵام قازی موحەممەد قبوڵی نەکرد بەو بیانوەی بە ڕێگەی هێمنانە هەوڵی بەردانیان دەدا، واپێدەچێت قازی موحەممەد مەبەستی بووبێت ماوەیەك زەبیحی لە گرتووخانە بمێنێتەوە، هەتا سیاسەتی خۆی بەسەر "ژێکاف"دا بچەسپێنێت. ئەمە لەکاتێکدا قازی ویستویەتی ناوو بەرنامەی "ژێکاف" بگۆڕێتو زەبیحی بەرهەڵستی کردووە[762].

قونسوڵی سۆڤیەتی لە ورمێ لە ساڵی 1945 لەسەر رای "هاشیمۆف" لە ڕاپۆرتێکیدا ئاماژەی بە گرتنی زەبیحی کردووە، نووسیویەتی: "ژێکاف" پارتێکی چەپی دژ بە ئینگلیزە، بەڵام ئینگلیز لە ڕێگەی هێژا "کینك بالکوینك" ئەفسەری هەواڵگری لە کەرکووك توانیبووی دەست بخاتە ناو "ژێکاف"و لەناویاندا باڵێکی راسترەو درووست بکات، کە داوای دۆستایەتی ئینگلیز بکەن. بۆ ئەو مەبەستەش لەگەڵ دەسەڵاتی ناوەندیی پیلانێکیان ڕێکخست بەتایبەت خەلعەت بەری "ئەندامی پەرلەمانی

---

سەرکردایەتی "ژێکاف"و قازی موحەممەد نەهێنراوەتە گۆڕێ، دەگەڕێتەوە بۆ شێوازی کۆتایی هاتنی کۆمارو مەرگەساتی لەسێدارەدانی قازیو هەندێ لە هاوڕێیانی، کە قازی کردە سونبلی بەرخودانو خەباتی نەتەوەیی میللەتی کورد، هەموو ناتەواویەکانی سەردەمی سەرکردایەتی "ژێکاف"و "حدك" شاردەوە.

شیکاری بێ تاوانو تاوانباری ئەو ناکۆکییەش لە بزاڤی سیاسی کوردستان پێویستی بە توێژینەوەیەکی سەربەخۆ هەیەو ئێرە جێی درێژەپێدانی ئەو باسە نییە. "وەرگێڕ"

[760] - کەریمی: سەرچاوەی پێشوو، ل17، 116-117.

[761] - ئەفراسیاو: سەرچاوەی پێشوو، بەشی یەکەم، ل50.

[762] - شەمزینی: سەرچاوەی پێشووە، ل110-111.

ئێران" کە لەو ماوەیە سەردانی کوردستانی کردبوو، بۆیە راستڕەوەکانی ناو حکومەت دەستیان هەبووە لە گیرانی زەبیحیو برادەرەکانی[763].

ئەو پڕوپاگەندانەی لە سەرەوە ئاماژەمان پێداوە هیچ پەیوەندییەکی نییە بە گیرانی زەبیحیو هەڵوەشانەوەی "ژێکاف"و دامەزراندنی "حدك"، ئەو تاوانانەی ئاڕاستەی قازی موحەممەدێك کراوە، کە بە دڵسۆزیو راستگۆییو خۆنەویستیو دیموکراتی ناسراوە، پێویستە لێرەدا بە وردی لە ئاست ئەو تاوانبارکردنە بوەستین، کە مەبەستمان بەرگریی نییە لە قازی موحەممەد، بەڵکو تێگەیشتنە لە ڕاستی، ئەگەرنا ئەویش مرۆڤەو وەکو هەموو سەرکردەیەکی تر تووشی هەڵە بووە.

ئەو تاوانانەی دراونەتە پاڵ قازی موحەممەد لە کودەتا کردن بەسەر سەرکردایەتی "ژێکاف"و هەڵوەشاندنەوەی حیزب بنەڕەتەکەی دەگەڕێتەوە بۆ کتێبەکەی عەزیز عەبدوڵڵا شەمزینی[764]، لە کاتێکدا ململانێیەکی شاراوە هەبووە لە نێوان خانەوادەی شەمزینیو خانەوادەی قازی لەسەر سەرۆکایەتی بزوتنەوەی کوردایەتی لە کوردستانی ئێران. سەید عەبدوڵڵای باوکی سەید عەزیز لە چلەکان ئەندامی کارای کۆڕی کوردیی بووە لە ئێران، لە نەوەی نەهریە، هەندێ پێیانوابووە شایستە بووە بۆ سەرۆکایەتی بزوتنەوەی کورد، بەڵام گومانی ئەوەی لەسەر بووە پەیوەندیی بە ئینگلیزەوە هەبووبێت[765].

---

[763] -ئەفراسیاو: بەشی دووەم. ل79، لەراستیدا هیچ بەڵگەیەك نییە لەسەر باڵی راستڕەوە لەناو "ژێکاف" بەڵام لە بیرەوەریەکانی هەژار گێڕانەوەیەك هەیە کە ئاماژە دەکات بە باڵی لایەنگری ئینگلیز لەناو (حدك) بەتایبەت لایەنگرانی شێخ مەعسوم سۆفی. قازی موحەممەد بە پەیوەندییەکانی شێخ مەعسوم بە ئینگلیزەوە ئاگادار بووە، بەڵام ترساوە لەوەی شێخ سزای بدات، چونکە شێخ لایەنگری زۆر بووە. بڕوانە (چێشتی مجێور، ل73).

[764] -عەزیز شەمزینی لەو کتێبەی ئاماژەمان پێدا هەندێ زانیاریی سەلبیمان بۆ دەگێڕێتەوە لەسەر کەسایەتی قازی موحەممەد، کە لە کتێبو سەرچاوە ئێرانییەکانیشدا هاتووە کە دڵڕەقن بەرانبەر قازی موحەممەدو پێیان وتووە خیانەتکارو بەرژەوەندچیو... (بڕوانە لاپەڕەکانی 157 -159، ل163-164).

[765] -لەو میهرەجانەدا زیرۆ بەگ هێرشی کردە سەر عەبدوڵڵا شەمزینی و بە خائینی دانا، ئەو قسەیە لە رۆژنامەی کوردستانی فەرمی بڵاو کرایەوە، ئەوە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی لە حکومەتی کوردستان بەشداریی بۆچوونی زیرۆ بەگی کردووە. مستەفا، سەرچاوەی پێشوو، ل126-127.

وا دیاره لە سەرکردایەیی قازی موحەممەد رازیی نەبووبێت، لە مایسی ساڵی 1945 سەردانی "هاشیموف"ی کردووەو پێی وتووە: (قازی موحەممەد پیاوێکی ناسراو نییە، پەیوەندیی بە دەسەڵاتی ناوەندو ئینگلیزەوە هەیە، پارەیەکی زۆر بۆ چەکدارەکانی لایەنگری خۆی خەرج دەکات، کەس نازانێ ئەو پارەیەی لە کوێ هێناوە؟)[766]. ئەم گرژیەی سەید عەزیز بەرانبەر قازی موحەممەد هەندێکی لە باوکیەوە بۆی بەجێ مابوو، بۆیە دەبینین لە کتێبەکەیدا بە روونی دەریبڕیوە، کە ئامانجی شکاندنی شکۆی قازی موحەممەد بووە، لێرەدا چەند نموونەیەکی ناو کتێبەکەی دیاریی دەکەین لەسەر هەڵوێستی خراپی ئەو بەرانبەر قازی موحەممەد. پێشتر ئاماژەمان پێدا بەوەی، کە قازی تاوانبار کردووە بە دوورخستنەوەی زەبیحیو هاوڕێیانیو پیلاندانان بۆ گرتنیان. هەروەها بە قازی موحەممەد دەڵێ: "بە فەرمانی شاهانە دامەزراوە"، یان قازی موحەممەد لە شا نزیك بووە، هەروەها توانجی گرتۆتە سەردانەکەی قازی موحەممەدو پیاوماقوڵانی مهاباد بۆ لای هەمایونی "فەرماندەی ئەو هێزە ئێرانییە کە لە ساڵی 1946 هێرشی هێنابووە سەر میاندواو"، ئەو بەر لە هێرشەکەی سەر مهاباد دەڵێ: (بەم شێوە خوێن ساردییە قازی موحەممەد پێشوازیی لە سوپای ئێرانی داگیرکەر کرد). ئەمە لەکاتێکدا بارودۆخێکی زۆر ئاڵۆز قازی موحەممەدی ناچار کرد سەردانی هەمایونی بکات، بەڵام شاهیدیدانی سەید عەزیز لەسەر قازی موحەممەد لەو بەرئەنجامەی نووسەر بەدەر نییە، بۆیە پێویستە بە وریایی مامەڵەی لەگەڵدا بکەین [*].

سەبارەت بە گرتنی زەبیحی لە هاوینی ساڵی 1945 دوو بۆچوون هەیە: یەکەمیان گێڕانەوەی فەرمی حکومەتی ئێرانی هەیە، کە لە ئەحمەد زەنگەنەی فەرماندەی سەربازیی ئێرانی وەرگیراوە، دەڵێ: دەسەڵاتدارانی ئێرانی بە نهێنی ئاگاداری زەبیحیو هاوڕێکانی بوون، کە قازی موحەممەد رای سپاردبوون چاویان بە قونسوڵی رووسی بکەوێ، هەندێ بەڵگەنامەشیان پێدابوو، بۆسەیان بۆ دانراو یەکسەر گیرانو رەوانەی تاران کران. کەریمی لەبەر چەند هۆیەك باوەڕی وانییە زەبیحی لە سەفەری ورمێ گیرابێ، بە پشتبەستن بە چەند بەڵگەنامەیەك ئەو زانیاریانەی پێ هەڵەیە:—

[766] –ئەفراسیاو: سەرچاوەی پێشوو، بەشی یەکەم، ل41.

[*]– لێرەو لە ئەو شوێنانەی قازی موحەممەد دەکەوێتە بەر رەخنە بەرگرییەکانی نووسەر بە ئەکادیمیو زانستیانە نابینم، زیاتر لە گوتاری سیاسی و ئەدەبی دەچێت. "وەرگێڕ".

یەکەم: زەبیحی زۆر پێش لەو مێژووەی زەنگەنە باسی کردووە گیراوە، بەپێی گێڕانەوەی موحەممەد شاپەسند، کە ئەندامی دیاری ژێکاف بووە زەبیحی لە کاتی گەڕانەوەی لە کۆبوونەوەی "دلانبەر" گیراوە، زۆر لەو بەرواره درەنگترە، کە زەنگەنە ئاماژەی پێ کردووە.

دووەم: زەبیحی لەژیانیدا هیچ کارێکی بە فەرمانی قازی موحەممەد رانەپەڕاندووە، چونکە قازی موحەممەد ئەوکات لە ئاستی سەرکردایەتیدا نەبووە تا زەبیحی بۆ کارێك رابسپێرێت، حکومەتی ناوەندیش زۆر لاواز بووە، بەهەر ئامانجێك بێت دەبێت لایەنێك ئاسانکاریی بۆ کردبێت[767]، بەڵام هێژا مەحمودی مەلا عیزەت دەستی هەموو لایەنێکی کوردیی رەت دەکاتەوە لە گرتنی زەبیحیو هاوڕێکانیو دەڵێ: (ئەگەر هەر لایەنێکی کوردیی دەستی لەوکارەدا هەبوایە ئاشکرا دەبوو، دوایی بۆچی زەبیحیو دڵشادی رەسوڵی هوشیار بوونو دەیانتوانی بێنە گۆ، ئەدی بۆچی هێمن و هەژار و دۆستانی "ژێکاف" لە دوای کەوتنی کۆمار بێدەنگ بوون)[768].

بۆچوونی دووەم، کە پێشتر ئاماژەم پێدا بەرپرسانی سۆڤیەتی هێناویانە گۆڕێ، کە گرتنی زەبیحی بە پیلانی ئینگلیز بووە بە ڕێگەی چاندنی باڵێکی راستڕەو لەناو "ژێکاف"، چونکە زەبیحی نوێنەرایەتی باڵی چەپڕەوی ناو "ژێکاف"ی کردووە، گرتنی زەبیحی نووشستی باڵی چەپڕەو بووە لە بەرانبەر باڵی راستڕەوی ناو "ژێکاف".

لە هەردوو بۆچووندا بە دەستپێشخەریی حکومەتی ئێرانی بێت یان هەوڵی دۆستانی ئینگلیز لەناو سەرکردایەتی "ژێکاف" ئەوە هیچ بەڵگەیەکی یەکلاکەرەوە نییە لەسەر رۆڵی قازی موحەممەد لە کێشەی زەبیحی. بە بۆچوونی ئێمە باڵی هاوسۆزی ئینگلیز لەناو "ژێکاف"دا نەبووە، هاشیمۆف لەوەدا بە هەڵەدا چووە، هەروەها سەید عەزیزی شەمزینیش بە هەڵەدا چووە، بەوەی قازی موحەممەد زەبیحیو دڵشادو قاسمی لە شوێنی خۆی دوورخستبێتەوە، لەوکاتەی گیران کاریان بۆ "ژێکاف" دەکرد، قازی موحەممەد ئەندامی کارای "ژێکاف" بووە، ئەو ناوانەش لە کۆماری مهاباد

---

[767] - ژیانو بەسەرهاتی، ل112-116.

[768] - مەحمودی مەلا عیزەت: جمهوری کوردستان، نامەو دیکۆمێنت، ستۆکهۆڵم، 1995، بەرگی سێیەم، ل690.

بەرپرسیاریەتییان وەرگرتووە، کە قازی موحەممەد پیاوی یەکەم و دەسەڵاتدار بووە، ئەوەی باس دەکرێ لەسەر گرتنی زەبیحی زەمینەیەکی پتەوی نییە.

ئەوەش کە قازی موحەممەد بەرپرسیاریەتیەکی وای نەبووە زەبیحی بۆ کارێکی وا رابسپێرێ، پێچەوانەی هەموو گێڕانەوەکانی ترە، "هەژارو هێمن" بەدڵنیاییەوە دەڵێن: قازی موحەممەد بە ماوەیەکی کەم بۆتە پیاوی یەکەمو کەسی یەکەمی ژێکاف، گرتنی زەبیحی بەپێی گێڕانەوەی کەریمی لە حوزەیرانی ساڵی 1945دا بووە، بەڵام قازی موحەممەد لە تشرینی یەکەمی ساڵی 1944 پەیوەندیی بە"ژێکاف"ەوە کردبوو.

نووسەری ئەم وتارە پێیوایە قازی موحەممەد دەستی لە بەگرتدانی زەبیحیدا نەبووە، هەرچۆنێکی لێك بدەینەوە سوور نەبووە لەسەر هەوڵدان بۆ ئازاد کردنی، هۆی ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ فشار نەخستنە سەر رووس لەپێناو بەردانی زەبیحی تا کار گەیشتە خۆپیشاندانی خەڵکی مهاباد لەبەردەمماڵی قازی موحەممەد، ئەمە قازیی جوڵاند داوا لە رووس بکات گرەنتی بەردانی زەبیحی بگرنە ئەستۆ، بە کردەوەش هاتەدی[769]. هەروەها راستە قازی موحەممەد لە سەرەتای گرتنی زەبیحی نەیهێشتووە خەڵکی مهاباد بۆ دەبڕینی ناڕەزاییو ناچارکردنی حکومەت کاربەدەستانی عەجەم بگرن، هەتا زەبیحیو هاوەڵانی ئازاد بکرێن، بەڵام رۆژنامەی کوردستان کە لەژێر چاودێری قازی موحەممەد دەردەچوو، هەواڵی ئازادکردنی زەبیحی وەکو مزگێنی گەرم بۆ هەموو خەڵکی کوردستان بڵاو کردەوە، داوای کرد بەو بۆنەیەوە ئاهەنگ بگێڕن، هەتا هەژار بۆ ئەو رۆژە دەڵێ: وەکو رۆژێکی مێژوویی سەربەخۆیی کوردستان بووە[770]. بەردانی زەبیحیو هاوڕێکانی بەو گەرمیو رێزلێنانە لە ڕۆژنامەی کوردستانو لای خەڵکی مهاباد مانای خۆی هەبووە.

ئەگەر مەسەلەی پیلان لێبگەڕێینو بچینە سەر گۆڕینی ناوی "ژێکاف"بۆ "حدك" ئەوە دەبینین چەند هۆکارێکی پەیوەست بە"ژێکاف" خۆیو بارودۆخی ئێرانو باری نێودەوڵەتی هەبووە کوردی ناچار کردبێت "ژێکاف" بگۆڕێ بۆ چوارچێوەیەکی فراوانتر بۆ پەرەپێدانی بزوتنەوەی کوردایەتی، پێش "ژێکاف"یش چەند چوارچێوەیەکی تر

---

[769] - کەریمی: سەرچاوەی پێشوو، ل109.

[770]- هەژار: چێشتی مجێور، ل72.

هەبوون، گومانی تێدا نییە کە رووسو ووردتر بڵێین جەعفەر باقرۆف نەخشەسازو کارزانی سیاسەتی سۆڤیەتی بووە بەرانبەر کورد، لە دوای پێکهێنانی حیزبی دیموکراتی ئازەربایجان لە ژێر چاودێریی باقرۆف و پێکهێنانی کۆماری ئازەربایجانی دیموکراتی لە تەورێز لەگەڵ کابتن هاشیمۆف کاریگەریی راستەوخۆ و تۆکمەیان هەبووە بۆ هەڵوەشانەوەی "ژێکاف"و دامەزراندنی "حدك".

باقرۆف نەخشەی هەبووە بۆ لکاندنی کوردستان بە کۆماری ئازەربایجانەوە، بەڵام چاکی زانیوە، کە "ژێکاف" دەمارگیریی نەتەوایەتی بەهێزی هەیە، بە چاوی گومانەوە لێی دەڕوانی، دەیزانی دەبنە کۆسپی بنەڕەتی جێبەجێکردنی ئەو سیاسەتە، باقرۆف داوای لە ئەفسەری رووسی لە ئێران کرد وەفدێکی کوردیی پێك بهێنرێتو بە زوویی رەوانەی باکۆ بکرێن، قازی موحەممەد لەلایەن کابتن غازۆف ئەفسەری پەیوەندیی رووسی لە 12ی ئەیلولی 1945 داوای لێکرا وەفدێك لە سەرۆك هۆزەکانی کورد پێك بهێنێتو بچنە تەورێز، لەوێ دەیاندێرن بۆ باکۆ هەتا لە بابەت ئایندەی کوردەوە وتوێژ بکەن، وەفدی کوردستان بە سەرۆکایەتی قازی موحەممەد، لە 50 کەسایەتی کوردیی پێك هاتبوو، لەگەڵ گەیشتنە باکۆ، باقرۆف وتبووی: ناتوانرێ باس لە مافی چارەنوسی گەلی کورد بکرێ، بەڵام بۆ بارودۆخی ئەمڕۆ، هەتا بیری نەتەوایەتی لە هەموو پارچەکانی کوردستان لە یەك کاتدا بەهێز و رێكوپێك دەبێت، لە بەرژەوەندیی کوردە ببن بە بەشێك لە کۆماری ئازەربایجانی دیموکراتی لە ئێران، قازی موحەممەدو ئەندامانی وەفدەکە ئەوەیان قبولڵ نەکردبوو، گفتوگۆی توند لە نێوان قازی موحەممەدو باقرۆف رووی دابوو، دوایی باقرۆف وتبووی: رووسیای سۆڤیەتی پشتیوانی لە داواکاریی کورد دەکات لە چوارچێوەی حوکمی زاتی بە مەرجێ دەوڵەتی سەربەخۆی کورد رانەگەیەنن، هەروەها باقرۆف داوای لە وەفدی کوردیی کردبوو "ژێکاف"ی دۆستی ئینگلیز "بە ڕای ئەو" هەڵبوەشێتەوە، لە جێگەی ئەوە حیزبێك پێك بێت، کە ئامانجی جیابوونەوەی نەبێتو ئامادە بێت لە پێناو دیموکراتیەت لەگەڵ پارتە چەپەکانی تری

ئێران کار بکات. لە بەرانبەر ئەوەدا باقرۆف بەڵێنی پێدابوون چەکو پارەو چاپخانەیان بۆ بنێری[771].

پشدەری یەکێك بووە لە سەرکردە سەربازییەکانی کوردستان دەنووسێت: (دوای ئەوەی رووس داوای پێکهێنانی وەفدێکی کوردیی کرد، سەردانی باقرۆف بکەن، قازی موحەممەد وەفدێکی لە30 کەسایەتی کوردیی پێکهێناو لە کاتی سەردانەکە باقرۆف سوور بوو لەسەر ئەوەی دروشمی سەربەخۆیی لابرێت، بەرانبەر ئەمە بەڵێنی دابوو پشتیوانی دارایی‌و رۆشنبیریی کورد بکات)[772]، هەژار لەسەر سەفەری دووەمی باکۆ تێگەیشتنی خۆی هەیە دەنووسێت: (قازی موحەممەد لە دوای گەڕانەوەی بە ئەندامانی "ژێکاف"ی وتبوو: رووس بە"ژێکاف" نیگەرانە، چونکە داوای یەکگرتنی هەموو پارچەکانی کوردستان دەکات، ئەمە کێشە لەگەڵ تورکیای هاوپەیمان بۆ رووسیا درووست دەکات، بۆیە لەجێی "ژێکاف" حیزبێکی نوێ پێك بهێنن، داوای دیموکراتیەت بۆ ئێران و حوکمی زاتی بۆ کوردستان بکات[773].

غەنی بلوریان لە بیرەوەرییەکانی خۆیدا، باسی لە سەفەری دووەمی باکۆ کردووەو دەنووسێت: (رووس چاوی بڕیبووە لکاندنی کوردستان بە ئازەربایجانی ئێرانی، ئەمەش لەپێناو لکاندنی بە ئازەربایجانی رووسی، باقرۆف نیگەران بووە لە مامەڵەی کۆمەڵە لەگەڵ ئینگلیز، بۆیە قازی موحەممەدیش لە دوای گەڕانەوەی لە باکۆ بە لیژنەی مەرکەزیی "ژێکاف"ی وت: "ئێمە بۆ دەوڵەتێکی کوردیی تێدەکۆشین هەموو کوردستان بگرێتەوە، ئەوە مافێکی رەوایە، بەڵام دەبێت واقیعی بین، لە بارودۆخی ئێستا کار بکەین بۆ بەدەستهێنانی مافی نەتەوایەتی لە چوارچێوەی ئێران هەتا دەوڵەتە گەورەکان لەو خەباتە پشتیوانیمان لێبکەن، بۆیە پێویستە ناوی "ژێکاف" بگۆڕین، ئێستا بە تەنیا سۆڤیەت حەز دەکات پشتیوانیمان لێ بکات، بەڵام لە چوارچێوەی بەرژەوەندییەکانی خۆی[774].

---

[771]-FO, 371/52667. Persoa Confidial. Teleg. No, 65. March 3[rd], 1946. R. Bullard to Poosevelt. Pp.126-128 . مەحمودی مەلا عیزەت، سەرچاوەی پێشوو، ل92-93

[772] - پشدەری: سەرچاوەی پێشوو، ل45-47.

[773] -هەژار: چێشتی مجێور، ل72.

[774] -بلوریان: سەرچاوەی پێشوو، ل57.

ئەمە سەبارەت بە هۆکاری دەرەکی، دیارە ناوخۆییش هەبووە لە قەناعەتپێهێنانی قازی موحەممەدو سەرکردەکانی کورد بۆ گۆڕینی ئامانجە ستراتیژییەکانیان لە دەوڵەتی سەربەخۆی کوردییەوە بۆ حوکمی زاتی لە چوارچێوەی ئێران، چونکە لە ئێران بە گشتی و لە تاران بەتایبەتی رەوتێکی بەهێز هەبووە، کە رێگە بە موحەممەد رەزا شا نەدات ئەزموونی دیکتاتۆریەتی باوکی دووبارە بکاتەوە، حیزبی توودەی لایەنگری رووسیش دەسەڵاتی تەواوی پەیدا کردبوو لەسەر سەندیکاکانی کرێکاران لە ئێران، بە تایبەت سەندیکای کرێکارانی نەوت، هەروەها پارتە ئێرانییەکان خۆیان ئامادە دەکرد بۆ هەڵبژاردنو بەدەستهێنانی زۆرترین کورسی پەرلەمانی بۆ چەسپاندنی بارێکی دیموکراتی.

پارتی دیموکراتی لیبراڵی تریش لە دوای کەوتنی شا داوای ئازادیو دیموکراتییان دەکرد، بۆ کوردیش شتێکی ئاسایی بوو، خواستەکانیان لەو دەروازەیەوە بخەنە ڕوو. ئەمە لەکاتێکدا زۆربەی پارتە ئێرانییەکان داوایان دەکرد دەستووری ئێرانی "یاسای بنەڕەتی ساڵی 1911" بخرێتە گەڕ هەتا ئەندازەیەکی زۆر لامەرکەزیەت لە پێکهێنانی وڵات دەستەبەر بێت، بۆیە حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێرانیش لە بەیاننامەی دامەزراندنی خۆیدا داوای کردبوو، ئێران بگۆڕێت و ئەیالەتی کوردستان تەشکیل بکرێت[775].

"ژێکاف" لە بارودۆخێکی زۆر نهێنی دامەزرا، بەڵام گۆڕانکارییەکانی کاتی شەڕی یەکەمی جیهانی لە ئێران و جیهان لە بەرژەوەندیی دیموکراتی بوو[776]، بۆ بەرەوپیرچوونی ئەو بارودۆخە نوێیە پێویست بوو حیزبی نوێ درووست بێ، مەحمودی مەلا عیزەت لە زاری رەحیمی قازی دەگێڕێتەوە کە یەکەم بەیاننامەی حیزبی دیموکراتی کوردستان لە تشرینی دووەمی 1945 لە کۆبوونەوەیەکی نهێنی "ژێکاف"دا نووسرا، مەحمودی مەلا عیزەت دەڵێ: کاری حیزب بە تەواویی وەستا بوو، چالاکیی بە ڕادەیەك

---

[775]-جەلیل گادانی: 50 ساڵ خەبات، کورتە مێژوویەکی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران، بەرگی یەکەم، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەرێمی کوردستان، ل26.

[776]- قاسملو: سەرچاوەی پێشوو، ل29-30، گولمرادی، سەرچاوەی پێشوو، ل10، گادانی، سەرچاوەی پێشوو، ل26.

سست بوو، هەر سێ ژمارەکانی (7، 8، 9)ی نیشتیمان لە یەك ژمارەدا دەرچوو[777]، هێمن دەڵێ: هەندێ لە رووناکبیرانی ناو "ژێکاف" باوەڕیان کردبوو، کە لەو بارودۆخە تازەیەی نێودەوڵەتی ناتوانن لە تێکۆشان بەردەوام بن، بۆیە لەپێناو کوردایەتی لەو بارە تازەیەدا "حدك"یان دامەزراند. "حدك" لەسەر بنەڕەتی "ژێکاف" دامەزراو قازی موحەممەدیش، کە پێشتر ئەندامی "ژێکاف" بوو، بووە سەرۆك‌و سەرۆکی پێشووش، بووە ئەندامێکی ئاسایی، بەڵام دڵسۆزی "حدك" بوو[778].

بەرزکردنەوەی دروشمی حوکمی زاتی لەلایەن "حدك"و گوزارشتی "دروشممان لەم قۆناغەدا" لە سەرەتای دامەزراندن مانای وایە کورد مافی ئەوەی هەیە لە قۆناغەکانی ئاییندە دروشمی تر بەرز بکاتەوە، بەمەش جۆرێك لە بەردەوامی هەیە لە دروشم‌و ئامانجەکان، بۆ زیاتر پشتگیریی ئەو بۆچوونەمان نەوشیروان مستەفا ئاماژەی بە یاداشتنامەیەك کردووە، کە "ژێکاف" لە ساڵی 1944 داویەتی بە"فەهیم مەلیك"ی ئەندام پەرلەمانی ئێرانی، کە سەردانی کوردستانی کردووە، ئەم داواکاریانەی لەخۆ گرتبوو، کە زۆر لە داواکاریی "حدك" دەچێت:

زمانی کوردیی ببێتە زمانی فەرمی کوردستان.

ئیدارەی حکومەتی کوردیی لەلایەن کاربەدەستانی کوردەوە بەڕێوە ببرێ.

باجی کوردستان لە ناوچە کوردییەکان خەرج بکرێ.

ئەو داواکاریانە لە پەرلەمانی ئێرانی وتوێژیان لەسەر بکرێ‌و یاسای تازە زەمانەتی ئەو مافە بکات‌و بیپارێزێت.

ئەو مافانەی ئێستا دەخرێنە ڕوو، بە ڕەوای دەزانین لە داهاتوو دروشمی مافی چارەنووس بەرز بکەینەوە[779].

لەراستیدا گۆڕینی "ژێکاف" بۆ "حدك" وەرچەرخانێکی گرنگ بووە لە مێژووی بزووتنەوەی کوردایەتی. ژێکاف رەوتێکی نوخبەویی نهێنی لە ئیشوکاردا گۆڕا بۆ

---

[777]- مەحمودی مەلا عیزەت: دەوڵەتی جمهوری کوردستان، نامەو دیکۆمێنت، 690-692.

[778] - هێمن: تاریك‌و روون، ل32.

[779]- حکومەتی کوردستان، رێبەندانی 1324-1325، کورد لە گەمەی سۆڤیەتدا، هۆڵەندا، 1993، ل62-63.

حیزبێکی جەماوەریی ئاشکرا. مامۆستا گولمرادی دەڵێت: لە کۆتایی شەڕی یەکەمی جیهانی ژێکاف ڕێکخراوێکی بچوك بوو، ژمارەی ئەندامانی (72) ئەندامی نیشتەجێی شار بوون، لە 16ی ئابی 1945و دوای ساڵێك گۆڕانی بۆ "حدك"، بووە بزوتنەوەیەکی میللی کە هەموو توێژەکانی کۆمەڵگای کوردیی بگرێتەوەو ژمارەی ئەندامانی گەیشتە (20) هەزار کەس[780].

## کۆماری کوردستان

هێژا مەحمودی مەلا عیزەت دەڵێ: چەندین لایەنی ژیانی کۆماری کوردستان هەیە پێویستی بەتوێژینەوەیە، بەتایبەت ئەوەی پەیوەستە بە پەیوەندییەکانی نێوان ئازەربایجانو تاران و رووس. نووسەرانی هاوچەرخ زیاتر پێویستیان بە ڕوونکردنەوەو هەڵوێستە هەیە لەسەر هۆیەکانی روخانی کۆماری مهاباد لەژێر رۆشنایی بەڵگەنامە بڵاوکراوەکانی دەوڵەتە پەیوەندیدارەکان[781]. لەم بەشەدا تیشك دەخەینە سەر هەندێ لایەنی سروشتی کۆماری کوردستانو پەیوەندییەکانی لەگەڵ ئازەربایجانو رووس، دواتر دەچینە سەر ئەو هۆکارە ناوخۆییو ئیقلیمیو نێودەوڵەتیانەی کۆماریان هێشتەوە.

کۆماری کوردستان بەرهەمی تێکۆشانی "ژێکاف"ە کە "حدك" لە 16ی ئابی 1946 نوێی کردەوە، بۆیە لێرەدا پێویستە بگەڕێینەوە بۆ ئامانجو چۆنییەتی پێکهێنانی حیزبی دیموکرات، پێشتر ئاماژەمان پێدا، هۆی سەرەکیی لە پێکهێنانی "حدك" دەگەڕێتەوە بۆ دووەم سەردانی باکۆی ساڵی 1945ی سەرکردە کوردییەکانی ئێران، لە سەرەتای بەیاننامەی دامەزراندندا هاتووە، حیزب تێدەکۆشێت بۆ زەمانەتی مافی کورد لە ئێراندا، کە لە قانونی بنەڕەتی ئێرانی "دەستووری ساڵی 1911"دا هاتووە، داوای پێکهێنانی ئەیالەتی "ویلایەت"ی کردووە لە ناو ئێراندا.

لە ئامانجەکانی حیزبدا هاتووە:

1– بەکارهێنانی زمانی کوردیی لە فێرکردنو دادوەریو کارگێڕیدا.

2– گرەنتی حوکمی زاتی لە چوارچێوەی ئێراندا.

---

[780] – گولمرادی: سەرچاوەی پێشوو، ل10.

[781] – مەحمودی مەلا عیزەت: دەوڵەتی جمهوری کوردستان، نامەو دیکۆمێنت، ب3، 697-714.

3– کاربەدەستانی دەوڵەت لە ناوچە کوردییەکان کورد بن.

4– زەمانەتی ماف جوتیارانی کوردستان.

5– پەرەپێدانی کشتوکاڵو بازرگانیو دارتاشی.

6–کارکردن بۆ دەستەبەرکردنی دیموکراتی لە ئێران.

7– پشتیوانی لە دابینکردنی دیموکراتی لە کوردستانو پاراستنی ماف مرۆڤی کورد بەبێ رەچاوکردنی بیروباوەڕی ئایینیو رامیاریو رەچەڵەك.

8– خەبات بۆ گەشەپێدانی خزمەتگوزاریی تەندرووستیو رۆشنبیری بۆ کوردستان.

9– باجی کۆکراوەی ناوچە کوردییەکان لە کوردستان خەرج بکرێت، بە تەنیا رێژەی 30٪ بنێردرێتە خەزێنەی دەوڵەتی ناوەند.

10– پشتیوانی لە ماف گەلانی تری ئێران بکرێت[782].

بە وردبوونەوە لەو ئامانجانەوە دەردەکەوێ، کە "حدك"ی ئێرانی وەکو هەموو پارتە کوردییەکانی تری سەدەی بیستەم پارتێکی سیکۆلاریزمی بووەو لە ئێران بە دوای دیموکراتیدا وێڵ بووە، وەکو ئامانجێکی ستراتیژی جەختی لەسەر حوکمی زاتی کردۆتەوە، پێیوابووە کوردستانی ئێران بەشێکە لە خاکی ئێرانی. بەدیهێنانی ئەو ئامانجەش پەیوەندییەکی جەوهەریی هەبووە بە بڵاوبوونەوەی دیموکراتیەت لە هەموو ئێراندا، ئەمەش نە لە ئێرانو نە لەو وڵاتانەی ئێدارەی کوردستانیان لەدەست بووە نەهاتۆتە دی. بۆ دروشمی حوکمی زاتیش کە حیزبە کوردییەکان بەرزیان کردبۆوە، چەندین جار دەرکەوت کە نەزۆكو بێ ئاکام بووە، دەبینین چۆن ئەو دروشمە لە کوردستانی ئێران نووشستی هێنا؟

لە1945/12/11 حیزبی دیموکراتی ئازەری بە سەرۆکایەتی جەعفەری بیشاوری حکومەتی کۆماری ئازەربایجانی راگەیاند، لە 1946/1/22 بە ئامادەبوونی ژمارەیەکی زۆر لە سەرۆکە کوردەکانو بە سەرۆکایەتی "حدك" بە ئامادەبوونی 10 هەزار هاووڵاتی لە ئاهەنگێکی گەورەدا قازی موحەممەد کۆماری میللی کوردستانی راگەیاند. لە دوای راگەیاندنی کۆمار هێزەکانی حیزبی دیموکراتی کوردستان، کە پێیاندەوترا هێزەکانی کوردستان لە هەموو ناوچە کوردییەکان بڵاو بوونەوە، هێزی رووسیو بەریتانی تێدا

---

[782] گادانی: سەرچاوەی پێشوو، ل28-29.

نەبوو بێجگە لە چەند حامیەیەکی بچوکی ئێرانی نەبێت لە سەردەشتو سەقزو بانە، کە لە بەرانبەر هێزەکانی کورد گەمارۆ درابوون، راگەیاندنی کۆمار لە چەند روویەکەوە ئەمری واقیع بووە، قازی موحەممەد لە وتارەکەیدا رایگەیاند، کە لە ساڵی 1941ەوە کورد ئیدارەی ئەو ناوچانە دەگێڕن. هەر لەوێ نازناوی پێشەوایان لە قازی موحەممەد نا، ئیدارەیەکی حکومەتیان بە ناوی "هەیئەی رەئیسی میللی کوردستان" پێکهێنا، کە لە ئاستی دەستەی وەزاریدا بووە، ئاڵای کوردیان لە جیاتی ئاڵای ئێرانی لەسەر کۆشکەکانی مهاباد بەرز کردەوە، لە دوای ئەو ئاهەنگە هەموو گوندو شارەکان ئاڵایان بەرز کردەوە، لەگەڵ ئەوەدا دیبلۆماسیەکانی رووس لە کوردستانو ئازەربایجان ئامادەی ئاهەنگی راگەیاندنی کۆمار نەبوون، بەڵام سەڵاحەدین ئەفسەری ڕووسی لە بەرگی بازرگانیدا بە ناوی "کاکە ئاغا" لە مهاباد خۆی شاردبۆوە، قازی موحەممەد لە ئاهەنگێکی گەورەی رۆژی 1946/1/22 وتی: (گەلی کورد هەموو پێویستییەکی نەتەوایەتی خۆی هەیە، بە تایبەت ناوچەی جوگراف، وەکو هەموو نەتەوەکانی تر ماف دیاریکردنی چارەنوسی خۆی هەیە، گەلی ئێمە ئەمڕۆ لە خەوێکی قوڵ هەستاوە، هاوپەیمانی بەهێزی هەیە، لە ئەمڕۆوە مهاباد لە ئیدارەی کاروباری خۆی لە حکومەتی ناوەندیی سەربەخۆیە، گەلی کورد کەلەپورێکی دەوڵەمەندی هەیە لە بەرێوەبردنی خۆی، شاری مهاباد بەشێکی دەوڵەتی کوردی موکریانی "ئەردەڵانی" بووە، لە مێژووی کورددا کاروانێك خانەوادەی فەرمانڕەوامان هەیە، بۆ نموونە ئەیوبیەکان، ئەردەڵان، بابان، کە بابان کۆتایی هات، سۆران سەری هەڵدا [*]، هەروەها دەسەڵاتدارانی بەدلیس فەرمانڕەوایەتی بەشێکی کوردستانیان کردووە، تا بۆ دوژمنی بسەلمێنن کە گەلێکن دەستگیر ناکرێن. با جەماوەری کوردستان پارێزگاریی لە یەکرێزیو ئاڵای پیرۆزی کوردستان بکەن، هەتا بۆ هەمیشەیی بە بەرزی بمێنێتەوە).[783]

---

[*]- ئەگەر ئەو برِگەیە لە نوسخەی بنەڕەتیش وا هاتبێ هەڵەیە، چونکە میرنشینی بابان لە ساڵی 1851ز روخا، پێشتر لە ساڵی 1833ز میرنشینی سۆران رووخابوو. هەردووکیان بەدەستی عوسمانییەکان بۆ هەتا هەتایە دواییان پێهات. "وەرگێڕ".

[783] بلوریان: سەرچاوەی پێشوو، ل64، مەحمودی مەلا عیزەت: دەوڵەتی جمهوری کوردستان، نامەو دیکۆمێنت، ب3، ل639.

لەم وتارەدا بە ڕوونی بەدیار دەکەوێ، کە قازی موحەممەد زانایەکی بەرز بووە، وەکو زانایانی پێش خۆی شارەزایی لە شەرعو زانستە کۆمەڵایەتییەکاندا هەبووە، ئاگاداری بنەڕەتی سیاسی نەتەوەیی بووە لە زمانو ناوچەی جوگرافی تایبەت بەخۆی، زۆر بە قوڵی لە مێژووی کورد ئاگادار بوە، وەکو ئەوەیە بە زمانی حاڵ بڵێ ڕاگەیاندنی کۆمار مافێکی سروشتیو مێژووییەو دەبێت لە چوارچێوەی ڕێڕەوی مێژووی کورد دیراسە بکرێ. لە 1946/1/26 کابینەی حکومەتەکەی بەم شێوەی خوارەوە ڕاگەیاند:

| حاجی بابە شێخ | سەرۆك وەزیران | زانای ئاییني |
|---|---|---|
| موحەممەد حوسێن سەیفی قازی | وەزیری جەنگ | / |
| موحەممەد ئەمینی موعینی | وەزیری ناوخۆ | بازرگان |
| ئەحمەد ئیلاهی | وەزیری ئابوری | بازرگان |
| کەریمی ئەحمەدیان | وەزیری پۆستەو گەیاندن | فەرمانبەر |
| مەنافی کەریمی | | خاوەن زەوی |
| سەدیق حەیدەری | وەزیری ڕۆشنبیری | / |
| حاجی عەبدوڕڕەحمانی ئیلیخانی زادە | وەزیری ڕاگەیاندن | خاوەنی زەویو سەرۆك هۆز |
| موحەممەد وەلی زادە | وەزیری کار | بازرگان |
| خەلیل خەسرەوی | وەزیری بازرگانی | بازرگان |
| حاجی مستەفا داود | وەزیری داد | زانای ئاینی |
| مەلا حەسەنی موجەددی | وەزیری تەندروستی | / |

هەروەها کۆمار چەند بەڕێوەبەراتییەکی گشتی هەبووە وەکو:

بەڕێوەبەرایەتی تۆمارکردنی زەوی.

بەڕێوەبەرایەتی لاوان.

بەڕێوەبەرایەتی شارەوانی.

بەڕێوەبەرایەتی کاروباری دارایی.

هەر زوو سەیفی قازی راسپێردرا هێزێکی چەکدار بۆ بەرگریی لە کۆمار پێك بهێنێت، ئەمە لەکاتێکدا ژمارەیەکی زۆر چەکدار لە خزمەتی کۆماردا بوون، بەڵام پێویستیان بە مەشق‌و رێکخستن هەبووە، ئەم ئەرکەشیان خستە سەرشانی ئەو ئەفسەرە کوردانەی لە تشرینی دووەمی ساڵی 1945 بە هۆی بۆردومانی هێزی ئاسمانی پاشایەتی عێراقەوە ناچار بوون لەگەڵ مەلا مستەفا بچنە کوردستانی ئێرانەوە. ئەوەی شایانی باسە شۆڕشی دووەمی بارزان لە ساڵانی (1943ـ 1945) بە سەرۆکایەتی مەلا مستەفای بارزان هەڵگیرسا. حیزبی هیوا پشتیوانی لەم شۆڕشە کرد، هێزی بەرگریی کوردیی توانی بەرپەرچی سوپای عێراقی بداتەوە، بەڵام ئینگلیز بۆ رزگارکردنی عێراق لەو بارودۆخە هاتە ناوەوە. مستەفای بارزانی‌و ئەفسەرانی لەگەڵیدا بوون پەنایان بردە بەر کۆماری کوردستان‌و دوایی بوونە بەشێك لە هێزی کۆمار، ئەوانیش: (عەقید مستەفا خۆشناو، موقەدەم خەیروڵڵا عەبدولکەریم، نەقیب موحەممەد قودسی، عەقید عیزەت عەبدولعەزیز، نەقیب بەکر خۆشناو، موقەدەم سەید ئەحمەد، عەقید میرحاج، مولازمی یەکەم نوری ئەحمەد تەها، مولازمی یەکەم جەلال ئەمین، عەقید سەید عەبدولعەزیز، گەیلانی، نەقیب نوری ئەمین).

بۆ زیاتر رەسمیەتدان‌و رێکخستنی ئەو هێزە خێڵەکیەی پشتیوانییان لە کۆمار دەکرد پلەی "ژەنەراڵ"یاندا بە موحەممەد حوسێن سەیفی قازی، عومەر خانی شوکاك، حەمە رەشیدخان، مستەفا بارزانی.

پلەی سەربازییش درا بە کۆمەڵێك لە کوردی ئێران، هەروەکو پلەی عەقیدیان دایە "موحەممەدی نانەوا زادە"، کە دواتر بووە "یاریدەدەری سیاسی" سەیفی قازی‌و رۆڵی فەرماندەی گشتی هێزە چەکدارەکانی دەبینی. 12750 چەکدار لە ئامادەییدا بوون بۆ بەرگریی لە کۆمار، لەوانە 2000 چەکداریان نیزامی بوون.[784]

---

[784] - گادانی: سەرچاوەی پێشوو، ل47.

له سەرەتاوە حکومەتی کوردستان بایەخی بە بواری رۆشنبیریی دابوو، رۆڵی بەرچاوی هەژارو هێمن و حەسەنی قزڵجی لە زیندووکردنەوەی ئەدەب و رۆشنبیریی کوردیی دیار بووە، زەبیحیو دڵشادی رەسوڵیو قاسمی قادری لە چاپخانەی کوردستان کاریان دەکرد، ژمارەیەك بڵاوکراوە بەو رۆشنبیرانە سپێردرابوو، وەکو رۆژنامەی "کوردستان" و "هاواری نیشتیمان" و "هەڵاڵە" لەگەڵ نووسینی کتێبەکانی قوتابخانە[785]. قازی موحەممەد بایەخی زۆری داوە بە بواری بازرگانیو ئابووری، مەحمودی مەلا عیزەت لەو باوەڕەدایە قازی موحەممەد لە ژێر کاریگەریی بیردۆزەی ئابووری هیتلەردا بووە، ویستوویەتی زێڕی کوردستان کۆ بکاتەوەو لە خەزێنەی دەوڵەت وەکو بارمتە دایبنێ، هەتا پارەی نەختینەی بانکەکانی کوردستانی دەست بکەوێ. هەروەها لە پێناو چالاککردنی بازرگانیی ناوخۆو دەرەوە بەیاننامەی کۆمپانیای پێشکەوتنی کوردستانی دەرکرد، بە مەبەستی بەکارخستنو بەرهەمهێنان دەبوایە هاووڵاتیانی کورد لە کۆمپانیای ناوبراو بە گوێرەی توانا بەشدارییان بکردایە، ئەو پرۆژەیە چوار ملیۆن تومانی بۆ کۆکرایەوە، بەڵام شەڕو کەوتنی ئازەربایجان پەکی خست[786].

گرتنەبەری ئەو رێوشوێنانە بۆ بنیاتنانی دامەزراندنی دەوڵەتی کوردستان چەند لایەنێکی هەبووە: قازی موحەممەد بەر لە ڕاگەیاندنی دەوڵەت و بە ئامادەبوونی جەماوەرێکی زۆری کورد لەهەموو چینەکانو لە کاتی راگەیاندنی دەوڵەتو بەرزرکردنەوەی ئاڵا، کە بە هەزاران خەڵکی هەموو بەشەکانی کوردستان هاتبوون، وەکو تاك بەیعەتی لە پیاوماقوڵان وەرگرتو لە ڕاگەیاندنی لەدایکبوونی کۆماریش لە گۆڕەپانی چوارچراو لە بەرانبەر هەزاران کەسو لەناو گەرمەی چەپڵەڕێزانو خوێندنی قورئانو سروودی نیشتیمانی پەیمانی لە جەماوەر وەرگرت.

ئەو رێگەیەش لە بەدەستهێنانی رەوایەتیو پشتگیریی کورد ئەو شێوازەمان بە بیر دێنێتەوە، کە خەلیفەکانی راشیدی پەیڕەویان کردووە، لە سیاسەتی شەرعی پێی دەوترێت پەیمانی تایبەتو پەیمانی گشتی، بە زاراوەی سیاسی هاوچەرخ: لە

---

[785]- کوردستان، ژمارە23، مایس 1946.

[786] ـ مەحمودی مەلا عیزەت: دەوڵەتی جمهوری کوردستان، نامەو دیکۆمێنت، ب3.

بەڕێوەبردنی کاروباری خەڵك "میللی" بوون. عەلی قازی کوڕی قازی موحەممەد دەڵێ: (باوکم شەوان بە بازاڕو گەڕەکە گشتییەکاندا گەڕاوە هەتا لە هەستی جەماوەر ئاگادار بێت).[787]

زیاتر لە سێیەکی ئەندامانی کابینە وەزارییەکەی قازی موحەممەد لە چینی ناوەند "بۆرژوازیەتی بچوك" بوون، لە فەرمانبەرو بازرگانو خاوەن زەوی بچوك، ئەوەش نیشانەی بەردەوامیەتیە لە بەرنامەی "ژێکاف"، بە پێچەوانەی ئەو پڕوپاگەندانەی باسمان کرد، کە ئەندامانی "ژێکاف" پەراوێزکراون لە کۆماری کوردستان. روناکبیرانی وەکو هێمنو زەبیحیو دڵشادی رەسوڵیو هەژار راستگۆیانە سەرقاڵ بوون بەو ئەرکەی لەسەر شانیان بووە، حەسەنی زێڕنگەر کرابوو بە یاریدەدەری سەرۆکی هێزەکانی پۆلیس، کە دواتر زانرا ناڕاستو نائەمینە لابرا. هەروەها موحەممەدی نانەوا زادە کە یەکێك بووە لە دامەزرێنەرانی کۆمەڵە کرابووە یاریدەدەری فەرماندەی هێزەکانی کۆمار هەتا بە ڕووداوی سەیارە مرد لەو پۆستەدا مایەوە.

دانانی حاجی بابەشێخ لە سەرۆکی وەزیران بە ڕێکەوت نەبووە، بابەشێخ زانایەکی پایەدارو پیاوێکی خواناسو توند بووە لەگەڵ دوژمنانو خۆشەویست بووە لە هەموو کوردستان، تا کۆتایی تەمەنی کۆمار بە هەموو توانا ئەرکی خۆی راپەڕاندووە، چاودێریی کاروباری وەزیرەکانی کردووە، "لەگەڵ ئەوەشدا کە بە تەمەن بووە، ئەو وردیو جدیەتیەی زۆر قورس بووە لەسەر شانی بەرپرسانی تر، ئەوە بووە هێمنی سکرتێری تایبەتی حاجی بابەشێخ ناچار بووە نەتوانێ لەگەڵیدا بەردەوام بێت، وازبێنێتو خۆی بۆ کاروباری رۆشنبیریی یەکلایی بکاتەوە[788].

ئەوەی تێبینی دەکرێ قازی موحەممەدو سەرکردەکانی کۆمار تێڕوانینی ناوچەییان هەبووە، چوار عەقیدو پێنج پایەی بەرزی سەربازیی کوردستانی عێراق هەبووە لە مهاباد، سەرەڕای رۆڵی جوامێرانەیان لە کۆمار هیچ کامیان بەرپرسیارێتی گرنگیان پێ نەدرابوو. ئەگەر هەندێ رۆڵی لاوەکی بە هەندێکیانو بارزانییەکان درابێت زیاتر ئەمری واقیع بووە. ئەو فەرماندە سەربازییانە خاوەنی کارامەیی سەربازیو سیاسی بوون،

---

[787] - جان دۆست، ئاڤین من کری نەدەن، بلا ئەز سبەهی مهابادی ببینم، رامان، 2000، ل7.

[788]- هێمن: سەرچاوەی پێشوو، ل23.

بەڵام بەداخەوە هەندێ لە وەزارەتەکان بەدەست خەڵکی ناشایستەوە بووە، بۆ نموونە وەزارەتی فەرهەنگ درابووە کەسێك خوێندن و نووسینی بە زمانی کوردیی نەزانیوە، نەدرابووە یەکی وەکو دڵشادی رەسوڵی، کە شارەزاییەکی باشی لە فەرهەنگ و کارگێڕیدا هەبووە*.

هەتا ئێستاش قسە هەیە لەسەر سروشتی پێکهاتنی کۆمارو ئاساییە ئەگەر هەندێ سەرنج بخەینە ڕوو لەسەر مشتومڕی نێوان توێژەرانی کورد لەسەر کۆماری نیشتیمانی کوردستان. ئایا کۆمارێکی سەربەخۆ بووە یان حکومەتێکی کوردیی محەلیی؟ داواکاریی حوکمی زاتی بووە بۆ کورد لە چوارچێوەی ئێران، چ وەکو قەوارەیەکی خودموختار چ وەکو حکومەتێکی سەربەخۆ ناساندنی کۆماری کوردستان بەو وردییە ئاسان نییە، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەو ناوو ناونیشانەی بۆ کۆماریان بەکار هێناوە.

لەلایەکی ترەوە مامەڵەو لێدوانی تێکگیراوی بەرپرسان شتێکی تر بووە، ئاڵای تایبەت بۆ کۆمار نووسراوە "دەوڵەتی کۆماری کوردستان"و "کۆماری دیموکرتی کوردستان"و "کۆماری میللی کوردستان"، بەڵام لە ڕۆژنامەی فەرمی "کوردستان" زمانحاڵی حکومەت "کۆماری دیموکراتی کوردستان" بەکار هاتووە[789].

لە گوتاری سیاسی دەوڵەت یانی قەوارەی خاوەن کەسایەتی دەوڵەتی سەربەخۆ، بەڵام وشەی کۆمار دوو مانا دەبەخشێت. لە رۆژئاواو وڵاتانی دونیای سێیەم مانای حکومەتی خاوەن سەروەریەتیو کەسایەتی نێودەوڵەتی هەیە، بەڵام بەکارهێنانی وشەی کۆمار لە سەربازگەی سۆسیالزمی لای دۆستانی یەکیەتی سۆڤیەتی پێشوو، ئاماژەیە بۆ ئەو هەرێمانەی جۆرێك لە سەربەخۆیی کارگێڕییان هەیە لە چوارچێوەی سۆڤیەتی پێشوو.

---

* - بەڕاستی کابینەی حکومەتی کوردستان لەوە زیاتر هەڵدەگرێ، بەوەی زۆری وەزیرەکان لە ڕووی کارامەییەوە دوور بوون لەو ئەرکەی پێیان سپێردرابوو، زۆربەیان پێشینەیان لە خەباتی نەتەوەییدا نەبووەو دوای رووخانی کۆماریش ئەوانە زۆربەیان بە سەلامەتی دەرچوونو شوێن پەنجەیان لە درێژەدان بەخەباتی رزگاریخوازی کورد دیار نییە، دوورخستنەوەی سەرکردایەتی " ژێکاف" لە دەسەڵات بە ڕوونی لەو کابینەیە بەدیار دەکەوێ. "وەرگێڕ".

[789] - مەحمودی مەلا عیزەت: دەوڵەتی جمهوری کوردستان، نامەو دیکۆمێنت، ب3، ل101-109.

بەکارهێنانی هەندێ ناوی دامەزراوەو کەسایەتی سیاسیو رۆشنبیری کورد لەو زەمانە بەڵگەیە لەسەر نەبوونی سەرچاوەیەکی یاسایی بۆ ئەو بابەتە، لەلای ئەوانەی کۆماریان بەڕێوە دەبرد هەندێ لامەرکەزیەتی گەڕەلاوژەیی هەبووە، ئەگەر دەرفەتێك لە بەردەم کۆمار بوایە یان دەستورێك لە بەردەست بوایە یان دامەزراوەیەکی هەبوایە بۆ یاسادانان دەبوایە ئەو مەسەلەی یەکلایی بکردایەوە.

هەریەك لە مامۆستایان کەریمی حیسامیو گوڵمرادی لەو باریەوە رای جیاوازیان هەیە، حیسامی دەڵێ: (قازی موحەممەد بە نوێژی نیوەڕۆیە، بەرانبەر بیست هەزار کوردو رای جیهانی، دەوڵەتی سەربەخۆی کوردی راگەیاندووە، بەو دەوڵەتەشیان وتووە: "حکومەتی میللی کوردستان"). حیسامی دەڵێ: (بەرزرکردنەوەی ئاڵاو دامەزراندنی سوپای کوردیی سەربەخۆ و پاککردنەوەی ناوچە کوردیەکان لە سوپای ئێرانیو دەسەڵاتداریەتی حکومەتو دوایی کەوتنە پەیوەندیی لەگەڵ دەوڵەتانی تر، هەموو ئەوانە ئاماژە بووە بە ئەوەی کۆماری کوردستان قەوارەیەکی سەربەخۆو کەسایەتی نێودەوڵەتی هەبووە).

هەروەها لە گوتاری رۆژی راگەیاندنی کۆمار خودموختاری تێدا نەبووە، چونکە باش لەو گوزارشتە تێگەیشتبون، لەدایکبوونی حکومەتی میللی سەربەخۆی کوردستانیان راگەیاند، قازی لەو رۆژەدا رایگەیاند، کە هەتا دوا دڵۆپی خوێن لەپێناو سەربەخۆیی کۆمار خەبات دەکات)[790].

لەلایەکی ترەوە گوڵمرادی پێیوایە بەکارهێنانی وشەی "کۆمار" یان "بەرزرکردنەوەی ئاڵا" لە یاسای نێودەوڵەتیدا ئاماژە نییە بۆ دەوڵەتی سەربەخۆ، چەندین دەوڵەتی فیدراڵی هەیە، کە رێگەی بە قەوارە ناوخۆییەکانی داوە وشەی کۆمار بەکار بهێنن، یان ئاڵای هەرێمەکەیان لە تەنیشت ئاڵای دەوڵەتی فیدراڵی بەرز بکەنەوە[791].

نووسەری کورد "عەولە" پشتگیریی لە بۆچوونی حیسامی دەکات و پێیوایە کۆماری کوردستان دەوڵەتی سەربەخۆ بووە، چونکە سەرەڕای لابردنی ئاڵای دەوڵەتی ناوەندیی

---

[790] - کەریم حیسامی: گزینك، ژمارە (13)، نامۆ لە ناوەرۆکی، گزینك، ژمارە (14)، ل47.

[791] - گولمرادی: سەرچاوەی پێشوو.

له هەموو ناوچەکانی ژێردەسەڵاتی کۆمار، کارکردنی بە یاسای ئێرانی وەستاند[792].

بەڵام هێژا نەوشیروان مستەفا پەیڕەوی لە بەرنامەیەکی مامناوەندی کردووە لە نێوان رای حیسامیو گوڵمرادی و دەنووسێت: (کۆماری کوردستان دامەزراوەیەکی یاسایی نەبووە، تا یاسا دابنێت، بەڵکو رەوایەتی لە یاسای بنەڕەتی ئێرانییەوە وەرگرتووە بۆ دامەزراندنی حکومەتی هەرێمەکان. لەگەڵ ئەوەدا بەرپرسانی کۆمار قسەیان لە "خودموختاری" کردووە، بەڵام هەڵسوکەوتو رێوشوێنەکانیان بەوە دەچوو دامەزراوەیەکی هەرێمایەتی بن لە چوارچێوەی دەوڵەتی فیدراڵی)[793].

وا پێدەچێت قازی موحەممەد لە کاتی راگەیاندنی کۆمار بیری لە ڕووداوە هەرێمیو نێودەوڵەتییەکانی ئەو کاتە کردبێتەوە، توانیبێتی بگاتە دامەزراندنی قەوارەی سەربەخۆ بۆ کورد، بەڵام دوایی بێ ئومێدیی لە پشتیوانی سۆڤیەتی یان ئینگلیزی یان ئەمریکی بۆ سەربەخۆیی کوردستان بە ماوەیەکی کەم لە ڕاگەیاندنی کۆمار ناچار بووبێت ئەو بیرۆکەیە بگۆڕێت، لە هەموو لێدوانەکانی جەختی کردبێتەوە سەر حوکمی زاتی.

ئەوەی شایانی باسە گوتاری قازی موحەممەدو کۆماری کوردستان نەك بەتەنیا بۆ ناوەندەکانی حکومەتی ناوەندیی زۆر جێی نیگەرانی بووە، بەڵکو هەتا لای ئازەربایجانی میللییش قبوڵ نەبووە، جەعفەر بیشاوەری سەرۆکی کۆماری ئازەربایجان قازی موحەممەدی بانگ کردبووە تەورێزو بە توندیی نارەزایی دەربڕی بوو لە راگەیاندنی سەربەخۆیی کوردستان. بیشاوەری بە قازی وتبوو: (ئێمە حوکمی زاتی رادەگەیەنین، بەڵام ئێوە دەوڵەتی سەربەخۆ). قازی وڵامی دابۆوە بەوەی (دەسەڵاتدارانی سۆڤیەت پێشتر بە ڕووداوی مهاباد ئاگادار بوونو پشتگیرییان کردووە)[794].

ئەگەر بەکارهێنانی وشەو مانا سیاسیو یاساییەکان پێکەوە ببەستینەوە دەبنین قازی موحەممەد سەرۆکی حکومەتو وتەبێژی فەرمی بووە، لە چەندین بۆنەدا جەختی کردۆتەوە لەسەر ئەوەی کۆماری کوردستان لە خەباتدایە بۆ دانپێدانانی فەرمی حکومەتی ئێرانی و حکومەتی ئازەربایجان، بەو سیفەتەی حکومەتێکی ئیقلیمییە،

---

[792] - عەولە: ساڵێك بوو کورد ئازاد ئەژیا، سوید 1988، ل91.

[793] - حکومەتی کوردستان، ل130-131.

[794] - کریس کۆچیرا: سەرچاوەی پێشوو، ل273.

مانگێك لە دوای ڕاگەیاندنی كۆماری كوردستان لە سەروتاری ڕۆژنامەی "كوردستان"دا بە ڕاشكاویی هاتبوو، كە گەلی كورد لە حوكمی زاتی زیاتری ناوێ[795].

لە تەموزی ساڵی 1944 قازی سەردانی ڕەزا شای كردووە لە تاران‌و دڵنیایی گوێڕایەڵی خۆی‌و كوردی بۆ حكومەتی ناوەندیی لە تاران دەربڕیوە. قازیی بە شای وتبوو: (لەسەر ئەو بنەڕەتەی مسوڵمانین و ئەهلی سونەین، پابەندین بە گوێڕایەڵی بۆ ئەمیر، گەلی كوردستان شانازیی بە ئێرانیبوونی خۆیەوە دەكا). قازی موحەممەد لەو ماوەیەی لە تاران بوو چەندین چاوپێكەوتنی لەگەڵ ڕۆژنامەی "ایران نما" ئەنجامدا بوو، وتبووی كورد نایەوێ لە ئێران جیابێتەوە، بەتەنیا دەسەڵاتی خۆجێیەتی‌و هەڵبژاردنی ئەنجومەنی ئەیالەتی كوردستانیان دەوێ، ئەمەش لە یاسای بنەڕەتیدا هاتووە[796].

لە چاوپێكەوتنێكی تری هاوشێوەی ئابی 1946 لەگەڵ ڕۆژنامەی "شاهباز" ئێرانی لە تاران ئەنجامی دابوو، قازی موحەممەد لەوێدا دەڵێ: (من‌و سەركردەكانی كورد دژی جیابوونەوەین لە ئێران، بەڵام دوژمنانی كورد بە پێچەوانەی ئەمە پڕوپاگەندەیان كردووە). لە حوزەیرانی 1946 "فرانس پرێس"– (نازانرێ ڕۆژنامەیە یان چییە؟) لە قازی موحەممەد دەگێڕێتەوە، كە داوای دیموكراتی كردووە بۆ ئێران لەگەڵ حوكمی زاتی بۆ كوردستان، كە ئەو لاریی نییە دەسەڵاتدارانی ناوەندیی بۆ ئەنجومەنی ئێرانی لە كوردستان هەڵبژاردن بكەن، بە مەرجێ سوپا دەست لە هەڵبژاردن وەرنەدات[797]..

لە ئابی 1946 قەوام سەڵتەنە لە تاران پێشنیاری بۆ قازی موحەممەد كرد پارێزگایەك بە ناوی كوردستانەوە پێك بهێنێت بۆ هەموو ناوچە كوردنشینەكان‌و ئەم پارێزگایە بە حكومەتی ناوەندییەوە ببەستێتەوە، قازی موحەممەدیش پارێزگاری بێت. قازی ئەو پێشنیارەی قبوڵ كرد، ئەمەش پیلانێكی تاكتیكی قەوام سەڵتەنە بووە بۆ بەسەربردنی كات‌و لێكترازانی ڕیزی كوردو ئازەری‌و دابڕینی ناوچە كوردییەكان لە ئازەربایجان[798].

---

[795] - ڕۆژنامەی كوردستان، ژمارە (1) 1946/1/11.

[796] - بامشاد: ص88-90.

[797]ـ گولمرادی: سەرچاوەی پێشوو، ل11.

[798] ـ قاسملو: سەرچاوەی پێشوو، ل56.

له گفتوگۆی تەموزی 1946ی نێوان وەفدی حکومەتی ناوەندیی‌و ئیدارەی کوردیی لە مهاباد، حکومەتی ناوەندیی بە زمانی گڕەوە حوکمی زاتی خستە بەردەستیان بەرانبەر چەك دانان، قازی موحەممەد ئەمەی قبوڵ نەکرد، چونکە لە زوڵمی دەسەڵاتی ناوەندیی دڵنیا نەبوو[799].. بە درێژایی تەمەنی کۆمار سەدری قازی بە نوێنەرایەتی مهابادو دەوروبەری لە پەرلەمانی ئێرانیدا مایەوە بۆ دڵنیایی لە سەربەخۆیی کوردستان دەیتوانی داوای کشانەوە لە برایەکەی بکات، بەڵام قازی موحەممەد نەك هەر ئەمەی نەکرد، بەڵکو هەموو پشتیوانی‌و هاوکاریی کرد بمێنێتەوە[800].

لە ڕاستیدا لە لایەنی تیۆری و یاساییەوە حکومەتی میللی کوردستان بە تەنیا ویلایەتێك بووە بە پشتبەستن بە دەستوور هەوڵی سەربەخۆیی داوە، بەڵام حکومەتی ناوەندیی نەفام بوون لە پیادەکردنی. لەڕاستیدا کۆماری مهاباد دەوڵەتێکی سەربەخۆو پەیوەندیی ناوخۆو دەرەکی سەربەخۆی هەبووە، وەکو حکومەتێکی خاوەن سەروەریی هەنگاوی هاویشتووە، ناوبردنی کۆماری میللی کوردستانیش لەبەر چەند هۆیەك جێگەی مشتو مڕی نووسەرانی ڕۆژئاوایە، بۆ کەمبایەخی پێی دەڵێن: "کۆماری مهاباد"، بەو حیسابەی: دەوڵەتی شارەو کورد پشتیوانیی نەکردووە، ئەمە لەکاتێکدا حکومەتی کوردستان ئەو ناوەی بۆ خۆی بەکار نەهێناوە، لە چەندین بۆنەدا هەوڵ دراوە سەروەریی‌و دەسەڵاتی بگەیەنێتە زۆربەی شارەکانی کوردستان، لەو هەوڵانەدا گوندەکانی ورمێ بە ئاڕاستەی سنووری تورکیا و عێراق و خەڵکی شارەکانی سەقز و بانە و مەریوان بەبێ ئەوەی هێزەکانی میللی کوردستان بچنە ناوییەوە ملکەچی کۆمار بوون، وەکو دواتر باسی دەکەین.

لەگەڵ ئەوەدا حکومەتی کوردستان 11 مانگ ژیا، بەڵام ئەو دەرفەتەی نەبوو بەرنامەکانی جێبەجێ بکات لە بنیاتنانی دامەزراوەکانی دەوڵەتو پەرەپێدانی ناوچەکە لە رووی ئابوورییەوە، بەڵام "وەکو پێشتر ئاماژەمان پێدا" لەو ماوەیەدا کوردستان لە ڕووی ڕۆشنبیرییەوە گەشەی کرد، ئەو توانا فەرهەنگیانەی لە سەردەمی رەزا شا تەنگیان پێهەڵچنرابوو لەو ماوەیە ژیانەوە.

---

[799] - پشدەری: سەرچاوەی پێشوو، ل71-72.

[800] ـ هەمان سەرچاوە، 73.

شاری مهاباد بووه مەڵبەندی گەشانەوەی شارستانیو سازدانی کۆنگرەی روناکبیریی، شانۆگەری "دایکی نیشتیمان"ی سەر بە تیپی لاوانی مهاباد جێگەی رەزامەندییو پێزانینی هەموو شارو گوندەکانی کوردستان بووە.

سەرچاوەی ئەو شۆڕشە رووناکبیریە ئازادیی بیروڕا بووە، کە کۆمار دابینی کردبوو، هەژارو هێمن لە باشترین شاعیرە نەتەوایەتییەکانی سەدەی بیستەم لە مهاباد بوون، لەگەڵ ئەو پۆلە رووناکبیرەی لە عێراقەوە کۆچیان کردبوو بۆ مهاباد، دوا فاکتەریش قازی موحەممەد خۆی وەکو رووناکبیرو ریفۆرمیستێکی شۆڕشگێڕ لە سەرووی کابینەی حکومەتەوە بووە، بایەخی بە زانستو رۆشنبیریی داوە.

ماوەی دەسەڵاتی قازی موحەممەد وەکو سەرۆك کۆمار دادگەر بووە، سوور بووە لەسەر مسۆگەرکردنی ئازادیو پاراستنی ماڵو سامانی خەڵك. لیژنەی شۆڕشگێڕیی لە مهاباد نەبووە وەکو ئەوەی لە ئازەربایجان هەبووەو خەڵك بە مەترسییەکانی گیرۆدە بووە، قازی موحەممەد خۆشەویستی خەڵك بووە، لە ڕۆژی لە سێدارەدانی بازاڕ داخراو هەموو شەقامەکان چۆڵ بوون[801].

دکتۆر ئەمیری حەسەن پوور دەڵێ: کۆماری کوردستان کۆمارێکی دیموکراتی و سەربەخۆ بووە لە بڕیاردان، بەڵام نووسەرانی رۆژئاوا و دیبلۆماسیەکانی ئینگلیز و ئەمریکا لە هەوڵی ئەوەدا بوون سەرکردە شۆڕشگێڕەکانی بشکێنن بەوەی یاری دەستی سۆڤیەتن[802]. بۆ دڵنیایی لەو سەربەخۆییە قازی موحەممەد لەگەڵ "دوهلر"ی یاریدەری قونسوڵی ئەمریکی لە ورمێ خوازیاری پتەوکردنی پەیوەندیی دوو لایەنە بووە لە نێوان حکومەتی کوردستانو ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا. قازی بەهیوا بووە بە پشتیوانی حکومەتی ئەمریکا بەشدار بێت لە گەشەپێدانی لایەنی رۆشنبیریو پیشەسازی[803].

---

[801] نجفقولی: سەرچاوەی پێشوو، ل141.

[802] - Amir Hassan Pour (Two Nationalist Revolutions in Azerbaijan Kurdistan) pp.80-81.

[803] - FO, 371/52702. Mr, Le, Rougete (No, 572 from Tehran Office, 29 Aprill 1946.

لەو کاتەی بۆ حکومەتی کوردستان ئاشکرا بوو مەحمودی غەفوریان گەنجی مارکسی خەڵکی مهاباد راپۆرتی نهێنی لەسەر بارودۆخی کورد داوەتە "هاشیمۆف"ی قونسوڵی سۆڤیەتی لە ورمێ. غەفوریان لە بارێکی لێڵدا کوژرا، قازی ئیدانەی ئەو کارەی نەکرد[804]. ئەگەر قازی موحەممەد بەکرێگیراوی رووس بوایە هەڵوێستی تری دەبوو، گەرچی هەریەك لە هاشیمۆف‌و باقرۆف خۆشەویستی‌و پشتگیرییان بۆ کێشەی کورد دەربڕیوە، بەڵام سەرڕەقترین دوژمنی کورد بوون.

کوشتنی غەفوریان لە ماوەی ئەو 11 مانگە تاکە خوێنڕشتنی ناوچەکانی ژێردەسەڵاتی کۆمار بووە، قازی موحەممەد پیاوێکی چاکساز و خاوەن بڕوا بووە بە گۆڕانی گشتگیر، بەڵام بە ڕێگەی ئاشتی لە هەوڵی بنبڕکردنی خوێنرشتندا بووە. لە ساڵی 1946 پیلانێك هەبووە لەلایەن حکومەتی ئازەربایجانییەوە بۆ کۆشتنی چەند دەرەبەگێکی کورد، قازی موحەممەد خۆی گەیاندە تەورێز هەتا بیشاوەریی لەو بیرۆکەیە پەشیمان بکاتەوە[805]، هەروەها کۆمەڵێك لە سەرۆك هۆزەکانی مامەش‌و مەنگوڕ بە هاندانی ئینگلیزو حکومەتی ناوەند هێزی چەکدارییان کۆکردەوە بۆ هێرش بردنە سەر کۆمار، قازی موحەممەد هێزێکی نارد بۆ بەرپەرچدانەوەیان‌و ئامۆژگاریشی کردن با خوێن نەڕژێ‌و پیلانگێڕانیش گەڕانەوە ناوچەی پشدەری شوێن دۆستانی ئینگلیز[806].

سەرەڕای لەسەرخۆیی‌و نەرمی بەرانبەر چینی ئاغاکان، بەڵام ئەوان بە درێژایی تەمەنی کۆمار لە پیلانگێڕی‌و ئاژاوەنانەوە نەکەوتن، قازی بڕوای وابوو دەبێت پشتگیریی ئەوان مسۆگەر بکات یان هەر هیچ نەبێت لەو ململانێیەی هەیە لەگەڵ حکومەتی ناوەند ئەوان بێلایەن بن. لە هەمان کاتدا بە ڕێگەی کردنەوەی قوتابخانەو ناردنی کوڕانی ئاغاکان بۆ خوێندن لە تەورێزو رووسیا لە هەوڵی لێکهەڵوەشاندنەوەی دامەزراوەی دەرەبەگایەتیدا بووە[807]. نووسەری ئێرانی نەجەفقولی ئەوکات لە نزیکەوە چاودێریی رووداوەکانی کردووەو دەڵێ: (قازی موحەممەد بەکارزانی‌و شارەزایی‌و ژیری

[804] Hengaw (Kurdish Magazine). No, 23 amd 24 fob. 1996. FO. 371/05667. Vice Consull Tabriz. Feb 23- 1946.55، بلوریان: هەمان سەرچاو، ل

[805] – هەژار: سەرچاوەی پێشوو، ل78.

[806] پشدەری: سەرچاوەی پێشوو، ل75، هەژار: سەرچاوەی پێشوو، ل79.

[807] –پشدەری: سەرچاوەی پێشوو، ل73.

مامەڵەی کردووە، ماڵی کەسی زەوت نەکردو خوێنی کەسی نەڕشتووە، زۆر خۆشەویستی خەڵك بووە، بەو سیاسەتەش دەوڵەتی ناچار کردووە، بە ژیرانەو بە ڕێزەوە مامەڵەی لەگەڵدا بکات، لەو کاتەی لیوا هەمایونی چووە ناو مهاباد، چووە ماڵی قازی موحەممەدو لەگەڵ ئەو نانی خواردووە)[808].

پرۆفیسۆر وای جوەیدە لە چەند روویەکەوە بەراوردی نێوان هەردوو کۆماری مهابادو ئازەربایجانی کردووە: حکومەتی ئازەربایجان حکومەتێکی داپلۆسێنەر بووە، سنووری بۆ ئازادیی سیاسی دانابوو، حاڵەتێکی تۆقین هەبووە لە دژی خاوەن زەوی‌و دەرەبەگو بەرهەڵستکاران، حیزبی دەسەلاتدار کۆمۆنیستی بووە، بەلام کۆماری کوردستان کۆمۆنیستی نەبووە، کۆت‌و بەند نەبووە لە بەرانبەر ئازادیی، ڕووس بوونێکی بەرچاویان لەوێ نەبووە.

حکومەتی ئازەربایجان دەستکردی ڕووس و پیلانی ئەوان بووە بۆ لکاندنی بە ڕووسیای سۆڤیەتی، بەلام کوردستان بەرهەمی خەباتی نەتەوەخوازانی کورد بووە، بۆ بنیاتنانی دەوڵەتی کوردستانی گەورە. حکومەتی ئازەربایجان لەلای جەماوەر گۆشەگیر بووە، بەلام کۆماری کوردستان خاوەن جەماوەری زۆر بووە، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ کەسایەتی بەرزی قازی موحەممەد[809].

قازی لە چاوپێکەوتنێکیدا لەگەڵ وەکالەتی هەواڵی فەرەنسی لەسەر بڕیارەکانی کۆماری کوردستان وتوویەتی: (دوای کشانەوەی هێزەکانی رەزا شا، هێزەکانمان دەستیان گرتووە بە سەر کوردستان‌و رێگە بە هیچ دەستێوەردانێکی دەرەکی نادەین، بارودۆخی ئێمە تەواو جیایە لەگەڵ هی ئازەربایجان)[810].

دکتۆر جەمال نەبەزیش لایەنێکی تری ئەو مەسەلەیەی روون کردۆتەوە، دەڵێ: ئەگەر لە یاساو دەستوورو یاسادانانی کۆماری کوردستان بکۆڵینەوە دەبینین مارکسیەتی تێدا نییە، ئەمە بە پێچەوانەی کۆماری ئازەربایجانی کۆمۆنیستییە[811].

---

[808] - من مهاباد الدامية الى ضفاف أراس، 141.

[809] - W. Jwaideh (The Kurdish Nationalist Movement It s. Origins and Development,) unplug PH.D Dissetation, Syracuse University. 1960. vol. 2. pp.771-772.

[810] - کۆچێرا: سەرچاوەی پێشوو، ل280.

[811] - نەبەز: سەرچاوەی پێشوو، ل22.

له تەمەنی کورتی کۆمار گۆڕانکاریی سیاسیو کۆمەڵایەتی نەهاتە دی، کە ئەمە خواستی قازی موحەممەد بووە بەدەستی بهێنێت بۆ کۆمەڵگای کوردستان، بۆیە بابەتێك نییە بۆ حوکمدان لەسەر کۆمارو دەستکەوتەکانیو سەرکردەکانی. بەبێ تێڕوانین لە هۆکاری کات، کە بابەتێکی زیندووە لە هەموو پرۆژەیەکی کۆمەڵایەتی. بنیاتنانی دامەزراوەی حکومەتو گۆڕانکاریی ریشەیی کۆمەڵایەتی کە قازیو سەرکردەکانی کۆمار پێوەی سەرقاڵ بوون لە سایەی گۆڕانی دونیاو ئیقلیمیو هەرێمایەتیو ناوخۆ زۆر قورس بووە، کاری لەو جۆرە مەلەوانی پێچەوانەی شەپۆلان بووە.

ئەوەی زۆر جێی سەرسوڕمانە ئەو رووداوە جیهانیو هەرێمایەتیانەیە، کە بوونە هۆی سەرهەڵدانی کۆمار، هەر هەمان هۆکاریش بوونە هۆی لەناوچوونی کۆمار، ئەمە سەرەڕای دڵخۆشی کوردان لە کوردستانی گەورە بە لەدایکبوونی "کۆمار"، بەڵام بەشێك بووە لە ناوەند. لە بڕگەکانی ئایندە هەوڵ دەدەین ئەو هۆیانە روون بکەینەوە، کە بوونەتە هۆی کەوتنی کۆمار.

## بارودۆخی سیاسیی ئێران لە ساڵانی 1945- 1946

پەرەسەندنی رووداوە سیاسییەکان کاریگەریی خۆی هەبووە لەسەر باری سیاسی کوردستان، لە ساڵی 1945 ئەزیح حەکیم مەلیك لە سەرۆکایەتی وەزیران لابراو قەوام سەڵتەنە جێی گرتەوە، ئەمەی دوایی سیاسییەکی لێزانو براگماتیەکی فێڵزان بووە، قەوام سەڵتەنە دەیویست دەسەڵاتی تەواوی خۆی بسەپێنێت بەسەر سیاسەتی ناوخۆو دەرەوەی ئێران، کۆسپی بنەڕەتی هەبوون لەبەردەم پێکهێنانی پرۆژە سیاسییەکانی لەوانە: حیزبی تودە، هێزی سەربازی ڕووسی لە هەرێمەکانی باکوور.

قەوام سەڵتەنە دەیویست تەواو هەیمەنە بکات بەسەر موحەممەد رەزا شای لاو و کەمئەزموون، ژەنەراڵەکانی ئێرایش بۆ سەپاندنی دەسەڵاتی خۆیان کاریگەریی خۆیان دەچەسپاند بەسەر رەزا شا، بۆیە قەوام سەڵتەنە "حەسەن ئەرخەع"ی لە پلەی فەرماندەی گشتی هێزە چەکدارەکان لابرد، ژەنەراڵ "رازمار"ی لە شوێنی دانا، لە سەرەتاوە گوێڕایەڵیی بۆ قەوام سەڵتەنە دەرخست. رووبەڕووبوونەوەکی تازەتر لە

ئایندەی حیزبی تودە پەیدابوو، کە دەسەڵاتی تەواویان بەسەر سەندیکاکانی کرێکاران‌و بەتایبەتی سەندیکاکانی کرێکارانی نەوت لە باشوور هەبوو، هەروەها نفوزی سیاسی گەورەیان لە ئەسفەهان و مازەندەران و دەسەڵاتی تەواویان بەسەر ئازەربایجاندا هەبوو، هەندێ لە ئەندامانی تودە گەیشتبوونە ئەنجومەنی ئێرانی. قەوام سەڵتەنە دەیوست بە ڕێگەی بەخشینی هەندێ کورسی وەزارەتی حکومەتەکەی دەسەڵاتی تودە لاواز بکات و دەستی بەسەردا بگرێ. هەروەها بە دەستەبەری کشانەوەی هێزەکانی رووسی لە باکووری ئێران ئیمتیازی نەوتی بەخشییە رووس، بەمەش هەموو کۆسپەکانی بەردەم خواستە سیاسیەکانی تەخت بوون[812].

قەوام سەڵتەنە لە 1946/2/28 چووە مۆسکۆو میوانی ستالین‌و مۆلۆتۆف بوو، رووسیای دڵنیا کرد، کە حکومەتەکەی ئامادەیە ئیمتیازی نەوتی باکوور ببەخشێتە رووس بەرانبەر وەرگرتنی زەمانەت بۆ کشانەوەی هێزەکانی ڕووس لە ئێران لە ماوەیەکی دیاریکراو لەگەڵ پشتگیریی ڕووس بۆ چارەسەرکردنی ئازەربیجان‌و کوردستان بە شێوەی ئاشتیانە، بەو حیسابەی کێشەیەکی ناوخۆییە، لەگەڵ یارمەتیدانی رووس بۆ ئێران لە ئەنجامدانی هەڵبژاردن بۆ ئەنجومەنی ئایندە لە هەموو بەشەکانی ئێران و کشانەوەی هەموو هێزەکانی بێگانە لە ئێران[813].

لە نیسانی 1946 رێککەوتنامەی لێکتێگەیشتن لە نێوان سادگیکۆف و قەوام سەڵتەنە مۆر کرا. رێککەوتن لەسەر پێکهێنانی کۆمپانیای ئێرانی - سۆڤیەتی بۆ نەوت‌و ئەو کۆمپانیایە بڕیاری دەرهێنانی نەوتی ئێرانیدا. ئەم رێککەوتننامەیە وەکو سەپاندنی دەسەڵاتی سۆڤیەتی وابووە بەسەر ناوچەیەکی بەرفراوانی باکوور، بەڵام قەوام سەڵتەنە سوور بوو لەسەر ئەو مەرجانەی پێکەوە لەسەری رازیی بوون لە بابەت ئیمتیازی نەوت‌و رەزامەندیی سۆڤیەت لەسەر چارەنوسی ئاشتیانە بۆ مەسەلەی ئازەربایجان بەو حیسابەی مەسەلەیەکی ناوخۆییە لەگەڵ رەزامەندیی بۆ هەڵبژاردن لە هەموو بەشەکانی ئێرانی هەتا پەرلەمانی ئێرانی رەزامەندیی لەسەر ئەو ئیمتیازە دەربڕی کاری پێبکرێت[814].

---

[812]-Evand Abrahamin, Iran between Two Revolutions (prncetion University, 1982). Pp.185

[813] -سوجادی: سەرچاوەی پێشوو، ل304-305. مەلا عیزەت: کۆماری، ل107-109

[814] – yasin, pp.208-209

له دوای بەدەستهێنانی ئیمتیازی نەوت سۆڤیەت ئاگادارییدا بە حیزبی تودەو سەرکردەکانی ئازەربایجان هاوکاریی قەوام سەڵتەنە بکەن. حکومەتی ناوەندیی رێککەوتنامەیەکی هاوشێوەی لە 12ی حوزەیرانی 1946 بە موزەفەر فەیرۆزی یاردەدەری فەرماندەی هێزەکانی سوپا لەگەڵ جەعفەر بیشاوەری نوێنەری حکومەتی ئازەربایجان مۆر کرد لەسەر چارەسەرکردنی مەسەلەی ئازەربایجان بە شێوەیەکی ئاشتیو دامەزراندنی د. جاوید لە حیزبی ئازەربایجانی پارێزگاری ئازەربایجان[815]. لە ئەیلولی 1946 قازی موحەممەد برووسکەیەکی نارد بۆ قەوام سەڵتەنە، لەوێدا پشتگیریی لە سیاسەتی حکومەت کردبوو بەرانبەر رووسو حیزبی تودە، هەروەها پشتگیریی لە حیزبی دیموکراتی ئێرانی کردبوو، کە قەوام سەڵتەنە سەرۆکایەتی دەکرد[816].

موحەممەد رەزا شا لەو سیاسەتەی بەرانبەر رووسو حیزبی تودە پشتگیریی قەوام سەڵتەنەی نەکردو پێیوابوو ئەمە تەسلیم بوونە بە سۆڤیەت، داننانە بە جیابوونەوەی ئازەربایجانو کوردستان لە ئێران. شا سوپاو رەوتە راسترەوەکانی ناو پەرلەمانی هاندا بۆ دژایەتی سیاسەتی رووس[817]، هەر لەوبارییەوە ئەم سیاسەتە ئینگلیزیشی وروژاند، بۆیە بە مەبەستی فشار بۆ سەر قەوام سەڵتەنە ئینگلیز هانی خێڵەکانی باشووری کوردستانیدا، لیژنە لە هۆزەکانی باشووری پێك هات، ئەو لیژنەیە وەکو کوردو ئازەرییەکان داوای حوکمی زاتی دەکرد، هەروەها بۆ ورییاییدان بە قەوام سەڵتەنە ئینگلیز هێزی زیاتری ناردە کەنداو[818].

---

[815] -کۆچیرا: سەرچاوەی پێشوو، ل175.

[816] -The Foreign Relation of The United States (F.R.U.S) state Department. Confidention File No, 1196. September. 7-1946, Tehran Embassy to Washington .

[817]- Muhamad Raza Shah Pahlavi, Mission for My Country (London: Hutchinson &Co) 1941 pp.116-118.

[818]- Fakhreddin Azimi, Iran the Crisis ofDemocracy London (I.B. Tauris &C.Ltd). pp.161-163.

لەڕاستیدا قەوام سەڵتەنە بەرانبەر ئازەریەکانو تودەو سۆڤیەت سیاسەتی خۆبەدەستەوەدانی نەبوو، بەڵکو براگماتی بوو بۆ لەباریەکبردنی رەوتی شۆڕشگێڕی ئەوکاتەی شەقامی ئێرانیو باڵکێشان بەسەر حیزبی تودە. بۆیە قەوام سەڵتەنە بەرانبەر ئازەربایجانو کوردستان سوور نەبوو لەسەر ئەو سیاسەتە، چونکە نە لە بانگەوازکارانی مافی دیموکراتی بووەو نە لایەنگرانی مافی ئازەریو کوردیش بووە، بەڵکو لە هەوڵی بێلایەنکردنی سۆڤیەتدا بووە لە مەسەلەی قەیرانی ئازەربایجان لە لایەکو راکێشانی تودە لەلایەکی ترەوە، مەبەستی قەوام سەڵتەنەش دەستبەسەراگرتنی هەردوو کۆمار بووە لە تەورێزو مهاباد، هەروەها بە مەبەستی لەیەکتر دابڕین کەوتبووە ئاژاوەنانەوە لە نێوان هەردوو گەلی ئازەریو کورد. بۆ ئەو مەبەستە پێویستی بە درێژکردنەوەی وتوێژ هەبووە لەگەڵ کوردو ئازەری، تا سوپا تەواو خۆی ئامادە بکات بۆ دەستبەسەراگرتنی هەردوو کۆمار[819].

لە تشرینیساڵی 1946 قەوام سەڵتەنە بۆی دەرکەوت ئەگەر بەردەوام بێت لەو سیاسەتە کراوەیە لە بەرانبەر ڕووسو تودە ئەوە ئینگلیزو لایەنگرانی شا و لە ناویاندا راوێژکارە ئەمریکیەکان بەخێرایی لە زیادبووندا دەبن، لە کاتێکدا لە نیسانی 1946 هێزەکانی رووس ئێرانیان بەجێهێشت، قەوام سەڵتەنە لە حیزبی تودە هەڵگەڕایەوەو هەرسێ وەزیرەکەی لە حکومەتەکەی دەرکردن، کەوتە سەرکوتکردنی رەوتی چەپی ئێرانیو راپەڕینو ئاژاوەیی سەندیکاکانی کرێکاران، هەتا لە هەڵبژاردنە گشتیەکانی ئەنجومەنی ئێرانی حیزبی دیموکراتی ئێرانی بووە کەناڵی راستڕەوەکان[820]. وای لێهات قەوام سەڵتەنە داوا لە هەریەك لە بیشاوەریو قازی موحەممەد بکات، رێگە بە سوپا بدەن بۆ هەڵبژاردن بچێتە هەرێمەکەیان. بیشاوەری وتبووی: بە پشتبەستن بە رێککەوتنامەی فەیرۆز- بیشاوەری هێزەکانی ئازەربایجان بەشێکن لە سوپای ئێرانی. قازی موحەممەدیش وتبووی پێشوازیی لە هەڵبژاردن دەکەین، بەڵام پێویستمان بە سوپای زیاتر نییە بێتە کوردستان[821].

---

[819] پشدەری: سەرچاوەی پێشوو، ل70، قاسملو: سەرچاوەی پێشوو، ل56، ئەفراسیاو: بەشی دووەم، ل74.
[820]- Howell, p.384.
[821] - مەلا عیزەت: کۆماری ، ل179-180. سوجادی: 308.

دەتوانین بڵێین بوونی پیاوێکی لێزانو براگماتی وەکو قەوام سەڵتەنە بە هۆی کارامەییو سیاسیو ئیمتیازی نەوت کۆماری کوردستانی لە ڕووس دابڕی، ئەمە سەرەڕای چەند هۆکارێکی تر، کە ڕۆڵیان گێڕا لە ڕووخانی کۆمار، هەڵوێستی قەوام سەڵتەنە لەگەڵ کوردو حیزبی تودە هەمان هەڵوێستی سەدام حوسێن بووە لە ساڵی 1970 ـ1975 لەگەڵ کوردو کۆمۆنیستەکان، بەڵام دیارە پەیوەندییەکانی کۆماری کوردستانو سۆڤیەت لێدوانی زیاتر هەڵدەگرێ، چونکە ئەو پەیوەندیانە زۆر بایەخدارن بۆ لەدایکبوونی کۆمارو گۆڕان لە سروشتی ئەو پەیوەندیانەش لە ساڵانی 1945ـ 1946 بەشداریی کەمیان هەبووە لە ڕووخانی کۆماری کوردستان.

## کۆماری کوردستان و سۆڤیەت

د. هاویل توێژەرەوەی پسپۆڕ لە پەیوەندییەکانی کوردی ـ سۆڤیەتی دەڵێ: (گومانی تێدا نییە بە مەبەستی فشارخستنە سەر ئێرانو لەپێناو دەستهێنانی ئیمتیازی نەوت کارتی کوردیو ئازەری لەلایەن سۆڤیەتەوە بەکار هاتووە)[822]. بۆ پشتگیریی لەو بۆچوونەی "هاویل" هەندێ دەگەڕێینەوە بۆ دواوە، ئەوە بەبیر خوێنەری بەڕێز دەهێنینەوە کە باقرۆف لە کاتی دووەم سەردانی وەفدی کوردیی بۆ لە ئەیلولی 1945 بە ڕوونی وتبووی: (هەتا دەسەڵاتی سۆڤیەت بمێنێت ئێمە کورد بەجێ نایەڵینو کورد هەموو ئامانجەکانی بەدەست دێنێت)[823].

ڕاگەیاندنی کۆماری کوردستان لەسەر بەدەنگەوەچوونی ئەو لێدوانەی باقرۆف بووە، هەروەها بەڵێنی پێدابوون لە پشتیوانی سەربازیو ئابووری، بۆیە کورد هیوای زۆری لەسەر هەڵچنیبوو، لە سەروتاری ژمارەی 6ی مایسی 1946ی ڕۆژنامەی "کوردستان"دا هاتووە: (دەوڵەتانی هاوپەیمانی ئەنلەنتی لەو بڕوایەدا بوون لە دوای شەڕی جیهانیو سەرکەوتنی فاشیەت فێڵ لە گەلان دەکەن، بەڵام بێئاگابوون لە پابەندی سۆڤیەت بە مەسەلەی دیموکراتیو مافی گەلانی بچوکی وەکو گەلی کورد).

بە هۆی سیاسەتی براگماتی سۆڤیەتی لە ئێران لە دوای ڕاگەیاندنی کۆمار بە ماوەیەکی کەم خواستەکانی کورد بەرەو داخورانو وێرانی چوون، هەموو هاوکاریی

---

[822] – Howell, p.384, Azimi. Pp.160-161

[823] ـ مەلا عیزەت: کۆماری کوردستان، ل96.

سۆڤیەتی بۆ کۆمار 1200 پارچە چەکو وەرگرتنی 50 گەنج بۆ دیراسە لەگەڵ کەمێك تەقەمەنیو تۆپی مۆلۆتۆفو400 هەزار تومانی ئێرانیو چاپخانەی بچوکو هەندێ کاغەز[824]، ئەو یارمەتییە بچوکانە بۆ کۆماری کوردستان لە لایەنی سەربازی هیچی لە واقیعدا نەگۆڕی، چونکە پێشتر کورد بە هەزاران لەو چەکانەی هەبووە، بەڵام چاپخانەکە بۆ ئەو کاتە پێویست بووە بۆ بزواندنی جوڵانەوەی رۆشنبیری، ئەو هێندە یارمەتییە کەمە لە چەكو پارە بیانووی خستە بەردەم حکومەتی ناوەندیی لە تاران پروپاگەندە لەسەر رۆڵی سۆڤیەت بۆ دابەشکردنی ئێرانو بەکارهێنانی کورد دژی بەرژەوەندیی رۆژئاوا لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، لە 25ی تشرینی دووەم چەند رۆژێك دوای گەیشتنی ئەو هاوکاریانە حکومەتی ئێرانی ناڕەزایی خستە بەردەم باڵیۆزخانەی سۆڤیەت لەسەر ئەوەی چاپخانەیەكو کۆمەڵێك چەکی سوکی داوە بە کورد[825]. رۆژنامەی تایمی بەریتانی لە ژمارەی رۆژی 4ی نیسانی 1946 نووسیبوی، کە رووس 20 دەبابەو ژمارەیەك چەکی قورسی داوە بە حکومەتی مهاباد، ئەمەش پیلانی رووسیە بۆ بەکارهێنانی کارتی کوردیی بۆ لێدانی تورکیاو ئێرانو عێراق، گومانی تێدا نییە، کە ئەمە گەورەکردنی هۆکاری رووسییە لەسەر کوردو پیلانی هاوبەشی ئێرانو تورکیا بووە هەتا فشار بخەنە سەر رووسیا بۆ ئەوەی پشتیوانی کورد نەکات، لە هەمان مانگدا "دوهلر"ی قونسوڵی ئەمریکی لە ورمێ راپۆرتێکی نهێنی بۆ باڵیۆزخانەی ئەمریکی نووسیبوو، دەڵێ: (لەڕاستیدا یارمەتی ماددییو چەکی ڕووسی بەو ئەندازەیە نەدراوە بە کورد، شایانی باسە کورد هەستی بە نیگەرانی کردووە لە بەرانبەر هەڵوێستی ڕووسی و ئامادەیی هاریکاری پتەوبوون لەگەڵ ویلایەتە یەکگرتووەکانی رۆژئاوا)[826].

بێ ئومێدیەکی تری کورد ئەوە بووە لەسەر داوای رووس نوێنەری ناردووە بۆ پەرلەمانی ئازەری، حکومەتی ئازەربایجانی کۆمۆنیستی وەکو نوێنەری کوردو نوێنەری دەوڵەت مامەڵەیان لەگەڵدا نەکردبوو، بەڵکو وەکو نوێنەری مهاباد لە پەرلەمانی ئازەری حیسابیان بۆ کردبوو، ئەمەش داننەنانی ئاشکرای ئازەربایجان بووە بە کۆماری

---

[824] - O.S.S. State Department Intelligence Residence Reports Vol. 11. University Poblication, 1977, Teleg. Nom 587, April 35, 1946

[825] -FO, 371/4559 Persia (Inernal Security) a note addressed to Soviet Embassy in Tehran. November 17-1945

[826] -FO, 371/4559, Teleg. 135 April 26 1946

کوردستان، لە دوای سێ کۆبوونەوە وەفدی کوردی گەڕانەوە مهاباد و ناڕازی بوون لەو شێوازەی مامەڵەیان لەگەڵدا کردبوون[827].

پەیوەندییەکانی رووس‌و کۆماری کوردستان بە درێژایی ساڵی 1946 وردە وردە بەرەو خراپی چوو، "دوهلەر" لە پێنجی تشرینی دووەمی ساڵی 1946 سەردانی مهابادی کردووە، لە بابەت قازی موحەممەدو سەرۆك هۆزەکانی رۆژئاوای ورمێ‌و دەوروبەری بەتایبەت عومەرخان نووسیویەتی: (ئەوانە خۆیان بە گەورەترین دوژمنی مارکسیەت دەزانن، هەست بە بێئومێدی‌و بێئاکامی دەکەن لە سۆڤیەت، کە وەفادار نەبووە بە بەڵێنەکانی بەرانبەر کوردو ئامادەن هاوکاریی لەگەڵ دەسەڵاتی ناوەندیی بکەن، لەهەر هێرشێکی بکرێتە سەر ئازەربایجان، بە مەرجێ حکومەت لە چالاکییە سەربازییەکانیدا لەگەڵیان رێك بکەوێ‌و موحەممەد رەزا شا بەڵێن بدات سیاسەتی باوکی پیادە ناکات لە سەرکوتکردنی هۆزە کوردییەکان)[828].

"ئەرجفێڵد روزفلت"ی یاردیدەری پاشکۆی سەربازیی لە باڵیۆزخانەی ئەمریکی لە تاران لە ئەیلولی ساڵی 1946 سەردانی مهابادی کردووە، قازی موحەممەد پێی وتووە: (هەندێ بە هەڵە پێیانوایە ئێمە بەکرێگیراوی سۆڤیەتین). قازی لێی پرسیبوو: (ڕووسەکان یان هێزەکانیان لە کوێن؟)[829] ڕووسەکانیش بەرانبەر قازی موحەممەد کەوتنە نیگەرانی، بە تایبەتی دوای ئەوەی گومانیان برد لە تاران پەیوەندیی لەگەڵ دیبلۆماسەکانی ئەمریکادا هەیە)[830]، حاجی بابەشێخ لە سەرسەختترین دوژمنانی رووس‌و کۆمۆنیزمی بووە، هەوڵی داوە قازی موحەممەد گوێ بە ئامۆژگارییەکانی بیشاوری و رووس نەدات و نەیەڵێ یەکەکانی سوپای ئێرانی بۆ سەرپەرشتیکردنی هەڵبژاردن لە کوردستان خڕ ببنەوە. لە بەرانبەردا "ئەسەدۆف" قونسوڵی رووسی هەڕەشەی لە قازی

---

[827] -Eagelton p.60

[828]-Foreign Relation of the United States (f.R.U.S) Vol. Vll. Pp.545-546. Teleg 1450. November 1946. G, Allen Tehran Embassy to State Deoartment .

[829] - کۆچیرا: سەرچاوەی پێشوو، ل283.

[830] - F.R.U.S, Voc- 11-Dispatch October 14 1946, From Vice Consul. G. Doohler to Tehran .

موحەممەد کرد لەسەر ڕێگەنەدان بە هێزەکانی حکومەت بۆ ناو مهاباد، مستەفا بارزانیش وەکو پیاوێکی چالاکی کۆمارو بیروباوەڕی ئایینی لەلای خۆیەوە دڵخۆش نەبووە بە پەیوەندیی کوردو سۆڤیەت[831].

هۆکارەکانی ئەو قەیرانە دەگەڕێتەوە بۆ گۆڕانی هەڵوێستی رووس لەمەڕ کێشەی کورد، ئەمەش بە هۆی بەدەستهێنانی ئیمتیازی نەوت لە حکومەتی ئێرانیو واژۆکردنی رێککەوتنامەی فەیرۆز ـ بیشاوەری، دوای ئەوە هەموو ئەولەویاتی سیاسەتی رووسی، پاراستنی ئەو دوو دەستکەوتە بووە، دەبینین بەر لە بەدەستهێنانی ئیمتیازی نەوت بەرپرسە رووسەکان چالاکی گەرمو گوڕیان هەبووە لە ناوچەکە، ئەمەش بە بەکارهێنانی کارتی کوردیی بۆ پاڵپشتی هەڵوێستی ڕووسی لە گفتوکۆ لەگەڵ حکومەتی ئێرانی. دیبلۆماسەکانی رووس رۆڵی گەورەیان گێڕا لە قەناعەتپێهێنانی سەرۆك هۆزەکانی کورد لە ورمیٚو ماکۆ و سەلمان بۆ پشتگیرییکردن لە کۆماری مهاباد، پشتگیریی عومەرخانو زیرۆبەگی هەرکیو سەرۆك هۆزەکانی جەلالی بۆ کۆماری کوردستان بەرهەمی هەوڵی ڕووسەکان بووە[832].

گفتوگۆی رووسیاو ئێرانییەکان لە ئازاری ماڵی 1946 بۆ گەیشتن بە بەندەکانی ئیمتیازی نەوت، کوردی وەکو کارتی فشار بەکار هێناوە. ستالین فەرمانیدا بە هەندیٚ مانۆڕی سەربازی بۆ هێزەکانی رووسی لە ناوچە کوردیەکان، هەر ئەوکات هێزی هۆزەکانی کوردی دۆستی رووسو هێزەکانی رووسی لەسەر سنووری تورکیا کۆبوونەوە.

پێدەچێت رووس بە گوێی ئیرانییەکان و هاوپەیمانە رۆژئاواییەکانیدا چرپاندبیٚ، ئەگەر ئیمتیازی نەوت بەدەست نەهێنیٚ ئەوە یارمەتی کوردی ئێران دەدات هاوکاریی کوردەکانی عێراق و تورکیا بکەن لە بەدەستهێنانی سەربەخۆیی، بەمەش ئەو کابووسە دەگەڕێتەوە، کە بە درێژایی مانەوەی هێزەکانی رووس لە باکووری ئێران مەترسی هەبووە بۆ سەر سیاسەتی رۆژئاوا، کە لە دەوڵەتی سەربەخۆی کوردیی بە سەرپەرشتی سۆڤیەت خۆی دەبینێتەوە، لە بەرانبەردا بێهێزکردنی ئەو رژێمانەی دۆستی رۆژئاوا

---

[831] - نجفقولی: سەرچاوەی پێشوو، ل148.

[832] -FO, 371/52702, No, 30, British Conculate General, Tabriz, September 11m1946, Pahlavi, p.191 .

بوون لە هەریەك لە تورکیا و عێراقو ئێران، بۆیە هەریەك لە بەریتانیاو ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بایەخی زۆریان دابوو بە چالاکی دیبلۆماسیەتی رووسو هێزەکانی رووس لە ناوچە کوردیەکان، وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکی ناڕەزایی گەیاندبووە حکومەتی رووسیو وتبووی ناتوانێ دەستەوستان بوەستێ بەرانبەر خۆخافلاندنی کشانەوەی هێزەکانی رووسی لە باکووری ئێرانو هاندانی کورد بۆ دروستکردنی لە ئاریشە لە بەردەم ئیدارەی ئینگلیز لە عێراق، دیبلۆماسەکانی ئینگلیزیش ئەو مەسەلەیان بە بایەخەوە وەرگرتبوو[833].

لە دوای واژۆکردنی ئیمتیازی نەوت لە نێوان سۆڤیەتو ئێرانییەکان، هێزەکانی رووسی گەڕانەوە شوێنی پێشووی خۆیان، دەرکەوت هیچ نەخشەیەك لەلایەن سۆڤیەت یان سەرکردەکانی کوردستاندا نەبووە بۆ دەست خستنە ناو کاروباری کوردەکانی تورکیاو عێراق. دوای دەستخستنی ئیمتیازی نەوت مەسەلەی کورد بووە لاوەکیو تەنانەت رووسیا کوردی بە کۆسپ دادەنا لە بەردەم سوودوەرگرتن لە ڕژێمی قەوام سەڵتەنە.

سەرکردەکانی سۆڤیەت زۆر نیگەران بوون لە سەرکردەکانی کۆماری کوردستان، چونکە وەکو سەربەخۆ مامەڵەیان کردووە لە پەیوەندیی دیبلۆماسی لەگەڵ ئینگلیزو ئەمریکیەکانو ملکەچی فەرمانەکانی کۆماری ئازەربایجانی کۆمۆنیستی نەبوون. وەکو پێشتریش ئاماژەمان پێدا بیشاوەریو هاوڕێکانی ئامادە نەبوون وەکو دەوڵەتی هاوشێوە مامەڵە لەگەڵ کۆماری کوردستان بکەن، حاجی بابەشێخی سەرۆك وەزیران وتبووی: (ئەگەر پێویست بێ لە کامەیان فەرمان وەربگرین، لە تاران فەرمان وەربگرین چاکترە نەك لە ڕووس)[834].

مەسەلەی ناکۆکی نێوان کۆماری ئازەربایجانو کۆماری کوردستان چاوەڕوانکراو بووە، چونکە ئازەربایجان ویستویەتی دەسەڵاتی ببێ بەسەر کوردستانو ناوچە

---

[833] - O..S.S.S.tate Department Confidenment, Files Teleg. 385. March 5-1946 from State Department to Tehran.

[834] - نجفقولی: سەرچاوەی پێشوو، ل148.

کوردیەکان بە مەبەستی بەکارهێنانی کەمایەتیە ئازەریەکانی ئەو ناوچانە لە شارەکانی ورمێ و خوی و میاندوا و نەغەدەو سەڵماس[835].

ناکۆکی نێوان کوردو ئازەری دەگەڕێتەوە بۆ پێش ساڵی 1941، لەو کاتەی حکومەتی ناوەندیی کەمایەتی ئازەری شیعەیان بەکار هێناوە بۆ زاڵبوون بەسەر کورد، کە زۆرینەی سوننی مەزهەب بوون، بەگشتی ئازەریەکان لە شار دادەنیشتن‌و بە چاوی نزمەوە دەیانڕوانییە کوردە کۆچەریە لادێیەکان. ڕاستە حیزبی دیموکراتی ئازەری حیزبێکی کۆمۆنیستی بووە، بەڵام تێگەیشتنە کۆمەڵایەتی‌و ڕەچەڵەکیەکەی بە میرات بۆ مابۆوە، ناکۆکی کوردی ـ ئازەری دەرفەتێکی زۆری کۆماری کوردستانی بە فیڕۆدا، لە چەندان جار هەردوولا هێزی سەربازییان لەسەر سنوورەکان ڕووبەڕووی یەکتر کۆکردبۆوە[836].

ئەم ناکۆکیە ڕووسی زۆر نیگەران کرد، سووربوون لەسەر مانەوەی کۆماری ئازەربایجان، هەتا بیکاتە بنکەیەك لەناو ئێران بۆ دەستبەسەراگرتنی گۆڕان‌و ڕووداوەکانی هەموو بەشەکانی ئێران، سەرەڕای ئەوەش هەڵگیرسانی شەڕی نێوان هێزەکانی ئەو دوو کۆمارە یانی نوشستی سیاسەتی ڕووسی لە باکووری ئێران، هاشیمۆف ڕاسپێردرابوو ناوبژیوانی کوردو ئازەری بکات‌و ڕاستەوخۆ ئەو ململانێیە یەکلا بکاتەوە. لە نیسانی 1946 لە دوای دانوساندن یەکلایی بۆوەو گەیشتە چەند خاڵێکی هاوبەش، گرنگترینیان ئەمانەن:

1ـ کەمایەتییە ئازەرییەکانی ژێر دەسەڵاتی کۆماری کوردستان مافی ئەوەیان هەبێت بە زمانی خۆیان بخوێنن‌و نوێنەری فەرمی ئیدارەی خۆیان بکەن، کوردانی دانیشتووی ژێردەسەڵاتی حکومەتی ئازەربایجانیش هەمان ئەو مافەیان هەبێت.

2ـ لە حاڵەتی مەترسی دوژمن هەردوولا یارمەتی یەکتر بدەن.

3ـ هیچ گفتوگۆ یان ڕێککەوتنامەیەك لەگەڵ حکومەتی ناوەندیی ئەنجام نادرێت بە ڕەزامەندیی هەردوولا نەبێت[837].

---

[835] ـ کوچیرا: سەرچاوەی پێشوو، 273.

[836]-FO. 371/52702, British Consulate General, Tehran. No, 6.feb. 8 .

[837]-FO. 371/52702 Le Rougeletel Tehran. No. 618. May 6th, 1946.

ئەو رێککەوتنە تەنیا وەستاندنی ململانێی کوردی ـ ئازەری بووە لەژێر فشاری رووسی، لەڕاستیدا ئەو ناوچە کوردیانەی لەژێر دەسەڵاتی کۆمۆنیستە عەجەمەکاندا مانەوە لایەنی کوردیی پێی رازی نەبووە، بەڵام لەبەر فشار و هەڕەشەی ڕووسیی سەربەست نەبووە لە بەرگریکردن، ئەمەش لە زاری عومەر خانی شوکاکەوە بەدیار دەکەوێ، کە یەکێك بووە لە واژۆکارانی ئەو رێککەوتنامەیە[838].

هەروەها ئازەرییەکان بە تەواوی گوێیان نەدایە ئەو رێککەوتنامەیە، بەردەوام بوون لە پێشێلکاری بەرانبەر ماف نەتەوایەتی کورد لەناوچەکانی ژێردەسەڵاتیانو لەگەڵ حیزبی تودەش درێغییان نەکردووە لە شێواندنی کەسایەتی سەرکردەکانی کۆماری کوردستان لەلای دەسەڵاتدارانی سۆڤیەت. دوایی لە حوزەیرانی 1946 رێککەوتنامەی فەیرۆز- بیشاوەری مۆر کرا، کە لادانی ئاشکرا بووە لە ڕێککەوتنامەی نیسانی ئەو ساڵە لەگەڵ کۆماری کوردستان، چونکە بیشاوەری لەسەر ئەو رێککەوتننامەیە راوێژی بە حکومەتی کوردستان نەکرد، ئەوەی جێی سەرسوڕمانە جاوید کرایە پارێزگاری ئازەربایجانو سنووری دەسەڵاتی دیاری کرا، کە هەموو ناوچەکانی ژێردەسەڵاتی کۆماری دەگرتەوە بە مهابادیشەوە[839].

رێککەوتنامەی فەیرۆز ـ بیشاوەری سیاسەتی ڕووسی بووە، حکومەتی ئازەربایجان بە تەنیا جێبەجێکردنی لەسەر بووە، ئەمەش ئاماژەیەکی ترە، کە مەسەلەی کوردیی چەند لاوەکی بووە لە سیاسەتی ڕووسی لە بەرانبەر ئێران. نووسەری ئەمریکی "تورنز" دەڵێ: وای لێهات لە ناوەڕاستی ساڵی 1946 کێشەی کورد بووە بەربەستی سەر رێگای خۆفەرزکردنی رووسی بەسەر هەموو ناوچەکانی ئێران. هەروەها دەڵێ: ئەو سیاسەتەی کورد پیادەی دەکرد نەك هەر خزمەتی بەرژەوەندییەکانی ڕووسی لە ئێراندا نەکردووە،

---

[838] - ناکۆکی نێوان ئازەریەکانو کورد دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتاکانی دامەزراندنی کۆمەڵە، حیزبی تودەو رووس دەیانویست کۆمەڵە خۆی هەڵبوەشێنێتەوەو ئەندامەکانی بچنە ناو حیزبی تودە، هەژار دەڵێ: (قازی موحەممەد کە لە تەورێز گەڕایەوە لەگەڵ قولیف قونسوڵی رووسی لە تەورێز قسەی کردبوو، لەوێدا قونسوڵ وتبووی: ئێمە بە تەنیا حیزبی تودە دەناسین، بەڵام قازی موحەممەد بە جددییو راشکاوی وەڵامی دابۆوە بە جۆرێ قبوڵی ژێکاف بکات، چێشتی مجێور، ل72.

[839]- O.S.S. State Department Confidentid File. American Embassy Tehran No, 776, Oct, 114.1946.

بەڵکو تەواو پێچەوانەی ئەو بەرژەوەندیە بووە، کورد پێچەوانەی داواکاریی ڕووسی کاری کردووەو ملکەچی کۆماری ئازەربایجان نەدەبوو، لەگەڵ ئەوەشدا هەندێ لە سەرکردەکانی کورد هێڵی پەیوەندییان لەگەڵ ئینگلیز پاراستبوو[840].

دەتوانین بڵێین ئەم ملکەچ نەبوونە بۆ سۆڤیەت ئەرکی زۆری خستبووە سەر کۆماری کوردستان، لەوانە: گەمارۆی شاراوەی ئابووری لەلایەن سۆڤیەتەوە، پابەند نەبوون بە بەڵێنەکانی پێشوویان لە کڕینەوەی توتنی کوردستان، هەتا هەموو یارمەتیە داراییەکانی لەسەر کورد بڕی. وای لێهات لە ئەیلولی ساڵی 1946 کۆماری کوردستان لە قەیرانی دارایی تاڵدا دەژیا، قازی موحەممەد ناچاربوو داوا لە سەرکردە سەربازیەکان بکات بۆ بژێوی، پارەو یارمەتی لە هۆزەکانی کورد کۆ بکەنەوە، ئەمەش پێویستیەکانی دابین نەدەکرد لە چەك، بۆیە هەزاران چەکداری کورد، کە ئامادەیی خۆیان دەربڕی بوو لە بەرەکانی شەڕ لە سەقز و بانە و سەردەشت لە بەرانبەر خڕبوونەوەو چالاکی هەراسانکارانەی هێزەکانی ئێرانی چەك هەڵبگرن[841].

قازی موحەممەد هەستی کرد تووشی گۆشەگیریو تەنگژەی ئابووری بووە، ناچار بوو لە هاوینی ساڵی 1946 بە مەبەستی چارەسەرکردنی مەسەلەی کوردستان بەشێوەی ئاشتیانە بۆ وتوێژ لەگەڵ قەوام سەڵتەنەی سەرۆك وەزیرانی حکومەتی ناوەند بەرەو تاران ڕێ بکەوێ، لەوێ پێشنیاری کردبوو، کە هەموو ناوچە کوردیەکان لە ئێران "ئازەربایجانی ڕۆژئاوا، سنە، کرماشان" لەیەك ئەیالەتدا کۆ بکرێتەوە، بەڵام قەوام سەڵتەنە، کە باوەڕی بە دەسەڵاتی ڕاستەوخۆی سەربازی هەبووە بەسەر کوردستان، بەو بیانووەی ناوچە کوردیەکان دەکەونە چوارچێوەی پارێزگای ئازەربایجان ئەویش بەپێی ڕێککەوتنامەی فەیرۆز- بیشاوەری یەکلایی بۆتەوە، ئەمە قبوڵ نییە، لەوێ وتی: زۆر باشە بە مەرجێ جاویدی پارێزگاری ئازەربایجان ڕازی بێت[842].

هەڵوێستی قەوام سەڵتەنە وتوێژەکانی لەگەڵ کورد درێژکردەوە، تا دەرفەتی باشی بۆ بڕەخسێت هێزی سەربازی پێویست ئامادە بکاتو دڵنیا بێت لە دابڕینی تەواوی

---

840 - Arthur Turner (Kurdish Nationalism) in ed. Chelkwiski C. P.400.

841 - کۆچیرا: سەرچاوەی پێشوو، ل275.

842 - پشدەری: سەرچاوەی پێشوو، ل67-68.

ئاغاکانی کوردو بگاتە کاتێکی گونجاو بۆ خنکاندنی کۆمار[843]. هەروەها قەوام سەڵتەنە لە هەوڵی ئاژاوەنانەوەدا بوو لە نێوان هەردوو کۆماری ئازەربایجان‌و کوردستان بەرانبەر بەو قەیرانە، کە دەسەڵاتی ناوەند ئامادەی چارەسەری ئاشتیانە نەبوو بۆ مەسەلەکە، سەرەڕای ئەوەش هێزی کۆکردەوە لە بەرەکانی سەقزو بانەو سەردەشت. قازی موحەممەد لەلای خۆیەوە بڕیاری دا 10 هەزار چەکداری کورد لە بەرەکانی شەڕ کۆ بکاتەوە، هێزەکانی کورد لەوپەڕی ئامادەییدا بوون بۆ دەرپەڕاندنی حامیە سەربازیەکانی ئێران، کە زیاتر گۆشەگیرو گەمارۆدراو و ورە بەزیو بوون[844].

ڕووس ئاگادار بوو، کە ئەمە دەبێتە هۆی نائارامی ناوچەکەو تێکدانی پیلانی درێژخایەنی رووس بۆ دەستبەسەراگرتنی حکومەتی قەوام سەڵتەنەو دوایی هەڵگیرسانی شۆڕشی میللی وەکو ستالین پێی دەوت هەڵوەرینی سێوی ئێران لە سەبەتەی سۆڤیەت، بۆیە لەڕێگەی قونسوڵی ڕووسییەوە لە تەورێز حکومەتی سۆڤیەت ئاگادارکردنەوەیەکی توندیدا بە قازی موحەممەد، هەڕەشەی لێکرد، کە رووس راستەوخۆ دژی کورد دەوەستێ ئەگەر هێزی کوردیی نەخشەی هێرشکردنیان هەبێت بۆ سەر هێزی ئێران لە کوردستان[845].

سیاسەتی ڕووسی دژ بە کۆماری کوردستان کەم نەبووە لە ڕووخانی کۆمار، هەتا ئێستاش دەتوانین هەمان سەرنج هەست پێ بکەین لە ڕۆڵی هێزە گەورەکان لە نوشستیهێنان بە بزووتنەوەی کورد، شێخ مەحمودیش لە کۆتایی شەڕی یەکەمی جیهانی سوودی لەو بۆشاییە سیاسیەی درووست ببوو بینی، بۆ ماوەیەکی کەم حکومەتێکی کوردیی دامەزراند، ئینگلیز رایگەیاند، کە دەرفەتی بیرۆکەی دامەزراندنی حکومەتێکی داوە، ئەوەش وەکو کارتی کوردیی بەرانبەر حکومەتی عێراقی لەپێناو بەدەستهێنانی ئیمتیازاتی ئیستیعماری زیاتر، بەڵام هەر دوای سەرکەوتنیان لە عێراق‌و دامەزراندنی حکومەتێکی دۆستی خۆیان پشتیان لە شێخ مەحمود کرد.

---

843-FO, 371/912, No, 294. Sept. &. 1946. From Embassy, Tehran to FO .

844 -Arafa, pp.90-92.

845 -O.S.S. Confidentid File, No, 903 June 28, 1947 .

## کۆماری کوردستان و شەڕی سارد

شەڕی سارد و بارودۆخی نێودەوڵەتی سالآنی (1946ـ1991) بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ کاریگەریی هەبووە لەسەر رووخانی کۆماری نیشتیمانی کوردستانو کۆماری ئازەربایجان، هەر لە دوای شەڕی دووەمی جیهانییەوە رۆژئاوا بۆی دەرکەوت لە شەڕی خودبەسەری رژێمی نازیی رزگاری بووە، بەڵام لە جێگای ئەوە رژێمی کۆمۆنیستی هات، کە لە ڕووی گشتگیریەتیەوە وەکو نازیی وابووە، ڕژێمی کۆمۆنیستی باوەڕی بە خاوەنداریەتی هۆیەکانی بەرهەمهێنان هەیە، لەگەڵ رژێمی تاك حیزبی، رۆژئاواش دژ بەو رژێمەیە، لە ڕێگەی شالآوەوە بێت یان درووستکردنی شۆڕشی کۆمۆنیستی لەناو دەوڵەتانی دەرەوەی کۆبەندی سۆسیالیزی کۆمۆنیستی چالاکانە کاری دەکرد بۆ رێگەگرتن لە بنەماکانی شۆڕشی بەلشەفی ڕووسی لە جیهان، بەتایبەتی لە ئەورووپای رۆژئاوا، بەریتانیا بە ماندوویی لە شەڕ هاتبووە دەرێو ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا سەرکردایەتی رۆژئاوای دەکرد لە بەرەنگاربوونەوەی رژێمی کۆمۆنیستی.

بەریتانیا بە نهێنی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئاگادار کردەوە، کە ناتوانێ رۆڵی کلاسیکی خۆی ببینێ لە سەرکردایەتیکردنی رۆژئاواو بەرژەوەندیە ئیمپریالیستیەکان، دواتر ئەم سیاسەتە لە سەرەتای ساڵی 1946 لە سیاسەتی جیهانی بە ناوی "بیروباوەڕی ترومان"ەوە ناسرا، بەپێی ئەمە حکومەتی ئەمریکا بەرپرسیاریەتی سەرکردایەتیکردنی دونیای رۆژئاوای لە دژی سەربازگەی کۆمۆنیستی گرتە ئەستۆ، هەندێ لە پسپۆڕانی کاروباری نێودەوڵەتی دەڵێن شەڕی سارد لە ئێرانەوە دەستی پێکردووە[846]. چەند نیشانەیەك لە ئاسۆوە هەبووە دەریخست، کە سۆڤیەت ئارەزووی مێژوویی هەبووە بۆ دەستبەسەراگرتنی ئێران، لە سەدەی نۆزدەهەمەوە رووسیای قەیسەری ویستویەتی دەسەڵاتی ئیمپریالیستی بگەیەنێتە ئاوەگەرمەکانی کەنداوی فارسی، بەمەش دەستبەسەراگرتنی ئێران بووە مەسەلەیەکی بایەخدار لە چوارچێوەی چاوتێبڕینی ستراتیژیەتی رووسی. لە دوای هاتنی دەسەڵاتی بەلشەفیەکان لە ڕووسیا ئەم خواستە ئیمپریالیستیە بە شۆڕشی ئومەمەی "کۆمۆنیستی" گۆڕانی بەسەردا نەهات.

---

846 -Eagellton, pp.97-98.

سۆڤیەت لە سەرەتای ساڵی 1941 لەگەڵ هیتلەری نازی بە نهێنی بەیەك گەیشتن لەسەر دابەشکردنی دونیا بۆ سەر پێگەی دەسەڵاتی هەردووکیان، ئێرانو ئاوەگەرمەکانی کەنداو لەم دەستبەسەراگرتنە بەر سۆڤیەت کەوت. رووسیا ساڵانی شەڕی جیهانی بە دەرفەتزانی بوو، لە سنووری ئێرانەوە لە هەوڵی بەهێزکردنی دەسەڵاتی خویدا بێت، دواتریش حیزبی تودەو کۆماری ئازەربایجانی بەکار دەهێنا بۆ پتەوکردنی ئەو پێگەیە، هەوڵی قۆستنەوەی کۆماری کوردستانیش بۆ هەمان مەبەست بووە، لە لێدوانێکی بەناوبانگی ستالیندا هاتووە، کە پێشتر ئاماژەمان پێدا دەڵێ: ئێران سێوێکە زوو یا درەنگ دەکەوێتە سەبەتەی سۆڤیەتەوە.

رۆژئاواو بە تایبەت ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە ساڵی 1946 زۆر نیگەران بوون لە خۆخافلاندنی سۆڤیەت لە کشانەوەی هێزەکانی لە ئێران، ئەمەش لادانێکی ئاشکرای رێککەوتنامەی تارانی ساڵی 1942 بووە، کە دەبوایە لەگەڵ کۆتاییهاتنی شەڕ تەواوی هێزەکانی بکێشێتەوە، ناوەندە راسترەوەکانو سوپاو شاو حکومەتی تورکیا لە هەوڵی ئەوەدابوون، ئەوە لەلای رۆژئاوا بورووژێنن، کە سۆڤیەت کاتێك دەکشێتەوە حکومەتێکی دۆستی خۆی لە تاران دابمەزرێنێ، یان هەردوو کۆماری ئازەبایجانو کوردستان بە فەرمی بناسرێ، لەگەڵ دابەشکردنی ئێران بۆ دەوڵەتی بچووك بچووك هەتا دەستبەسەراگرتنی ئاسان بێت[847]. ئێران جێی بایەخی ستراتیژیەتی رۆژئاوا بووە، بەتایبەتی بۆ ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، چونکە شوێنی جوگراف ئێران بایەخی گەورەی هەبووە بۆ ئاسایشی کەنداو، ئەو هەنگاوانەی وردە وردە گەلاڵە دەبوو، لە نێردراوی ئەمریکی گەورە بە فەرماندەی "شوار سکۆف"، کە سەرپەرشتی مەشقی 20 هەزار جەندرمەی ئێرانی دەکرد، دەتوانین تێبینی زیاتری بایەخی ئەمریکی بکەین بە ئێران[848].

---

[847]-Louiso L. Esrance Fawcett, Iran abd the Cold War (Cambridge University) ,pp.72-74 .

[848]- O.S.S. Cnfidential Files state Department, Teleg No 385.. March 5, 1946 From State Department to US. Embassy in Moscow.

ئێران لەساڵی 1946 شوێنێکی جوگراف بە بایەخیشی هەبووە بۆ پاراستنی بەرژەوەندییەکانی رۆژئاوا بەتایبەتی نەوت، نزیك بووە لە دوورگەی عەرەبو عێراق. کۆمپانیای نەوتی ئێرانی ـ ئینگلیزی لە بەرانبەر ئەگەری ئەوەی کانە نەوتییەکانی باشووری ئێران و کانە نەوتیەکانی کەرکووك لە عێراق نەکەونە ژێر دەسەڵاتی سۆڤیەت، هەندێ لە لێکۆڵەرەوە دیبلۆماسیەکانی رۆژئاوا گەیشتنە ئەو باوەڕەی کە ئێران کلیلی رۆژهەڵاتی ناوەڕاستە[849]. "ترومان"ی سەرۆکی ئەمریکی زۆر نیگەران بووە بە بارودۆخی ئێرانو هەوڵی زۆری داوە ئێران نەبێتە قوربانی چاوتێبڕینی رووسی. دەگێڕنەوە لە ساڵی 1926 وتبووی: (هیچ گومانی تێدا نییە رووسیا دەیەوێ شاڵاو بهێنێتە سەر تورکیاو گەرووەکانی دەریای رەشو سپی داگیر بکات، ئەگەر بە هێز و بە زمانێکی توند وەڵامی نەدەینەوە ئەوە شەڕێکی گەورە بەرپا دەبێت، تاکە زمان سۆڤیەت تێی بگات ئەوەیە چەند تیپتان هەیە؟ من ئێستا دژی ئەوەم لەگەڵیاند نەرم بین، لە ئایندەش داننانێم بە حکومەتەکانی کۆمۆنیستی دۆستی سۆڤیەت لە بولغاریاو رۆمانیا، چونکە رووس رێزی بەرپرسیاریەتی خۆیان لە شوێنەکانی ترو بەتایبەت لە ئێران نەگرتووە. زۆر ماندوو بووم بەوەی ئارامم گرتووە لە بەرانبەر ئاژاوەی ئەو منداڵە ڕووسییە)[850].

ستالین لە ساڵی 1946 بە توڕەییەوە قسەی دەکرد لەسەر بزاوتنی هێزەکانی ئیمپریالیستی لە دژی بەرژەوەندیی سۆڤیەت، بەتایبەت لەسەر ئەوەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا کێشەی ئێرانو کشانەوەی هێزەکانی رووسی خستبووە بەرنامەی کارەکانی کۆمەڵەی گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان[851]. هەڵوێستی رۆژئاوا توند بووەو هەندێ لەو باوەڕەدا بوون ئێران دەگۆڕێ بۆ "ستالینگرادی دیموکراتی ڕۆژئاوا"[852]. لە کۆتایی مانگی ئازارەوە رووس بەجددیی لەسەر پاشەکشە لە ئێران قسەی دەکرد، بەڵام "کۆرشی سامی" توێژەر، لە لێکۆڵینەوەیەکی خۆیدا جەختی

---

[849]- FRUS Vol. 711. pp.529-531, memo No, 4818.. October 12, 1946.

[850] Fawcet,p.80

[851] -Juross Samif (Truman Against Iran: A Tale of Theree Messages) Middle Eastern Vol 23 No, pp.107-108.

[852] -U.S. Conf. Print Allen To Sec. State The Dec. 17.1946.No,1597.

لەسەر ئەو بابەتە کردۆتەوە، کە ئەوەی دواتر روویدا لە هەڵوێستی ڕووسی بە هۆی نامە گرنگەکەی "ترومان"ەوە بووە، کە لە 3ی ئازار بە رێگەی باڵیۆزی ئەمریکییەوە بۆ ستالینی ناردبوو، لەوێدا نووسیبوی: (ستالین پیاوێکە رێزی بەڵێنی خۆی دەگرێ)، داوای لە ستالین کردبوو ئاگاداری بەڵێنەکەی بێتو لە ئێران بکشێتەوە[853].

لە بەدبەختی هەردوو کۆماری کوردستانو ئازەربایجان رۆژئاوا پێیوابووە ئەمە بەشێکە لە ململانێی نێوان سەربازگەی سۆسیالزمی بە سەرۆکایەتی رووسیاو سەربازگەی سەرمایەداری بە سەرۆکایەتی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، بۆیە ئەو دوو کۆمارە بوونە قوربانی ئەو ململانێیە، هیچ گومانی تێدا نییە کۆماری ئازەربایجان بەشێك بووە لە نەخشەی ڕووسی لە ئێران، بەڵام بۆ کۆماری کوردستان ئەمە راست نییە، وەکو ئاماژەمان پێدا رووس هاندەرو پشتگیری کۆمار بووە، بەڵام کۆمار سەربەخۆ بووە لە بڕیارو ئارەزووی زۆری هەبووە پەیوەندیی لەگەڵ رۆژئاوا هەبێت، بە نارەوا کۆماری کوردستان تێکەڵی ململانێی رووسی کراوە.

راپۆرتی دیبلۆماسەکانی ئینگلیز لە ئێرانو تورکیاو عێراق رۆڵی گەورەیان بینی لەو بۆچوونە هەڵەیە لەسەر کۆمار، راپۆرتیان دەنووسی گوایە بۆ دامەزراندنی کوردستانی گەورەی دۆستی رووسیا سەرکردەکانی کۆماری کوردستان نەخشەی رزگارکردنی کوردستانی عێراقو ئێرانو تورکیایان هەیە بۆ ئەوەی بیلکێنن بە کۆماری کوردستانەوە، ئەمەش دەبێتە هۆکاری لێکهەڵوەشانەوەی هەریەك لەو وڵاتانە. دوایی رووسیا بۆ بێبەشکردنی وڵاتانی رۆژئاواو بەتایبەتی بێبەشکردنی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە سەرچاوەی نەوت ئەو وڵاتە لێك هەڵوەشاوانە قوت دەداتو دەگاتە ئاوە گەرمەکان[854]. بەشی توێژینەوە لە وەزارەتی دەرەوەی بەریتانی راپۆرتێکی ئامادە کردبوو، لەوێدا رایگەیاندبوو، کە رووسیا دەیەوێ سوود لە کوردو دامەزراندنی دەوڵەتی ئەرمەنیو کوردی دۆستی خۆی وەربگرێ، ئەو دەوڵەتەش ناوچە کوردییەکانی ئێرانو تورکیا بگرێتەوە، سنوورەکەی بگاتە بەندەری ئەسکەندەروونە لە سنووری سوریا-

[853] -O.S.S. British Embassy in Iran No, 1597. Dec. 17-1946.

[854] - Sami, 109.

تورکیا[855]، هەروەها ئەو راپۆرتە نهێنییە جەختی کردبۆوە لەسەر خراپی بارودۆخی کوردان، بە هۆی خۆگێلکردنی حکومەتە یەك لە دوای یەکەکانی دۆستی ئینگلیز لە جێبەجێکردنی ئەو بەڵێنانەی بە کوردیان داوە، بۆیە ئێستا کورد بە چاوی هیواو ئاواتەوە دەڕواننە سۆڤیەت هەتا رزگاریان بکات لە حکومەتی عەرەبی لە بەغدا[856]. لە ئاکامی هەست کردن بە مەترسی کۆماری کوردستان لەسەر کوردستانی عێراق لەگەڵ سەرۆك هۆزەکانی دۆستی خۆیان لە پشدەر کەوتنە دامەزراندنی حیزبێکی کوردیی بە ناوی "پارتی دەستە راست: حزب الید الیمنی" بۆ ئەوەی هۆکارێکی بەرپەرچدانەوەی پێگەی رووسیو دیوارێك بێت لە نێوان پێگەی سۆڤیەتی لە کوردستانی ئێرانو پێگەی ئینگلیزی لە کوردستانی عێراق[857].

ئەفسەرە هەواڵگرەکانی ئینگلیز برەویان بەو هەواڵانە دەدا، کە گوایە مستەفا بارزانی پەیوەندیی بە کوردیی عێراقەوە کردووەو بەڵێنی پێداون بەو نزیکانە بە سوپایەکی کوردستانی ئێرانەوە دەگەڕێتەوە بۆ کوردستانی عێراق[858]. لە کاتێکدا ئیدارەی ئەمریکی زۆر بە گەرمی پشتی بەستووە بە دیبلۆماسەکانی ئینگلیز، چونکە حکومەتی ئەمریکی لە کانونی دووەمی ساڵی 1946 هەتا نیسانی هەمان ساڵ وریایی دابوو بە گەشتی دیبلۆماسی بۆ کوردستان[859].

بۆ دەستێوەردانی ئەمریکییەکان لە کاروباری ئێرانو یارمەتی حکومەتی تاران بدەن لە دەستبەسەراگرتنی کۆماری کوردستان، هەردوو حکومەتی ئێرانیو تورکی کەوتبوونە گەورەکردنی قەوارەی پەیوەندیەکانی نێوان کۆماری کوردستانو سۆڤیەت،

---

[855]- FO, 371/persia. Twl. No, 104. April 6, 1946. Top Secreet. Of Middle East to WO. 26 April 1946. General HQ FORCE. Jan 1946 Foregn, Relate vol, v11, pp.364-365 Locen. (Murray) to See Sate Tehran March 18.1946 No, 362 Foreign Relation 1971 vol 5. F.Foregn Relation. Vol V 11. p.364-365 The March Jan 1946 .

[856]- FO, 371/52369 (Tour Notes: Deputy Assistant poltical Advisor in Arbil Rowanduz January 6-9.1946.

[857] – هەمان سەرچاوە.

[858]– سەرچاوەی پێشوو.

[859]-FO 371/52702 Top Secet. Middle East to War Office 26 April 1946

چونکە هێزەکانی ئێرانی بە تەنیا نەیاندەتوانی هێرش بکەنە سەر مهاباد[860]. لەبەر ئەنجامو دەنگدانەوەی شێواندنو گەورەکردنی راپۆرتی بەڕێوەبەرایەتیە فەرمیەکانی بەریتانی رۆژنامەی "دیلی تەلەگراف"ی لەندەنی نووسیبووی: ئەگەر کوردستان سەربەخۆ بێت چاڵە نەوتیەکانی کەرکوك دەکەونە بن دەستی سۆڤیەت[861].

دیبلۆماسیەکانی ئینگلیز لە ڕاپۆرتە نهێنییەکانو قونسوڵی تورکی لە تەورێز رۆڵی گەورەیان بینی لە گەورەکردنی رۆڵی سۆڤیەت لە کۆماری کوردستان. لەدوای کشانەوەی هێزەکانی ڕووسی لە ناوچەکە رۆژنامە تورکیەکان نووسیبویان کە ئەم رووداوە سەرکەوتنێکی گەورەیە بۆ تورکیاو هەنگاوێکە بۆ دەستبەسەراگرتنی حکومەتی کوردیی لە مهاباد، لەوبارەیەوە سوپاسی هەوڵەکانی حکومەتی ئەمریکییان کردبوو[862].

کوردیش لە شوێنی خۆیەوە بە تایبەتی پێشەوا قازی موحەممەد رۆڵێکی دیاری هەبووە، کە تێڕوانینێك بداتە دیبلۆماسە ئەمریکیەکان لەسەر کۆماری کوردستان بەو شێوەی کە ئامرازێکن بەدەستی رووسیاوە. دکتۆر بورهانەدین یاسین لەسەر زاری ژەنەراڵ شەریف پاشاوە دەگێڕێتەوە، کە بەباڵیۆزی بەریتانی لە قاهیرەی وتووە: رووس ئێستا تەواو دەستی گرتووە بەسەر بارودۆخی کوردستانی ئێران، ئەگەر حکومەتەکانی تورکیاو عێراقو ئێران لە بەرژەوەندیی کورد نەکەونە خۆ، ئەوە رووس بەم زوانە دەگاتە کەرکووك[863].

قونسوڵی بەریتانی لە تەورێز لە 12ی ئەیلولی 1946 لە چاوپێکەوتنێکیدا لەگەڵ قاسم ئاغای ئێلخانی زادە، لەسەر زاری ئیلخانی زادەوە نووسیویەتی: قازی موحەممەد هیچ دەسەڵاتێکی کردەیی بەسەر سەرۆك هۆزەکانەوە نییەو ئەوانە بە ئاماژەی رووسی دەجولێن، قازی موحەممەد ناتوانێ هیچ کارێك یەکلایی بکاتەوە بەبێ رەزامەندیی پێشتری رووسیا، هەروەها ئێلخانی زادە وتویەتی: لە ڕوکەشدا کورد داوای حوکمی زاتی

---

[860] FRUS. Vol. v11. pp.364-365. Tehran Embassy, March, 18, 1946.

[861] Yasin. P.141.

[862] - شەمزینی: سەرچاوەی پێشوو، ل153.

[863] -FO. 371/52702, Mr. Shone, No, 3. 28th, Jan, 1946. Dept. State Conf. Prin. Ankara. End Beirut. Oct. 22, 1946. Teleg. 7330.

دەكات، بەڵام لەگەڵ هەموو پارچەكانی كوردستان هاوئاهەنگی هەیە بۆ دامەزراندنی دەوڵەتی سەربەخۆی یەكگرتووی كوردستان[864].

ڕۆژنامە فەرمیەكانی كوردستانیش هەندێ جار بێئاگایانە لاسایی ڕۆژنامەكانی تودەو تەورێزیان كردۆتەوە لە بەكارهێنانی گوزارشو دروشمی "بژی سەرۆكی گەورە ستالین". گومانی تێدا نییە ئەم ڕۆژنامانە گەیشتوونەتە قونسوڵیەكانی بەریتانیو ئەمریكی، ئەمەش تێڕوانینی هەڵەی درووست كردبوو لەسەر هەقیقیەتی كۆماری كوردستان.

قازی موحەممەد هەتا درەنگ نەخشەی كوردستانی گەورەی لە نوسینگەكەی خۆی هەڵیواسیبوو، دواتر هەستی بە مەترسی ئەو كارە كردو لای برد. لە سەرەتای سەردەمی كۆمار ڕۆژنامەی كوردستان چاوپێكەوتنی لەگەڵ قازی موحەممەدو سەركردەكانی تری كۆماری كوردستان كردووە، ئەوانیش قسەیان لەسەر مەینەتیەكانی كورد كردووە لە عێراقو توركیاو وتوویانە كورد مافی خۆیەتی وەكو یەك گەل یەك قەوارەی سیاسی هەبێت[865].

سەرەڕای هەموو ئەوانە ئەوەی زیاتر نیگەرانی لای حكومەتی ناوەندیی درووست كردبوو، كە كۆماری كوردستان لە مهاباد هەنگاوێكە بۆ یەكگرتنی هەموو كوردستانی گەورە. بە درەنگەوە قازی موحەممەد لە ناوەڕاستی ساڵی 1946 هەستی بەو هەڵەیە كرد، زانی كە ئەو لێدوانانە لەو ماوەیە باری كۆماری كوردستانی قورس كردووە، دوژمنی ئیقلیمیو نێودەوڵەتی بۆ پەیدا كردووە. بۆیە دەبینین دواتر لە زۆربەی بۆنەكاندا نكۆڵی لەوە كردووە، كە كۆماری كوردستان هیچ خواستێكی جیابوونەوەی هەبێت لە ئێران یان هیچ خواستێكی پەیوەندیی نییە بە سەركردەكانی جوڵانەوەی نەتەوەیی كوردیەوە لە دەرەوەی ئێران. لەو كاتەی "دوهلەر" دیبلۆماسی ئەمریكی پرسیاری كرد دەربارەی پەیوەندیی لەگەڵ سەركردەكانی كورد لە عێراقو توركیا، قازی موحەممەد نكۆڵی لەمە كردووە[866].

---

[864]FO, 371/52707, British Consulate General Tabriz. No, 30 September, 11.1946.O.S.S. Confidential Files Teleg. From Tehran to State Deparment May.2.1946 .

[865]-ڕۆژنامەی كوردستان، ژمارە (24)ی مایسی 1946.

[866] -O.S.S. Confidential Files Dispatch April, 26, 1946. Sect. 135. Consulate General. Tabriz. From Vie Consul.

بەڵام ڕاگەیاندنەکانی تورکیو ئێرانی بەهێزتر بوون، توانیبوویان مەترسی لەلای ڕۆژئاواییەکان درووست بکەن لەسەر کۆماری کوردستان بەتایبەتی لای هەردوو حکومەتی بەریتانی و ئەمریکی، کە ئامادە نەبوون دان بە ماف نەتەوایەتی کورددا بنێن، بۆیە پشتگیریکردنی هەڵوێستی فەرمی ئێرانیان پێ چاك بوو، پێیانوابووە کۆماری کوردستان یاریی دەستی سۆڤیەتە، بۆیە سوور بوون لەسەر پاڵپشتی تەواوی شا لە پێناو دەستبەسەراگرتنی کۆمار. لە ئازاری 1946 ڕێککەوتنامەی هاوبەش لە نێوان هەریەك لە تورکیاو عێراق واژۆ کرا، بۆ ئەوەی هاریکاریی هاوبەشیان هەبێت لە ڕووبەڕوونەوەی کێشەی کورد. ئەو ڕێککەوتنامەیەش بە ڕێکەوتنامەی سەعدئابادی ساڵی 1937و ڕێککەوتنامەی 1926 دەچوو، هەموویان لە ژێر چاودێریی بەریتانی ئەنجام درابوون بۆ بەرپەرچدانەوەی بەرژەوەندییەکانی نەتەوەی کورد.

تورکیا باوەڕی وابووە لە هەموو لاوە کۆماری کوردستان لە لایەن سۆڤیەتەوە دەورە دراوە، ئینگلیز لە هەوڵی لێکنزیکردنەوەی تێڕوانینی هاوبەشدا بووە لەگەڵ لە نێوان هەریەك لە عێراق و ئێران لەسەر هاوکاریی یەکتری بۆ گەڵاڵەکردنی هەڵوێستێکی یەکگرتوو دژی بزوتنەوەی کوردی. هێزەکانی ئێرانی بەرلەوەی لە کانوونی یەکەمی ساڵی 1946 دەست بە هێرش بکەن بۆ سەر مهاباد، دیبلۆماسە بەریتانییەکان بە مەبەستی کاری هاوبەش کەوتبوونە سازدانی وتوێژ لە نێوان فەرماندەکانی سوپای عێراقیو فەرماندەکانی سوپای ئێرانی هەتا ئەگەر شەڕ روویدا کۆماری کوردستان دابڕن لە پشتیوانی کوردی عێراقو تورکیا[867].

واژۆکردنی ڕێککەوتنامەی ئیقلیمی لەو جۆرە دژی کۆماری کوردستانو لەژێر سەرپەرشتی بەریتانیا ئاکامی شەڕی ساردی نێوان ڕووسیاو ڕۆژئاوا بووە، لە کانوونی یەکەم لەو کاتەی خەڵك لە مزگەوتی هەباس ئاغا کۆببونەوە بۆ وتوێژ لەسەر دیاریکردنی یەکێك لەو دوو ئەگەرە، خۆبەدەستەوەدان یان بەرگریی لە کۆماری کوردستان لە دژی هێزەکانی ئێرانی بە فەرماندەی هەمایونی، سەرکردەکانی کورد زانییان هێزەکانی

[867] .- O.S.S. Confidential Files,Sect. 7530 22, Oct. 1946.

عێراقیو تورکی لەسەر سنوورەکان کۆبوونەتەوە[868]. ئـەمـە یـەکێك بوو لە هـۆکارەکانی هەست کردن بە نائومێدیو گۆشەگیریو لاوازی، دواتر بڕیاری خۆبەدەستەوەدان[869].

## باری ناوخۆیی وەکو هۆکاری کەوتنی کۆمار

ئەوەی سەرەوە هۆکاری نێودەوڵەتیو ئیقلیمی بوون لە ڕوخانی کۆماری کوردستان، بەڵام هەوڵدان نییە بۆ دوورەپەرێزکردنو بێتاوان نیشاندانی کورد بە تایبەتیش فەرماندە سەربازییەکانی کۆماری کوردستان، چونکە هەندێ لە نووسەرانو بەرپرسانی دونیای سێیەم زۆربەی مەرگەساتەکانی گەلەکەیان دەگەڕێننەوە بۆ ئیستیعمارو زلهێزەکانو دەوڵەتانی ئیقلیمی، لێرەدا هەندێ تاوان دەکەوێتە ئەستۆی کوردو پێویستە لە بەردەم خاڵە لاوازەکانی ناوخۆ بوەستین. لێکۆڵینەوە لەو هۆکارە زاتیانە بکەین، کە بوونە هۆی کەوتنی کۆمار، سەرەڕای ویستی نێودەوڵەتی گەلێك لەسەر پێی خۆی وەستابوو، ئایا لە ئاستی ناوخۆ تەبا بوو؟ سەرکردەکانی خاوەن تێڕوانینی ستراتیژی بوون؟.

---

[868] .- O.S.S. Confidential Files,Sect. 7530 22, Oct. 1946

[869] - ئەگەر خوێندنەوەیەك بۆ شێوازی سەرکردایەتیکردنو پرنسیپی بەڕێوەبردن بکەین لە کۆماری کوردستان، ئەوە دەبێتە هۆکارێکی تری رووخانی کۆمار، پرسیارێکە لە جێی خۆیدایە، بڕیاری بەرگریی لە کۆماری کوردستان چۆن لەناو حەشاماتێکی جەماوەری لەناو هۆڵی مزگەوتی هەباس ئاغا وەردەگیرێ، ئەوە کاری کۆبوونەوەیەك بووە لە نێوان قازی لەگەڵ سەکردایەتی سیاسی حیزبی دیموکراتی کوردستان، یان ئەنجومەنی وەزیرانی کۆمار یان فەرماندەکانی هێزی بەرگری. وەرگرتنی هەڵوێست لە ئاست بابەتێکی وا چارنوسساز بەو رێگەیە، نیشانەی هەڵوەشانەوەی سەرکردایەتی حیزبی دیموکراتو ئەنجومەنی وەزیرانی کۆماری کوردستانە پێش ئەو کۆبوونەوەیە، تێڕوانینی خوێنەر بەرەو ئەو ئاقارە دەبات، کە قازی موحەممەد بەرپرسیاریەتی گەورەی لە دێژەنەدان بە بەرگری دەکەوێتە ئەستۆ نەك رزگاری دەبێت لە بەرپرسیاریەتی، سەرکردەی شایستە لە حاڵەتێکی لەو جۆرە لە دوای بڕیاری سیاسی بە راوێژ لەگەڵ ئەو ناوەندانەی دەسەلات، کە باسمان کرد بە تەنیا بۆ روونکردنەوە لەگەڵ جەماوەر دێتە ئاخاوتن، نەك بۆ بڕیار وەرگرتن، راگەیاندنی کۆماری کوردستانو هاتنی سوپای داگیرکەر شەرعیەتی بەرگری لەسەر سەرکردەکانی کۆمار لەگەڵ خۆیدا جێگیر کردووە، بە کۆبوونەوە لەگەڵ تێکەڵیەکی ناجۆری جەماوەری لە جێی خۆیدا نەبووە. "وەرگێڕ".

بەر لەوەی بچینە ناو بارودۆخی ناوخۆیی پێویستە رای هەندێ لە توێژەرەوان روون بکەینەوە لەسەر هۆکارەکانی کەوتنی کۆماری کوردستان، کە خۆی دەبینێتەوە لە ناتەبایی‌و نەبوونی یەکیەتی نێوان سەرکردەکانی کۆمارو نەبوونی سوپایەکی نیزامی بۆ بەرگری لە کۆمار و باری ئابووری، دوایی کەسایەتی قازی موحەممەد[870].

## قازی موحەممەد و مستەفا بارزانی

لەگەڵ ئاماژەمان بۆ فەرماندەکانی کۆمار، دەبێت سەرکردە چالاکەکانی ئەو کۆمارە بەدیار بخەین وەکو قازی موحەممەدو مستەفا بارزانی‌و حەمە رەشیدخانی بانەو عومەر خانی شوکاك. پەیوەندیی نێوان ئەوانە رۆڵی گرنگو یەکلاییکەرەوەی گێڕاوە لە دامەزراندن یان کەوتنی کۆمار، هەردوو نووسەری ئێرانی نەجەفقولی‌و عەرەفە لەگەڵ دیبلۆماسەکانی ئینگلیز ئاماژەیان کردووە بە هەندێ ساردی‌و کێبەرکێی نێوان قازی موحەممەدو مستەفا بارزانی، هەندێ ئەوە دەبەستنەوە بە ئارەزووی بەهێزی بارزانی، کە پێی باش بووە رووس دەسەڵاتی باڵای هەبێت لە کۆماری کوردستان، یان هەیە پێیوایە ئەم ساردی‌و کێبەرکێیە دەگەڕێتەوە بۆ کەسایەتی مستەفا بارزانی کە کەسایەتیەکی خاوەن خواست بووە، خۆی لە قازی موحەممەد پێ باشتر بووە بۆ بەرپرسیاریەتی[871].

ئەوەی من بزانم تاکە سەرچاوەی کوردی، کە ئاماژە بەم ناکۆکیە بکات، قاسم ئێلخانی زادەی دیبوکریە کە لەگەڵ حکومەتی کوردستاندا بووە، بە هۆی ململانێی خانەوادەی هەردووکیان لەسەر زەوی‌و دەسەڵات "دیبوکریەکان‌و خانەوادەی قازی موحەممەد" سەرسەخترین دوژمنی یەکتری بوون، قاسم راپۆرتی نهێنی لەسەر هەموو جوڵانەوەکانی قازی موحەممەد داوە بە ئیگلیز و حکومەتی ناوەندیی، لە کاتێکدا قاسم ئێلخانی زادە لەگەڵ ئەو وەفدە بووە، کە لە ساڵی 1942 بۆ جاری دووەم سەردانی باکۆیان کردووە، بە درێژی لەسەر ئەو سەفەرە زانیاریی دابوو بە ئینگلیزو شای ئێران[872]. بۆیە لەسەر ئەو بابەتە نابێتە سەرچاوەیەکی باوەڕپێکراو، بەڵام ئەوەی

---

[870] - بلوریان: سەرچاوەی پێشوو، ل74-75.

[871] -Arfa, p.79.

[872] -FO, 371/52707, Brish Consuneral Tabrez. No, 30 September, 11,1946 .

نەجەفقولی دەیگێڕێتەوە لەسەر دوژمنایەتیو کێبەرکێی نێوان قازی موحەممەدو مستەفا بارزانی پشت دەبەستێ بە گێڕانەوەی شێخ ئەحمەدی بارزانی برا گەورەی مستەفا بارزانی، کە لە دوای کەوتنی کۆماری کوردستان نەجەفقولی بینیویەتی، لەو دیدارەدا شێخ ئەحمەد، قازی موحەممەدی بەوە تاوانبار کردووە، کە فەرمانی بە بارزانییەکان کردبێت هێرش بکەنە سەر حکومەتی ناوەندیو هۆزەکانی دۆستی حکومەت، گوایە شێخ ئەحمەد وتوویەتی بارزانییەکان ئەو فەرمانەیان قبوڵ نەکردووەو قازی موحەممەدیش ئەوانی لە زۆر ئیمتیاز بێبەش کردووە[873].

دەگونجێت بە هۆی ئەو ئاکامەی لە کەوتنی کۆمار بە سەریاندا هات ئەو قسەی شێخ ئەحمەد گوزارشت لە ئارەزووی خۆی بکات بۆ لابردنی سەرکۆنە لەسەر بارزانییەکان، لە راوەدوونانی ئەوان لەلایەن هەندێ لە هۆزە کوردییەکانی دۆستی حکومەتی ناوەندیو گوزارشت لە ناکۆکیی و ناتەبایی قازی موحەممەد و بارزانی، گەرچی بە دیار دەکەوێ بارزانی لە قازی موحەممەد زیاتر پێی باش بووە لەگەڵ رووس هاوئاهەنگی هەبێت[874]، بەڵام قازی موحەممەد دیکتاتۆر نەبووە، رای خۆی بسەپێنێ بەسەر بەرهەڵستکارانیدا، هیچ ئاماژەیەکی ورد نییە لەسەر ناکۆکی گەرمی نێوان قازیو بارزانی، بەڵکو لەڕاستیدا پەیوەندیی نێوان ئەو دوو کەسە توندوتۆڵ بووە، لەگەڵ گەیشتنی بارزانییەکان بۆ مهاباد قازی موحەممەد فەرمانی بە لیژنە حیزبییەکان داوە پێشوازییان لێ بکەنو دالدەیان بدەن، ئەمەش متمانەی بە خۆی زیاتر کردو بڕوای وابووە هێزی بارزانییەکان لە ئایندە زیاتر کۆمار دەپارێزێن، لە کاتێکدا بارزانییەکان (1500) هەتا (2000) چەکداری بەئەزموونیان لەگەڵ بووە، سەرەڕای ئەو ئەفسەرە نیزامیە کوردە عێراقیانەی لەگەڵ بارزانییەکان هاتبوونە کوردستانی ئێران[875].

---

[873] - من مهاباد الدامية الى ضفاف اراس، ل36.

[874] - دکتۆر پێشتر لەسەر پەیوەندیی نێوان کۆمارو رووس پێچەوانەی ئەمەی وتووە کە دەڵێ: (مستەفا بارزانیش وەکو پیاوێکی چالاکی کۆمارو بیروباوەڕی ئایینی لە لای خۆیەوە دڵخۆش نەبووە بە پەیوەندیی کوردو سۆڤیەت). "وەرگێڕ".

[875] - بەڵگەمان لەوە زیاتر لەبەر دەستدا نییە لەسەر ناکۆکی نێوان ئەو دوو سەرکردەیە، بەڵام دووریش نییە ناکۆك بووبن، کەلتووری ناتەبایی لە نێوان سەرکردە تەقلیدیو ناتەقلیدیەکانی کورد زاڵترە لە کەلتووری تەبایی، ئەوەی هەیە لە مێژووی بزاڤی رزگاریخوازی کوردستان ئەو باوەڕەمان لەلا دروست

لەسەر داوای بارزانی سوپای کوردستان پێکهێنرا، خۆی بووە سەرپەرشتیاری سوپا، لە نیسانی 1946 سوپای کوردستان پێکهاتبوو لە (1500) چەکداری بارزانی و (3) تیپی نیزامی و (700) سەرباز، بارزانی لەو سوپایەدا نازناوی ژەنەراڵی پێدرا، قازی موحەممەد سەر بە ڕێبازێکی سۆفیگەری یان سەر بە هۆزێکی گەورە نەبووە، لە بەرانبەردا پشتی بە بارزانییەکان بەستبوو[876]. ئەم پەیوەندییە پتەوەش هەتا دوا ساتی ژیانی کۆمار مایەوە، لە 16ی کانوونی یەکەمی 1946، لەو کاتەی سوپای ئێرانی گەمارۆی مهابادیدا بارزانی سەرەڕای ئەو هەموو مەترسیە چووە سەردانی قازی موحەممەدو پێشنیاری بۆ کرد خۆی نەدا بەدەستەوەو لەگەڵیدا سەرکەوێتە سەر شاخەکان بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی هێزەکانی ئێرانی، بەڵام قازی موحەممەد بۆچوونێکی تری هەبووە[877]. ئەگەر وەکو هەندێ کەس دەڵێن: ناکۆکی هەبووە لە نێوان قازی موحەممەدو بارزانی ئەوە بارزانی داوای لە قازی نەدەکرد لە گەشتەکەیدا هاوڕێیەتی بکات، ئەمە لە کاتێکدا قازی موحەممەد هۆزێکی گەورە یان سوپایەکی نەبووە پشتی پێ ببەستێ، بەڵکو دڵسۆزیو جددیەتی لە قازی موحەممەد بینیوە، ویستویەتی ژیانی لە مردنی چاوەڕوانکراو بپارێزێ. لە کاتی دادگاییکردنی قازی موحەممەد بەوپەڕی راشکاوی وتبووی ئالآیەکە بدەنە بارزانی، چونکە پیاوێکی گەورەو رەوشت بەرزە[878]، ئەمەش قسەی مەسعود بارزانییە، کە باوکی بۆی گێڕاوەتەوە[879].

دەتوانین بڵێین ئەو ناکۆکیەی باس کراوە لە نێوان قازی موحەممەد و بارزانی ئەسڵی نییەو هیچ رۆڵێکی لە ڕوخانی کۆماری کوردستاندا نەبووە، بەڵکو قازی لە کاتی دادگاییکردنیدا زۆر بە توندی بەرگریی لە بارزانی کردووەو وتویەتی بارزانی: لەسەر خاکی کوردستانی ئێران بێگانە نییە، بەڵکو کوردەو مافی ئەوەی هەیە لە سنووری مهاباد

---

دەکات، ئەو سەرچاوانەی نووسەر دەیەوێ گومانیان بخاتە سەر ناکۆکی نێوان قازی موحەممەدو مستەفا بارزانی لەجێی خۆیدا بێت یان نا، ئەوە بەڵگەکانی نووسەر هێندە بەهێز نین ئەو تەمومژە بڕەوێنێتەوە. "وەرگێڕ".

[876] - نجفقلی: سەرچاوەی پێشوو، ل141.

[877] - پشدەری: سەرچاوەی پێشوو، ل91.

[878] - کیومرس: سەرچاوەی پێشوو، ل5.

[879] - مسعود البارزانی: سەرچاوەی پێشوو، ل39.

لێرە یان لە کوردستانی عێراق بژی، لەو کاتەی لە گرتووخانە بووە بارزانی پێی وتووە، کە دەیەوێ رزگاری بکات، بەڵام نەیویستووە.

قازی موحەممەد بەم گوزارشتەی خوارەوە باسی مستەفا بارزانی کردووە: باشە، بەڵام لە چەند رستەیەك زیاتر ناڵێم، مەلا مستەفا بە هەموو خاسیەتێکی پیاوەتیو خانەوادەیيو شەرەفمەندیو مرۆڤایەتیو ئازایەتیو لەخۆبردوویی باس دەکرێ، ئەوانە لە مێژوودا نەمرن، هەروەکو ئەو مسوڵمانانەی سەرەتای ئیسلامەتی بە ڕاستگۆییو پاکیو دڵسۆزی ناسراون بۆ ئایینو خەڵکی هەژار[880].

لە چاوپێکەوتنێکی رۆژنامەوانی لەگەڵ عەلی کوڕی قازی موحەممەد، کە بەشدار بووە لە ڕووداوەکان نکۆڵی لە هەموو ناکۆکیو لێك دابڕانێك کردووە لە نێوان باوکیو مستەفا بارزانیدا هەبووبێت، بۆ ئەو مەبەستەش بەسەرهاتێکمان بۆ دەگێڕێتەوەو دەڵێ: جارێکی لە نەغەدە لەلای کەسایەتیەکی ئەوێ میوان بووین، چوومە ماڵەکە بارزانی لەوێ میوان بوو، باوەشی پێداکردمو لەبەرم هەستاو شوێنی دانیشتنی بۆ دیاریی کردمو وتی: ئێمە قەرزاری ئێوەینو ئێوە نوێنەری پێشەوان[881]. لە هەموو ئەو بەڵگەنامانەی مەحمودی مەلا عیزەت بڵاوی کردۆتەوە لە سێ بەرگدا، بەڵگەی وا نابینرێ لەسەر ناکۆکیو دابڕانی نێوان ئەو دوو سەرکردە مێژووییە، بەڵام ئاساییە هەریەك لەوان بۆچوونی جیاوازی هەبووبێت لەسەر ئەو رووداوە گەرماو گەرمانەی رۆژگاری کۆمار. بارزانیو بارزانییەکانو ئەفسەرانی کورد رۆڵی شەرەفمەندانەیان گێڕا لە بەرگری لە کۆمار، هیچ بەڵگەیەکی وانابینین بەر لە ڕووخانی کۆمار باس لە ناکۆکیی نێوان قازی موحەممەدو بارزانی بکات، لەڕاستیدا هیچ هۆکارێکیش نابینرێ بۆ ناکۆکی، چونکە بارزانی دەیزانی ئەوان داوای حوکمی زاتی دەکەن، بارزانییەکانش ئێرانی نینو هەر دەبێ مهاباد بەجێ بهێڵنو بگەڕێنەوە کوردستانی عێراق، بۆ زیاتر دڵنیا بوونی خوێنەری بەڕێز لە ئابی ساڵی 1946 بارزانی هەمزە عەبدوڵڵای ناردەوە بۆ کوردستانی عێراق تا "پارتی دیموکراتی کوردستانی عێراق"[882] دابمەزرێنێتو لەسەر داوای خۆی مستەفا بارزانی بووە سەرۆکی حیزب.

---

[880] - کیومرس: سەرچاوەی پێشوو، ل5.

[881] - جان دۆست: سەرچاوەی پێشوو، ل4-5.

[882] - ئەوکات ناوی "پارتی دیموکراتی کورد" بوو، دوایی ناوی گۆڕا بۆ پارتی دیموکراتی کوردستان. "وەرگێڕ".

## عومەر خانی شكاك

پەیوەندیی عومەر خانی شكاك بە كۆماری كوردستانەوە بابەتێكی ترەو گرنگە لە مەسەلەی دامەزراندنو روخانی كۆماری كوردستان. عومەر خان سەرەڕای ئەوەی سەرۆكایەتی لقێكی گەورەی هۆزی شكاك بووە، پیاوێكی زیرەكو خاوەن قابیلیەتێكی دیبلۆماسیو كەسایەتی بەڕێزی ناو هۆزە كوردیەكان بوو، حكومەتی ناوەندی لە ڕۆژانی ململانێی لەگەڵ كۆمار گرنگی زۆری پێدابوو بەلای خۆیدا رایبكێشیێ، لەمەڕ هەڵوێستی عومەر خان لە بەرانبەر كۆمار بە لایەنی باشە یان خراپە زۆر وتراوە، قاسم ئیلخانی زادە وا باسی كردووە: (پیاوێكە بەس بیر لە بەرژەوەندیی تایبەتی خۆی دەكاتەوە، بە زوویی دۆستایەتی دەگۆڕیێ، ماوەیەك بەرانبەر پارەیەكی كەم كاری بۆ رووس دەكرد، لەگەڵ ئەوەشدا هێزە خێڵەكیەكەی هێنابووە بەرەی سەقزو بانە، بەڵام بەرانبەر ئەندازەیەك پارە هێزەكەی كشاندەوەو شەڕی نەكرد)[883].

كوڕی رەش عەلی قازی موحەممەد باوەڕی وایە عومەر خان هەتا كۆتایی بە دڵسۆزی كۆمار مایەوە[884]، قاسمی ئیلخانی زادە ئەندامی حكومەتەكەی مهاباد بووەو دڵڕەق بووە لەگەڵ قازی موحەممەد، ئەمەش بە هۆی ناكۆكیە تەقلیدیەكانی نێوان سەرۆكەكانی دیبوكریو قازی موحەممەد، بەڵگەنەویستە كە دۆستانی كۆماری خۆش نەویێ، عومەرخان هەتا بە ناچاری هێرشی بەرەی سەقزی هەڵوەشاندەوە، لە سەقز مایەوە[885]. لەوكاتەش قازی موحەممەد لە گرتووخانە بووە عومەر خان هەڕەشەی لە قونسوڵی ئەمریكی لە تەورێز كردووە، بەوەی ئەگەر: (قازی موحەممەد لە سێدارە بدریێ یان داوێك لەسەری بێتەوە ئەوە هەموو كوردستان دەكەنە ئاگر)[886]. سەرەڕای ئەو بایەخەی پێی درابوو عومەر خان پشتیوانی حكومەتی ئێرانی نەكردووە، هەتا ئەو كاتەی مستەفا بارزانی سەفەرە مێژووییەكەی بۆ ڕووسیا دەست پیێ كردووە، چونكە

---

-[883] FO, 371/52707, British Consulate General Tabriz. No, 30 September, 11.1946 .

[884]- جان دۆست: سەرچاوەی پێشوو، ل5.

[885]-FO, 371/52369 Tabriz Genral Consulate.. No, 30. 11-09-1946. Eagleton, pp.97-98.

[886] - FO, 371/52369 Tabriz Genral Consulate.. No, 30. 11-09-1946.

ئەوان بە خاکی شکاکدا تێپەڕین، عومەر خان لە ناوەڕاستی ساڵی 1946 گەیشتە ئەو باوەڕەی ناتوانێ پشت بە ڕووس ببەسترێ، ئەو وای دەبینی ئەو ئەفسەرە رووسانەی ماوەیەکە لە کوردستان ماونەتەوە بایەخ زیاتر بە ئازەریی دەدەن لە ورمێ نەك بە کورد، بۆیە ئەو پێی وابووە ئەوانە هەموویان لە ڕۆژهەڵات بە رەچەڵەك ئازەرینو ئەو رێککەوتنانەش کە لە نێوان ئازەربایجانو کوردستان واژۆ کراوە بە لای بەرژەوەندیی ئازەریەوەیە[887].

کەناڵی پەیوەندیی لەگەڵ "دوهلەر"ی یاریدەرەی قونسوڵی ئەمریکی لە تەورێز کردۆتەوەو هەروەها داوای لە ئینگلیز کردووە داوا لە قەوام سەڵتەنە بکەن مافی نەتەوایەتی کورد بدات، عومەر خان ویستویەتی سەرۆکەکانی بەختیاریو قەشقایی بهێنێتە ناو ئەو بەرەیەی قەوام سەڵتەنە کە لە دژی تودەو رووس درووستی کردبوو، عومەر خان پەیوەندیەکانی خۆی لەگەڵ ئەمریکییەکان تەرخان کردبوو بۆ بەرژەوەندیی کۆماری کوردستانو هانی داون پەیوەندییان لەگەڵ مهاباددا هەبێت، لە ئاکامی ئەمە بوو "ئەرشی رۆزفلت"ی یاریدەری پاشکۆی سەربازی ئەمریکی لە ئێران سەردانی کۆماری کوردستانی کردووە، ئەوەی شایانی باسە قازی موحەممەد ئاگادار بووە بە پەیوەندییەکانی عومەر خان، بەڵام دژی نەوەستایەوە[888].

لە کاتی هێرش سەر بۆ سەر تەورێز ساڵی 1946 عومەر خان چەکدارەکانی شکاکی نارد بۆ هاوکاریی هێزەکانی ئێرانی، بۆیە دەبینین لە نیسانی ساڵی 1947 "رازما"ی فەرماندەی هێزەکانی ئێرانی سوپاسی عومەر خانو رۆڵی ئەوی کردووە لە یارمەتییدانی حکومەت لە قەیرانەکەی ئازەربایجان[889]، بەڵام نووسەر نەیتوانیوە ئەوە دیاریی بکات کە چۆن عومەر خان یارمەتی حکومەتی داوە لە کاتی دەستپێکردنی هێرشی ئێران بۆ سەر مهاباد، بەڵام "کیومرس ساڵح" پەیامنێری رۆژنامەی لەشکری شاهەنشایی

---

[887]- O.S.S, Confidential files, memo, from Tehran to State Department. May, 9m1947.

[888] -O.S.S, Confidential files.Teleg,No, 776, October 14, 1946, from Vice Consulate, Tabriz. G.Doohler. Eagleton, p,110

[889] .-O.S.S, Confidential files.Teleg, 294 April, 18,1947. from Tehran Embassy to state Department

کوڕاسەیەکی لەسەر دادگاییکردنی قازی موحەممەدو کۆماری کوردستان داناوە و لەوێدا نامەی عومەرخانی هێناوە، کە لە کاتی کۆماری کوردستاندا نامەی بۆ شا نووسیوە، ، لەو نامەیەدا عومەر خان گوێڕایەڵی تەواوی خۆی بۆ شا بەدیار خستووە، بۆ دەرخستنی دڵسۆزیی خۆی بە چەند مانگێك بەر لە کەوتنی کۆمار دوو کوڕی وەکو بارمتە ناردۆتە تاران، لەو نامانەدا باسی لە بارودۆخی تاریکی کوردستان کردووەو داوای لە حکومەت کردووە بگاتە ئەوێ. ئەمەش بەڵگەیەکی ترە، کە وەکو زۆربەی سەرۆك هۆزە چالاکەکانی کورد لە هەوڵی پاراستنی پەیوەندییدا بووە لەگەڵ حکومەتی ناوەندیی، بۆیە گوێڕایەڵی بۆ کۆماری کوردستان جێگەی پرسیار بووە[890]. بەرلەوەی کۆتایی بە دوا وشە بهێنین لەسەر ئەندازەی دڵسۆزیی عومەر خان بۆ کۆماری کوردستان، پێویستە ئاگاداری ئەو بەڵگەنامەو نامە نووسراوانە بین، کە پەیوەستن بە پەیوەندیی عومەر خان بە شای ئێرانەوە.

## حەمە رەشید خانی بانەیی

حەمە رەشید خانی بانەش یەکێك بووە لە فەرماندە سەربازییە ناودارەکانی کۆماری کوردستان، لەناکاوو لە کاتێکی ناسکدا کۆماری کوردستانی بەجێهێشتووە، هەڵاتووە بۆ عێراقو لەگەڵ خۆیدا کۆمەڵێك بەڵگەنامەو تەقەمەنیو کەلو پەلی بردووە، هەندێك پێیانوایە ئەمە لێدانێکی گورچکبڕ بوو بۆ ورەی هێزە کوردییەکانو یەکێك بووە لە هۆکارەکانی کەوتنی کۆمار، حەمە رەشید سەر بە یەکێك لە خانەوادەکانی بەگزادەی لای بانەیە، خاوەنی لاپەڕەی پرشنگدار بووە لە شۆڕشو ڕاپەڕین دژ بە حکومەتی ئێرانی. لە ساڵەکانی 1925و 1929و 1931 دژی حکومەتی ئێرانی ڕاپەڕیوەو لە دوای هەریەك لەو ڕاپەڕینانە پەنای بردۆتە بەر عێراقو لەگەڵ هەندێ لە خزمەکانی لە عێراق ژیاوە، لەوێشەوە هەندێ جار بۆ کەرکووك و موسڵ دوورخراوەتەوە. لەوکاتەی عێراق بە هۆی شۆڕشی ڕەشید عالی گەیلانییەوە لە ساڵی 1941 تووشی بێسەرەوبەریی هاتووە، حەمە رەشید خان بە دەرفەتی زانیوە، هەڵاتووەو گەڕاوەتەوە

---

[890]- حقائق دفينة عن محاكمة الزعيم القاضي محمد و سيف القاضي "ترجمة عبدالله بابان" خةبات، عدد (4576)، ونشرت الترجمة الكردية للنص في (خةباتي قوتابيان) العدد (37)، في 2000/8/14.

بۆ ئێران. لەگەڵ گەیشتنەوەی بۆ ئێران بانگەوازێکی بۆ هێزەکانی ئێرانی کردووە خۆیان بدەن بەدەستەوە، بەمەش توانیویەتی دەستبگرێ بەسەر بانەو دەوروبەری. هێزەکانی ئێرانی بە فەرماندەی "حەسەن ئەرفەع" لە هەوڵدا بوو ئەو ناوچانە بگێڕنەوە ژێر دەسەڵاتی ئێران، بەڵام سەرنەکەوتوون. لە ساڵی 1943 هێزەکانی ئێرانیی ناچار بوون وەکو حاکمی بانە دان بنێن بە دەسەڵاتی حەمە رەشید خان، هەتا بە ماوەیەکی کەم حەمە رەشید دەستی گرت بەسەر بانە و سەردەشت و سەقز، رادیۆیەکی محەلیی هەبوو، وەکو حکومەت هەڵسوکەوتی کردووە، حکومەتی ئێرانی نیگەران کردووە، تا ناچار بووە سوپایەکی گەورەی بنێرێتە سەر حەمە رەشید خانو جارێکی تر لە ساڵی 1944 ناچاری بکات هەڵبێت بۆ عێراق، بەڵام لە دوای راگەیاندنی کۆماری کوردستان جارێکی تر گەڕایەوە کوردستانی ئێران. لە سەرەتاوە رووس لێی بە گومان بووە، بەڵام ئەو گومانە رەوییەوە، لە کۆماری کوردستان رێزی لێگیراوەو کراوە بە فەرماندەی هێزەکانی بۆکانو دەوروبەریو یاریدەدەری مستەفا بارزانیو پلەی ژەنەراڵیان پێداوە.

لە دوای ئەوەی حەمە رەشید خان لە پێناو بەرگریی لە کۆماری کوردستان تووشی گرفتو ناخۆشی زۆر هات، لە ناکاو لە تشرینی یەکەمی ساڵی 1946 لە بۆکان هەڵاتو کۆمەڵێك بەڵگەنامەو سامانی کۆماری لەگەڵ خۆی بردو دای بە دەسەڵاتدارانی عێراقی، ئەوانیش دووریانخستەوە بۆ رووبادی لە باشووری عێراق[891].

ئەو خستنەڕووە کورتە لەسەر ژیانی حەمە رەشید خان ئەندازەی خواستی ئەو پیاوەمان بۆ بەدیار دەخا، ئەو پیاوە لە کۆماری مهاباد بۆچی وەکو سیاسییەك ئەو کارەی کرد، ئەدی بۆچی ئینگلیز ئەگەر پیاوی ئەوان بووبێت لەو ماوەیەدا دەرفەتی پێدا ئەو هەموو جوڵانەوەیە لە دژی حکومەتی ئێرانی بکات، لەکاتێکدا لە ساڵانی 1925ـ1946 ئینگلیز دەسەڵاتی تەواوی بەسەر عێراقدا هەبووە، ئەوانەی لەسەر حەمە رەشید خان نووسیویانە دەڵێن: پیاوێکی خێڵەکی بووەو مەبەستی بەدەستهێنانی ئامانجی تایبەتی خۆی بووە.

پشدەری پێیوایە ئەو کارەی حەمە رەشید خان لە کۆماری کوردستان هاوشێوەی هەوڵی ئەو سەرۆك هۆزانەیە، کە لە نیوەی دووەمی ساڵی 1946 ناویانە بۆ دۆزینەوەی

---

[891] - مەحمودی مەلا عیزەت: بەڵگەنامە، ل723-724.

بەدیلێکی تر، کە زەمانەتی بەرەژەوەندیە خێڵەکیەکانیان بکات، هەڵاتنی حەمە رەشید خان لە دوای بێئومێدی بووە لە هاوکاریی رووس بۆ کوردان[892]. بەڵام شەمزینی باوەڕی وایە هەڵاتنی حەمە رەشید خان لە بنەڕەتەوە پیلانی ئینگلیز بووە بۆ دروستکردنی کۆسپ لە بەردەم نەخشەی سۆڤیەتی لە باکووری ئێران، ئەوەی پێی سپێردرابوو ئەنجامی داو گەڕایەوە عێراق[893]، ئەم لێکدانەوەی دوایی هەندێ بابەتییە، چونکە ئینگلیز سوور بووە کە نەیەڵێ دەسەڵاتی رووسی بگاتە ناوچە سنووریەکانی عێراق، حەمە رەشید خانیش بۆ ماوەیەك ئەو کارەی ئەنجام دا، هەژار لە ڕەشید خانەوە دەگێڕێتەوە، کە ئەو بە سەرکردایەتی کۆماری کوردستانی وتووە: (ئینگلیز ناردومی هەتا لە ئێوە و لە سۆڤیەتی تێك بدەم، بەڵام بەڵێن دەدەم گوێڕایەڵیان نابم)[894]، ئەم داننانەش دوو مانا هەڵدەگرێ:

یەکەم: ئینگلیز بۆ پیلانگێران لەسەر رووس‌و تێکدانی کۆماری کوردستان ناردویەتی، بەڵام کە هاتۆتە کوردستان بەو گەرم‌و گوڕیە لەلایەن بەرپرسە کوردەکانەوە بە شێوەیەکی چاوەڕواننەکراو پێشوازیی لێکراوە، لەوکاتەش کاریگەری رووسی بەو ئەندازەیە نەبینیوە، کە ئینگلیز پڕوپاگەندەی بۆ کردووە لەسەر کۆماری کوردستان، هەستی بە تاوان کردووەو دانی بە هەڵەی خۆیدا ناوە.

دووەم: هەر لە بنەڕەتەوە ئینگلیز نەیانناردووە، بەڵکو ویستویەتی بەو بایەخدانەی ئینگلیز ئاستی کۆمەڵایەتی خۆی پێ بەرز بکاتەوە، بۆیە بوختانی بە خۆی کردووە بەوەی پەیوەندیی لەگەڵ ئینگلیز هەبووە، ئەمەش دەگونجێ، چونکە ئینگلیز هێندە فەقیرحاڵ نەبووە کەسێکی وەکو رەشید خان بۆ کارێکی واگرنگ بنێرن، کە هەر لە سەرەتاوە خۆی ئاشکرا بکات، هەروەها هیچ بەڵگەیەکی بەریتانی نابینرێت لەسەر رۆڵی حەمە ڕەشید خان لە کۆماری کوردستان.

مەحمودی مەلا عیزەت ئەم بابەتەی حەمە رەشید خانی بە درێژی چارەسەر کردووە، ئێمە لێرەدا کورتی دەکەینەوە. مەلا عیزەت لە میرزا مەنگوڕییەوە "سکرتێری

---

[892] - پشدەری: سەرچاوەی پێشوو، ل75-76.

[893] - شەمزینی: سەرچاوەی پێشوو، ل165.

[894] - هەژار: سەرچاوەی پێشوو، ل86-87.

حەمە ڕەشید خان" دەگێڕێتەوە، کە ئەفسەرە کوردەکانی ناو تیپی بارزان ڕاپۆرتیان لە دژی حەمە ڕەشید خان نووسیوە بۆ شێواندنی کەسایەتی ئەوو ناردوویانە بۆ مهاباد، لەسەر چەند بابەتێکیش ناکۆکیی لە نێوان ئەو و مستەفا بارزانیدا هەبووە، زەقترینیان مەسەلەی ڕزگارکردنی سەقز بوو، بارزانی ویستویەتی پەلەی تێدا بکرێو حەمە ڕەشید خان خۆی خافڵاندووە، حەمە ڕەشید خان ویستویەتی پشتەوە مسۆگەر بکات نەوەکو تووشی هێرشی هۆزی دیبوکری بن، کە جێی مەترسی بووە لە پشتەوە بارەگاکانیان داگیر بکەن، هەروەها هەندێ لە بەرپرسانی کۆمار تاوانو هەندێ شتی تریان داوەتە پاڵ حەمە ڕەشید خان، وەکو: کۆکرنەوەی بەرهەمی کشتوکاڵیو سەرانەی نایاسایی لەو هۆزانەی پشتگیرییان لێ نەکردووە، یان ماڵو سامانی خەڵکی دەست بەسەردا گرتووە، یان لە شەڕی مامەشە بە ئانقەست پشتیوانی لە مستەفا خۆشناو نەکردووە لە دژی هێزەکانی ئێرانی هەتا زیان بە تیپی بارزانییەکانی ناکۆك لەگەڵ بکەوێت، پەیوەندیی نهێنی لەگەڵ حکومەتی ناوەندیدا هەبووەو بە مەبەستی بەرژەوەندیی تایبەت لەگەڵیاندا کەوتۆتە گفتوگۆ، هەروەها پەیوەندیی کردووە بە عەلی حیجازی بەرپرس لە وەزارەتی ناوخۆی عێراقی، بەڵگەنامەی لەسەر کۆمار داوەتە ئینگلیز. مەحمودی مەلا عیزەت لەسەر زاری حەمە ڕەشید خانەوە بۆمان دەگێڕێتەوە، کە چۆن بەرگریی لە خۆی کردووە لە بەرانبەر ئەو تاوانانە، سەبارەت بە وەرگرتنی باجی نایاسایی ئەوە لەبەر ناچاریی بووە، کە پێویستی بە تەقەمەنیو خواردن هەبووەو حکومەتی کوردستان لە ماوەی 9 مانگ تەنیا خواردن و تەقەمەنی 45 ڕۆژی بۆ دابین کردووە، بەڵام لە بابەت هاوکارینەکردنی هێزەکانی مستەفا خۆشناو لە شەڕی مامەش، ئەوە بەهۆی مەترسی هۆزی دیبوکریەوە بووە بۆ سەر بارەگاکانی[895].

بارزانیش لەلای خۆیەوە گومانی هەبووە لە حەمە ڕەشید خانو داوای لە سەرکردایەتی کۆمار کردووە لەو بابەتەوە لێکۆڵینەوە بکەن. دەگونجێ هۆی ڕاکردنی بۆ عێراق بە هۆی ئەو مەترسیەوە بووبێت، نەوەکو بارزانی نەخشەی هەبێتو هێرشی بکاتە سەر[896].

---

[895] - مەحمودی مەلا عیزەت، بەڵگەنامەو...، ل624-628.

[896] - عولە: سەرچاوەی پێشوو، ل75.

حکومەتی ئێرانیش لەلای خۆیەوە نیگەران بووە لە گەڕانەوەی حەمە رەشید خان بۆ ئێران، ئەم نیگەرانییەی لەلای زۆربەی بەرپرسانی ئینگلیز باس کردووە، ئینگلیزەکانیش بە تەواوی نکۆڵییان کردووە، کە ئاگاداری گەڕانەوەی ئەو بن بۆ ئێران.

بۆ زیاتر روونکردنەوەی راستی پەیوەندییەکانی حەمە رەشید خان و ئینگلیز و حکومەتی عێراقی لە خوارەوە چەند دەقێك لەو بەڵگەنامانە دەخەینە ڕوو، کە پەیوەستن بەو بابەتەوە:

## بەڵگەنامەکان

### وەزارتی دەرەوە، پاشکۆی بەڵگەنامەی ژمارە FO, 624/1891
### هێژای بەختەوەر باڵیۆزی بەریتانیا/ بەغدا

(لەگەڵ ئەوەدا لە ڕاپۆرتێکی تر تێبینی خۆمتان لەسەر بارودۆخەکە بۆ دەنووسم، لەو کاتەی لە سلێمانی بووم، بە شێوەیەکی گشتی لەگەڵ میجەر هیتشاو گفتوگۆمان کرد لەسەر مەسەلەی کورد، بەڵام خاڵێکی تر هەیە بە پێویستی دەزانم بیزانن، ماوەیەکە حەمە رەشید خان، لە دیوی ئێران لەسەر سنوور دەژی، هەر کە گەیشتە ئەویّ بیستم داوای لە بەرپرسانی عێراقی کردووە رێگەی پیّ بدەن بگەڕێتەوە عێراق. دەڵێن وەزیری ناوخۆی عێراقی بە باشی وەڵامی داوەتەوەو دڵنیای کردووە، لەو کاتەی دەگەڕێتەوە بۆ عێراق بێخەم بیّ لە ژیانی خۆی، بەڵام دواتر لە میجەر هیتشاوم زانی، کە موتەسەریفی سلێمانی هانی حەمە رەشیدخانی داوە بگەڕێتەوە، ئەویش ئامادەیی گەڕانەوەی دەربڕیوە بەو مەرجەی ژیانی سەلامەت بێتو حکومەتی عێراقی مەڵبەندی پۆلیس لەو ناوچانە بکشێنێتەوە، کە دەکەونە ژێر دەسەڵاتی ئەو لەناو سنوری عێراق، حکومەتی عێراقی ئەو مەرجانەی قبوڵ نەکردووە، بەڵام گفتوگۆکان هەر بەردەوام بوون، خاڵێکی گرنگ هەیە، هاوڕێیەکی کوردی میجەر هیتشاو لەگەڵ میجەر برادبۆرن دواوە تا قەناعەتی پیّ بکات، ئینگلیز رازی بێت بە گەڕانەوەی حەمە رەشیدخان، بەڵام میجەر برادبۆرن لەو بارەیەوە نکۆڵی کردووە لەهەر ئاماژەیەك لەسەر ئەو بابەتە گوترابێت، ئەو مەسەلەیە بە تەنیا خراپ حاڵیبوون بووە، بەڵام کێشەکەی پێگەیشتووەو هاوڕیّ کوردیەکەی دەڵیّ: حەمە رەشیدخان نامەیەکی بۆ ناردم لە نامەکەدا هاتووە، کە ئامادەیە فەرمانەکانی ئینگلیز جێبەجیّ بکات، بەڵام چەند مەرجێکی دانابوو بۆ

گەڕانەوە، نە منو نە میجەر هیتشاو بە گۆڕانکاری لەو مەسەلەیە دڵخۆش نین، پێشنیارم بۆ میجەر هتشاو کرد بە هاوڕێ کوردیەکەی بڵێ: ئەو ئاگادار بکاتەوە، کە ئینگلیز ناتوانێ دەست لەو مەسەلەیە وەربدات، ئەگەر حەمە رەشیدخان دەیەوێ بگەڕێتەوە با بە تەنیا ئەو مەسەلەیە لەگەڵ بەرپرسانی عێراقی باس بکات. ئەوەی لای ئینگلیز جێی بایەخە بڵاوبوونەوەی ئاشتیو ئارامیە لەکوردستانو هەموو جیهان. سەرەڕای ئەوەی هاوڕێیەکەی میجەر هیتشاو لە ناوچەیەکی کوردیی دوور دەژی پەیوەندیی پێوەکردنی ئاسان نییە، بەڵام ئێمە لە دوای وتوێژی نێوانمان ڕێککەوتین نامەیەك بەو ناوەرۆکە بنێرین، لە سەرەتاوە میجەر هیتشاو دوودڵ بوو لە ناردنی نامەکە، چونکە لەو باریەوە فەرمانی روونو ئاشکرای پێگەیشتووە، کە دەست نەخاتە ئەو بابەتانەی پەیوەستن بە کێشەی کوردەوەو ئەمە لێ بگەڕێ بۆ کاروباری ناوخۆی عێراق، سەرەڕای ئەوەی کە منیش لەگەڵ بۆچوونی میجەر هیتشاودام لەسەر ئەو مەسەلەیە، بەڵام بە پێویستی دەزانم سنوورێك بۆ ئەو پڕوپاگەندانە دابنێم، کە گوایە ئێمە وەکو ناوبژیوانی نێوان حکومەتی عێراقو حەمە رەشید خان کار دەکەین، بۆیە پێشنیارم کرد ناوەرۆکی ئەو نامەیە روونو ئاشکرا بێت، کە ئینگلیز حەز ناکات هیچ بەڵێنێك بە کەس بداتو نامەش بۆ میجەر هیتشاو نێردراوە، هەتا بۆ هاوڕێ کوردییەکەی بنێرێ، بەڵێنم بە میجەر هیتشاو دا لە حاڵەتی هەر کێشەیەك لەو بارەیەوە پشتیوانی لە هەڵوێستەکەی دەکەم.

**271 نیسانی 1946**

**بە ئیمزای دیگبۆرن**

**ئەفسەری سیاسیی لە عێراق.**

# له حەمە رەشید خانی کوردییەوە

## FO. 624/189

ژمارە 46/ 21/ 112

18ی ئۆکتۆبەر 1946

**کۆنووسی کۆبوونەوە ـ سلێمانی**

لە حەوتی ئۆکتۆبەر هێژا دیگبۆرن سەردانی کردم و پێی ڕاگەیاندم، کە سەرۆك وەزیرانی عێراق داوای گفتوگۆی لێ کردووم لەسەر هەندێ مەسەلە، یەکەم پەیوەست بووە بە حەمە رەشید خان، سەرۆك وەزیران هەواڵی دابوو بە دیگبۆرن، کە قەناعەتی تەواوی هەیە حەمە رەشیدخان بەکرێگیراوی ئینگلیزە، هەر ئینگلیز ناردوویانە بۆ ئێران، لەو باوەڕەدا بووە حەمە رەشید کارە گرنگەکەی ڕاپەڕاندووەو ئێستا هەر ئینگلیز دەیەوێ بیگەڕێنێتەوە.

دیگبۆرن لە وەڵامی سەرۆك وەزیرانی عێراقدا وتبووی ئەو تێڕوانینەت هەڵەیەو کارێکی نابەجێیە، هەروەها دیگبۆرن هەواڵی دابووە سەرۆك وەزیرانی عێراقی، کە ئەو ئاگادارە بەریتانیا لە بنەڕەتەوە نیگەران بووە حەمە رەشیدخان چۆتە ئێرانو چەندین جار پرسیاری کردووە لە شوێنی نیشتەجێ بوونو کاتی گەڕانەوەی، ئەگەر نوێنەرایەتی حکومەتی بەریتانی کردبایەو بە شوێنی ئەوی زانیبا ئەوە چەندین جار پرسیاری ئەوی نەدەکرد.

پێکەوە لەگەڵ هێژا دیگبۆرن ڕێك کەوتین لەسەر وەڵامێك بۆ سەرۆك وەزیرانی عێراقی، پێم وت: پێویستە هەموو لایەنە پەیوەندیدارەکان بەوە بزانن، کە ئامانجی سەرۆك وەزیران لە وروژاندنی ئەو بابەتە ئەوەیە، بەر لە دەربڕینی رەزامەندیی لەسەر گەڕانەوەی بۆ گوندەکەی خۆی لە ناوچە سنوورییەکان بزانێ ئایا حەمە رەشیدخان لە بەرژەوەندیی ئێمە کار دەکات یان نا؟ ئەو کات ئینگلیز سوود لە دەسەڵاتی ئەو دەبینێ.

دڵنیام کردەوە، کە ئەو مەسەلەی قسەی لێ دەکەین مەسەلەیەکی ناوخۆیی عێراقییە و من ناتوانم بچمە ناو بابەتەکەوە، بەڵام لەگەڵ سەرۆك وەزیران جەختم لەسەر ئەوە کردەوە، ئایا حەمە رەشیدخان پیاوێکی جێی متمانەیە یان نا؟ ئەگەر رای من

بپرسێ باوەڕم وایە، کە ئەو کەسە نییە بە تەواوی پشتی پێ ببەسترێ، چونکە پێشتر پەیمانی هەڵوەشاندۆتەوەو بێ ئاگاداری کەس لە کەرکووکەوە هەڵاتووە.

**ئیمزا / رائید هیتشاو**

**ئەفسەری سیاسی، سلێمانی**

## FO. 624/89
## (بەڵگەنامەی کۆنووسی کۆبوونەوە)

**هێزا سەعادەتی باڵیۆزی بەریتانی ـ بەغدا**

(عەبدولحەمید رەفعەت بەڕێوەبەری گشتی لە وەزارەتی ناوخۆی عێراق هەواڵی پێدام، کە لەوکاتەی لە ئاهەنگی هێزا واکر بووین، لە 14ی ئەیلول حەمە رەشیدخان ئەوکات لە بەغدا بووە، بەبێ مەرج خۆی داوە بە دەستەوە، عەبدولحەمید دەڵێ: خۆزگە دەخوازم ئێرانییەکان رێگە بە حەمە رەشیدخان بدەن بگەڕێتەوە گوندەکەی خۆیو کوردی عێراقو ئێران لێك جیا بکاتەوە. بڕوام وایە حەمە رەشیدخان رێگەی پێ بدەن بگەڕێتەوە نیشتیمانەکەی خۆی، ئێرانییەکان رازی دەکات.

ئەوەی پەیوەندی هەیە بە بارودۆخی گشتییەوە ئەوە ئێرانییەکان هیچ جۆرە یارمەتیەك یان زانیاریان نەداوە بە عێراقییەکان، بەڵام بە لایەنی کەمەوە ئاگادارین کە ئێرانییەکان پێشنیاری پێکهێنانی ئەفسەری پەیوەندییان کردووە لەسەر سنوور، بەڵام عێراق هیچ وەڵامی ئەو پێشنیارەیان نەداوەتەوە، باوەڕم نییە شتێك هەبێت لەوبارەیەوەیە ئێمە بتوانین پێشکەشی بکەین.

بەڕێوەبەری گشتی نیگەرانی خۆی لە مەبەستی رووسی نیشان دا لەو کارە "بۆ کورد. وەرگێڕ"، بەڵام بە درێژی قسەیان نەکردووە. بەرێوەبەری گشتی وتی: 120 پیاو لە لایەنگرانی مستەفا بارزانیو 300 خێزان سنووریان بڕیوەو لە ئێرانەوە گەڕاونەتەوە بۆ عێراق، ئەوانە ئەگەر قبوڵ بکرێن دەگەڕێنەوە، عێراقیش خواردنو جلوبەرگی پێ دەدا، مەلا مستەفاو شێخ ئەحمەد لە ناکۆکیدانو رووسیاش هەوڵی پێکهێنانەوەی داوە.

**واژۆ/ رائید دیگبۆرن**

**8 ی تشرینی یەکەمی 1946**

خوێندنەوەی ئەو بەڵگەنامانە چەند پرسیارێك دەوروژێنێ: ئایا حەمە رەشید بەبێ ئەوەی ئینگلیز داوای لێ بکات گەڕاوەتەوە بۆ عێراق؟ بۆ رێکخستنی گەڕانەوەی یەکەم جار پەیوەندیی بە کێوە کردووە؟ چۆنو لەبەر چی بەرپرسانی عێراق رێگەیان پێدا بگەڕێتەوە عێراق؟

ئێمە لە خوێندنەوەی ئەو بەڵگەنامانەی سەرەوە سروشتی ئەو کارە ناخوێنینەوە، کە بە حەمە رەشیدخان سپێردرابێت لە کوردستانی ئێران. بۆیە من بە لای پشتگیریی بۆچوونەکەی مەحمودی مەلا عیزەتەوەم، بەوەی حەمە رەشید خان سوودی لە بارودۆخی شەڕی دووەمی جیهانی بینیوەو بەبێ ئاگاداری ئینگلیز هەڵاتووە بۆ ئێران، بەڵام ئەگەری ئەوە هەیە ئەفسەرە ئێرانیو عێراقیەکان بەبێ ئاگاداری ئینگلیز رێوشوێنی گەڕانەوەکەیان بۆ عێراق بۆ رێك خستبێت، چونکە هەردوو وڵات لە ئینگلیز بە گومان بوون بەوەی بۆ بەرژەوەندییەکانی خۆی رێوشوێنی هەڵاتنی حەمە رەشید خانی دانابێت. لە کاتێکدا لە زۆر بۆنەکاندا ئێران لە جیاتی دەسەڵاتدارانی عێراقی داوایان لە ئینگلیز کردووە حەمە رەشیدخان ناچار بکات بگەڕێتەوە بۆ عێراق، ئەمەش هەوڵێکی ئێرانی بووە بۆ لەتکردنی ریزەکانی کورد.

شایانی باسە حەمە رەشیدخان لە کوردستانی عێراق زەوی هەبووە و خێزانەکەی لە عێراق ژیاوە. لە نیسانی 1946 ژەنەراڵ جیهانباری فەرماندەی هێزەکانی ئێرانی لە ناوچە کوردیەکان بە قونسوڵی بەریتانی لە کرماشانی وتبوو، کە زۆر پێویستە ئینگلیز فشار بخاتە سەر دەسەڵاتدارانی عێراقی هەتا حەمە رەشید خان هان بدەن بگەڕێتەوە بۆ عێراق، چونکە مانەوەی بەو هێزەوە هاندەرێك بووە بۆ کورد هێرش بکەنە سەر سەقزو بانەو سەردەشتو حکومەتی ئێرانی ناچار بکەن هێزەکانی لە ناوچە سنووریەکانی عێراق بکێشێتەوە، ئەگەر ئەو ناوچانەش کەوتنە ژێردەسەڵاتی کورد ئەوە بەرژەوەندییەکانی ئینگلیز دەکەوێتە مەترسیەوە، چونکە ئەو کوردە عێراقیانەی لەگەڵ مستەفا بارزانین دەشێ بگەڕێنەوە عێراقو سەرلەنوێ هەڵبگەڕێنەوە[897].

وا بەدیار دەکەوێ لە نیسانی 1946ەوە حەمە رەشید خان دەستی کردووە بە وردبوونەوەو هەنگاونانی تازە بە جۆرێ بەرژەوەندیە تایبەتیەکانی بپارێزێ، هەر لەو

[897]- W.O/327/829. Teleg. No. 26,February 4,1946. From Tehran Embassy to Foregn Office. Teleg No, 54. April $5^{th}$. 1946.

مانگەدا قسەی لەگەڵ دەسەڵاتداران کردووە، ئامادەیی خۆی نیشان داوە، کە کۆماری کوردستان بەجێبهێڵێ و پەیوەندیی بکات بە دەسەڵاتی ناوەندیی، بە مەرجێ بیکەنە حاکمی بانەو موچەی مانگانەی 170 هەزار تومەنی بۆ دیاریی بکەن، ئێرانییەکان بەمە رازی نەبوون، چونکە متمانەیان پێنەکردووە، بەخشینی ناوچە سنووریەکانیش ئەوکات بۆ ئێرانییەکان مەسەلەیەکی ترسناك بووە، گەڕانەوەی دەسەڵات بۆ ناوچە کوردیەکان لە خزمەتی ستراتیژیەتی ئێرانیدا نەبووە[898].

لەو باوەڕەدام ئەو راپۆرتە راست بێت، چونکە مانگی نیسان سەرەتای قەیرانی کۆماری کوردستان بوو، سەرۆك هۆزە چالاکەکانی ناوچەکە بۆ مەبەستی پاراستنی بەرژەوەندیەکانیان بە نهێنی کەوتبوونە کردنەوەی کەناڵی نهێنی لەگەڵ دەسەڵاتی ناوەندیی، هۆکارێکی تریش هەیە شایانی باس بێت لە دابڕانی نێوان حەمە رەشیدخان‌و سەرکردایەتی کۆماری کوردستان، ئەویش نیگەرانی حەمە رەشیدخان بووە بەو گفتوگۆیانەی قەوام سەڵتەنەو قازی موحەممەد، لە مانگی تەمموز، قازی موحەممەد لە تاران گەڕایەوەو حەمە رەشیدخان چووە سەردانی لە مهاباد، بینی قازی ئاڵاو نەخشەی کوردستانی لەسەر مێزەکەی لابردووە، قازی موحەممەد پێی راگەیاند، کە حکومەتی ئێرانی ئامادە نییە هیچ ئیمتیازێك بە کورد بدات بێجگە لە گۆڕینی مهاباد بۆ ویلایەتێکی تایبەت‌و دانانی 2500 جەندرمەی کوردی، ویلایەتەکەش دەکەوێتە ژێر سەرپەرشتی سەیفی قازی بە مەرجێ هێزەکانی ئێرانی بگەڕێنەوە مهاباد و دەوروبەری، حەمە رەشیدخان پرسیاری لەمە کرد، کە بۆچوونی قازی موحەممەد لەوبارەیەوە چییە؟ قازی موحەممەد وەڵامی دابۆوە، کە لە قبوڵکردن بەولاوە هیچ چارەیەکی تری نییە، حەمە رەشیدخان بەمە نیگەران بووە[899].

وادەردەکەوێ حەمە رەشیدخان هەستێکی سیاسی وردی هەبووێت بۆ وەرگرتنی هەڵوێستی براگماتیانەی خۆی، توانای هەبووبێت بە لێکدانەوەی رووداوەکان‌و سەرنجی براگماتیانە، درکی بەوە کردووە، کە چارەنوسی نوشستی کۆماری کوردستان چاوەڕوانکراوە، بەر لەوەی کار لە کار بترازێ پلانی دانا بگەڕێتەوە بۤ عێراق، ئاگادار

---

[898] - W.O/327/829. Teleg. No. 26,February 4,1946. From Tehran Embassy to Foregn Office. Teleg No, 54. April 5th. 1946 .

[899] - پشدەری: سەرچاوەی پێشوو، ل70-73.

بووه بەوەی ئینگلیزەکان رێ لە گەڕانەوەی ناگرن، هەڵاتنی لەناکاویش خۆدزینەوە بووە لە ڕووبەڕووبوونەوەی چاوەڕوانکراوی لەگەڵ هێزەکانی بارزانی، هەرچۆنێك بێت ئەو مانگەی دوایی حەمە رەشیدخان لە بۆکان لە دژی ناحەزەکەی جەنگاوە، بەتایبەتیش لەو ماوە لێکدابڕانی تەواو کەوتبووە نێوان ئەو و هێزەکانی کۆمار بە فەرماندەیی مستەفا خۆشناو. ئەمەش توانای زۆری کۆماری بەفیڕۆدا، هەروەها هەڵاتنی لەناکاوی کاریگەریی زۆر خراپی هەبووە لەسەر ورەی هێزەکانی کورد، لە کاتێکدا چەندین هۆزی تر هەبوون گوێڕایەڵیی لەرزۆکیان هەبووە بۆ کۆمارو هەڵاتنی ئەمیش دەروازەیەك بووە بۆ ئەوانەو بای پێچەوانەی بەرژەوەندیی کۆمار دەستی پێکرد.

## هۆکاری ئابووری‌و کەوتنی کۆمار

هۆکاری ئابووری رۆڵێکی گەورەی بینیوە لە کەوتنی کۆماری کوردستان، کۆمار لە بارودۆخێکی زۆر قورسدا دەژیا، ئەوکات کوردستان‌و تەنانەت هەموو جیهان تازە بە هۆی شەڕی دووەمی جیهانییەوە کاول ببوو، خەڵك تووشی برسیەتی‌و مردنی بەکۆمەڵ ببونەوە، خواردن کەم ببۆوەو دەست نەدەکەوت، ماوەیەك حکومەتی ناوەندیی‌و دواتر رووس‌و ئینگلیز خواردنیان دابەشی دەکرد، بە برسیکردنی ئەوکات چەکی تەقلیدی هەموو هێزە ئەورووپیەکان بووە، رووسیاش لەو رێسایە دەرنەچووە، ئەفسەرە سۆڤیەتییەکان سەرپەرشتی دابەشکردنی شەکرو چاو و گەنم‌و سیگاریان کردووە. ئەگەر لە هێرش کردنە سەر هێزەکانی ئێرانی ملکەچی فەرمانی ئەوان نەبوونایە ئەوە یارمەتییەکانیان دەبڕین[900].

کۆماری کوردستان سەرچاوەی دارایی نەبووە هەتا خەرجی بکات بۆ دامەزراوە تازەکانی دەوڵەت لە سوپاو کاربەدەست و فەرمانگەکان، تاکە سەرچاوەی سنووورداری میزانییەی دەوڵەت باج و گومرگ و داهاتی توتن‌و ئابوونەی ئەندامانی "حدك" بوو، سەبارەت بە داهاتی گومرگ زۆربەی نەدەگەیشتە کۆمار، چونکە حکومەت گەمارۆی خستبووە سەر کۆمارو بازرگانی لەگەڵ ناوچە ناکوردییەکانی تردا نەبووە، هەروەها خاڵی سنووری "مەڵبەندەکانی گومرگ" بەدەستی هێزەکانی کۆماری کوردستانەوە

---

[900] - مەحمودی مەلا عیزەت: سەرچاوەی پێشوو، ج3، ل723-724.

نەبووە، سەبارەت بە باجی ناوخۆ، ئەوە حکومەت یاسای باجی لەو ناوچانە جێبەجێ کردووە، کە لەژێر دەسەڵاتی خۆیدا بوون، بەڵام کەمی دەگەیشتە دەست، چونکە کورد بە هۆکاری توندوتیژی نەبێت لەگەڵ باجدان رانەهاتبوو، هەروەها خۆی لەگەڵ هەستی هاووڵاتیبوون رانەهێنابوو، لە بنەڕەتەوە بەیەکسانی لەلایەن حکومەتەوە مامەڵەی لەگەڵ نەکرابوو، خوی بە بەرتیل و خۆدزینەوە لە باجدان گرتبوو.

رووس لە سەدا پێنجی داهاتی کشتوکاڵی لە ناوچە کوردیەکانی ژێردەسەڵاتی خۆی وەردەگرت، وەکو بەخشین بۆ مانگی سووری رووسی، حکومەتی کوردیش سەرانە یان غەرامەی دارایی خستبووە سەر دەوڵەمەندانی کوردو هەندێ هۆزی دژ بە حکومەتی کوردستان هەتا بیکاتە خەرجیی بۆ هێزەکانی پارێزەری کۆمار. بەهۆی نەبوونی یاسا یان نەرێتی پیادەکراو زۆر جار ئەو رێگەیەی باجی پێ کۆدەکرایەوە تووشی گێروگرفتی کردبوون، هەروەکو لەسەر دەستی حەمە رەشید خان روویدا[901].

حەزم کرد ئەوە بۆ خوێنەرانی بەڕێز روون بکەمەوە، کە نیوەی خاکی دەوڵەمەند بە کشتوکاڵ لە دەرەوەی دەسەڵاتی حکومەتی کوردستاندا بووە، یان وەکو شار و گوندەکانی بانەو سەردەشتو سەقز، کە لە ڕووی ئۆقرەییەوە کەوتبوونە باری نە شەڕو نە ئاشتی، هەموو ئەو بارودۆخە وەبەرهێنانی لە سنووری کۆمار وەستاندبوو، بۆ زیاتر گەمارۆ خستنە سەر کۆمار ئەفسەرە ئینگلیزەکانیش لەلای خۆیانەوە هانی دەرەبەگە کوردەکانیان دەدا، کە خەڵکی ژێردەسەڵاتی خۆیانو شارە کوردیەکان بەروبوومەکانیان بەتایبەتی گەنم بە کۆماری کوردستان نەفرۆشن[902].

حکومەتی کوردستانیش دەیزانی لە ڕێگەی سەپاندنی گەمارۆی ئابووریەوە لە هەوڵی خنکاندنی کۆماردان، رۆژنامەی کوردستان لە ژمارە (23)ی 6ی ئازاری 1946 باسی گەمارۆی سەر کوردستانی کردووە، بەوەی گەمارۆیەکی ستەمکارانەیە، داهاتی توتن داهاتی سەرەکی خەڵکی ناوچەکە بووە، حکومەت بەکاری دەهێنا بۆ بەچۆکدا هێنانی کورد. ئەمە حاڵەتێکی تری پیلانی بەژێردەستەیی کردنی حکومەتی ناوەندیی بووە، وا سەیری کوردستانیان کردووە، کە موستەعمەرەیەکی ناوخۆی ئەوانە. لە حاڵەتی هەر

---

[901] - مەحمودی مەلا عیزەت:سەرچاوەی پێشوو، ج3، ل723-724.

[902] - FO, 371/52702 memo February 13, 1946, From K.Cornwalls.

مامەڵەیەکی ئابووری دەرەکیش رێگر دەبوون، چونکە کوردستان بەشێکە لە نیشتیمانی ئەوان.

ئەوەی شایانی باسە بایی دوو ملیون تومەن تووتن لە خەزێنەی ناوەندی لە مهابادا هەبووە، کە حکومەت قبوڵی نەکرد وەری بگرێ، بۆ ساڵی دواتر دەبوایە رووس توتنی ناوچە کوردیەکان بکرێ، بەڵام بە شێوەیەکی کەم نەبێ پابەند نەبوو بە بەڵێنەکەی خۆی[903]، قەیرانێکی ئابووری خنکێنەر رووی کردە مهاباد، حکومەتی کوردستان هەوڵیدا پەنا بەرێتە بەر قەرزی دەرەوەو (20,000) تومانی لە حکومەتی ئازەربایجان قەرز کرد، بەڵام ئەو ئەندازەیە زۆر کەم بووە بەرانبەر ئەو هەموو خەرجیەی رۆژانەی فەرمانگەکانی حکومەتو بۆ زیاتر لە (12) هەزار چەکدارو خەرجیەکانی تر. لە پیلانی خۆبژێویدا قازی موحەممەد هەوڵی دەدا کۆمپانیایەکی نیشتیمانی دابمەزرێنێ، ناوی نابوو "تەرەقی کوردستان"، داوای لە نەوەکانی کوردستان کرد بە پشك بەشداریی لەو کۆمپانیایە بکەن. کۆمپانیای تەرەقی کوردستان دەبووە کۆڵەکەی بنەڕەتی بۆ بووژانەوەی بازرگانیو کشتوکاڵ لە کوردستان، قازی دەیوست بانکی خەرجی بارمتەو تاپۆ "مصرف الرهائن والعقارات" دابمەزرێنێ هەتا ئەو زێڕەی لە کوردستاندا هەیە کۆی بکاتەوە[904]. ئەو رێوشوێنە ئابوریانەی باسمان کرد ئاماژەن بەوەی قازی موحەممەد لەژێر بەرنامەی ئابووری هیتلەردا بووە، لە ڕاستیدا ئەو پرۆژە ئابوورییانە بە ڕوونی ئەوە دەردەخەن، کە قازی بڕوای بە سەرمایەی دەوڵەت هەبووە، وەکو هۆکارێکی بزوێنەر بۆ ئابووری نیشتیمانی. ئەگەر تەمەنی کۆمار زۆر کورت نەبوایە دەیسەلماند وەکو "موحەممەد عەلی پاشای میسر" دەوڵەتی خۆی دابمەزرێنێت لە کوردستان.

سەرەڕای ئەو بارودۆخە قورسە ئاژاوەو برسیەتی سەری هەڵدا، قازی موحەممەدو سەرکردەکانی تری کۆمار هانی خەڵکیان دەدا لەسەر پشتبەخۆبەستنو ئارامگرتن. وەکو هەنگاوێکی جددیی بۆ بەرگریی لە چەوساوانو پشتبەسەتن بە ئەحکامی ئیسلامیو دابینکردنی دادگەری کۆمەڵایەتی، ئەگەر بەرتیلدەرو بەرتیل وەرگر لەسەر هەر کەسێك ساغ بوایەوە لەسێدارە دەدرا.

---

903 - مەحمودی مەلا عیزەت: سەرچاوەی پێشوو، ج3، ل742-743.

904 - هەمان سەرچاوە.

ئەدمۆنس لە بەگەورەیی باسی دەکات، کە ئەزمونی قازی موحەممەد بەدیاری خست لە ئیدارەدانی ئەو ئەندازە داهاتەی دەهاتە خەزێنەی دەوڵەت بۆ بەڕێوەبردنی حکومەت بووە[905].

## رۆڵی قازی موحەممەد لە کەوتنی کۆماری کوردستان

گومانی تێدا نییە سەرکردەو سەرکردایەتی لە هەموو سەرکەوتن‌و ژێرکەوتنێکدا لە ئاستی دەوڵەت یان لە ئاستی گروپی سیاسی بەرپرسیاریەتی دەکەوێتە ئەستۆ، بۆیە پێویست ناکات پاکانە بکەین بۆ هیچ سەرکردەیەك لە ژێرکەوتن، بەداخەوە لە هەردوو سەدەی رابردوو کورد بەشی تێکشکان بووە، هەموو جارێك تێکشکانی بە سەرکەوتن هەژمار کردووە، ئەمەش لەگەڵ ژیری‌و ئەکادیمیەت‌و ئایین یەك ناکاتەوە، نەوەی ئایندەش سوودی لێوەرناگرێ، ئەو پرسیارەی ئێستا دێتە پێشەوە ئایا ئەندازەی بەرپرسیاریەتی قازی موحەممەد لەو تێکشکانە چەندە؟ ئایا رابردووی کۆمەڵایەتی "چینایەتی" وەکو چەپی کوردیی ئاماژەی پێ کردووە رۆڵی لەو تێکشکانەدا هەبووە.

هەریەك لە "گادانی" و "پشدەری" وای دەبینن، کە قازی موحەممەد هەندێ خاسیەتی سەرکردایەتی تێدا نەبووە، وەکو زوو یەکلاکەرەوەو بڕیاردان، پێدانی بەرپرسیاریەتی بە کەسانی شایستە، ئەو بێتواناییەی لە بڕیاردان لە کاتی بەرەی شەڕگەکانی سەردەشت‌و سەقزو بانە بەدیار کەوت، هەروەها قازی بەوە تاوانبار کراوە خەڵکی مهابادی لەپێش شوێنەکانی تر دانابوو لە کاروباری کۆماری کوردستان[906].

مەحمودی مەلاعیزەت‌و توێژەرەوانی تریش لەو بارەیەوە هەمان بۆچونیان هەیە، کادیرو رۆشنبیرو پلەدارە عەسکەریەکانی کوردستانی باشوور لەوێ هیچ بەرپرسیاریەتییەکی فەرمییان پێنەدرابوو[907].

عەولە نامیلکەیەکی بچوکی لەسەر کۆماری کوردستان نووسیوەو لەوێدا چەندان هەڵە دەخاتەڕوو لەسەر قازی موحەممەد، لەوانە: دروستنەکردنی سوپایەکی نیزامی لە

---

[905]- C.J. Edmonds, Kurds, Turks and Arabs, (London: 1957), pp.97.

[906]- گادانی: ل73، پشدەری...، ل111.

[907] مەحمودی مەلا عیزەت: سەرچاوەی پێشوو، ج3، ل692.

جیاتی هێزی خێڵەکی. عەبدوڕڕەحمان قاسملوش لەو بارەیەوە ڕەخنەی هەیەو دەڵێ: (هێزە کوردیەکان مەشق و نەخشەو زەبتی سەربازیو چەك و تەقەمەنی باشیان نەبووە..)[908].

هەر لەسەر سەرکردایەتییکردنی کۆمار لەلایەن قازی موحەممەدەوە، پشدەری دەڵێ: (قازی موحەممەد وەکو پێویست پیاوێکی شۆڕشگێڕ نەبووە، ویستویەتی بابەتە سیاسیی و ئابوورییەکان بە بۆچوونی ئیسلامی و لە ڕێگەی ئاشتیەوە چارەسەر بکات، کە لەگەڵ پێویستیەکانی سەردەم نەدەگونجا، چونکە سەرکردە دەبێت شۆڕشگێڕ بێت)[909].

نووسەرە چەپەکانی کورد لەسەر ئەوە کۆکن، کە سەرکردایەتی دەرەبەگیو شێخ و پیاوانی ئاینی لە کۆماری کوردستان هۆکاری نوشستی هێنانی کۆمار بوون. بە بۆچوونی ئەوانە ئەگەر ڕێکخستن یان پارتێکی شۆڕشگێڕ هەبوایە لە چینی زەحمەتکێش "کرێکار و جوتیار" ئەوە لە بەرانبەر سوپای ئێرانی بەرگریی دەکرد، نەك وەکو ئەوەی ڕوویدا خۆی بەدەستەوە بدات، چونکە دەرەبەگو شێخەکان خۆپەرست بوونو توانای بەرگرییان نەبووە[910]..

پێویستە بەبێ چوونە ناو مشتومڕی بێ ئاکام ئەو ڕەخنانەی ڕوانگەیەکی مارکسیانەی پێوە دیارە بابەتیانە هەڵبەسنگێنین: یەکەم وشەی شۆڕش، کە بە عەرەبی دەکاتە "الثورة" واتە گۆڕانکاریی گشتگیر، ئەمەش مەرج نییە هەموو جارێ گوزارشت لە لایەنی باش بکات، لە قاموسی عەرەبی شۆڕش بە مانانی ئاژاوە "الهیجان" هاتووە، لە ئیسلامدا زاراوەیەکی ڕوونتر هەیە گوزارشت لە گۆڕانی گشتگیر دەکات ئەویش "چاکسازی"یە.

کەواتە ئایا قازی موحەممەد گۆڕانێکی ڕیشەیی کۆمەڵگای کوردستانی مەبەست بووە؟ ئێمە پێمانوایە هەر وەرگرتنی پۆستی سەرۆککۆمار لەلایەن قازی موحەممەدەوە

---

[908] - سالێك بوو، ل98-99.

[909]- پشدەری: سەرچاوەی پێشوو، ل111.

[910] - شەمزینی: سەرچاوەی پێشوو ل111، مەلا عیزەت: سەرچاوەی پێشوو، ل199، قاسملو: سەرچاوەی پێشوو ل64.

نیشانەی شۆڕشگێڕیە، چونکە لە جیاتی ئەوەی لە چوارچێوەی مزگەوت هاتووە وەکو زۆر لە پیاوە ئایینییەکانی تر خۆی بە بابەتی زانستی فقهیو ڕێزمانەوە خەریك بکات لەو قۆناغە ناسکە خۆی تەرخان کردووە بۆ بەرپرسیاریەتی سیاسی کورد، ئەمە خۆی گۆڕانێکی گەورەیە ئەوجا دانانی بابەشێخ بە پلەی سەرۆك وەزیرانو خستنەگەڕی ئەو هەموو توانا جیاجیایانە لە ڕووی کۆمەڵایەتیو ڕۆشنبیریەوە جۆرێك بووە لە کارزانیو لێوەشاوەیی. وردنەبوونەوە لە تایبەتمەندیەکانی ئەو قۆناغەو هەڵسەنگاندن لە ڕوانگەی تێڕوانینێکی تیۆریی دیاریکراوەوە، کە نەگونجاوە لەگەڵ ئەو کاتو شوێنەی ئەو نووسەرانەی گەیاندۆتە ئەو جۆرە بیرکردنەوانە لەسەر کۆمار[911].

گەڕانەوەی هۆکاری نوشستی کۆمار بۆ ئاینداریەتی قازی موحەممەد ناگونجێت لەگەڵ واقیعیەتی مێژووی کورد، زۆربەی شۆڕشەکانی کورد لە سەدەی نۆزدهەمەوە لەلایەن پیاوانی ئاینینەوە سەرکردایەتی کراون. قازی موحەممەد پیاوێکی داخراو نەبووە وەکو هەندێ وای بۆدەچن، بێ دوودڵی عەلی کوڕی ناردە قوتابخانەی هاوچەرخ لە تەورێزو ئەمەش ڕێگەی خۆش کرد بۆ خەڵکی تر.

قازی موحەممەد پیاوی دەوڵەت بووە، بەرنامەی درێژخایەنی هەبوو بۆ ئایندەی کوردستان، بەڵام پیلانی ناوخۆو دەرەوە ڕێگر بووە بۆ سەرخستنی بەرنامەکەی، بەڕای من روو وەرگێڕانی رووس لە کورد هەموو بەرنامەکەی قازی موحەممەدی نەزۆك کرد، ئەگینا لە بیری ئەلتەرناتیڤی کردەییدا بووە، لە کەوتنی کۆمارو گرفتی ناشۆڕشگێڕیەتی "ڕووس"مان نییە، بەڵکو گرفتی بێ ناوەرۆکی ئەو هەموو دروشمە باقو بریقەی رووسیەمان هەیە بە ناوی شۆڕشگێڕییەوە هاتو دوایی بەتەنیا بیری لە بەرژەوەندیی خۆی کردەوە.

قازی بێ دوودڵی سوور بوو لە هەنگاونانی شۆڕشگێڕیەتیو رووس لەو هەنگاوە شۆڕشگێڕیە هاوکاری بووەو هانی داوە، بەڵام قازی لەوەدا بە هەڵە چوو بوو بڕوای پێ کردن، لە ستراتیژیەتی دامەزراندنی کۆماری کوردستان پشتی پێ بەستن، بەڵام رووس

---

[911] - لێرەدا جۆرێك لە پاساوی ناواقیعی هەیە بۆ پێشەوا و بابەشێخی سەرۆك وەزیرانی کۆماری کوردستان، چونکە گۆڕان لە سروشتی کاری مرۆڤەکان مەرج نییە گۆڕانی گشتگیری لەو کارەی لێ بکەوێتەوە، کە دەیگرنە ئەستۆ. "وەرگێڕ".

له پشتەوە زەبری لێدا، بۆ دەرچوون لەو قەیرانەی رووس بۆی درووست کرد، قازی موحەممەد هەوڵیدا گفتوگۆ لەگەڵ حکومەتی ناوەندیی بکات، قەوام سەڵتەنە لەو خاڵە لاوازە تێگەیشتبوو، کە کورد داوای گفتۆگۆی لەگەڵدا دەکات، بۆیە رەزامەندیی دەربڕی، بەڵام لە هەوڵدا بووە چۆن مافی کوردان لەباریەك ببات.

دواتر قازی هاتبووە سەر ئەو باوەڕە ئەمریکیەکان بەزەییان پێدا دێتەوە، بۆیە پەیوەندیی پێوە کردبوون‌و بە "رۆزفێلت"ی وتبوو: کە لەژێر کاریگەری فیدراڵیەتی ئەمریکیدایە، بەڵام بێ ئاکام بوو، واباشتر بوو بۆ کۆماری کوردستان پێشتر پەیوەندیی لەگەڵ پیشاوەری بپچڕاندایەو ئەفسەرە رووسیەکانی لە ناوچە کوردنشینەکان دەربکردایە، هەتا ناحەزانی رووسی قبوڵیان بکردایە، بەڵام قازی موحەممەد لەوەدا خەیاڵی بووە نەك خەیانەتکار. شەڕی سارد دەستی پێکردبوو، ئەمریکیەکان نەیاندەتوانی بڕوا بە قسەکانی قازی موحەممەد بکەن، مامەڵەی رووس لەگەڵ کۆماری کوردستان هەمان مامەڵە بووە، کە لەگەڵ کۆماری ئازەربایجانی کۆمۆنیست کردیان.

بۆ ئەو پڕوپاگەندەیەش، کە قازی موحەممەد بێ عەزم‌و یەکلایکەرەوە نەبووە، راستی رووداوەکان پشتگیریی ئەوە ناکەن، لە سەرەتای راپەڕینەکانی کورد، حکومەت ئەسعەد خۆشەوی کردبووە حاکمی مهاباد و لە هەوڵی ئەوەدا بوون دەسەڵاتیان بگەڕێتەوە کوردستان، لە ساڵی 1941 قازی‌و خەڵکی مهاباد رۆڵی گرنگیان بینی لە ڕازینەبوون بەکرێگیراون، ئەمە وای کردووە، کە لە ئازاری ساڵی 1945 حکومەت بە فەرمی مامەڵە لەگەڵ راپەڕیواندا بکات.

لە دووەم سەردانیشیدا بۆ باکۆ لە ئەیلولی ساڵی 1945 باقرۆف لە هەوڵی ئەوەدا بووە قەناعەت بە کورد بکات داوای سەربەخۆیی نەکەن، پەیوەست بن بە حکومەتی ئازەربایجان، لەوێدا قازی موحەممەد بە دەنگی پڕ لە عەزمەوە وەڵامی دانەوە: (هێز نییە بتوانێ داواکاریی کورد بۆ حکومەتی سەربەخۆ پاشگەز بکاتەوە)[912]. دیارە رووبەڕووبوونەوەی باقرۆفیش لەوکاتە ئاسان نەبووە، چونکە ئەو لە نزیکەکانی ستالین بووە.

---

[912] - پشدەری: سەرچاوەی پێشوو، ل112.

سەبارەت بە وەرنەگرتنی ڕێوشوێنی یەکلایکەرەوە لە شەڕەکانی سەقز و سەردەشت و بانە، منیش لەگەڵ ئەوەدام دەرفەتێکی مێژوویی هەبووە بۆ یەکگرتنەوەی هەموو کوردستانی ڕۆژهەڵات، بەداخەوە ئەو دەرفەتە مێژووییە سوودی لێوەرنەگیرا، بەڵام سەرکردایەتی کۆماری کوردستان هەموو پێکەوە لە پشت بەفێرۆدانی ئەو دەرفەتەوە بوون نەك بە تەنیا قازی موحەممەد.

پێویست بوو لێرەدا هەڵوێستێکی یەکلایکەرەوە بگیرایەبەر، چونکە حکومەتی ئێرانی بە باڵادەستی سوپاو شوڤینییەکانی فارس بە تەنیا لە زمانی هێز تێدەگەیشتن، حکومەت ئەوکات بە تەنیا لە بیری خودبەسەریدا بووە، ڕەزا شا لە ڕێگەی سەربازیەوە سەپاندبووی بە سەر کوردستان، ناوچە کوردییەکانی ملکەچی دەسەڵاتی کۆمار لە30٪ خاکی کوردستانی ئێران تێنەدەپەڕی، بۆیە دامەزراندنی قەوارەیەك لەو پارچە بچوکە مەسەلەیەکی واقیعی نەبووە، ئەگەر قازی بیتوانیبایە هەموو ناوچە کوردیەکانی تری وەکو کرماشانو سنەو بانەو سەقزو سەردەشتو ورمێی پێکەوە رزگار بکردایە، ئەوکات دەیتوانی ئەوە بۆ کورد بەدەست بهێنێت، کە هەریەك لە گالیبالدی و بسمارك و مستەفا کەمال بۆ ئیتاڵییەکان و ئەڵمان و تورك بەدەستیان هێنا.

ئایا بە زەبری سەربازیی ئەوکات ئەمە دەهاتە دی؟ من لەبەر چەند هۆیەك بەلای وەڵامی ئیجابیانەدام، گرنگترین هۆ ئەوەیە، کە ئێران لەو ماوەیەدا دەوڵەتێکی لاوازو پەرت بووە، لەسەر بنەمای خێڵایەتی دابەش ببوو. ئەمەو ململانێی نێوان سەربازو پارتەکان، موحەممەد ڕەزا شا لە هەڕەتی هەرزەکاری هاتبووە سەر تەختی حوکم دەسەڵاتی تەواوی بەسەر سوپای ئێراندا نەبووە، لە توانایدا نەبووە ڕیزەکانی ڕێك بخاتەوەو دەسەڵاتی بگەڕێنێتەوە بۆ ناوچە کوردیەکان، نەجەفقولی پەیامنێری ڕۆژنامەی "ئیتلاعات"ی ئێرانی لەگەڵ سوپای ئێرانی لە کوردستان، لە یەکێك لە فەرماندەکانی سوپای ئێرانی ناوچە کوردییەکان دەگێڕێتەوە، کە لە مانگی حوزەیرانی 1946 فەرمانی چۆڵکردنی سەقزی بەدەست گەیشتووە، بەڵام فەرماندەی ئێرانی ئەو فەرمانەی قبوڵ نەکردووە، چونکە چولکردنی ئەو ناوچەیە یانی دواتر کشانەوە لە بانە و سەردەشت، دەرکردنی فەرمانی کشانەوە بە هۆی ئەو باوەڕەوە کە حکومەت لە دوای

کۆکردنەوەی (100) هەزار چەکداری کوردیی لە رووی سەربازییەوە لە ناوچە کوردییەکان نوشستی هێناوە..[913].

کۆچیراش لێداوانێکی هاوشێوەی ئەوەمان لە قازی موحەممەدەوە بۆ دەگێڕێتەوە: (گەر فەرمانێك هەبێت بۆ (4) هەزار پێشمەرگە بەرەو کرماشانی نەوتدار بڕوات گوایە وتویەتی: ئێمە نامانەوەێ نائارامی لە ناوچەکە بڵاو بێتەوە)[914].

باشە بۆچی کورد ئەو دەرفەتەی لەدەست دا، لەو بەرەیەوە هێرشی نەکرد؟. لە سەرەوە ئاماژەمان پێدا کە فەرماندە کوردەکان ئەو هێرشەیان راگرتبوو، هەتا هاشیمۆف گەیشتە بەرەی شەڕو کەوتە هەڕەشە لە فەرماندە کوردەکانو سنووری بۆ دانان، بە دەستێوەردانی ڕووسو ئینگلیز لە دژی کورد، ئەگەر ئەوان هێرش بکەن، داوای لێبوردن لە خوێنەر دەکەین دەرفەتمان بدات بچینە ناو درێژەی چۆنییەتی وەرگرتنی بڕیار لە کۆمار هەتا شێوازی بەڕێوەبردنی حکومەتی قازی موحەممەدمان بۆ روون ببێتەوە، کاتێك هاشمۆف گەیشتە بەرەی شەڕ قازی موحەممەد بۆ خۆی سەرپەرشتی چالاکییە سەربازییەکانی دەکرد، هاشمۆف هەڕەشەی لە کورد کرد، قازی داوای لە فەرماندە سەربازیەکان کرد هەتا بڕیاری سیاسی دەدرێ لە مهاباد هێرشەکەیان دوابخەن، بۆ ئەو مەبەستە قازی موحەممەد هەر زوو کۆبوونەوەی بە ئەنجومەنی راوێژکاری جەنگ کرد، بە وەزیرەکانی وت: ئەم دەرفەتانەمان لەبەر دەستدایە، یان هێرش بکەینو گوێ نەدەین بە هەڕەشەکانی سۆڤیەتو کۆمار بەرگەی ئاکامی بڕیاری خۆی بگرێت، یان خۆبدەین بەدەست دەسەڵاتی ناوەندیی، یان ئەم هێرشە بۆ کاتێکی تر دوابخەین، بۆچوونەکان تێك دەگیران، هەندێ کەس بە دەمارگیرو دواکەوتوو باسی حاجی بابەشێخیان دەکرد، ئەو پیاوەی سوور بوو لەسەر ئەنجامدانی هێرشەکەو دوانەخستنی، وتبووی: رووسیا چی دەکات با بیکات، لە ئاکامدا قازی موحەممەد لەسەر رای زۆرینە پێی چاك بووە هێرشەکە دوابخەن[915]. ئەمەش چەند خاڵێکمان بۆ بەدیار دەخا، لەپێش هەموویان ئەوەیە کە قازی موحەممەد پابەندی بڕیاری زۆرینە بوو، لە

---

913 - Arfa. Pp,92-95.

914 - مێژووی کورد، ل279.

915 - Egeleton. Pp.97-98.

ڕێگەی چارەی دیموکراتیانەوە دەوڵەتی بەڕێوە بردووە. دووەم: هەموو سەرکردەکانی کۆمار نەك بە تەنیا قازی بەرپرسن لە لەدەستدانی ئەو دەرفەتە، کاتێك دەوترێ قازی موحەممەد لەو مەسەلەیە کەمتەرخەم بووە. (گادانی) لەو بارەیەوە زوڵمی لە قازی موحەممەد کردووە، کە پێی وایە دەرفەتی لەدەست داوەو سوور نەبووە لە بەرەی سەقز هێرش بکرێ، لەو بارەیەوە (نەجەفقولی) لەسەر شێوازی عەزمو راشکاوی قازی موحەممەد شتێکمان بۆ دەگێڕێتەوە، کە لەگەڵ یەکێك لە فەرماندەکانی سوپای ئێرانی بە ناوی "فەیوزی"، قسەی کردووەو پێی وتووە: (یان لە بەرانبەر ئەو ئیستیفزازە دەوەستین، کە لەگەڵ کورد دەکرێ، هەتا دەسەلاتی ناوەندیی ماف کورد دەدا یان فەرمان بە هێزەکانمان دەکەین هەلوێستی یەکلایکەرەوەی سەربازی بنوێنن، کە دەتوانین ئەمە بکەین)[916].

توێژەرەوە چەپە کوردەکان دەڵێن سەرکردەکانی کۆماری کوردستان دەربەگو دواکەوتوو بوون لەپاڵ شێخەکانو پیاوانی ئایینی، ئەوانەش بە تەنیا بیریان لە بەرژەوەندیی خۆیان کردۆتەوە، نەیانتوانیوەو نەیانویستووە بەرگریی لە کورد بکەن، ئەگەر پارتێکی شۆڕشگێڕو بیروباوەڕێکی شۆڕشگێڕ هەبوایە دەتوانرا لە بەرانبەر هێزەکانی ئێرانی بەرگریی بکەن.

بەر لەوەی ئێمە وەڵامی ئەو سەرنجانە بدەینەوە پێمانوایە هێزەکانی کۆمار لە توانایاندا هەبوو بەرگریی باش بکەن لە بەرانبەر هێزەکانی ئێرانی، بەڵام وامان دانا بڕیارێکی لەو جۆرەیان دا، بەڵام ئەو نووسەرانە تێکشکانی هێزەکانی کۆمۆنیستی لە ئازەربایجان لە بەرانبەر هێزەکانی ئێرانی چۆن راڤە دەکەن؟ بیشاوەر فەرماندەیەکی شۆڕشگێڕ نەبووە؟ حیزبی ئازەری دیموکراتی حیزبێکی شۆڕشگێرو نوێنەری چینی کرێکارانو جوتیاران نەبووە؟ دوایی کۆماری ئازەربایجان خاوەنی (18) هەزار فیدائی بووە، کە لە ڕووی سوپاو تەقەمەنی باڵادەستتر بووە بە سەر کۆماری کوردستان؟ ئەدی بۆچی لەگەڵ ئەوەشدا خۆی بەدەستەوە دا؟ لەڕاستیدا توێژەرەوان نووشستی سەرکردایەتیو حکومەتی شۆڕشگێڕی ئازەربایجانو هەڵاتنی لە بەرانبەر هێزەکانی ئێرانی بە یەکێك لە هۆکارە سەرەکیەکانی کەوتنی کۆماری کوردستان دەزانن، ئەمەش وەکو لێدانێکی گورچکبڕ بووە بۆ ورەی کوردان.

---

[916] - من مهباد الدامية الى ....ل149.

دکتۆر قاسملو دەڵێ: یەکێك لە هۆیەکانی کەوتنی کۆماری کوردستان نەبوونی پاڵپشتی جوتیارانی کورد بووە لە کۆمار[917]. بە بۆچوونی ئێمە ئەوە هەوڵدانە بۆ لێکدانەوەی تێڕوانینی مارکسیەتی ئەوروپیە بۆ سەر واقیعیەتی رۆژهەڵاتو کوردستان، چونکە لە چلەکانی سەدەی بیستەم چینی کرێکار و کارخانە لە کوردستاندا نەبووە، نەخوێندەواری باڵی بەسەر ناوەندی چینی جوتیاراندا راکێشابوو، نەقابەی جوتیارانو دامەزراوەی پیشەیی نەبووە، هەتا لە هەوڵی وەرگرتنی سەرکردایەتی کۆماردا بێتو بیپارێزێت، بە پێچەوانەی ئەوروپا جوتیارەکانی کوردستان لە ڕێی پەیوەندی جیاجیاوە وەکو رەچەڵەکو بەرژەوەندی پابەندبوون بە ئاغاو شێخەکانەوە، بە شێوەیەکی گشتی لە کۆمەڵگای ئێمە جوتیاران بنەڕەتێکی یەکگرتووییان نەبووە، جوتیاری کورد لە ڕوانگەی بڕیاری ئاغاکانەوە سەیری چارەنوسو هەڵوێستی کۆماری کوردستانی کردووە.

هەندێ لەو بڕوایەدان دابەشکردنی زەوی بەسەر جوتیاران دەبووە زیاتر پتەوکردنی پەیوەندیی جوتیارانو کۆمار، هەتا ئەگەر ئەو بۆچوونەش بەڕاست بزانین بەو ماوە کەمەی تەمەنی کۆمار ئەو کارە ئەنجام نەدەدرا، بڕیاری لەو جۆرە لە سازدانی هەموو وزەو تواناکان بۆ خزمەتی کۆمار بە خراپ بەسەر قازی موحەممەددا دەشکایەوە، راکێشانی هیچ نەبێت بێلایەنکردنی ئاغاکانی کورد لە ململانێی کۆمارو دەسەڵاتی ناوەند، یەکێك لە هەوڵەکانی کۆماری ئازەربایجان دەستبەسەراگرتنو دابەشکردنی زەوی ئاغاکان بووە، بەمەش جەماوەری ئازەری کردە ناحەزی کۆمۆنیستەکان، لەگەڵ گەیشتنی هێزەکانی حکومەتی ناوەند بۆ تەورێز خەڵکی کەوتنە تەقەکردن لە سوپای کۆمۆنیستی ئازەریو بە خراپترین شێوە کوشتیانن. جێی سەرسوڕمانە چەپی کوردی بە هۆی دەمارگیریی ئایدلۆژی هەڵوێستی رووسی لە کۆماری کوردستان هەڵسەنگاندووە. بۆ نموونە ئەوانە، کە دێنە سەر ئاکامی شۆڕشی ئەیلولو پشت تێکردنی ئیمپریالیست لە بارزانی وا بەدیار دەخەن رۆژئاواو لیبرالیەتی رۆژئاوا سەرسەخترین دوژمنی کوردن، بەڵام کە دێنە سەر خیانەتی رووس بەرانبەر کۆماری کوردستان دەکەونە بیانوو هێنانەوە، سۆڤیەت بە بێتاوان نیشان دەدەن یان گلەیەکی زۆرکەم لە سۆڤیەت دەکەن. لەوێدا توند نین بەرانبەر رووس یان مارکسیەت یان ستالین، کە کێشەی کوردی کردە

[917] - قاسملو: سەرچاوەی پێشوو ل53.

قوربانی بەدەستهێنانی بەرژەوەندیەکانی ئیمپریالیستی رووسی بۆ پەترۆل لە ئێران لە ژێر پەردەی نێونەتەوەیی. نووسەرە ئاراستە مارکسیەکانی کورد، کە دێنە سەر هێنانەوەی پروپاگەندە بۆ هەڵوێستی ڕووسی دەڵێن: ڕووس لە ژێر هەرەشەی ئەمریکا بە بەکارهێنانی چەکی ئەتۆمی لە ئێران کشایەوە، بەڵام هەروەکو روونمان کردەوە بێجگە لە نامە توندەکەی ترومان هیچ هەڕەشەیەکی ئەمریکی نەبووە.

هەر لەناو ئەو نووسەرە چەپانەی کورد دکتۆر حەسەن پوور هەوڵی داوە مارکسیەت لەم خیانەتەی رووس بێتاوان رابگرێ، دەنووسێ: ستالین لەوەدا بە هەڵەدا چووبوو، کە قەناعەتی وابووە بە هۆی نەبوونی مەرجە بابەتیەکانی شۆڕشێکی میللی بەپێی بیردۆزەی مارکس دەبێت لە ئێران بکشێتەوە، حەسەن پوور دەیەوێ بۆچوونی ستالین بەدرۆ بخاتەوە، کە لە ناوەرۆکی ئەو نامەیەدا بەدیاری خستووە بۆ باقرۆف ناردبوو لەسەر بیانوو هێنانەوە بۆ کشانەوەیان لە ئێران، بڕوای حەسەن پوور هەموو ئەو مەرجانەی مارکس باسی کردووە بۆ هەڵگیرسانی شـۆڕشی مـیـللی لە ئێراندا هەبووە[918].

هەژار بۆمان دەگێڕێتەوە، کە چۆن مارکسیە کوردەکان ئامادە نەبوون دان بنێن بەوەی کە سۆڤیەت "دەوڵەتی کرێکارو جوتیاران"ە، لە دوای کەوتنی کۆماری کوردستان خیانەتیان لێکردووین و لە هەوڵی ئەوەدا بوون بیانووی وەهمی درووست بکەن بۆ ستالین، هەژار دەڵێ: لە دوای ئەوەی مارکسیە کوردەکانی وەکو هەمزە عەبدوڵڵاو ئەوانی تر لە سەرەتای 1947 گەیشتن زۆر بە توندیی بەرگرییان لە رووس دەکرد، هەمزە عەبدوڵڵا دەڵێ: (بۆیە ستالین بڕیاری کشانەوەی لە ئێران دا هەتا بیانوو بۆ رۆژئاوا درووست نەبێت لەموستەعمەراتەکانی نەکشێتەوە، بەتایبەت لە ئەمریکای لاتین‌و چین‌و ئاسیا)[919]، گریمان ئەو بیانووە راستە، باشە بۆچی هەندێ چەکی بۆ کۆماری ئازەربایجان‌و کوردستان بەجێنەهێشت لە بەرانبەر هێزەکانی ئێرانی بەرگریی پێ لە خۆیان بکەن، ئەمـە لەکـاتێکدا چـاك دەیانزانی هەر لە دوای کـشـانەوە ئێـران هێرش دەکات.

---

[918] – ئەمیری حەسەن پوور: ستالین قەیرانی شۆڕش، گزینك، ژمارە 13، ل16-17.

[919] – هەژار: سەرچاوەی پێشوو، ل102.

لەدواییدا بۆچی قازی موحەممەد بە زۆریی پشتی بە لەشکری خێڵەکی دەبەست کە دوودڵ بوون لە گوێڕایەڵییکردنو پەلەی نەکرد لە دامەزراندنی سوپای نیزامی بۆ کۆمار. گومانی تێدا نییە کە دامەزراندنی سوپایەکی نیزامی کارێکی وائاسان نەبووە، بەڵکو ئەمە پێویستی بەهەندێ کەرەستەی بنەڕەتی هەبووە لەوانە: مەسەلەی کاتو پارەو کادیری سەربازی، هەروەها ئەزموونی زۆری دونیای سێیەم ئەوەمان فێر دەکات، کە ناتوانین دەستبەرداری پاڵپشتی دەرەکی بین.

هەر بۆ نموونە ئەوەی بۆ رەزا شای ئێرانو مستەفا کەمالی تورکیو مەلیك فەیسەڵ لە عێراق رەخسا لە دابینکردنی پارەو پاڵپشتی دەرەکی، بۆ قازی موحەممەد بڕەخسایە ئەوکات دەمانتوانی سەرکۆنەی بکەین. قازی موحەممەد سەرچاوەی زۆر کەمی دارایی لەبەردەستدا بووە، لەگەڵ کۆمەڵێك کۆسپ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بەرایی دامەزراندنی سوپای کوردستان بەر لە ڕووخانی کۆمار هەبووە، لە جیاتی ئینگلیزو رووس پشتیوانی لە دامەزراندنی سوپایەکی نیشتیمانی بکەن بۆ کۆماری کوردستان بە هەموو توانا لە هەوڵی درووستکردنی کۆسپدا بوون لە ڕێگەی ئەو مەسەلەیە.

## داگیرکردنی مهابادو لە سێدارەدانی قازی موحەممەد

داگیرکردنی مهابادو لە سێدارەدانی قازی موحەممەد جێگەی ناکۆکی بووە لە نێوان شا "بە پاڵپشتی سوپاو ئەمریکیەکان"و "قەوام سەڵتەنەو سیاسیە لیبراڵەکان"، ئەمەش رەنگدانەوەی جیاوازی بووە لەسەر چۆنییەتی چارەسەرکردنی هەردوو مەسەلەی ئازەربایجانو مهاباد، شا بە لای چارەسەری سەربازیدا بووە، بەڵام قەوام سەڵتەنە باوەڕی وابووە بە گەمارۆی ئابووری تەورێزو مهاباد بێزار بکاتو دوایی لەگەڵیاندا بکەوێتە گفتوگۆ، لە ڕووی رۆشنبیریەوە دایببڕێو جۆرێك لە لامەرکەزییان بداتێ، لە کانووی یەکەمی ساڵی 1946 قەوام سەڵتەنە توانی هەنگاوێکی گەورە ببڕێ لەو ستراتیژیەتە، بەڵام ژەنەڕاڵە سەربازیەکان چارەسەری یەکلاییکەرەوەیان دەویست.

رەزا شا لە دەرفەتێك دەگەڕا شکۆی خۆی بەسەر ئێراندا فەرز بکاتەوەو قەوام سەڵتەنەش بەرەنگاری ئەو خواستەی دەبۆوەو دەیویست سنورێکی بۆ دابنێت. پێشتر وتمان سوپای رووسی لە حوزەیرانی 1946 بە تەواوی لە ئێران پاشەکشەی کردو لە

نیسانی ئەو ساڵەوە لە پێناو پاراستنی ئیمتیازی نەوت رووس سوور بوو لەسەر پاراستنی پەیوەندیەکی باش لەگەڵ ئێران، بۆیە شا بە گونجاوی زانیبوو هێرش بکاتە سەر هەردوو کۆماری ئازەربایجانو مهاباد[920].

پشتیوانی بێسنووری مستەر "ئالت"ی باڵیۆزی ئەمریکی لە تاران بووە هۆی زیاتر پەلەکردنی شا لە دەرکردنی بڕیاری سەربازی[921]. لەوکاتەی قەوام سەڵتەنە سەرگەرمی گفتوگۆ بووە لەگەڵ سەرکردەکانی ئازەربایجان لە کانوونی یەکەمی 1946 شا بەبێ ئاگادری ئەو فەرمانی بە سوپا دا هێرش بکەنە سەر ئازەربایجان، هێزێکی (200) هەزار سەربازی بەرەو زنجان لەوێشەوە بەرەو تەورێز کەوتە ڕێ، سەرەڕای راگەیاندنی باری نائاساییو پەیمانی بەرگری لەلایەن کۆمۆنیستەکانەوە هەر زوو ورەیان رووخاو سەرکردەکانیان هەڵاتن بۆ رووسیا، خەڵکی بەر لە هاتنی سوپای ئێرانی هێرشیان کردە سەر بارەگاکانی حیزبی دیموکراتی ئازەریو دەیان کەسیان بە خراپترین شێوە لێ کوشتن، ئیهانەیان بە لاشەی موحەممەد بیریای وەزیری پەروەردە کرد[922].

هۆکارەکانی رووخانی کۆمۆنیستەکان لە تەورێز زۆرن، کە ئەمە ئەرکی ئەم توێژینەوەیە نییە، وا بەدیار دەکەوێ رووس نەك هەر پاڵپشتی سەربازیی لێنەکردوون، بەڵکو ئاگاداری فەرماندەکانی ئازەربایجانیشی کردبوو، کە بەرگریی نەکەن. شا دڵنیا بووە لە بەڵێنەکانی رۆژئاوا، ئەوەش لەوەدا بەدیار دەکەوێ لە مانگی ئازارو نیسانی ساڵی 1946 فشاری خستبووە سەر رووس بۆ کشانەوە لە ئێران. لە دوای هێرشی هێزەکانی ئێرانی بۆ سەر تەورێز باڵیۆزی رووسی داوای چاوپێکەوتنی شای کردبوو، لەوێدا ناڕەزایی دەربڕی بوو لە بەرانبەر شا و پێی وتبوو: (بزاوتنی هێزەکانی ئێرانی بە ئاراستەی تەورێز هەڕەشەیە بۆ سەر ئاشتی جیهان). شا لە وەڵامدا پێی وتبوو: چارەسەر نەکردنی ئەو مەسەلەیە هەڕەشەیە بۆ سەر ئاشتیو بڕیاری پاشەکشە بە هێزەکان رەفز دەکەمەوە)، هەروەها لەوێ شا نامەیەکی خۆبەدەستەوەدانی حاکمی

---

[920] - شەمزینی: ل160-161.

[921] -FO, 371/2074, Persia, No, 141. March, 6,1946, From Angora to Foreign Office.

[922] - Fawcett pp.78-7.

ئازەربایجانی بەدەست گەیشتبوو کە فەرماندەکانی هەڵاتوون، هەروەها شا وتبووی بەپێی ڕێککەوتنامەی رووسی ـ ئێرانی، ئەوە رووسیا نەوتی دەستکەوتووەو کێشەی ئازەربایجانی بە کێشەیەکی ناوخۆیی داناوە[923].

کەوتنی لەناکاوی تەورێز بۆ کۆماری کوردستان چاوەڕواننەکراو بووە، بۆیە فەرماندەکانی تەزینو پەشێوییان تێکەوت، "هێمن" کە شایەت ئەعیانە بەسەر رووداوەکانەوە دەڵێ: لە دوای هەواڵی کەوتنی تەورێز لە ماڵی قازی موحەممەد کۆبووینەوە، هەموومان ورەمان بەرز بوو، بە کۆی دەنگ ئەنجومەنێکی جەنگیمان بە سەرۆکایەتی بابەشێخ تەشکیل کرد بۆ بەرگریی لە کۆمار، بەڵام بۆ رۆژی دواتر فەرماندەکانی ئەنجومەن هەڵاتن بۆ تارانو لە ڕێگەی هەندێ بازرگانەوە گیانی خۆبەدەستەوەدانیان لەناو خەڵکی بڵاو دەکردەوە[924].

قازی موحەممەد لە 6ی کانوونی دووەم داوای کرد ئەنجومەنی شورا لە مزگەوتی عەباس ئاغا لە مهاباد کۆبێتەوە بۆ پشتگیریی لە بڕیاری ئەنجومەنی جەنگی حکومەتی کوردستان لەسەر بەرگریی لە بەرانبەر هێزەکانی ئێرانی، لەو کاتە هێزێکی ئێرانی بە سەرۆکایەتی هەمایونیو هێزێکی زۆری بەکرێگیراوان، کە یاوەری هێزەکانی ئێرانی بوون، هەموویان لەوپەڕی ئامادەییدا بوون لە شاری میاندواو بۆ هێرش کردنە سەر کۆمار لە مهاباد.

غەنی بلوریان دێتە سەر ئەو گفتوگۆیانەی لە نێوان لایەنگرانی خۆبەدەستەوەدانو لایەنگرانی بەرگریی دەڵێ: لەوکاتەی قازی موحەممەد لە وتارەکەیدا وتی: (ئازەربایجان خۆی بەدەستەوەداو سوپای ئێرانی گەیشتۆتە تەورێزو ورمێ، هەمایونی هەندێ لە هێزی هۆزە کوردیەکانی لەگەڵدایەو چاوەڕوانی وەڵامی منن، ئەوەشتان پێ بڵێم هێزەکانی تورکیو عێراقیش گردبوونەتەوە، رووسەکان بێ دەنگن، ئێمە تەنیا هەندێکمان چەك ماوە، بەڵام لە دوای ئەوەی بۆم روون کردنەوە، بڕیار لەدەستی ئێوەدایە، خۆبەدەستەوەدان یان بەرگریی. "بارزانی" وەڵامی دایەوە: "هیچ گەلێك

---

[923] – Mission, pp.117-178.

[924] – تاریكو روون، ل28.

نەبووە داوای ماف خۆی بکات بەبێ قوربانی"، بەڵام ئەوانی تر هاواریان دەکرد بەرگریی بەدەستی بەتاڵی واتە خۆڵەناوبردن[925].

وا بەدیار دەکەوێ کۆبوونەوەی مزگەوتی عەباس ئاغا بێ ئاکام بووە لە گەیشتن بە بڕیارێکی یەکلاییکەرەوە. دوایی قازی موحەممەد بەو بارە دوودڵییەوە داوای لە سەرکردەکانی کۆمار کرد بۆ خۆبەدەستەوەدان، بۆ رۆژی دوایی پیاوماقوڵانی مهاباد لە دۆستانی حکومەتی ناوەندیی وەکو رەحمەت شافیعیو شێخ حەسەن بورهانو عەلی ئاغای ئێلخانی زادە سەردانێکی هەمایونیان کرد، هەتا گوێڕایەڵی خۆیان بە ناوی خەڵکی مهابادەوە بۆ هەمایونی رابگەیەنن، دوایی قازی موحەممەد وەفدێکی نارد بۆ لای هەمایونی، کە پێکهاتبوو لە حاجی بابەشێخو سەیفی قازی بۆ وتوێژ لەسەر مەرجەکانی خۆبەدەستەوەدانو رێگەخۆشکردن بۆ سەردانی قازی موحەممەد. دوای چەند رۆژێك قازی موحەممەد سەردانی هەمایونی کردو ئەویش رێزی لێگرت. هەمایونی دەیویست هێزە بەکرێگیراوەکانی لەگەڵیدا بوون بنێرێ بۆ تاڵانی مهاباد، بەڵام قازی موحەممەد پەشیمانی کردەوە، لە 15ی کانوونی دووەم هەمایونی بەبێ هیچ بەرگرییەك هاتە ناو شاری مهاباد، بەمەش کۆتایی بە حکومەتی سەربەخۆی کورد هات، کاتێك شا زانی بە پێچەوانەی خەڵکی تەورێز شاری مهاباد پێشوازییان لە حکومەتی ناوەندی نەکردو دەرگای ماڵەکانیان داخست، هەر کە هەمایونی گەیشتە شار چووە ماڵی قازی موحەممەدو لەوێ نانی نیوەڕۆی خوارد، بەڵام لە دوای دوو رۆژ، دوای ئەوەی قازی موحەممەد لە نوسینگەی خۆی دەوامی دەکرد هێزەکانی ئێرانی قازی و 28 کەس لە سەرکردەکانی کۆماریان گرت، گیراوەکان درانە دادگای سەربازی، حوکمی لەسێدارەدانیان بەسەرا سەپاندن. لە 30ی ئازاری 1947 قازی موحەممەدو سەدری قازی برایو سەیفی قازی برازای لە چوارچرای مهاباد لەسێدارە دران، هێزەکانی ئێرانی چەندان دەستەی تریان لە کادیرانی "حدك" لە شارەکانی تر لەسێدارە دا[926].

---

[925] --بلوریان: سەرچاوەی پێشوو، ل75.

[926] -هەڵەموتی لە هەمایونیەوە چیرۆکی بەیەکگەیشتنی خۆیو قازی موحەممەد بەو شێوەیە دەگێڕێتەوە: لە بەڕێوەبەرایەتی پۆستەی میاندواو دانیشتبووم، پیاوێك هاتو وتی: سەرۆك دەیەوێ لەگەڵتان قسە بکات، وتم کام سەرۆك؟ وتی: قازی موحەممەد، وتم: خۆ ئەو سەرۆك نییە، بە تەنیا قازی موحەممەدە، بە

سەرلەنویَ قۆناغێکی تر لە زوڵم و زۆرداری لە کوردستان دەستی پێکردەوە، ماوەی ئازادی نێوان دیکتاتۆریەتی رەزا شاو سەرەتای سەردەمی کوڕەکەی تەنیا (11) مانگ بووە، وەکو ئەوە وایە گەلی کوردی لە خەونێکی خۆشدا بووبێت، بەهۆی بانگەشەی واقیعی ناوخۆیی و هەرێمییەوە بەخەبەر هاتبێت.

ئەم خستنەڕووە کورتە لە چۆنییەتی کەوتنی مهاباد چەندان پرسیارمان لادرووست دەکەن. بۆ نمونە، بۆچی کۆماری کوردستان بەرگری هێرشی هێزەکانی ئێرانی نەکرد؟ بۆچی قازی موحەممەد خۆیدا بە دەست هێزەکانی سوپاوە؟ چۆن و لەبەرچی قازی موحەممەد لەسێدارە درا؟ ئەگەر بە وردی سەیری وتاری قازی موحەممەد بکەین لە مزگەوتی عەباس ئاغا، چەند هۆکارێکی بنەڕەتی دەبینین لە کەوتنی مهاباد. لەوانە کەوتنی تەورێز. پشتتێکردنی رووس. ئەو لەشکرە بەکرێگیراوە کوردانەی هاتبوون بۆ تالاَنو دەستبەسەراگرتن، نەبوونی چەکی تەواو، خڕبوونەوەی هێزەکانی تورکیاو عێراق لەسەر سنوور. گومانی تێدا نییە هەریەك لەو هۆکارانە لەجێگەی خۆیەوە بەشداریی هەبووە لە هەڵبژاردنی خۆبەستەوەدان، بەڵام ئاساییە هۆکارێك یان چەند هۆکارێك بکەینە هۆکاری یەکلاکەرەوەی کەوتنی کۆمار.

راستە هەندیَ هەڵەی قازی موحەممەد لە دانەمەزراندنی سوپایەکی نیزامیو نەبوونی چەکی پێویست دەکەنە هۆکاری گرنگ لە ڕووخانی کۆمار، بەڵام من لەبەر چەند هۆیەك خۆ لەوانە بەدوور دەگرم:

یەکەم: هۆکاری چەكو سوپای نیزامی لە مێژووی جەنگدا نەبۆتە هۆکاری بنەڕەتی سەرکەوتن یان ژێرکەوتن. لە مێژووی کۆنو نوێدا چەندان جار سوپای نیزامی بەرانبەر هێزی نانیزامی بە چۆکدا هاتووە.

دووەم: ورە بەرزیو بیروباوەڕ لە شەڕدا ڕۆڵی گەورە دەگێڕیَ لەسەر جەماوەر یان سەرکردەی لێوەشاوە بۆ بەدیهێنانی سەرکەوتن. ئەم خاڵە لە ڕووخانی کۆمار لەلایەن توێژەرەوانەوە ئەو بایەخەی پێنەدراوە.

---

تەلەفۆن بە قازی موحەممەدم وت: بەم نزیکانە کوردستان هەموو دێتە ژێر دەسەڵاتی سوپا، قازی موحەممەد وەڵامی دامەوە وتی: "رێککەوتنامەی ئاشتی واژۆ دەکەین"، وتم رێککەوتنامەی ئاشتی هەمیشە لە نێوان دوو دەوڵەتدا دەکرێت، وا چاکترە پێش شەڕ خۆتان بدەنە دەست سوپا.

لەڕاستیدا ئەو سوپایەی هێرشی هێنابوو بۆ سەر کوردستان نە سوپای نیزامیو نە چەکی تازەی پێبووە، ئێران تەنیا 20 هەزار سەربازی تەرخان کردبوو بۆ هێرش کردنە سەر کوردستانو ئازەربایجان. (3) هەزاری لەو پیاوانە پێك هاتبوو، کە پێیان دەوت چریك "سوپای نانیزامی". نیوەی ئەو هێزەی تەرخان کرابوو گەمارۆی کوردستان بدات ورەی رووخابوو، هەروەها ئەو هێزەش کە هومایونی سەرکردایەتی دەکرد داڕوخاوو باوەڕی وابووە قازی موحەممەد بەرگریی دەکات[927].

کۆماری کوردستان خاوەنی نزیکەی 10 هەزار چەکدار بووەو لەسەر خاکی خۆیو بۆ بەرگریی لە میللەتی خۆی شەڕی دەکرد، دۆستێکی دێرینیشی هەبووە، کە لێی جیانەبۆتەوە ئەویش چیا ئەستەمەکان بووە. هێزی بارزانییەکان نزیکەی هەزار چەکدار بووە، دەیانتوانی لە چەندین شەڕگەو بۆ چەند مانگ بەرەو رووی هێزەکانی ئێرانی بوەستن، هەروەکو پێش گەشتە ئەفسانەییەکەی بۆ سۆڤیەت چەندین سەرکەوتنی بەدەست هێنا. ئەمە وای لە نەجەفقولی کرد بڵێ: هێزەکانی بارزانی بە جۆرێ شەڕی سوپای ئێرانیان کرد تۆڵەی روخانی مهابادیان کردەوە. لە کاتێکدا هێزی بارزانییەکان لە بارودۆخێکی یەکجار سەخت شەڕیان دەکرد. لە کاتی بڵاوبوونەوەی برسیەتی دەبوایە حیساب بۆ سێ هەزار منداڵو ئافرەتو پیرو ئاوارەی بارزانی بکەن، کە لەگەڵیاندا بوون، سەرەڕای پەلاماری هۆزە کوردە کرێگرتەکان لە پشتەوە[928]، چی دەبوو ئەگەر بۆ ماوەیەکی کەمیش هێزەکانی کۆماری کوردستان وەکو بارزانییەکان خۆیان بگرتایە، لەکاتێکدا مستەفا بارزانی بە چەند رۆژێك بەر لە خۆبەدەستەوەدانی قازی موحەممەد چووە مهابادو ئامادەیی خۆی نیشان دابوو لەژێر فەرمانی ئەو درێژە بە خەباتی کوردانە بدەن. وا دەبینین ئەگەر قازی موحەممەد بەرگریی هەڵبژاردایە سوپای ئێرانی نیگەران دەکردو دوایی دەتوانرا فشار لەسەر ئێران درووست بکرایە بۆ چارەسەری سیاسی. ئەمەش بە هۆی ئەو ناکۆکیەی نێوان شاو قەوام سەڵتەنە دوور نەبوو. ئەنجومەنی ئێرانی لە ساڵی 1947 ئەو ئیمتیازەی لەسەر نەوت لەگەڵ رووس پەسندی کردبوو هەڵیوەشاندەوە، بەمە خەباتی کورد دەیتوانی پەشێویی پەیوەندیی رووسی - ئێرانی بەکار بێنێت بۆ بەرژەوەندیی خۆی.

---

[927] - نەجەفقولی: سەرچاوەی پێشوو، ل24.

[928] - النضال من اجل الحرية، ص149، الملحق الاول لكتاب من مهاباد الدامية الى ضفاف أراس.

بەم گوزارشتەی خوارەوە دکتۆر شەمزینی باسی سەردانەکەی قازی موحەممەد بۆ میاندواو کردووەو دەڵێ: بەم ساردو سڕیە قازی موحەممەدو فەرماندەکانی ئێرانی پێشوازییان لە سوپای ئێرانی کرد، بێ ئەوەی تەقەیەك بکەن بە ئارەزووی خۆیان چوونە بەردەستی دوژمن. ئەمە کارێکی سەرشۆڕیو ریسوایی بوو، پێشتر کوردستان نوشستی وای بەخۆوە نەدیوە. ئەمە بەڵگەیە کە بۆرژوازی نیشتیمانی، بەرژەوەندیی خۆی بە بەرژەوەندیی گشتی ناگۆڕێتەوە[929].

جەلال تاڵەبانی لە چاوپێکەوتنیدا لەگەڵ عەلی کەریمی هەمان تێڕوانینی هەیە، دەڵێ: چۆن شایستەی سەرۆکی دەوڵەتە پێشوازیی لە فەرماندەی سوپای داگیرکەری وڵاتەکەی بکاتو قوربانی بۆ سەربڕی. وەکو پێشتر ئاماژەمان پێدا، لێرەدا مەبەستمان نییە پاساوێك بۆ قازی موحەممەد بهێنینەوە، خۆزگە قازی بەرگریی بکردایە، بەڵام دەبێت ئەم دوو راستیە ببینین. یەکەم: قازی سەرۆکی دەوڵەتێکی سەربەخۆ نەبووە و پڕ بە گەرووی هاواری کردووە: کوردستان بەشێکە لە ئێرانو تەنیا مەبەستی بەدەستهێنانی مافی کورد بوو لە کارگێڕیەکی تایبەت، کە دەستووری ئێرانی رێگەی پێداوە. دووەم: هەڵوێستی مستەفا بارزانیش لە ساڵی 1975 زۆر جیاواز نەبوو لە هەڵوێستی قازی موحەممەد، سەرەڕای ئەوەش بارزانی بە ئازایەتیو چاونەترسی ناسرابوو، کەچی ناچاری قبوڵکردنی فەرمانی واقیع بوو بۆ گوێڕایەڵی ئەمریکاو شای ئێران، لە کۆتاییهێنان بە شۆڕشی ئەیلولی دژی رژێمی عێراقی. لە ساڵی 1991 سەرکردەکانی کورد ناچار بوون سەردانی سەدام حوسێن بکەنو تەوقەی لەگەڵدا بکەن، کە ئەنجامدەری تاڵترین مەرگەساتی مێژوویيو دەستی سوور بووە بە خوێنی گەلی کورد، ئەوکات لەگەڵیدا دانیشتنو گفتوگۆی بێ ئاکامو بە رای زۆر کەس زیانی هەبوو بۆ سەر بزوتنەوەی کورد.

زۆربەی هاوچەرخانی قازی موحەممەد لەسەر ئەوە کۆکن، کە لە سەرەتاوە قازی موحەممەد لەگەڵ بەرگریو خۆبەدەستەوەنەدان دا بووە[930]، بەڵام رووس تووشی ئەو ریسواییەی کردن. کە ئەسەدۆف مهابادی جێهێشت ئاماژەیەکی روون بووە بۆ کورد،

[929] - شەمزینی: سەرچاوەی پێشوو، ل109.

[930] - کۆچیرا: سەرچاوەی پێشوو، ل284-285، مەلا عیزەت: سەرچاوەی پێشوو، ل184-185.

بەوەی بە تەنیا بەرەنگاری سوپا دەبنەوە، هەروەها هەندێ فەرماندەو ناوداری مهابادیش لەبارەیەوە دەستیان لەو خۆبەدەستەوەدانەدا هەبووە، بەڵام یەکەم کەسی رووخاو، سەدری قازی بوو، هەڵاتو پەنای بردە بەر قەوام سەڵتەنە رزگاری بکات. سەدر بە پێچەوانەی قازی پیاوێکی لەرزۆك بووە "لە کاتی خۆیدا دێینە سەری". هەروەها بازرگانو بەرژەوەندیچییەکانی مهاباد توانیبوویان خەڵك بترسێنن‌و گیانی بەرگرییان لە ناودا لاواز بکەن. لە دوایشدا سەرکردەکانی "حدك" لەسەر رایەك کۆنەبوونەوە. قازی موحەممەد بە ئیجتیهادی خۆی کرد، بەتایبەتی خەڵکی مهاباد دەپارێزێ لە تاڵان‌و دەستبەسەراگرتن‌و ئابڕوبردن‌و شەڕی ناوخۆیی، ئەو تاڵانییەی فەرماندەکانی سوپای ئێرانی بەتایبەتی عەلی غەفاری لەناو مهاباد نەخشەیان بۆ کێشابوو[931].

بە کورتی قازی موحەممەد درکی بەوە کردبوو، کە شاری مهاباد بە بەراورد لەگەڵ شاری مەدینەی کاتی هێرشی ئەحزاب پێویستیەکانی بەرگریی تێدا نییە لە بەرانبەر رووبەڕووبوونەوە. ئەوکات موسڵمانان لە هەموو لاوە گەمارۆ درابوون، بەڵام بڕوا بەخوابوون‌و ئارامی خۆڕاگریی دابوونێ.

بیری نەتەوایەتی ئەو کاریگەرە گەورەی تێدا نەبووە لەسەر دڵان، قازی موحەممەدو هەندێ لە سەرکردەکانی کۆمار خاوەن بڕوای پتەوی ئیسلامی پتەو بوون لەگەڵ هەزاران چەکداری کورد کە ئامادە بوون بۆ قوربانی بە ژیانی خۆیان لە پێناو بەرگریی لە کۆمار، بەڵام دەستبژێرێکی قیادی نەبووە تا مردن ئامادەی بەرگری بێت. ژمارەیەك لەفەرماندەکانی "حدك" لە ناویاندا عەبدوڵڵای مودەریسی‌و مەلا حەسەنی موجەدی‌و پیاوماقوڵانی شار پێیانوابووە بەرگریی یانی خۆکوشتن[932].

---

[931] – نجفقولی: سەرچاوەی پێشوو، ل142، ئەلەموتی: سەرچاوەی پێشوو، ل18.

[932] – لە ڕوانگەی ئەو چەند بڕگەیەی نووسەر دوو سەرنجم لەلا گەڵاڵە بووە:

یەکەم: تێکەڵیەك لە گوتاری ئیسلامەتی‌و بەکارزماییکردنی قازی موحەممەد هەیەو نووسەر لە شرۆڤەکردنی نەگەیشتۆتە چارەسەرێکی دروست‌و واقیعی.

دووەم: ئەو بۆچوونەی نووسەر لەسەر دیموکراتیەت‌و خاوەن پرنسیپیەتی حیزبی دیموکرات‌و قازی موحەممەد داکۆکی لێدەکرد هەڵدەوەشێتەوە، لێرەدا حیزبی دیموکرات‌و سەرکردایەتیەکەی بە تەواوی سڕاوەتەوە، قازی یانی سەرچاوەی بڕیاری حیزب‌و بڕیاری دەستەی کۆمارو ئەنجومەنی وەزیران. " وەرگێڕ".

پیاوە گەورەکانی مهاباد سەرشۆڕی‌و زەلیلیان هەڵبژارد لە بەرانبەر هێزی ئێرانی نەك بەرگری‌و بڕوابوون بە سەرکەوتن. لە جیاتی ئەوەی پیاوماقوڵانی شار، شارەکەیان بکەنە ستالینگرادی دووەم چاویان لە پیاوانی پاریس کرد، لە کاتی شەڕی یەکەمی جیهانی نەوەکو شوێنە گەشتیارەکان وێران بن بێ بەرگری دایانە دەست سوپای هیتلەر.

قازی موحەممەد لە دوای راوێژی تایبەتی بە فەرماندەکانی کۆمار لە ماڵەکەی خۆی‌و راوێژی گشتی لەگەڵ خەڵکی مهاباد لەمزگەوتی هەباس ئاغا ناچاری خۆبەدەستەوەدان بووە بە سوپای ئێرانی. ئەمەش لە هەستی ترسنۆکی‌و بێ غیرەتی نەبووە، بەڵکو رێزگرتن بووە لە ویستی گەل هەتا لەو پێناوەدا گیانی خۆی دابنێ، ئەمەش ئەوپەڕی دیموکراتیەت بووە.

دادگاییکردنی قازی موحەممەد شەهیدکردنی، لایەنێکی تری ئەو کەسایەتیەو لایەنێکی بزری سوپای ئێرانیمان بۆ بەدیار دەخا. سەرەڕای بەڵێنی هەمایونی لە میاندواو بە قازی موحەممەد، کە نایەوێ تۆڵە بستێنێتەوە، کەچی دوای گەیشتنی بە مهاباد قازی موحەممەدو سەیفی قازی و (38) کەس لە فەرماندەکانی کۆماری گرت، لەوکاتەی سەدری قازی لە تاران لە لای قەوام سەڵتەنە خەریکی بەردانی قازی موحەممەدو پاراستنی خۆی بوو، هەمایونی نووسراوێکی بەدوادا نارد لە مهاباد ئامادە بێت. قەوام سەڵتەنە بەڵێنیدا بوو لە دوای لێکۆڵینەوە ئازاد دەکرێ، کە بەدوای سەدری قازیاندا نارد بێتە مهاباد ئەفسەرەکە سوور بوو لەسەر ئەوەی فەرمانی گرتنی پێیە بیگرێ. سەدری قازی نووسراوەکەی دایە هەمایونی کە خۆی داوە بە دەستەوە، بەڵام ئەم پێیوت: فەرمانی پێدراوە لای ئەوان بمێنێتەوە. سەدری قازی بە قەوام سەڵتەنەی وت: کە دەترسێ بچێ، بەڵام ئەو پێی وت: "سوپا بەهێزەو لە هەر کاتێ بیانەوێ دەیگرن"[933]. ئەمەش بەڵگەیەکی ترە لەسەر ناکۆکی نێوان سوپاو حکومەت، دۆسیەی

---

[933] - دکتور مصطفى الموتي: ایران در عسر بهلوی، جلد، جهارەم. بیرەوەری رۆژنامەنووسی ئێرانی لەمەڕ کۆماری کوردستان 1946. وەرگێڕانی ئەنوەری سوڵتانی، وتاری یەکەم، حیکایەتی پرخەمی منو ایرانی من ئیسماعیل پوور والی "بامشاد"، ل14-17، (سوپاسی ئەنوەر سوڵتانی دەکەم بەر لە بڵاوکردنەوەی رێگای پێدام سوود لەو دەستنووسە وەربگرم).

کوردستانیش به تەواوی درابووە دەست سوپا، هەمایونیو هاوڕێیانی ڕقو یەکلایی کردنەوەیان دەویست لەگەڵ کورد لەسەر بنەڕەتی ڕقو ریسواکردن نەك بە یاسا. ئەوان ڕاستەوخۆ لە ڕازمارای هاوپەیمان لەگەڵ شای ناحەز بە قەوام سەڵتەنە فەرمانیان وەردەگرت. وا بەدیار دەکەوێ سوپا سوور بووبێت لەسەر ڕزگارنەبوونی قازی موحەممەد لە پەتی سێدارە، هەتا لە باڵادەسترین ئاست کە ڕازماراو شا بوون.

هەمایونی دەڵێ: لە میاندواو بەر لەوەی بچمە ناو مهاباد قازی موحەممەد سەردانی کردمو ڕێگەم پێدا بگەڕێتەوە. ڕازمارای برووسکەی بۆ کردمو ناڕەزایی توندی دەربڕی بوو لەسەر ئەوەی ڕوخسەتی قازی موحەممەدم داوە بگەڕێتەوە مهاباد، داوا لە من کرابوو بیگرم... هەروەها هەندێ پارە دانرابوو بۆ خانەوادەکەی قبوڵی نەکرد. چەندین برووسکەشمان پێگەیشت قازی ئازاد بکەین. هەندێ جار لە تارانەوە برووسکەمان بۆ دەکرا قازی بنێرین هەتا لە ڕێگە گوللەبارانی بکەن. من دژی هەموو ئەو فەرمانانە بووم، لەبەر هیچ نا، بەتەنیا لەبەر ئەوەی لەسەر ئەو باوەڕە بووم، کە هەڵدێن، ئەگەری تریش لە تاران لە ئارادابوو[934].

ئەوەی پەیوەندیی بە دادگاو پێکهاتەو دەستەی ناوبژیوانییەوە هەیە گوزارشتە لە نایاسایی. سەرۆکی دادگایان دابووە دەست عەقید "بارسی نیا"و عەقید "فەلوزی"و سەرۆك ئەرکانی سوپای کوردستانو داواکاری گشتیو چەند ئەندامێکی تر. نەجەفقولی زۆر بە دادگەرانە دەڵێ: (هەموو ئەندامانی دادوەری ئەوانە بوون، کە ساڵانی ڕابردوو قازی موحەممەد شەڕی لەدژیان کردبوو). داوا لە قازی موحەممەد کرا پارێزەرێکی بەرگریی بۆ خۆی هەڵبژێرێت. قازی موحەممەد پێی وتن: کە ئەو دان بە شەرعیەتی ئەو دادگا سەربازیەدا نانێت، چونکە مەدەنی نییە. لە کۆتایی قازی موحەممەد ناچار کرا پارێزەر بۆ خۆی دابنێت، ئەویش لەو ئەفسەرە مافناسانە داینا، کە کاتی خۆی لە تاران ناسیبوونی، بەڵام دادگا داوای لێکرد لەو ئەفسەرە نزیکانەی مهاباد دایبنێو ئەویش قبوڵی نەکرد. سەرۆکی دادگا بە ڕابواردنەوە بە قازی موحەممەدی وت: (بۆچی پارێزەری بەرگریی لە لەندەن دیاریی ناکەی؟). قازی لە وەڵامدا پێی وت: (ڕێزی خۆت

---

[934] – نەجەفقولی: سەرچاوەی پێشوو، ل9.

بگره لەو هۆڵەی ناوتان لێناوە دادگا، چی پێتان دەکرێ بیکەن، ئەگەر پەیوەندیم بە لەندەنەوە هەبوایە حاڵم بەو رۆژە نەدەگەیشت)[935].

دادگا دەیویست بە زوویی کۆتایی بە کارەکانی خۆی بێنێت، چونکە هەر رووکەش بووەو پێشتر بڕیاری لەسێدارەدان لەلایەن شاو دوایی راوێژکارە ئەمریکییەکانەوە یەکلا کرابۆوە. لە بەرگریی لەخۆکردندا قازی موحەممەد وتبووی: (لەو زەنزانەیەدا بە دەوڵەتی ناوەندیی دەڵێم: کە ئەو بەرپرسیارە، من تاوانبار نیمو تاوانبار ئێوەن، ئەگەر لەو چەند ساڵەی دوایی دەوڵەت هێزی هەبووەو ویستویەتی بینێرێتە ناوچەکە بۆ ئەوەی گوزارشت لە دەسەڵاتی دەوڵەت بکات، من ئەو فشارەی بێگانەم نەدەکەوتە سەر، من ناچار بووم بۆ پارێزگاری لە ژیانی خۆمو خێزانم ئەو کارە بکەم، لەلای خۆمەوە ئەوەی پێویست بووە گەیاندوومەتە بەرپرسە باڵاکان، بەڵام ئێوە زوڵمتان کردو هێزتان لە دژی ئێمە بەکار هێنا. چەند جار خۆم داوەتە دەست ویستی دەوڵەتی شاهەنشایی. هاوارم بۆ هێناون لەسەر فشاری سۆڤیەتو فەرمانم خستە بەردەستتان، سەرەڕای ئاگاداری هەموو باڵیۆزخانەی بێگانە لە تارانو لە بەردەم ویستگەی دەوڵەتان، رازی نەبوون بۆ پاراستنی گیانو ماڵو سامانی هاووڵاتیان هێز بنێرنە ناوچەکە. ئێمەش ناچار بووین ئەمە بکەین، من هێزو سوپام نەبووەو ناچار کراوم فەرمانی ئەوان جێبەجێ بکەم)[936].

کیومێرس ئەو تاوانانەی دیاری کردووە، کە قازی پێ لەسێدارە دراوە:

1- بەرێژەی 51٪ بۆ 49٪ بازرگانی بە نەوت کردووە لەگەڵ رووس، بێ ئاگاداریو رەزامەندیی فەرمیی دەوڵەتی ئێرانی.

2- هەوڵی گۆڕینی نەخشەی ئێرانی داوەو ویلایەتە کوردیەکانی لێ جیاکردۆتەوە.

3- ئاڵای تایبەتی لەسەر شێوەی چەکوچو داس بۆ کۆماری کوردستان داناوە.

4- پارەی تایبەتی بە ناوی کوردستان لەسەر شێوەی رۆبڵی رووسی بۆ حکومەتی کوردستان داناوە.

5- نەخشەی کوردستانی گەورەی دیاریی کردووە، کە بەشێکی ئێرانو عێراقو تورکیا و سوریای گرتۆتەوە.

---

[935] - سەرچاوەی پێشوو.

[936] - سەرچاوەی پێشوو، ل144.

6- بەبێ رەزامەندی حکومەتی ناوەندی خەڵکی بێگانە بەتایبەتی مستەفا بارزانی هێناوەتە کوردستانو نیشتەجێی کردوون.

7- هەڕەشەکردنو هاندانو راگەیاندنی شەڕی کورد دژی شا.

8- بەستنی رێککەوتنامەی هاوکاری لەگەڵ رووس دژی ئێران.

9- راگەیاندنی سەربەخۆیی کوردستانو داگیرکردنی بەشێکی خاکی ئێرانی بە ناوی کوردستان.

10- ناردنی وەفد بۆ رووسیاو سەردانی باقرۆفو ئەنجامدانی گفتوگۆ.

11- گرتنو کوشتنی فەرمانبەرانی دەوڵەت.

"کیومەرس"یش لەسەر ئەو بابەتە دەڵێ: (لەگەڵ ئەوەدا تاوانباران یاداشتنامەی بەرگرییان لەسەر خۆیان لە 14 لاپەڕەداو بە وردی لەسەر ئەو تاوانە پێشکەشی یەکەم کۆبوونەوەی دادگایی تێهەڵچوونەوە کردو داوایان کردبوو، ئەو تاوانە بسەلمێنرێت، لە دادگای مەیدانی لە فەرماندەیی سوپا سێ مانگ بەسەر داواکەیان تێپەڕی. دۆسیەکەیان هەر لە مهاباد داخرا.... چونکە دادگای تەمیز لە لایەن سوپاو بە رەزامەندی شا پێکهێنرا بوو، راسپێردرابوون جەخت بکەنە سەر بڕیاری دادگای مەیدانی یەکەم. لە 24ی ئازار ئەندامانی دادگای تێهەڵچوونەوە گەیشتنە مهاباد. ئەندامانی دادگا پێکهاتبوون لە عەقید "نیکۆزادە" بە سیفەتی داواکاری گشتیو عەقید رەجەب عەتا سەرۆكو مولازم حوسێن سالّح و مولازم نەبەوی وەکو پارێزەر. کیومەرس، چەند لایەنێکی دادگاییکردنەکەمان بۆ دەگێڕێتەوەو تیشك دەخاتە سەر سروشتی قازی موحەممەدو دوژمنەکانی: قازی موحەممەد سوور بوو لەسەر وەڵامدانەوەی هەموو ئەو تاوانانەی دراونەتە پاڵی. داواکاری گشتی دەنگی بەسەردا هەڵبڕیو ئەویش بە توڕەیی وەڵامی داواکاری گشتی دایەوەو بە زمانی فارسی پێی وت: (ئەگەر دینتان هەیەو باوەڕتان بە خوا و بە لێپرسینەوەو بە قورئان هەیە، ئەگەر زەڕەیەك پیاوەتیتان هەیە)، ئەم دەربڕینانە لە فارسیدا گوزارشتن لە ڕیسواکردن. لەوکاتە داواکاری گشتی توڕە بووەو وتوویەتی: (ئێوەی کورد خاسیەتی سەگتان هەیە)، قازیش بە روویدا راپەڕیوەو وتوویەتی: (سەگ ئێوەن، ئێوە بێ ئابڕوو بێ شەرەفن، چونکە رێزی خۆتانو رێزی خەڵکیو رێزی یاسا ناگرن. بۆیە بێ شەرەفن، چونکە تۆ ناتوانی بڕیارێکی تر دەربکەی

بێجگە لە ئەنجامدانی بڕیارێکی لە هی خۆت بێ شەرەفتر.. من بێتاوانم و لەپێناو ئازادی گەلەکەم دەکوژرێم، ئەمەش بەخششێکی خوایە... شانازی دەکەم بەو مردنە شەرەفمەندانەیە). لە وەڵامی ئەو پرسیارەی کە دەرفەتی مەلا مستەفای داوە بێتە ناو خاکی ئێران، بەم شێوە قازی وەڵامی دایەوە: (مەلا مستەفا لە کوردستان بێگانە نییە، کوردستانماڵی هەموو کوردێکە، دوایی کەس لە دوای نەناردووە، بەڵکو لە بەشێکی ماڵەکەیەوە چۆتە بەشێکی تری ماڵەکەی..)، عەقید نیکۆلای زادە، کە پێشتر قازی وەڵامی دابۆوە پارچە پەڕۆیەکی رەنگ سوورو سپیو سەوزی دەرهێنا، کە وێنەی چەکوچو داسێکی لەسەر بوو، بە قازی موحەممەدی وت: ئەمە ئاڵای حکومەتو تەشکیلاتەکەتان نییە؟! دوایی نیکۆلای زادە تفی لێکردو خستیە ژێر پێی... قازی موحەممەد وەڵامی ئەو مامەڵەیەی دایەوەو وتی: (ئەمە هەرگیز ئاڵای کوردستان نییە، چونکە ئاڵای ئێمە هەرگیز دروشمی چەکوچو داسی لەسەر نییە، ئەو کارەت بەڵگەی بێ ئەقڵیو بێ شعوری تۆیە.. ئاڵای کوردستان بەدەستی ئێوە نەگەیشتووە هەتا پیسی بکەن، رۆژێك دادێ لەسەر هەموو ئەو تەلارەی ئێستا تۆ حوکمی تیا دەکەی دەشەکێتەوە. ئاڵای کوردستانم بە ئەمانەت داوە بە مەلا مستەفا هەتا لەم نەوەیەوە بیداتە نەوەیەکی تر)[937].

بە تێڕوانینی ورد لەو تاوانانەی ئاڕاستەی قازی موحەممەد کرابوو، بەتایبەتی ئەوەی پەیوەندیی هەبووە بە ئیمتیازی نەوتی رووسو لێدانی پارەو کوشتنو گرتنی کاربەدەستنانی دەوڵەت، بەڵگەیە لەسەر بێ بنەڕەتیو نامەنتیقی ئەوەی لەسەر قازی موحەممەد وتراوە، چونکە بە خێرایی ئەفسەرەکان لە کوردستان ئامادەیان کردبوو بۆ شێواندنی کەسایەتی قازی موحەممەدو ترساندنی شاو ئەمریکیەکان. هەر باسەکانی ناو دانیشتنەکە تێڕوانینی شۆڤینیانەی فارس بەدیار دەخا بەرانبەر کورد. ئەوەی لێرەدا زۆر نامۆیە قازی موحەممەد تاوانبار کراوە بەپێدانی ئیمتیازی نەوت بەرووس، ئەگەر ئەمە تاوان بێت، قەوام سەڵتەنەی سەرۆك وەزیران لەپێشترە بە تاوانبارکردن لەسەر ئەو مەسەلەیە، چونکە ئەو ئیمتیازی نەوتی بە رووس داوەو قازی موحەممەد تەنیا لە

---

[937] - حقائق دفينة عن اعدام الزعيم القاضي محمد وصدر القاضي و سيف القاضي، ص4-5.

ڕێگەی رۆژنامەکانەوە ئەوەی بیستووە، بەڵام ئەوەی پێشبینی کراوە دادگای تەمیز بڕیارەکانی یەکەم دادگایی پەسند بکات.

ئەو پرسیارەی بە بیری خوێنەردا دێت ئەوەیە: بۆچی حکومەتی ئێرانی سوور بوو لەسەر لەسێدارەدانی قازی موحەممەدو کادیرانی "حدك"؟ ئایا قازی موحەممەد لەپێشتر زانیبووی لەسێدارەی دەدەن؟ ئەوەی شایانی باسە لیوا هەمایونی بەڵێنی دابوو، کە حکومەت نییەتی تۆڵەسەندنەوەی لە کەس نییە. نەجەفقولی دەڵێ: هەمایونی لەپێشتر نەخشەی هەبووە بۆ گرتنو لەسێدارەدانی قازی موحەممەدو براکانی، بەڵام کە هاتە مهابادو بینی باری ئەمنی ناتەواوەو هێزەکانی بارزانی لە نزیك مهاباد جێگیرن، یەکەم جار هاتە سەر لابردنی مەترسی بارزانییەکانو دوایی کەوتە یەکلاییکردنەوەی حیساباتی لەگەڵ خەڵکی مهاباد، لە دوای گەیشتنی هەمایونی بۆ مهاباد داوای لە سەرۆك هۆزی قەرەباباغی ئازەری دۆستی حکومەت کرد نامەیەك بەرێ بۆ مەلا مستەفای بارزانیو داوای کردبوو گفتوگۆی لەگەڵدا بکات. بارزانی رازی بوو هەتا میرحاجی نارد قسە لەگەڵ هەمایونی بکات، بۆ ئەو مەبەستە میرحاج گەیشتە مهاباد. دوای ئەوە مەلا مستەفا بۆ خۆی سەردانی مهابادی کرد. ئەو سەردانە بۆ هەمایونی زۆر بایەخدار بووە، چونکە خزمەتی مەبەستەکانی ئەوی کردووە، هەمایونی بە ئەنقەست لەهەمان ئەو شوێنەی قسەی لەگەڵ سەرۆك هۆزو پیاوماقوڵانی مهاباد کردووە قسەی لەگەڵ میرحاج کردووە. هەتا لەلایەك بارزانی پێی وریا بێتەوە، کە خەڵکی مهاباد هاتوونەتە ژێر گوێڕایەڵی حکومەتو لەلایەکی تر وریایی بێت بۆ سەرۆك هۆزەکانو خەڵکی مهابادیش کە بارزانییەکانیش خەریکی خۆبەدەستەوەدانن، ویستویەتی ڕێگە خۆش بکات خەڵکی مهاباد گوێڕایەڵی تەواو بن بۆ حکومەت. لە دوای ئەو گەمەیە، ڕێککەوتن لەسەر ناردنی مەلا مستەفا بۆ تاران بۆ وتوێژ لەگەڵ دەسەڵاتی ناوەندیی هەتا دڵنیا بێت لەسەر دەسەڵاتی تەواوی بەسەر مهاباد. بۆیە جورئەتی کردووە لەسەر گرتنی براکانی قازی موحەممەدو 30 لە سەرکردەکانی کۆماری کوردستان. نەجەفقوڵی دەڵێ: هەمایونی لە قازی موحەممەد تورە بوو، چونکە بۆی دەرکەوتووە نەخشەی داڕشتووە بۆ بەرگری دژی حکومەت، هەتا لە دوای هاتنی هێزەکانی ئێرانیش پەیوەندیی لەگەڵ بارزانییەکان نەپچڕاوە[938].

---

[938] - من مهاباد الدامية الى ضفاف اراس، ص143-144.

داواكاريی ئەفسەرانی سوپای ئێرانی بووە كە قازی موحەممەد لەسێدارە بدرێ، وا بەدیار دەكەوێ لەگەڵیاندا شا بەشدار بووبێت لە بەدیهێنانی ئاواتی سوپا. زامارا لە نزیكەكانی شا بووەو سوور بووە لەسەر لەسێدارەدانی قازی موحەممەد. ئەو ترسی بۆ شا درووست كردووە لەسەر كوردو كۆمۆنیستەكانو راپۆرتی نادرووستی بۆ شا ناردووە لەسەر پەیوەندیی قازی موحەممەد لە گرتووخانە بە بارزانییەكانەوە لەپێناو لێڵكردنی بارودۆخەكە، هەروەها زامارا ئەندازیاری كۆنگرەی سەرۆك هۆزە كوردەكان بووە لە كانوونی دووەمی ساڵی 1947 لە تاران، هەتا شا رێزیان لێبگرێو مەدالیای پاڵەوانییەتیان بداتێ. لە واقیعدا ئامانجی زامارا سوود وەرگرتن بووە لەو بۆنەیە لەپێناو هاندانی سەرۆك هۆزەكان بۆ ئەوەی داوا لە شا بكەن قازی موحەممەد لەسێدارە بدات. سەرەڕای ئەمە زامارا داوای لە ئەفسەرانی سوپا كرد ئیمزای داواكاری لە سەرۆك هۆزەكان كۆبكەنەوە بۆ لەسێدارەدانی قازی موحەممەد[939].

ئەمە لەكاتێكدا عومەر خانو هەندێ لە سەرۆك هۆزە كوردیەكان هەڕەشەیان كردبوو بە تەقینەوەی بارودۆخەكە، ئەگەر قازی موحەممەد لەسێدارە بدرێ، باڵیۆزی ئەمریكی لە تاران لە وتوێژدا بووە لەگەڵ شا لەسەر مەسەلەی لەسێدارەدانی قازی موحەممەد، ئامۆژگاری شای كردبوو، كە بە ئارامو وردبوونەوە هەنگاوبنێ، لەسەر جێبەجێكردنی حوكمی لەسێدارەدان، وەڵامی شا ئەوە بووە: مەسەلەی لەسێدارەدان داوای هەموو سەرۆك هۆزە كوردەكانە، قونسوڵیەتی ئەمریكاش لە تەورێز كەوتە سەر هەندێ بەدواداچوون لەسەر ئاكامی لەسێدارەدانی قازی موحەممەد. راپۆرتەكان ئەوە دەگەیەنن زامارا لە رێگەی ترساندنو هەڵخەڵەتاندنو تەنانەت خوێن رشتن ئەو راپۆرتانەی ئامادە كردووە[940].

پەیوەندیی ئاشكرا لە نێوان شەڕەكانی سوپای ئێرانیو بارزانییەكانو دادگاییكردنی قازی موحەممەددا هەبووە، ئەو تێكشكاندنو ریسواییەی بارزانییەكان كردیانە گەرووی

---

[939] - State Department Confidential Report , Tehran Embassy, Teleg. No, 5133 K May 29, 1947.

[940]-State Department Confidential Report , Tehran Embassy, Teleg. No, 5133 K May 29, 1947.

سوپای ئێرانی کاریگەریی هەبووە هەتا لەسەر سێدارەدانی قازی موحەممەد، بۆ ئەوەی ببێتە هەناسە هەڵکێشانو گیانی تۆڵەسەندنەوە لە بارزانییەکان. لەوکاتەی قازی موحەممەد لە گرتووخانە بووە بارزانییەکان چالاکی سەربازییان بۆ رزگارکردنی قازی موحەممەد دەست پێکرد، فەرماندە سەربازیەکان لەسێدارەدانیان بە باشترین رێگەچارە زانیبوو بۆ دەربازبوون لە قازی[941] .

هەندێ لە سەرکردە کوردەکان وای بۆ دەچن قازی موحەممەد پێشبینی لەسێدارەدانی نەکردبێت، بەڵکو هیوا بووە سەدری قازی برای لە ڕێگەی پەیوەندییەکانییەوە بتوانێ ئازادی بکات، هەروەها ناکۆکی سارد هەبووە لە نێوان قەوام سەڵتەنەو شا، کە لەڕاستیدا ناکۆکی نێوان بەریتانیاو ئەمریکا بووە، قازیو براکانی قەوام سەڵتەنەو ئینگلیزیان هەڵبژارد تا لەگەڵیدا رێك بکەون، بەڵام بەهەڵەدا چووبوون.

ناتوانین نکۆڵی لە ناکۆکی جەوهەری بکەین لە نێوان ئەمریکاو بەریتانیا لە ئێران لەسەر ئەو سیاسەتەی لە کوردستان پیادەیان کردووە[942] .

هێژا مەسعود بارزانی لە کتێبەکەیدا لە باوکیەوە دەگێڕێتەوە: کە هەوڵی زۆری داوە قازی موحەممەد قەناعەت پێ بکات لەگەڵیدا لە مهاباد بێتە دەرەوە، چونکە فارس یان عەجەم بە توندترین شێوە تۆڵەی لێدەکەنەوە، بەڵام قازی موحەممەد سوور بوو لەسەر مانەوە لە مهاباد، چونکە بەڵێنی پێدابوون لە ناخۆشیدا لەگەڵیاندا بێت[943] . "هێمن" لەسەر هەمان بابەت جەخت دەکاتەوەو دەڵێ: لە قازی موحەممەدم بیستووە، کە وتوویەتی دەزانم دەمکوژن، بەڵام دەمەوێ لەگەڵ خەڵکی مهاباد بمو لە ڕۆژانی ناخۆشیدا بەجێیان نەهێڵم. "کیومیرس"یش لە کاتی دادگاییکردنەکەی، لە قازی موحەممەدەوە دەگێڕێتەوە: (لەو باوەڕەدا نەبوومو نەمزانیوە، کە ئەوە چارەنوسم دەبێت، دەمتوانی لەهەر کاتێ بمەوێ لە سنوور بپەڕمەوە، بەڵام ویستم لە پێناوی کورد قوربانی بە ژیانی خۆم بدەم، ئەم کوردستانە خاکی منەو گۆڕی بابو باپیرانمە)[944] .

---

[941] - بامشاد: سەرچاوەی پێشوو ، ل91.

[942] -Deparment of Sate Reference Division O.I.R. Report No, 4365 May 8, 1947.

[943] - مسعود بارزانی: سەرچاوەی پێشوو: ل39.

[944] - حقائق دفنية عن اعدام الزعيم القاضي محمد وصدر القاضي و سيف القاضي، ص506.

"مستەفا ئەلەموتی" بە درێژایی‌و بە وردی ڕووداوەکانی باسی کۆتاییهاتنی دادگای تێهەڵچوونەوەی کردووەو دەنووسێت: (دوای ئەوەی قازی موحەممەدو براکانیان بردەوە گرتووخانەی سەربازی، کە لە نزیك مهاباد بۆیان دانرابوو، فەرمانێك لە تارانەوە هات بە زوویی لەسێدارە بدرێن، لە کاتژمێر یازدەی هەمان شەو داوا لە ئەندامانی تەمیز کرا مهاباد بەجێبهێڵن، بۆ بەیانی زوو بە قازی موحەممەدو برایەکانیان وت دەوڵەت بڕیاری داوە ڕەوانەی "تاران"تان بکات‌و دوای سەعاتێکی تر بەڕێدەکەون.

هەموویان بەم هەواڵە دڵخۆش بوون، باوەشیان بەیەکتردا دەکردو کەلوپەلەکانیان کۆکردەوە. بەپێی بەرنامە هەریەکە سواری سەیارەیەکیان کردن‌و بە نهێنی بەرەو مەڵبەندی شاری مهابادیان بردن. کاتی گەیشتن قازی موحەممەد بینی جێگەیەك ڕێکخراوە، ئەفسەرێکی پزیشکی دادو مەلایەکی مهابادو قورئانێك. قازی موحەممەد هەر زوو تێگەیشت ئامادەی دەکەن بۆ لەسێدارەدان، بە مەلا کوردەکەی وت: ڕاسپاردەکانم بۆ بنووسە، وتی: نازانم بە کوردی بنووسم، قازی وتی: گەورەترین بەڵای کورد ئەوەیە نەوەکانی نازانن بە زمانی دایکیان بنووسن، دوایی بە مەلای وت: بە فارسی بنووسە: داوا لە کورد دەکەم پابەند بن بە یەکڕیزی‌و داواش لە خانەوادەکەم دەکەم بەشێك لە سامانەکەم دابنێن بۆ قوتابخانەو نەخۆشخانە، دوای ئەوە قازی دوو سەعات‌و نیو لە نوێژدا مایەوە، ئینجا وتی: ئامادەم بۆ لەسێدارەدان، بەڵام ئامۆژگاریتان دەکەم لە ئیسلامدا هەڵواسین باش نییە، داواتان لێ دەکەم بە چەك بمکوژن، خواستەکەیان بەجێ نەهێنا، ئەویش بەوپەڕی لەسەرخۆو سەربەرزییەوە بەرەو هەڵواسین چوو، بەر لەسێدارەدانی هاواری کرد "بژی کوردستان". دوایی سەیفی قازییان هێنا لە سێدارەیانداو لاشەی قازی موحەممەدی بینی بە هەڵواسراوی هاواری کرد "بژی پێشەوا قازی موحەممەد"، لە پێنجەم کاتژمێر سەدری قازیان هێنا، کە پەتی سێدارەی بینی رووخاو کەوتە گریان‌و ماچکردنی پێڵاوی سەربازە ئێرانییەکان، مەلا کوردیەکە بە ڕوویدا هاواری کرد: (گوێبگرە، من‌و ئەو سەربازانە ناتوانین رزگارت بکەین، دەسەڵات هی دادگایە، تۆش وەکو پیاو هەڵسوکەوت بکە)[945].

[945] -بەئاواتی سەربەخۆیی کوردستان، ل21-22.

## کورتەی توێژینەوە

کۆماری کردستان هەوڵێکی کەموێنە بووە لە مێژووی کورد بۆ جەختکردنە سەر ناسنامەی نەتەوایەتی‌و بنیاتنانی قەوارەی سیاسی تایبەت بە کورد. ئەو هەوڵەش وەکو هەوڵەکانی تری سەدەی نۆزدەو بیست نوشستی هێنا، چونکە لەگەڵ بەرژەوەندیی هێزەکانی ئەوروپی لەخۆباییبوو تێك دەگیراو لەگەڵ ئەو قەوارە ناسیۆنالستانەش تێکی نەدەکردەوە، کە دوای شەڕی یەکەمی جیهانی درووستی کردبوون.

لەم تێکشکانەش رووس‌و بەرژەوەندیە نەوتیەکانی بەشی شێریان بەرکەوتووە. کۆماری کوردستان بێ بەڵێنە پێشینەییەکانی رووس بە سەرکردایەتی کورد درووست نەدەبوو. سەرکردایەتی کورد پێیوابووە سۆڤیەت بە پێچەوانەی دەوڵەتانی تری رۆژئاوا لە زەمینەیەکی ئایدۆلۆژی‌و مرۆڤایەتیەوە هەنگاو هەڵدەگرێ‌و هەرگیز بەجێیان ناهێڵێ، هەموو متمانەی خۆیان خستبووە سەر رووس‌و لەجێگرەوەی تر نەدەگەڕان، لەوەشدا بە هەڵەدا چووبوون. لەڕاستیدا رووس لە نیسانی ساڵی 1946وە هاوپەیمانی کورد نەمابوو، بە دەربڕینێکی تر وازی لە کورد هێنابوو.

بەر لەوەی کورد بە تەواوی پەیوەندیی لەگەڵ سۆڤیەتی کۆمۆنیستی‌و ئازەربایجان ببڕێت دەرفەتێك لەبەردەم کورد مابوو بەدوای چارەسەری مامناوەندیدا بگەڕێن لەگەڵ دەسەڵاتی ناوەندی یان دەوڵەتی سەربەخۆ رابگەیەنن‌و بەتەواوی لە ئێران دابڕێن. وا چاکتر بوو سەرکردایەتی ئەوکاتەی کورد بچوایە هەڵوێستی بگرتایە بۆ ماوەیەك پشتی بە خۆی ببەستایە. ئەمە لە کاتێکدا دەبینین هێزە گەورەکان مامەڵەیان لەگەڵ ئاکامی واقیعەکە دەکرد. من پێموایە ئەگەر کورد پشتی بە خۆی ببەستایە - لە چلەکان‌و بیستەکان، ئەمەی بکردایە مەحاڵ نەبوو- ببوایە ئەمری واقیع‌و هێزە نێودەوڵەتی‌و ئیقلیمیەکان بە ناچاری مامەڵەیان لەگەڵدا دەکرد، هەروەکو لە بیستەکانی سەدەی بیستەم لە تورکیا ئەمە بۆ مستەفا کەمال هاتەدی.

ئەزموونی کۆماری کوردستان بە ڕوونی دەریخست، کە بیری نەتەوایەتی عەلمانی - لەو ماوەیەدا لە حیزبی دیموکراتی کوردستان رەنگی دابۆوە- لە بیری دەستەبژێری "نخبة"ی شار کورت هەڵهاتبوو. دۆستایەتی‌و گوێڕایەڵی جەماوەری کورد زیاتر خێڵایەتی بووەو سەرۆك هۆزو شێخەکان زاڵ بوون بەسەر ئەقڵیەتی ئەوکاتەی کورد.

قازی موحەممەد نەیتوانیوە جێگرەوەی واقیعی لە بەرانبەر خێڵایەتی لەناو کورد بخاتەڕوو. دروشمی کوردایەتی تێکەڵ بووە لە ئیسلامەتیو بیری نەتەوایەتی کوردستان.

سەرۆك هۆزەکان لە جیاتی ئەم دروشمانە بۆ بەرژەوەندیی کورد بەکار بهێنن، بۆ مەرامی تایبەتی خۆیان بەکاریان هێناوە، بەرژەوەندیی تایبەتی سەرچاوەی هاوکاریو تەبایی سەرۆك هۆزەکانی کورد بووە، کەسانی وەکو حەمە رەشیدخانو عومەرخانی شکاكو ئەوانی تریش بڕبڕەی پشتی قازی موحەممەد بوون لە بەرگریی کوردستان لە شەڕەکانی 1946 لەگەڵ دەسەڵاتی ناوەندیی، کۆماری کوردستان پەیوەستی سیاسیو ئایدۆلۆژی نەبووە یان ئەوەی پێی دەڵێن بەرژەوەندیی نەتەوایەتی نەخرابووە سەرووی بەرژەوەندیی تاكو هۆزو ناوچەیی.

وا باشتر بوو قازی موحەممەد سەرقاڵی پەیوەندیی راستەوخۆ بوایا لەگەڵ جەماوەری کوردستانو پشتی لە سەرۆك هۆزەکان بکردایە، پشتی بە کەسایەتی خۆیو خانەوادەیو هەستی ئیسلامەتیەکەی ببەستایە، کاریگەریی مەعنەوی باشی لەناو خەڵکدا دەبوو، ساڵانی شەڕی یەکەمی جیهانیش باشترین دەرفەت بووە بۆ کارێکی لەو جۆرە. ساڵانی 1941 ـ 1946 بۆشاییەکی سیاسیو سەربازی هەبووە بۆ بنیاتنانی تۆڕی پەیوەندیی لەگەڵ جەماوەرو بڵاوبوونەوەی هوشیاری ئیسلامیو سازدانی کۆمەڵگای کوردی بۆ خەباتو بەرگریی، ئەو خەباتەی لە بەرانبەر قەوارەو پەیوەستە خێڵەکیەکانی ئەوکات بەهێز دەبوو. لەگەڵ ئەوەی قازی موحەممەد شارەزایی لە مێژووی کوردا هەبووە، بەڵام بەداخەوە هەمان هەڵەی شێخ عوبێدوڵڵای نەهری دووبارە کردەوە لە پشتبەستن بە سەرۆك هۆزەکان، کە لەگەڵ سەرنجیان دەدا حکومەت بەهێز بۆتەوە لە کۆمار دوور دەکەوتنەوە، هەتا کۆتایی سەدەی بیستەمیش کورد مێژووە هەڵەکانی خۆی دووبارە دەکاتەوە. پێشتر ئاماژەمان پێدا، بەڵام بۆ دڵنیایی زیاتر دەڵێم لە سەدەی بیستەم بە هۆی تێنەگەیشتن لە گوزارشتە سیاسیو دەولیەکانو مەسەلەی هاوسەنگی هێز لەسەر گۆڕەپانی کوردستان کورد باجی زۆریدا، زۆر جار بێئومێدی باڵی بەسەر کوردا کێشاوە بەهۆی ئەو قورساییە متمانەییەی خستوویەتیە سەر یەکێك لە دەوڵەتە گەورەکانو بەشێوەیەکی هاوسەنگ تۆڕی پەیوەندیی لەگەڵ هێزە هەرێمیو

